

# کۆشکی باڵندە غەمگینەکان

بەختیار عەلی






ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: کۆشکی باڵندە غەمگینەکان
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٢٢٢٤)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-980-3



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

١

یەکێک لە ئێوارە ساردەکانی زستان بوو کە مەنگوڕی بابەگەورە و کامەرانی سەلما لە سەر سیلەی یەکێک لە کۆڵانەکاندا مەنسور ئەسرینیان بینی. سەعاتێک بوو بە تایبەت لەوێدا وەستابوون بۆ ئەوەی ئەو ببینن. کامەرانی سەلما سوێندی خواردبوو گەر قسەکانی لەگەڵ ئەسریندا نەگەنە ئەنجام، بیکوژێت. سووک و سادە بیکوژێت، «وەک سەگێک خەڵتانی خوێنی بکات» چونکە جگە لەوە چارەیەکی تری نییە. هەموو دەیانناسی چ کوڕێکی تووڕە و خۆنەگر و دڵگەرمە. ماوەیەک بوو ئەو دەنگۆ زۆرانەی لە هەندێ جێگادا دەهاتن و دەچوون، شێتیانکردبوو... کەس بەتەواوی نازانێت چۆن ئەو دەنگۆیانە گەیشتوونەتە کامەران، بەڵام دەرونێکی بەدخوا تەواوی چیرۆکەکەی بە زیادە و پێوەنانێکی زۆرەوە بۆ ئەو گێڕابووەوە. هەمووان دەیانگووت کە سەوسەن فیکرەت»ئەو کچە شۆخ و نەناسراوەی پتر لە ساڵێکە لە بەغداوە هاتۆتە ئەم شارە» حەزی لە مەنسور ئەسرین کردوە. ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، کامەرانی سەلما هیچ چارێکی نییە جگە لەوەی بیکوژێت، گەر پێویستبکات دەتوانێت خۆشی بکوژێت. ئەوەی بتوانێت چارێکی تر بێ ئومێدی ئەو خۆشەویستییە لە ناکاوە بژی، نەکردەبوو، کوڕەکە بە چەشنێک عاشق بوو مرۆڤ لێیدەترسا... ئەوەی بە هەموو کەسێک گووتبوو، بە هاوڕێکانی سەر خواردنەوە، بە خوشکەکانی، بە ئامۆزاکانی، بە دراوسێ

دوکانەکانی براکەی... یەکە یەکە پێیگوتبوون ئەگەر لەگەڵ مەنسور ئەسریندا نەگاتە ئەنجام دەیکوژێت. هەموو دەیانزانی کامەرانی سەلما لەو گەنجە سەرەڕۆ و شێتانەیە کە دەکرێت کاری لەو جۆرەی لێ بوەشێتەوە. کوڕەکە لەو چەقۆ وەشێنە بێدەروەستانەیە کە بەدروستی نازانێت حەزکردن مانای چی، ترسناکترین شتیش ئەوەیە یەکێک لەمجۆرە سەرشێتانە لە ناکاو عاشق بێت. مەنگوڕی بابەگەورە کە داناترین هاوڕێی بوو، پێشنیاری ئەوەی بۆ کردبوو بەر لەوەی دەستبداتە هیچ کارێک لەگەڵ مەنسوردا قسەبکات. گووتبووی «هیچ کەسێک تا ئێستا شتێکی ڕاست دەربارەی پەیوەندی سەوسەن فیکرەت و مەنسور نازانێت... ناکرێت تۆ ئەوەندە هەڵەشە و بێهۆش بیت، بێ هیچ قسەیەک و بەڵگەیەک کەسێک بکوژیت». مەنگوڕ خۆی لە ناسراوترین و کۆنترین چەقۆکێشەکانی شار بوو، هەمیشە بە حیکمەتێکی زۆرەوە ئیشیکردبوو، باوەڕی بەوە هەبوو مرۆڤ بەر لەوەی دەست بۆ چەقۆکەی بەرێت، دەبێت هەموو هەوڵێکی خۆی دابێت. هەمیشە کامەرانی سەلمای وەک کوڕێک یان برا بچوکێکی خۆی بینیبوو، شتێک لە ئازایەتی لەو گەنجەدا هەبوو ڕێزی دەگرت. ئەو ڕێزی ئەمجۆرە پیاوە کەللە گەرمانە دەگرێت، چونکە شتێک لە کڵپەی ژیانیان تێدایە مەنگور زۆر حەزی پێدەکات. ئەوکات کامەران تەمەنی لە بیستساڵ تێنەدەپەڕی، لەگەڵ هەموو منداڵی و سەرەڕۆیی خۆیدا خاوەنی ئەزمونێک بوو، مەنگوڕ کە گەلێک لەو گەورەتر بوو نرخ و بەهای گەورەی بۆ دادەنا. ساڵێک لەوەوبەر لە کاتی قوماردا لە ژێرزەمینی ئوتێلێکی ناسراودا ناسیبووی، ئوتێلێکی چڵکن و کۆن کە ناوبانگی خۆی یەکەمجار لە پیسی و پۆخڵی و دووەمیش لەوەوە وەرگرتبوو کە کۆمەڵێک لە شارەزاترین و دڵڕەقترین قومارچییەکان یاری تێدا دەکەن. هەر لە یەکەم ساتەوە بەوە سەرسامبوو کە کامەران گەنجێکی وەها چاوقایم و نەترسە، بەو چەشنە تێکەڵ بەو

یاریکەرە شارەزایانە دەبێت کە هەندێکیان لەسەر شتی زۆر لە پارە بچوک و بێماناتر دەستیان خوێناوی بووبوو. هەر ئەوە نەبوو کوڕێکی جوان بێت کە قژێکی قەترانی و پێستێکی شەرابی هەیە، بەڵکو کە هات لە یەکەم ئێوارەوە هەموو شتێکی لەسەر یاریکەرەکان و ئوتێلەکە دەزانی. شێوەی خۆگۆڕینی و چۆنێتی قسەکردنی، ئەو جلە کوردییە قەشەنگانەش کە ئێجگار شیک لەگەڵ قامەتیدا دەگونجان، وایاندەکرد هەمووان بە شتێک لەسەرسامییەوە سەیریبکەن. دەبێت بڵێین گەر لە یەکەم ڕۆژەوە مەنگوڕی بابەگەورە نەبووایە لەوانەبوو تووشی گێچەڵی کوشندە ببێت. خۆی یەکێک بوو لەو سەرەڕۆ بێباکانەی، سڵی لە وروژاندنی هیچ ئەژدیهایەک نەدەکردەوە. بەجۆرێک باوەڕی بە خۆی بوو، دەکرا گەلەک زوو خۆی بخاتە ناو دەرد و گرفتی گەورەوە. غەمخۆری و ئامۆژگاریی خوشکەکانی سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، هەردەم بە شتێک لە هەڵچوون و توڕەیی خۆی دەربازدەکرد. هەموو باوەڕیان وابوو هەر بە گەنجی خۆی تووشی کارەساتێک دەکات و تیادەچێت. پێشتر دووان لە خاڵوانی کە هەمان سروشتیان هەبوو، لە تافی جەهێڵیدا بە ڕوداوی بێمانا و بۆ شتی گەلێک بێبایەخ تیاچووبوون. وەک ئەوەی ئەوجۆرە ڕەفتارە لە خوێنی خێزانەکەدا بێت، هەمیشە ئارەزوویەکی توندی تێدابوو شتگەلێک بکات کە ئاسان نیین و کێشەیان بەدوادا دێت. مەنگوڕی بابەگەورە کەمجار کەسێکی بەو چەشنە خستبووە ژێر باڵی خۆی. دەیزانی ئەو سەردەمەی کامەران تیادەژی، جیاوازە لەگەڵ بیست ساڵ لەوەوبەردا، دەمێک خۆی هەمان یاریدەکرد. بیست ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ بەرچاوی ڕوونتربوو، دەوڵەت لە هەموو کونج و کەلێنێکدا خەڵکانێکی نەبوو مرۆڤ حیسابیان بۆ بکات، بەمشێوەیە نەخزابووە ناو چەورە و چەقۆکێشەکانی بازاڕەوە، ئەوکات سیاسەت وەک ئەمڕۆ کۆڕی گەرم نەبوو... ئێستا هەموو شتێک پڕ ترس و تاریکترە. مایەی ئەفسوسە

یەکێکی وەک کامەرانی سەلما بەهۆی نەفامییەکی گەنجانەوە تیابچێت. دوای ئەزموونی بیست ساڵ گەیشتبووە ئەو بڕوایەی نەهێڵێت ئەم کوڕە سوار سەری خۆی ببێت و خولیاکانی بیکوژن، ئەوە بووبوو بە مەسەلەیەکی گەورە لەلای. مەنگوڕی بابەگەورە دەیزانی ئێستا وەک جاران نییە مرۆڤ چەقۆیەک بخاتە گیرفانی و بێهەق و حیساب لە هەموو شوێنێکدا دەریبهێنێت و بە ڕووتی ئاشکرایبکات. گەر کامەرانی سەلمای بیست ساڵ لەوەوبەر ببینیایە باکی بەوە نەدەبوو لە کام شەڕە چەقۆدا زامداردەبێت، کێ دەیپێکێت یان کێ دەیکوژێت، بەڵام ئێستا چ ئارەزوویەکی نییە گەنجێکی وەها خوێن گەرم و پڕ کڵپە بە مردوویی ببینێت. بە هاوڕێکانی گووت ئەم کوڕە قۆناغێکی بێمێشکی ئێجگار تایبەت دەژی، دەبێت چاومان لەسەری بێت. سەرەتا وەک قومارچییەکی زیرەک کە جووتێک چاوی هوشیاری هەیە خۆشیویست، بەڵام دواتر جۆرە سۆزێکی برایانەی بەرامبەری هەبوو. مانگێک لەوەوبەر کامەران بە جۆرێک لە شانازی و خۆشبەختییەوە پێیگووت کە حەزی لە کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی کردوە. شێوازی ڕاگەیاندن و درکاندنی کامەران بۆ ئەو عەشقە بەجۆرێک سەیر و بێوێنە بوو، مەنگوڕی سەرسامکرد. پتر لە بیستوپێنج ساڵ بوو لێرەو لەوێ خەڵکی دەبینی کە باسی عەشق و عاشقی دەکەن، بەڵام پێشتر کەسی نەبینیبوو، بەو چەشنە ئاشکرایە باسی خۆشەویستی خۆی بکات. ئەو لە هەموو جێگایەکدا و لە بەردەم هەموو کەسێکدا بە فەخرێکی میرانەوە باسی حەزکردنی خۆی لە سەوسەن دەکرد. لە ناو خوشک و کچە پورەکانیشیدا هەمان ئاوازی دەخوێند. بەڵام هەموو دەیانزانی کە سەوسەن فیکرەت خۆی هیچ شتێک لەو بارەیەوە نازانێت. یەکێک لە خوشکەکانی پێیگووت «سەوسەن بە ئەندازەیەک جوانە، وادەزانم نیوەی پیاوانی شار حەزیان لێکردبێت، دڵنیابە جەنابت لەو حەزەدا بە تەنیا نیت». هەموو کچە

پورەکانی لەو باوەڕەدابوون کە سەوسەن گوڵدانچی کچێکی لووت بەرزە و ناوبانگی جوانی خۆی لەو جل و بەرگ و مەکیاجە کاڵانەوە بەدەستهێناوە کە بەردەوام دەیانگۆڕێت، بەڵام هەمووش دەیانزانی جگە لەو ڕێکپۆشی و جوانپەرگییەی شتێکی نەزانراو لە سەوسەندا هەیە دەیکات بە خانمێکی تایبەت. جلەکانی هەمیشە لە جلی ئافرەتانی دی بە حیشمەتتر بوون، گەرچی مەکیاجێکی زۆر تەنکی دەکرد، بەڵام شتێک لە گونجاندنی ڕەنگ و هارمۆنییەتی تێدابوو، سەرنجی هەر کەسێکی ڕادەکێشا. خانمێکی شاریتر و شارستانیتر لە ژنانی ئەم شارە دەردەکەوت کە لە خۆجوانکردندا خۆیان زۆر ماندوودەکەن، بەڵام هەمیشە شتێک ناڕێک دەڕوات و زۆربەیان هەرچییەک دەکەن هەر گوندەکی دەنوێنن. کە مەنگوڕی بابەگەورە یەکەمجار سەوسەن فیکرەتی بینی، گوتی « گەر ئەم خانمە ببێت بە ژنت تا ماویت پیاوێکی بەختەوەر دەبیت» . کامۆی سەلما ئەگەرچی ئەزموونێکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەڤین و خۆشەویستیدا نەبوو، بەڵام وەک زۆر لە گەنجە بۆشناخەکانی هاوتەمەنی لەو باوەڕەدابوو هەر کاتێک و هەر خانمێکی بوێت دەتوانێت بیکات بە ئەڤینی خۆی. ئەو جۆرە لە خۆڕازیبوونە بێئەندازەیە، لەڕاستیدا هۆیەک و بەهانەیەکی ڕاستەقینەی نەبوو. کوڕەکەی سەلما گەرچی گەنجێکی جوان و بەسەروسیما بوو، بەڵام ناوبانگی بە شێوەیەک خراپ ڕۆیشتبوو، کچە پورەکانی خۆی لێدەرچێت، بەشی هەرە زۆری خانمانی شار، وەک مێردێک یان خۆشەویستێکی نمونەیی سەیریان نەدەکرد. بەڵام مەنگوڕی بابەگەورە دڵنیابوو هەر کەسێک بەم کوڕە ئاشنابێت و ئەو دڵگەرمییە منداڵانەیەی لە نزیکەوە ببینێت، لەو هەڵچوونە لە ناکاو و زمانپیسی و شەڕانگێزییە نەگونجاوانەی دەگوزەرێت. هەمیشە دەیگوت «خراپەکانی خراپەی گەنجین» . هەموو هەستیاندەکرد لێبوردنی مەنگوڕی بابەگەورە بەرابەر ئەو کارە بەد و چەقۆوەشێنییە بێباکانەی کوڕی سەلما دۆڵان، جۆرە

لێبوردنێکە لە خراپەکانی گەنجی خۆی، لەو سەردەمانەی بێڕەحمترین چەقۆکێش و مەینۆشی شار بوو، سووکایەتی پیشەی سادە و کاری ڕۆژانەی بوو، وەک شەڕانییەکی بێڕەحم ناوی لە هەموو کۆڕ و مەجلیسێکدا دەهات. ئێستا کە بووە بە کەسێکی دیکە، هێشتا تێگەیشتنی بۆ ئەو جۆرە سەرگەرمی و لادەرییە وەک خۆیەتی. بەڵام مەنگوڕ وەک ئامۆژگاری برایەکی بچکۆلانەی خۆی بکات، پێیگووت «چەقۆ لە ڕووی کەسێکدا بەرزمەکەرەوە کە نەیناسیت، لەگەڵ یەکێکدا بچۆرە جەنگەوە بزانیت چ کارەیە». ئەو ئێوارە ساردەی زستان کە چاوەڕوانی مەنسور ئەسرینیان دەکرد، هەمووان بە تەمای بەفرێکی گەورەبوون، دونیا بە جۆرێک ساردبوو، مەنگوڕ دەلەرزی. ئەوە یەکێک بوو لە نیشانەکانی پیری کە هێدی هێدی هەستی پێدەکرد. وا بۆ زیاد لە سێ ساڵ دەچێت ناتوانێت زستانان بێ کلێتە بژی... بەدرێژایی زستان شتێک لە چەمینەوە و خۆکورپکردن و گرمۆڵەبوونی پێوەدیاربوو. ئێستا هەر کەسێک لە دووریشەوە بیدیبایە بەو کرژبوونە زۆر و بەو کلێتە ڕوسییە ئەستوورەدا دەیناسییەوە. مەنسور دوای نیو سەعات چاوەڕوانی لە پاڵتۆیەکی ڕەشدا دەرکەوت، گەنجێکی بەویقاربوو کە هیچ ترسێکی ئەوتۆی لە سەرما پێوە دیارنەبوو، لەو گۆرانیبێژانە دەچوو کە بە گیتارەوە لە بەفردا گۆرانی دەڵێن، قژێکی پڕی هەبوو کە با بەرەو دواوە دەیبرد، باریک و غەمگین بوو، شتێک لە نیگایدا بوو مرۆڤ واهەستبکات هەر ئێستا توانجێکی ڕەش دڵی شکاندوە. مەنگوڕ نەیدەزانی چۆن لەم چەشنە گەنجانە نزیک ببێتەوە، کوڕەکە دەنگێکی ناسک و خاڵی لە گرێی هەبوو، بەڵام دوور لە هەر چەشنە تۆنێکی کچانە کە دەشێت خۆشی و ئەفسونی ناو دەنگی هەر پیاوێکی ئەم شارە لکەداربکەن. مەنسور دەموچاوێکی باریک و جووتێک چاوی کراوەی هەبوو... چەشنێک لە ئادەمیزاد کە مەنگوڕ حەسودی پێدەبردن، بە درێژایی ژیانی وەک

کەسێکی کورت و کونج و سەرڕووتاوە دەبایە دڕتر و بێڕەحمتر بێت بۆ ئەوەی بژی، لە شارێکی بێڕەحمی وەک ئێرەدا، ئەو وەک پیاوێکی ناشیرین دەبایە دەجار لەوانی دی زیاتر هونەری ژیان بزانێت، بۆ ئەوەی بمێنێتەوە و نەخورێت و فەرامۆش نەکرێت. بەڵام ئەم نموونانەی لە جۆری مەنسور نەسرین هەمیشە زیرەکتر و خۆشەویستتر و قەبووڵکراوترن، شتێکیان تێدایە خەڵک ئاسانتر قەبووڵیانبکات. مەنگوڕ لە یەکەم ساتەوە کە سەیری چاوی کرد، تێگەیشت ئەم کوڕە عاشقە و عاشقێکی ئەبەدیشە. لە نیهانی خۆیدا دڵنیابوو ئەم چەشنە لە ئادەمیزاد، کە هەر چەند کەم زیان و بێخەتەر دەنوێنن، بەڵام لە ناوەوە سەرسەخت و زۆرکێشن. لەو جۆرانەن درەنگ هەڵدەچن و درەنگیش واز لە ئومێدی خۆیان دەهێنن... مەنگوڕ حەزی لەو توخمە دەکرد کە زوو هەڵدەچن، زوو دەیکەنە قیامەت، بەڵام ئاسان پەشیماندەبنەوە. گەرچی مەنسور کوڕێکی گەلەک شیرین دیاربوو، بەڵام مەنگوڕ لە دڵی خۆیدا گووتی « لە سەگ دەچێت». وشەی سەگ لە فەرهەنگی ئەودا هەمان مانای خراپی نەبوو کە خەڵکی ڕۆژانە بەکاریدەهێنن، بەڵکو وشەیەک بوو، بۆ وەسفی جۆرێک لە دەروون کە بە ڕێگای پێچاوپێچ دەگاتە نیازەکانی خۆی، دەروونێک بەڕووکەش سادە و ساکار دەنوێنێت، بەڵام لە ڕاستیدا وریا و زیت و پڕ فێڵە. مەنسور شتێکی لەسەر چیرۆکی ئەم یەکتر بینینە دەزانی، مەنگوڕ لە ڕێگای هاوڕێیەکی خۆیەوە هەواڵی ئەوەی بە مەنسور گەیاندبوو کە لەگەڵ دۆستێکدا دەیەوێت ببیبینێت، بەڵام کاتێکی دیاریکراویان بۆ ئەم چاوپێکەوتنە دیاری نەکردبوو. شتێک لە غرور و لە خۆڕازیبوونی دێرماک کە پێدەچوو پاشماوەی هەستە ئاگرینەکانی سەردەمی گەنجی بێت، وایدەکرد مەنگوڕ وابزانێت هەموو کەس لەم شارەدا دەیناسێت. ناوی خۆی وەک یەکێک لە ناوە گرنگەکان دەبینی، شۆرەت و ناوبانگی لە ڕیزی خەڵکی بازاڕ و قومارچییەکاندا ئەو خەیاڵەی

تیاسەوزکردبوو کە هیچ کەس نییە نەیناسێت، بەڵام لە ڕاستیدا مەنسور ئەسرین نەیدەناسی، کە هاوڕێیەکی پێیگووت «مەنگوڕی بابەگەورە و هاوڕێیەکی دەیانەوێت بتبینن». ئەسرین وای هەستکرد مەسەلەکە پەیوەندی بە کێشەی یەکێک لە خوشکەکانییەوە هەبێت، کە دەیزانی پەیوەندییەکی دڵداری توندی لەگەڵ ئالتونچییەکدا هەیە... ڕاستەوخۆ خەیاڵی بۆئەوەچوو، کە ئەو دڵدارییە شێتانە و بێسنوورەی خوشکەکەی دواجار موسیبەتێک لە خێزانەکەدا دروستدەکات. بەوەدا خۆشی عاشق بوو، هەستیدەکرد چەند عاشقێک لە یەککاتدا و لە ناو یەک خێزاندا جێگایان نابێتەوە. ناوی مەنگوڕی بابەگەورەی نەبیستبوو، بەڵام پێشتر مەنگوڕی بینیبوو، کەس نییە ئەم پیاوەی نەبینبێت کە هەمیشە لە مراخانی سەر دەق و کڵاشی پاک و سپیدا لە هەموو شوێنێکدا دەبینرا، لە زۆربەی چایخانە و باڕ و کەبابخانەکاندا دەردەکەوت. شێوەی بەچەشنێک بوو مرۆڤ گەر بیدیبایە لە یادی نەدەکرد. سەرێکی ڕووتاوەی خڕ، دەموچاوێکی کونج، ملێکی کورت، باڵایەکی بچکۆلە و گرد، بەڵام لە هەمان کاتدا پڕ لە شانازی. بەڵام مەنسور سەر بەو دونیایە نەبوو کە ئەو تیادەگەڕا. قوتابی پۆلی سێی بایۆلۆژی بوو. دڵنیابوو لەوەویەر دەیانجار ئەم پیاوە چکۆلانەیەی بینیوە کە لەگەڵ هەموو ناشیرینییەکانیدا جووتێک چاوی کراوە و هەنگوینی هەبوو، جووتێک چاوی هێند جوان کە زۆر لە دزێوییەکانی دیکەی کەمکردبووەوە، لەو چاوانەی دەکرێت پڕ ڕەحم دەربکەون و لە کاتی تایبەتیشدا ترسناک و توڕە دیاربن... ئەزموونێکی درێژ فێریکردبوو لە ڕێگای سەرنج و نیگاکردنەوە، هێمنی و توڕەییەکانی خۆی بۆ خەڵک بگوازێتەوە. هەر کەس بەوردی چاوی بخوێندبایەتەوە دەیتوانی خۆی لە شەڕی مەنگوڕ لابدات. بەڵام ئەو ئێوارەیە بە چەشنێک ساردبوو، مەنگوڕ تەنیا لە بیری ئەوەدا بوو، مەنسور ڕازیبکەن بچنە شوێنێکی نزیک، بچنە یانەیەکی خواردنەوە یان

دوکانی دۆستێک یاخود هەر گوزەرێک ئەو بایە نەیگرێتەوە.

دواجار جێگایەکیان بۆ دانیشتن لە ژێر زەمینی دوکانی خدرۆ دوویاردا دۆزییەوە. مەخزەنێکی گەورەی پڕ لە پانکەی شکاو و موبەڕیدەی کۆن و بۆردی کارەبایی ژەنگاوی و ماتۆڕی بێکەڵکی ناو سەرخستن و تۆپە وایەری کارەبایی ڕزیو و کلێپسی کەچاوی. ئەوەی مەنسور ئەسرین وەها ئاسان دوای ئەم دوو پیاوە نەناسراوە کەوت شوێنی گومان بوو، تا کاتێکیش کە لەسەر سێ کورسی شکاو بەرابەر یەک دانیشتن، مەنسور هەر وایدەزانی مەسەلەکە بۆ قسەکردنە لەسەر دڵدارییەکانی خوشکەکەی. گەر بیزانیبایە مەسەلەکە بۆ قسەکردنە لەسەر سەوسەن فیکرەت، بە دڵنیاییەوە نەدەهات. هەستیدەکرد هێزێک نییە وای لێبکات لەسەر سەوسەن فیکرەت قسەبکات. بەڵام شتێکی سەیربوو، بۆ ئامادەبوو لەسەر دڵداری خوشکەکانی لەگەڵ خەڵکانی غەریبدا قسەبکات، کەچی ئامادەنەبوو لەسەر خۆی هیچ ببیستێت.

بۆنی ژێر زەمینەکە و تارێکییەکەی زنجیرەیەک جێگا و شوێنی دیکەی بەیادی مەنسوردا هێنایەوە. ژووری منداڵی خۆی لە ماڵی باپیرەیدا بە خۆی و فەرشە قەشەنگەکانییەوە، ژووری مردنی هوشیاری هاوڕێی لە خەستەخانە، لابۆری جانەوەرە ئاوییەکان لە زانکۆ، ژووری خەوتنی یوسفی پورزای لەگەڵ ژنی دووهەمیدا، زنجیرەیەک شوێن کە یادەوەری ئەو نەبێت هیچ شتێکی دی پێکەوە گرێی نەدەدانەوە. لەو ساتەدا هەستێکی ڕاستەقینەی نەبوو کە ئەم ژێر زەمینە هەموو ژیانی دەگۆڕێت و بەرەو شوێنی زۆر دوور دەیبات.

کامەرانی سەلما لەسەرەتاوە گەلێک بێدەنگ بوو، مەنسور نەیدەزانی ئەم گەنجە لەگەڵ مەنگوڕی بابەگەورەدا چ کارەیە. مەنگوڕ خۆی مامۆستای قسەکردن بوو، دەیزانی چۆن وشەی جوان تێکەڵ بە زمانی سەرسەری و شەلاتییەکانی ناو بازاڕ بکات. بە خۆی دەگووت، من

تێکەڵەیەکم لە شەلاتی و مەلای دوازدە عیلم، لە بودەڵە و پیاوماقوڵ. هەر کەسێکیش ناسیبێتی زانیوێتی مەنگوڕ لەو وەسفەدا لەسەر هەقە. مەنگوڕ لەوەدا بەتەنها نەبوو، یەکێک بوو لە تاقمێک هەر لە سەرەتاوە ژیانیان بە خواردنەوە و شەڕەچەقۆ دەستی پێکردبوو، بەڵام ئەزمونێکی دوور و درێژ لە دونیای سیاسەت و شەڕدا شتێک لە عەقڵ و حیکمەتی پێدا بوون، بێئەوەی ماکی ئەو دەردە دێرینەیان تەواو تێدا بمرێت. مەنگوڕ کە سەیری کامەرانی سەلمای دەکرد لە دڵی خۆیدا دەیگووت «گەر لە سەردەمی مندا بووایە، لە مێژبوو تیاچووبوو». مەنسووری ئەسرین بە غەریزە زیرەکەکانی خۆی هەستیکرد دەبێت مەنگوڕی بابەگەورە پیاوێکی گرنگ بێت، ئەوەی تەزبێحێکی دەنک گەورەی پێبوو، ئەوەی چاوی شتێک لە سووری و بۆنی شتێک لە هالاوی هەمیشەیی عارەقی تێدابوو، ئەوەیان نەدەشاردەوە کە حەکیمانە ڕەفتاردەکات. شتێک لە هەڵسوکەوتیدا بوو متمانەی پێبکات... گەر ئەو شتە نەبایە دوای نەدەکەوت بۆ ئەم ژێر زەمینە. کە مەنگوڕ قسەیکرد، مەنسور دڵی خێراتر لێیدەدا، مەنگوڕ گووتی «شتێک هەیە عەزیزم حەزدەکەم بە خۆشی بیبڕینەوە... باوەڕت بێت حەزدەکەم بە خۆشی تەواویبکەین... ئێمە حەزمان لە شەڕ نییە، بەدرێژایی ژیانم خەڵک دەڵێن مەنگوڕی بابەگەورە حەزی لە شەڕەچەقۆیە، بەڵام وانییە. من و کاک کامەران بۆ ئەو مەسەلەیە قسەت لەگەڵدا دەکەین. بۆ ئەوەی هەرا و بەزمی تێدا نەکەوێتەوە، کاک کامەران دەیەوێت کچەکەی کاک فیکرەت گوڵدانچی بخوازێت. دەیەوێت ئەو بکات بە خێزانی خۆی... دەڵێن کچێکی شەریف و خێزانێکی باشن. بڕیارە لەم هەفتەیەدا بچینە داوای، بەڵام دەنگۆیەکمان بیستووە کە نازانین تا چەند ڕاستە، دەڵێت تۆ لەگەڵ ئەو کچەدا شتێکت هەیە و دەستتان تێکەڵکردوە. حەزدەکەین ئەگەر ئەوە ڕاستە دەست لە مەسەلەکە بکێشیتەوە... ئەوە هەموویەتی... گەر تۆ عەرقەلە

نەخەیتە ئیشەکەوە، هەموو شتێک وەک گوڵ دەڕوات، ئاوایە... شتەکە هەر ئەوەندەیە». مەنسور لەو ساتەوەی ناوی فیکرەت گوڵدانچی بیست، دڵی بە خێرایی لێیدەدا، ڕاستە مەنسور تا ئەوکات لە ژیانیدا شەڕێکی ڕاستەقینەی لەگەڵ کەسدا نەکردوە، بەڵام هەستی نەکردوە کەسێکی ترسنۆکیش بێت. بەڵام بە ڕاستی نازانێت بڵێت چی، نازانێت ئاخۆ ئەو هیچی لەگەڵ کچەکەی فیکرەت گوڵدانچیدا هەیە یاخود نا، زەحمەتە بتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. پێش دوو مانگ سەوسەن لەگەڵ کچێکی پوریدا هاتن بۆ ئاهەنگێکی زانکۆ، بەوەدا کچە پورەکەی مریەم هاوڕێی مەنسور بوو لە زانکۆ، واڕێکەوت لە ناو حەسودیی هەموو قوتابییە کوڕەکاندا مەنسور و سەوسەن بەدرێژایی ئاهەنگەکە لە تەنیشت یەکەوەبن، کچێکی هێند سیحراوی بوو، هێند جوان و ناسک بوو، ئەم شێتی بوو، سەیری لێهات کچێک هیچ زانکۆیەکی نەخوێندوە لە مامۆستاکانی زیاتر لەسەر باڵندە و گیانەوەرەکان و ڕووەکە ئاوازەکانی دونیا شت دەزانێت. لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا بە چاوێکەوە ئومێد و شەیدایی تێزابوو، تکایکرد ژمارە تەلەفونێکی بداتێ بۆ ئەوەی زیاتر قسەبکەن، بەوەدا سەوسەن ژمارە تەلەفونی نەبوو، پێیگووتبوو هەر لە ڕێگای پورزاکەیەوە پەیوەندی پێوەبکات. لەو ماوەیەدا دووجار تەلەفونیکردبوو، مریەم کە نزیکترین هاوڕێ و دەستەخوشکی سەوسەن بوو هەموو شتەکانی ڕێکخست و هەواڵەکەشی بەسەرتاسەری کۆلێژ و شارەکەدا بڵاوکردەوە، مریەم زارێکی هەبوو مرۆڤ سڵی لێبکاتەوە... هەموو نهێنییەک لای ئەو بەخێراییەکی گەورە بڵاودەبووەوە. مەنسور تەنیا دوو جار لەگەڵ ئەو خانمەدا قسەیکردبوو، ئێستا دەیتوانی بڵێت چی... بڵێ پەیوەندیم لەگەڵیدا هەیە؟. کچەکە بە چەشنێک ناسکە مرۆڤ شەیدای دەبێت، بەڵام نازانێت لەگەڵیدا بڵێ چی. سەوسەن ئەو دوو جارە بەدرێژایی کاتەکە باسی ئەوەی بۆ کردبوو کە نابێت ئەوی

خۆشبوێت، لەو کچانەبوو کە دەتوانن زۆر قسە لەسەر سیفەتە خراپەکانی خۆیان بکەن، باسی ئەوەی بۆ کردبوو ئەو لە زانکۆ دەتوانێت کیژی لەو باشتر بدۆزێتەوە. بەڵام ئەستەم بوو ئەو بتوانێت وازی لێبهێنێت. شتێکی زۆری لەسەر سەوسەن فیکرەت نەدەزانی، هێند هەبوو ئەم حەزی لێکردبوو، تا ئەندازەی شێتی حەزی لێکردبوو... لەدوای ئەو ئاهەنگەی زانکۆوە دووجاری تر لە ڕۆژانی هەینیدا بینیبووی، دوور بە دوور ئەو کاتەی لەگەڵ مریەم و هەندێک لە پورزاکانی دیدا بە کۆگاکان و قوماشفرۆشەکاندا دەگەڕان. هەر دوو جارەکە سڵاویان لە یەکتر کردبوو، چەند ساتێکی کورت بەبۆنەی مریەمەوە وەستابوون و سەیری یەکتریان کردبوو، هەر دوو جارەکە چاوانی سەوسەن هێندەی بەزەیی تێدابوو خۆشەویستی تێدانەبوو. ئێستا دەتوانێت بڵێت چی؟ بڵێ واز لەو کچە دەهێنم، بۆ تۆ... بۆ کاک کامەران کە هەرگیز لە ژیانیدا نەیبینیوە، بۆ مەنگوڕی بابەگەورە کە داوایەکی وا ئەستەمی لێدەکات. مەنسور لەو ساتەدا کە سەیری دەموچاوی هەردووکیانی دەکرد، بە خێرایی ڕوخساری مریەمی هاتەوە پێشچاو، ئەوە خوویەکی بەدبوو کە بەردەوام لە کاتی ناپێویست و سەیردا شتێکی دەهاتەوە پێشچاو پەیوەندی بەو ساتەوە نەبوو کە تیا دەژیا. دوای کەمێک وەستان و بیرکردنەوە بە ناسکی و لەسەرەخۆ گووتی «سەوسەن هیچی لەگەڵ مندا نییە، بەڵام من شتم لەگەڵیدا هەیە... پتر لە دوو مانگە شێتانە عاشقی ئەو بووم. بە ناوی ئەو خۆشەویستییە قووڵەی لە دڵمدایە منیش داواتان لێدەکەم واز لە سەوسەن بهێنن». کامەرانی سەلما ویستی قسەبکات، بەڵام مەنگوڕ دەستی بەرزکردەوە و بێدەنگیکرد. دەستەسڕێکی پەڕۆی گەلەک تازە و قەدکراوی لە گیرفانی دەرهێنا و لووتی سڕی و گووتی «وامەستدەکەم سەرمام بووە، ئەم ساڵ پێدەچێت زستان لە پار درێژتر بێت. من کە زستان وەها درێژدەبێتەوە، لە ئاخروئۆخردا تەندروستیم تێکدەچێت...

ها، تۆ وانیت... کاک مەنسور؟». مەنسوری ئەسرین بێئەوەی گوێ بداتە قسەکانی گوتی «دلواتان لێدەکەم واز لە سەوسەن بهێنن، چونکە من دڵنیاتاندەکەم کە ناتوانم وازی لێبهێنم... سەوسەن هیچ شتێکی بە من نەگوتووە، هێند هەیە من بە جۆرێک خۆشمدەوێت هیچ هێزێک لە دونیادا لە دڵم دەریناهێنێت». کامەرانی سەلما ئەمجارە بێئەوەی گوێبداتە مەنگوڕ گوتی «دەتکوژم، بە شەرەفی دایکم دەتکوژم... تێدەگەیت... بە شەرەفی دایکم دەتکوژم و تەواو». مەنگوڕ جارێکی تر لووتی سڕی و گوتی «جێی داخە کاک مەنسور کە تۆ پێدەچێت، باش لە قسە تێنەگەیت. من گوتم گەر تۆ عەرقەلە نەخەیتە ئیشەکەوە هەموو شتێک وەکو گوڵ دەڕوات. مەسەلەکە هەروا ئاسان نییە. شتێک مەنگوڕی بابەگەورە قسەی تیابکات، هەروا ئاسان ناتوانیت بڵێیت، من لە دڵمدا دەریناهێنم و نازانم چی. ئەم قسە قۆڕانە لە بەردەم مندا مەعنایان نییە... هیچ ژنێک نییە ئینسان نەتوانێت لە دڵی خۆی دەریبهێنێت. دەرهێنانی ژنێک لە دڵی خۆت، لە داکەندنی جووتێک گۆرەوی ئاسانترە... من وەک تۆ وەختێک گوتوومە ناتوانم فلانە ژن لە خەیاڵی خۆم دەربکەم، بەیانی کە پارچەیەکی جوانتر و عەیارترم بینیوە، گاڵتەم بە عەقڵی دوێنێم هاتووە. گەر تۆش ئەمڕۆ عاقڵ بیت، سبەی گاڵتە بە عەقڵی ئەمڕۆت دەکەیت». ڕەنگی مەنسور ئەسرین لە ژێر ڕوناکی ئەو گڵۆپە شەستییەدا زەردتر لە ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆی دەردەکەوت، بەبزەیەکی غەمگینەوە کە نیگای تەنیایی و دڵشکانی سەر ڕوخساری قووڵتردەکردەوە، گوتی «من تێدەگەم ئێوە دەڵێن چی، من نازانم ئاخۆ سەوسەن فیکرەت منی خۆشدەوێت یان نا، بەڵام ئەوەی ئێوە داوایەکی قورسە...». کامەران گوتی «ئەو کچە دەبێت بە ژنی من... تێدەگەیت، دەبێت بە ژنی من. هیچ تەرەسێک بۆی نییە لە دڵی خۆشیدا حەز لە ژنی من بکات». مەنسور بێئەوەی تووڕە ببێت یان

هەڵچێت، یاخود بترسێت گووتی «ئەگەر کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی شووی بە تۆ کرد، من ئەم شارە بەجێدەهێڵم و دەڕۆم... دڵنیابە ئەم شارە بەجێدەهێڵم و تا هەتاهەتایە ناگەڕێمەوە». کامەران قسەکانی مەنسووری وەک سووکایەتی وەرگرت، وەک بڵێت تۆ لەوە ناچیزتر و بچوکتریت ببیت بە مێردی کچی گوڵدانچی. بێنەوەی بیربکاتەوە چەقۆکەی دەرهێنا. مەنگوڕ لە ساتێکی غەفڵەتدا بەو خوێنگەرمییەی کامەران سەرسامبوو. گەر بیست ساڵ لەمەوبەر بایە، خۆشی هەمان شتی دەکرد، خۆشی بە هەمان توڕەیی و سەرگەرمی و خێرایی دەستی بۆ چەقۆکەی دەبرد، بە هەمان خێرایی پەلاماریدەدا، بەهەمان شێتی و نەگیران و نەسەکنانەوە. نەیویست دەستی بگرێت، بەردەوام حەزیدەکرد ئەو هەڵچوونە جانەوەرئاسایەی ببینێت... جگە لەوەی سەیربکات هیچی نەکرد. پێشتر شەڕی کامەرانی سەلمای بینیبوو، ئەو پەلامارە کتوپڕ و لەناکاوانە دڵیان خۆشدەکرد... دەیویست قسەبکات، دەیویست شتێک بڵێت، بەڵام وەک لە ناکاو بووبێت بە بینەرێکی خۆشحاڵ، شاڵاوی کامەرانی سەلمای دەبینی، بریسکەی چەقۆکەی دەبینی، کەوتنەخوارەوەی مەنسووری ئەسرینی لەسەر کورسییەکەی دەبینی، گرمۆڵەبوونی جەستەی ئەو گەنجە باڵابەرزەی لە زەوییەکەدا دەبینی. تا خوێنی سەر چەقۆکە نەکەوتە بەرچاوی، نەجوڵا. لە دڵی خۆیدا گووتی «خوای گەورە، ئەم هەتیوە، زۆر نەفامانە دەیوەشێنێت... زۆر بێمێشکانە، وانابێت». دڵنیابوو ئەگەر دوو جاری دی چەقۆکە وەها بوەشێنێت، ئەو کوڕە بەستەزمانە نابێتەوە بە مرۆڤ. لەو ساتەدا کە کامەران دەستی بەرزدەکردەوە، بۆ ئەوەی دووەم چەقۆ لە کەلەکەی چەپی مەنسوور بدات. مەنگوڕی بابەگەورە هۆشی هاتەوە خۆی و پەلاماری دەستی دا و گووتی «تۆ چ جانەوەرێکیت، کامەرانی سەلما کە قەت فێری چەقۆ وەشاندن نابیت... چ حەیوانێکیت». کامەرانی سەلما وەک یەکێک ئەوی برینداركردبێت،

گوتی «لێمگەڕێ بیکوژم... ئێستا نەیکوژم دوایی هەموو ژیانم خەفەتی ئەوە دەخۆم بۆ نەمکوشتوە». مەنگوڕ تا ئەو کات بە جۆرێک بەهێزبوو، بەجۆرێک لە جوڵەو خۆبادان و وەرگەڕان و یاریکردن بەلەشدا وەستابوو، کامەرانی سەلما هیچی بۆ نەکرا. کامەران نەیدەزانی مەنگوڕ چۆن لە چاوتروکانێکدا چەقۆکەی لەدەست دەرهێنا، لێزانینی مەنگوڕ لە گرتنی دەست و ڕاتەکاندنی مەچەک و شلکردنی پەنجەدا بەجۆرێک بوو، کامەرانی سەلمای حەپەساند. پێشتر لەو باوەڕەدا نەبوو کەس بتوانێت وا ئاسان چەقۆیەکی مەحکەم لە مشتیدا دەربهێنێت. بەدەنگی یەکێکی بێچارەوە لەقەیەکی گەورەی لە ئەژنۆی مەنسوری ئەسرین دا و وەک یەکێک بگری گوتی «کوڕی سەگ گەر وازت بهێنایە، بریندارم نەدەکردیت».

مەنگوڕ بەپەلە دەستی مەنسوری ئەسرینی دەکردەوە، قۆپچەکانی کراسەکەی دەترازان بۆ ئەوەی شوێنی برینەکەی ببینێت. خوای گەورە چەقۆکە لەلای چەپیدا بە نێوان پەراسووەکانیدا تێپەڕی بوو. مەنگوڕ دەیزانی ئەوە خراپترین و هەستیارترین شوێنە، گەر مرۆڤ زۆر بەختی نەبێت، برینێکی وەها دەیکوژێت. دیسانەوە لە دڵی خۆیدا گوتی «قەت فێری چەقۆ وەشاندن نابێت... قەت فێرنابێت...».

## ٢

«خالیدی مام سەبور» کە هەموو بە ئامرون بانگیاندەکرد، کاتژمێری دووی نیوەڕۆ لە ماڵ چووە دەرێ. دڵنیابوو گەر سەوسەن لە ماڵ بێتەدەرێ دەتوانێت لەو کاتانەدا بیبینێت. گەر جاران بووایە لەم ڕۆژە زستانە کورتانەدا نەدەگەڕایەوە بۆ ماڵێ و لە کۆگاکەی خۆی دەمایەوە، هەر لەوێ لە ناو بۆن و بەرامەی عەتر و جلی ژنانە و هالاوی ئەو خانمانەدا نانی دەخوارد کە بەردەوام لە بازاڕدا بۆ ستیان و عەتر و مەکیاجی نوێ دەگەڕان. بەڵام لەو کاتەوەی دەزانێت دەشێت لەم ڕێگایەدا ڕێکەوتی سەوسەن فیکرەت بکات، وازی لە هەموو نەریتە دێرینەکانی هێناوە، نیوەڕوان دەگەڕێتەوە ماڵێ بە ئومێدی ئەوەی عەسران لەو دەمەدا کە دەشێت سەوسەن لە ماڵ بێتەدەرێ بیبینێت. لە دڵی خۆیدا گووتی «خراپترین شتی عەشق ئەوەیە کە هەموو بەرنامەکانت تێکدەدا. تاکە جیاوازی نێوان ژن و پیاو ئەوەیە، عەشق ژنان بەو شێوەیە شێت ناکات، بەوجۆرە بەرنامەی خۆیان تێک نادەن... پیاوان تاکە جۆری جانەوەرن خۆشەویستی بەوجۆرە سەریان لێتێکدەدا». لەماوەی ئەو چوار مانگەدا کە عاشق بووبوو، جگە لەوەی هەموو خوو و نەریتەکانی گۆڕابوون، بەجۆرێکی ترسناکیش بڕوای بە خۆی نەمابوو. ژیانی پێشتر لەگەڵ ئەو ژنانەدا کە دەهاتنە کۆگاکەی جۆرێکی تربوو. شتێک بوو وەک یارییەکی

هەمیشەیی، بەڵام ئێستا بەردەوام بە دەست سەرئێشەیەکی بەردەوام و لاوازبوونی کتوپڕ و دابەزینی خوێنەوە دەیناڵاند. بە پێچەوانەی زۆربەی عاشقانی ترەوە ڕای وابوو عەشق بە جۆرێکی سەیر ژیان لە هەموو مانایەک خاڵیدەکاتەوە. خالید ئاموون خاوەنی گەورەترین کۆگای جل و بەرگی ژنانە لە ناوەڕاستی بازاڕدا، کە باشترین خۆشنوسەکانی شار بەخەتی گەورە تابلۆی دوکانەکەیان بە سێ زمان بۆ نوسیبوو «کۆگای ئاموون بۆ هەموو شتێکی نوێی دونیا». ئێستا دوای چوار مانگ ئازاری بەردەوام هەستی بە لاوازییەکی گەورە دەکرد. یەکەمین جار سەوسەن فیکرەتی لەگەڵ سێ کچی دیکەدا لە دوکانەکەی خۆیدا بینی، کراسێکی سپی شیفۆنی لەبەردابوو بە گوڵی شینی وردەوە، قژی بەجۆرێکی سەیر تۆپەڵکردبوو، جگە لە دوو تاڵی لوولی زەرد کە بە لادا شۆڕبکردبوونەوە هیچ شتێکی دیکەی پێوەنەبوو، نە گوارە، نە ملوانکە، نە مەکیاجێکی ئاشکرا، هەتا سەعاتیشی لە دەستدا نەبوو... بەڵام بە جۆرێک جوان بوو، مرۆڤ ناچاربێت هەر شتێکی بەدەستەوەیە دایبنێت و تەماشایبکات. پێشتر کچێکی وەها سادەی نەبینیبوو. مرۆڤ لەگەڵ خانمی وەهادا نازانێت ئاخۆ بە جوانییەکەی سەرسام بێت یان بە سادەییەکەی. شێوەی قسەکردن و تەماشاکردن و جوڵاندنەوەی بە گشتی لاوازییەکیان پێوە دیاریبوو. خالید ئاموون کە ژیانێکی گەلەک ئاسان دەژیا، لەناو خێزانە خانەدانەکاندا گەورەبووبوو، لە گەنجییەکی زووەوە سەروکاری لەگەڵ ئەو کڕیارە ژنانەدا بوو کە خۆیان بە خاتوونانی چینێکی باڵاتر دەزانن. خالید شارەزایەکی وردی دونیای داخراوی ژنانی ئەم شارە بوو، لە پاڵ ژنە خانەدانەکاندا، لەگەڵ ئەو ژنە فەرمانبەرە بچوکانەشدا سەروکاری هەبوو کە تەواوی موچە کەمەکەیان لە دوکانەکەی ئەودا خەرجدەکرد. هەزاران ئافرەت هاتبوونە دوکانەکەی، هەمووش دەیناسن کە کەسێکی داوێن پاک نییە. بەڵام لەگەڵ هەموو بەزمەکانی پشت دوکانەکەی و

شەوگەڕانەکانیدا، شتێکی نەکردوە دەنگیدابێتەوە و لکەدار بووبێت... ژنان هەمیشە ڕۆڵێکی گرنگیان لە ژیانیدا بینیوە، ساڵێک لەوەوبەر کە لەسەر هەڵنەواسینی وێنەی سەدام حوسەین گیرا، ژنێک ئازادیکرد کە ساڵانێک بوو کڕیارێکی بەردەوامی بوو، تا ئەوکاتە نەیدەزانی ئەو ژنە سەنگین و بە ویقارە دەستێکی وەهای لەگەڵ پیاوانی ئاسایشدا هەیە بتوانێت خەڵک ڕزگاربکات، بەڵام لەو ساتەدا تەنیا ئەوەی بۆ گرنگ بوو لەو جەهەنەمە دەرچێت و بێتەدەرێ. ئێستا چوار مانگە ئیش و کاری بە جۆرێکی بێمانا کەوتۆتە دواوە، لەو چوار مانگەدا سەفەرێکی پایتەختی بۆ هێنانی مۆدێلاتی نوێ نەکردوە، ئارەزوویەکی نەماوە وەک جاران بەدەم ئەو قاچاغچییانەوە پێبکەنێت کە جل و بەرگ و عەتر و مکیاجی ئەم شارە دابیندەکەن. چەند هەفتەیەکە هەستدەکات وردەوردە سیحری دوکانەکەی دەشکێت، شتەکانی کەمدەبنەوە، نەیارەکانی لە دوکاندارانی تر و خاوەن کۆگا گەورەکان پێیپێدەکەنن، بەڵام لە هەمووی سەختتر ئەوەیە وەک جاران بەلایەوە گرنگ نییە چی بەسەردێت. لە دڵی خۆیدا گوتی «عەشق وات لێدەکات نەزانیت چیت دەوێت». ئێستا تەمەنی بیستوچوار ساڵە، لە هەژدە ساڵییەوە ئەزمونی لەگەڵ ئافرەتاندا هەیە، لە سۆزانییەکانەوە تا ئەو کچانەی لە بازاڕ و قەیسەرییەکاندا بۆ شوویەکی باش دەگەڕێن. لەو چوار مانگەدا سەوسەن فیکرەت سێ جار هاتبوو بۆ کۆگاکەی، بەڵام هیچ کات بە تەنیا نەبوو، هیچ کات خۆی شتێکی نەکڕی بوو، هەر سێ جارەکە بە تەنیا و لاوازییەوە وەک کچێکی نەخۆش بۆ ئەوەی پشوو بدات لەسەر نیشتۆکێکی بچوک دانیشتبوو. هەر سێ جارەکە هەندێک ڕۆژنامەی بەدەستەوە بوو. ئەوەی کچەکە هەمیشە ماندوو دەینواند جوانتریدەکرد. لە هەفتەی یەکەمەوە هەموو شتێکی دەربارەی دەزانی، یاخود بە غروری پیاوانی بازاڕەوە وای هەستدەکرد هەموو شتێکی دەربارە دەزانێت. لەو چوار مانگەدا دوو

جاری دیکەش لە ڕێگای هاتوچۆی خۆیدا بینیبووی. سەوسەن فیکرەت هیچ کات بە تەنیا نەبوو، هەمیشە لەگەڵ تەوقێک ژن و کچی دیکەدا دەگەڕا کە خالید ئاموون نەیدەزانی کێن. لەگەڵ ئەوەی لە ژیانیدا زۆر نامەی لە کچان وەرگرتبوو، بەڵام خۆی هەرگیز نامەی نەنوسیبوو. باوەڕی وابوو، مرۆڤ تەنیا لەگەڵ ئەو ژنانەدا دەتوانێت خۆش بژی، کە عاشقیان نییە. پێشتر لە بازاڕدا چەندین جار حیکایەتی ئەو پیاوانەی بیستبوو کە هەموو شتێکی ژیانیان لە پێناوی ژنێکدا داناوە، بەڵام باوەڕی نەدەکرد... ئێستا خۆی بەجۆرێک گێژ و ماندوو بوو، بەڕاستی هەستیدەکرد جگە لەخەیاڵاتەکانی دەربارەی سەوسەن، هەموو شتەکانی تری ژیانی باری زیادن و خۆشبەخت دەبێت گەر بتوانێت هەموویان فڕێبدات. بۆ ناتوانێت هەموویان فڕێبدات، بێگومان دەتوانێت، لە دڵی خۆیدا دەیگووت، لە ڕێگای خۆشەویستییەوە، مرۆڤ پوچی هەموو شتەکانی تری بۆ دەردەکەوێت... هەتا پوچی خۆشی.

## ٣

کە مەنسور ئەسرین گەیشتە خەستەخانە لە دۆخێکی دژواردا بوو، لە نێوان ژیان و مردندا ئەوبەرەوبەری دەکرد. دکتۆر و تیمارپێچ و سیستەرەکان بەجۆرێک لەسەری کۆبوونەوە، وەک کۆمەڵێک منداڵ لە سەر کۆترێکی مردوو کۆبووبێتنەوە. کە گەیشتە خەستەخانە نزیکی سەعاتێک بوو خوێنی لێدەڕۆی. مەنگوڕی بابەگەورە هەندێک کەسی ڕاسپاردبوو بەپەلە بیگەێننە بیمارستان، ئامۆژگاریکردبوون تا زووتر بیبەن درەنگە، بە هەستی تۆرزانی خۆی دەیزانی برینەکەی لە شوێنێکی باشدا نییە. زۆربەی چەقۆکێشە شارەزاکان بە ئەندازەی پزیشکێک لە چۆنێتی برین و شوێنی دەمارەکان و ترس و ناترسی وەشاندنەکان دەزانن. ئەوەی چەقۆ بوەشێنیت و کەس نەکوژێت، هونەرێکی ڕاستەقینەیە. مەنگوڕ لە ژیانیدا خەڵکێکی زۆری زامدارکردبوو، زیاد لە یازدە چەقۆشی پێوەبوو، بەڵام چونکە گەمەکەی بە دەستوپلی چەقۆکێشی شارەزا کردبوو، زیندوو لە هەموو شەڕەکان دەرچووبوو، کەسیشی وەها زامدار نەکردبوو بمرێت. ئێستا خۆی و کامەرانی سەلما دەبایە تا چارەنوسی ئەو کوڕە ڕۆشندەبێتەوە دڵیان بلەرزێت. دکتۆرەکان لە ماوەی سەعاتێکدا بە پەلە هەموو شتێکی پێویستیان بۆ مەنسوری ئەسرین کرد، تا ئەوکات هیچ کەس لە کەسوکاری بە چیرۆکەکەی نەزانیبوو.

سەعات یازدەی شەو بوو کە ئیبراهیم ئەسرینی باوکی و بەفراو و

سیڤانی خوشکی بە لادا پەرپوت و هەڵوەشاوەکەیان گەیشتنە بیمارستان، لەگەڵ هەموو مەترسییەکی هاتوچۆکردندا لە ئێوارەوەماڵەو ماڵ بۆ کوڕەکەیان دەگەڕان کە بەبێ هۆیەکی سیاریکراو لە ناوەڕاستی هەفتەدا زانکۆی بەجێهێشتبوو و بێئەوەی هیچ بڵێت گەڕابووەوە بۆ شار. کە بەو حاڵە لە بیمارستان دۆزییانەوە، خوشکەکانی دەستیانکرد بە گریان، بەڵام باوکی نەیدەزانی چی بڵێت. بۆنی دەرمان و دیمەنی ڕاڕەوەکانی خەستەخانە و شەوقی مردووی ئەو بۆیە چەور و دێزەی بەدیوارەکانەوەیە، ئیبراهیم ئەسرینیان تووشی غەمۆکییەکی کتوپڕ کرد. پیاوەکە لە مەعدەنی ئەو کەسانە بوو کە بەرگەی نەخۆشی منداڵەکانیان ناگرن، بەڵام بەوەدا پێیشەرم بوو بگری، شتەکانی بێدەنگ بردەوە ناو خۆی. ویستی بڕوات و سوپاسی دکتۆرەکان بکات، بەڵام پەشیمان بووەوە، چونکە بەوردی نەیدەزانی چییان بۆ کوڕەکەی کردوە. نەیدەویست کوڕەکەی لێرەدا بمرێت، ئەم خەستەخانەیە شوێنێکی باش نییە بۆ مردن، مرۆڤ هەرچییەکی کردوە دەبێت هەوڵبدات لە جێگایەکی دی بمرێت. هەر جارێک هاتبێت بۆ خەستەخانە ڕێکەوتی مردنێکی کردوە، هەمیشە خەڵکانێکی بینیوە دەگرین و خەڵکانێکیشی بینیوە بە پەلە لە ناو قاوشەکاندا ڕادەکەن، بەڵام ئەمشەو دونیا لەوە هێمنترە بەکەڵکی مردن بێت. دڵنیابوو سبەی لە هەموو شتێک تێدەگات، بەڵام ئێستا کاتی ئەوەبوو لە دڵەوە دۆعابکات کوڕەکەی سەلامەت بێت... ئیدی لەم شەوە ساردەی زستاندا، لەوە زیاتر هیچی تر نەدەکرا.

لە ڕۆژی دووهەمدا هەموو شتێک ڕوون و ڕۆشن بوو، هەموو شتێک... ناوی مەنگوڕی بابەگەورە لەوە ناسراوتربوو کە ونبێت و بشاردرێتەوە، ئێوارێ دەیان کەس مەنگوڕیان بە خۆی و کلێتە زستانە گەورەکەیەوە لەگەڵ ئەو کوڕەدا بینیبوو... بەڵام ئەوەی ئیبراهیم ئەسرین تێینەدەگەیشت ئەوەبوو، چی وا لە مەنگوڕی بابەگەورە دەکات بیەوێت کوڕەکەی ئەو

بکوژێت.

ئیبراهیم تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو، بەڵام تەواو پیر دیاریوو، پیرێکی پاک و تەمیز کە هەمیشە کراسێکی سپی ملوان پاکی لەبەردابوو، لە هەژدە ساڵییەوە تا ئەمڕۆ یەکجۆر جل دەپۆشێت، قاتی نیللی لەگەڵ کراسی سپی، زستانانیش تەنیا پاڵتۆیەکی ڕەشی دەخاتەسەر. هەتا دوای مردنی ژنەکەشی ئەو عادەتەی نەگۆڕی، شەش مانگ بۆینباخێکی ڕەشی بەست و ئیدی شتێکی دیکەی نەکرد. ئێستا بەم جلە پاکانەوە، بەم قژە پڕە سپییەوە کە بەخشیوێتی بە کچ و کوڕەکانیشی، وەستاوە و نازانێت منداڵەکەی دەژی یاخود دەمرێت. بیستودوو ساڵ بوو لە شارەوانی فەرمانبەر بوو، گەلەک نهێنی گەورەی ئەم شارەی دەزانی، بەڵام ئێستا ناتوانێت تێبگات چ شتێک کوڕێکی زیرەک و بەفامی وەک مەنسور لەگەڵ سەرسەرییەکی وەک مەنگوڕدا کۆدەکاتەوە... دڵنیاشە چیرۆکەکە هەر چییەک بێت دواتر خەڵک بەجۆرێکی تر دەیگێڕنەوە.

خۆی و کچەکانی لە ناو بۆنی نەخۆشەکاندا دانیشتن، دوو کچەکە بەجۆرێک بۆ براکەیان دڵشکاویوون ئارام نەدەبوونەوە، گەرچی هەردووکیان ڕازی نەبوون تا بەتەواوی مەکیاج نەکەن بێنەدەرەوە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نەبوو بۆ براکەیان دڵ بەکەسەر نین. ئیبراهیم ئەسرین لە دڵی خۆیدا گووتی «عەیبی هەرە گەورەی ژنی ئەم شارە، ئەو خووگرتنە نەخۆشەیانە بە مەکیاجەوە، کچەکان هەمان ئەو خووەیان بۆ ماوەتەوە کە دایکی خوالێخۆشبوویان هەیبوو». بەڵام ئێستا بە حەسرەتێکەوە پرسی «چی لەم دوو کچە بەستەزمانە دێت، گەر من و براکەشیان لە ماوەیەکی کورتدا بمرین... چیان بەسەردێت؟». لە ڕاستیدا هیچ وەڵامێکی پێنەبوو. ئیبراهیم ئەسرین چەندجارێک واهاتە پێشچاوی کە ئیزرائیل بە خۆی و باڵە گەورەکانییەوە دەبینێت، دڵنیابوو ئەوە خۆیەتی، ئیزرائیلە بە لەشێکی سپی و زەبەلاحەوە دەچێتە ناو قاوشەکان و دێتەوەدەرێ.

بینینی ئیزرائیل یەکێک بوو لە دەردە بەردەوامەکانی ژیانی، لایەنی کەم مانگی جارێک بە رێکەوت لە شوێنی جیاواز و بۆنەی جیاوازدا ئیزرائیلی دەبینی. ئەگەرچی ئیبراهیم هیچ وەخت نوێژی نەکردبوو، بەڵام ئیمانێکی نەپساوی بەخودا هەبوو، هەتا لەگەنجیشدا کاتێک کۆمۆنیست بوو، هەرگیز باوەڕی بە خودا لەق نەبووبوو. ئێستا دڵنیابوو مەسەلەی بینینی ئیزرائیل بەرهەمی وەنەوز و نائومێدی و ڕێشکەوپێشکەی خەیاڵ نییە، بەڵکو بەرهەمی بینینێکی ڕۆشنی چاوەکانێتی، هەتا جارێک لە جارەکان هەستیکرد زۆر لە نزیک ئەوەوە تێدەپەڕێت و سەیریدەکات. بە هێمنی بەخۆی گووت «بە دڵنیاییەوە ئیزرائیل بەشێک لە ژیانی لێرەدا دەباتەسەر، لەم خەستەخانەیەدا» . نزیکی دەمەویەیان بە دەم وەنەوزەوە گووتی « نا ئیزرائیل پیاوێکی بێنیش نییە» . ئەوەی بەدەنگی بەرز گووت. هەر دوورکچەکەی دەزانن لەدوای مردنی دایکیانەوە، زۆرجار بێئاگای خۆی شتەکان بەدەنگی بەرز دەڵێت.

بەیانی هەموو شتێک ڕۆشن بوو، چەندین کەس مەنگوڕ و کامەرانی سەلمایان لە بەردەرکی ژێرزەمینەکەی خدرۆ دوویاردا بینیبوو، بینیبوویان لەگەڵ گەنجێکی نەناسراودا دەچنە ژوورێ. ئەو کەسانەش کە مەنگوڕ ڕایسپاردن کوڕەکە بۆ بیمارستان بگوازنەوە، هەر هەمان قسەیانکرد... بەڵام هێشتا هیچ کەس ڕاست و دروستی چیرۆکەکەی بە تەواویی نەدەزانی.

ئەو ڕۆژە نزیک بە نیوەڕۆ مەنگوڕی بابەگەورە بە خۆی و کلێتە ڕووسییەکەیەوە لە باغی بەر دەرکی خەستەخانەدا دەرکەوت، هەر مرۆڤێکی زیرەک دەیتوانی مێژووی تەواوی شارەکە لە ڕوخساریدا بخوێنێتەوە، وەک هەندێک ناویاندەنا سەگی کۆڵانە تەسکەکانی شار بوو. قسە و ڕەفتاری لە کوچە کۆنەکان و چایخانە تاریکەکاندا شێوەی خۆیان وەرگرتبوو، لە هونەری جنێوداندا پیاوێکی تا خودا حەزیکات لێزان بوو، بەڵام بۆ ئەوەی

بتوانێت جارجار لەگەڵ پیاوە بەڕێزەکانیشدا قسەبکات، ساڵ دوای ساڵ دەستکاری ئەو فەرهەنگە ڕەشەی خۆی کردبوو. هێدی هێدی توانیبووی، ڕووی ڕاستەقینەی مەنگوڕی بابەگەورە بە دەمامکێکی ئەستوور لە وشەی شیرین بشارێتەوە، بەڵام دەمامکەکانی بۆئەوە نەبوون خەڵک فریوبدات و لە خشتەیان بەرێت، بەڵکو بۆئەوەبوو زیاتر بەڕێز بنوێنێت و قسەکردنی لە دەمودووی کەسانی ئاسایی نزیک ببێتەوە... دەرکەوتنی لەو نیوەڕۆیەدا دڵی ئیبراهیم ئەسرینی ڕاچڵەکاند. بینینی ئەو لەبری ئەوەی تووڕەییکات یاخود بیخاتە سەر هەوای هەڵچوونێکی باوکانە، بێخواستی خۆی هێمنییەکی کتوپڕ دایگرت. ئیبراهیمی ئەسرین لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی ناو حەوشی گەورەی خەستەخانە دانیشتبوو، مەنگوڕ دوای ئەوەی خۆی پێناساند، پێیگووت هاتووە شتەکانی بۆ ڕوونبکاتەوە، تا بەدرۆ لە زاری ئەم و ئەوەوە نەیبیستێت. ڕاستەوخۆ بەدەنگی بەرز، بەجۆرێک هەموو ئەوانەی چواردەور گوێیان لێبوو گووتی « نازانم ئەو بێنەزاکەتانە چییان لەسەر من گووتووە. دڵنیابە کە کوڕەکەت قەرزاری منە... من دوو جار لە مردن ڕزگارمکرد، بەڵام شتەکان وابوون نەتوانم لەگەڵیدا بێم بۆ خەستەخانە... من دایکیشم لە خەستەخانەبێت ناچم بەلایدا... خۆم برینی خۆم بە شەش تەقەڵ دووریوەتەوە و نەچووم بۆ لای دکتۆر... مەسەلەکە بەوجۆرە نییە کە خەڵکی ناحەز گێڕاویانەتەوە. شتەکە ولیە کە کوڕەکەی تۆ حەزی لە کچی فیکرەت گوڵدانچی کردوە، حەزێک لەوجۆرەی مرۆڤ تووشی سکچوون دەکات، شتێک نەلایەقی ئەمە و نەلایەقی کچەکەیە، من کەیفم بەوجۆرە حەزە پڕوپوچانە نایەت... خۆت دەمبینی لە عومری حەزدا نەماوم... شتەکە هیچی بۆ من نییە... ئەوەندەیە کە کوڕەکەی سەلما دۆڵان ئەگەر ئێوە بیناسن، تووشی هەمان دەرد و هەمان نەفامی بووە، ئەویش وەک کوڕەکەی تۆ بە قوونیش فرمێسک بۆ ئەو کچە دەڕێژێت. ئێستا ئەو دەیەوێت کچەکەی فیکرەت

گوڵدانچی بخوازێت، وابیردەکاتەوە بیکات بە ژنی خۆی و مارەیبکات... بەڵام خۆت دەزانیت، دوو سەگ دەتوانن لە یەک قاپ بخۆن، بەڵام دوو عاشق ناتوانن... ئاوابوو کە شتەکان بەهۆی بێمێشکی و سەرگەرمی کامەرانی سەلماوە لەدەست دەرچوو... قسەوباسێکی سادە کە دەبوو شتەکان ڕێکبخات و وایان لێبکات وەکو گوڵ بڕۆن، لەدەست دەرچوو، من ئەوەم بۆ کرا چەقۆی دووەمم گرتەوە... خوای گەورە هێزی دامێ و لە کاتی خۆیدا فریای کەوتم. کامەرانی سەلما ڕەفیقمە، ئەو لە هەڵچوونی وەهادا خۆی بۆ ناگیرێت... کوڕێکی ناکەسبەچە نییە، بەشی خۆی پیاوە... شتم لێدیوە بۆیە وادەڵێم، دەزانم بەشی خۆی پیاوە. دەیەوێت ژنێک بهێنێت کە تەنیا خۆی خۆشیدەوێت و کەسی تر خۆشی نەویستوە...».

ئیبراهیم ئەسرین ناوی فیکرەت گوڵدانچی نەبیستبوو، پیاوێکی خۆشباوەڕ نەبوو، بەڵام خێراتر لە ئاسایی باوەڕی بە قسەکانی مەنگوڕ کرد. ئەو لەمێژە وەک دڕترین و ترسناکترین، بەڵام سەرڕاستترین چەقۆوەشێنی شار ناوبانگی مەنگوڕی بیستووە.

# ٤

فیکرەت گوڵدانچی تەنیا دوای زنجیرەیەک کارەسات بیری لەوەکردەوە بگوازێتەوە بۆ باکوور. تا ساڵی ١٩٨٥ لە بەغداد لە بەڕێوەبەرایەتی دابەشکردنی ئارد، سەرپەرشتی هەندێک عەمباری گەورەی دەکرد کە ئاردیان بۆ سوپا دابیندەکرد. سەرەتای جەنگ فڕۆکە ئێرانییەکان دووجار ئەو عەمبارەیان بۆردومانکرد، بەڵام فیکرەت گوڵدانچی هەردوو جارەکە بەسەلامەت لە ناو تەپوتۆزی تێکەڵاوبوونی ئارد و باروت و خۆڵدا هاتەدەرێ. هەردووجارەکە فەرمانبەر و کۆڵهەڵگر و کیژانی کوژراوی بەشی حیساباتی بەدەستی خۆی هەڵگرتبوو، سەرنجی ئەو ڕەنگە تایبەتی و بێوێنەیەی دابوو کە تێکەڵاوبوونی خوێن لەگەڵ ئاردا دروستیدەکات. بەڵام فیکرەت گوڵدانچی تەنیا فەرمانبەرێکی باڵانەبوو کە لەسەرەتای پەنجاکاندا بۆ خوێندن چووبووە بەغداد و دوای سیوپێنج ساڵ گەڕابووەوە، بەڵکو پیاوێکی خوێندەواربوو کە بەهۆی ڕۆشنبیرییەکی بەربڵاوەوە ڕێزێکی زۆری لە وەزارەت و لای بەڕێوەبەرەکانی سەرو خۆی هەبوو. ڕۆشنبیری فیکرەت گوڵدانچی لەگەڵێک بواری جیاواز جیاواز و دوور لە یەکدا بوو، وەک چۆن زانیارییەکی زۆری دەربارەی ڕووەکی سەیر و گیای ئاوارە و گوڵە عاجباتییەکانی دونیا هەبوو، هەمان شێوەش لەسەر وردەکارییەکانی میکانیکی ئوتومبێل و شێوازی گەشەسەندنی ماتۆڕی هایدرۆلیکی و پەرەسەندنی ڕاکێتی ئاڕاستەگر شتی زۆری دەزانی.

سنووری شارەزاییەکانی گەلەک کایەی لەخۆدەگرت، لە ئەدەبەوە بیگرە تا وردەکارییەکانی مێژووی نیگارکێشان و حیکایەتی گەڕاڵە گەورەکان و تراژیدیای زاناکان و نەخۆشی ناوازە و بیۆێنەی پاشاکان. لەسەردەمێکی ژیانیدا بیری لە نوسینی کتێبێکی گەورەکردبووەوە دەربارەی شارە نغرۆکان، بابەتگەلێکی زۆری لەسەر کاولبوونی شارەکان کۆکردەوە لە سەدوم و ئامووراوە بیگرە تا دەگاتە سەر وێرانبوونی شارە گەورەکانی وەک «دریسدن» و «ستالینگراد» لە مێژووی نوێدا. بەڵام ژیان هەرگیز بوارێکی ئەوتۆی پێنەدابوو کە بەڕاستی زانیارییەکانی بخاتەکار. لە هەموو ژیانیدا تەنیا چوار وتاری نوسیبوو، کە هەریەکەیان لە بوارێکدا بوون و هەریەکەشیان لە گۆڤارێکی جیاوازدا بڵاوبووبوونەوە، سەرەتای گەنجی گووتارێکی درێژی لەسەر گەڕاڵە ئەوروپییەکان نوسی، هەوڵیدابوو بە کۆمەڵێک نەخشەی زۆر ورد هەندێک هەڵەی گەورە بۆ مێژوونوسە ئەوروپییەکان ڕاستبکاتەوە کە هێندەی کار دەگاتە سەر مێژوو و جوگرافیای خۆرهەڵات بەجۆرێکی منداڵانە شوێنەکان و ساڵڕۆژەکان تێکەڵاودەکەن. وتارەکەی هاوشانی پاشکۆیەک بوو دەربارەی ئەو ئامێرە کۆنانەی دەریاوانەکان لە سەدەی چواری زاینییەوە تا سەدەی پازدە بەکاریانهێناوە، هاوشان بەگەلەک وێنەی دەگمەن و ناوازە دەربارەی فۆرمی قیبلەنمای دێرین و ئامێرێکی نەزانراو کە ئەو ئەستێرەپێوی پێدەڵێت. وتارەکانی تری فیکرەت ئیحسان گوڵدانچی، یەکێکیان دەربارەی کاریگەریی زینگەیە لەسەر مۆسیقای خۆرهەڵاتی دێرین، یەکێکی دیشیان دەربارەی گرێی ئۆدیبە لە شانامەی فیردەوسیدا، ئەوی دیکەیان دەربارەی کاریگەری گوڵی بەیبونە لەسەر ئەنزیماتی ناو لەش و هەر سێکیان لە سێ گۆڤاری ناوداری زەمانی خۆیدا چاپکراون. تێوەگلانی تەواوەتی فیکرەت گوڵدانچی لەگەڵ بازرگانی ئارددا دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی شەستەکان، زەمانێک لەگەڵ وەفدێکی دەوڵەتیدا دەڕواتە یەکێتی سۆڤێت و لەوێ

لەگەڵ ئۆكرانییەكاندا گرێبەندێكی گرنگی هێنانی ئاردی سپی مۆردەكات. شارەزایی گوڵدانچی لە گەلێک زمانی بێگانەدا كۆمەكیدەكات لەو دەمەوە تا سەرەتای هەشتاكان لە زۆر رێكەوتننامەی هێنانی ئارددا بەشداربێت. گوڵدانچی سەفەرەكانی دەخاتە خزمەتی كڕینی كتێبی ئاوازە و نەخشەی دێرین و شتی ئەنتیكەوە، لە ماوەیەكی كەمدا دەیان ئەتڵەسی ڕووەک، ئەتڵەسی تایبەت بە كانزاكان، ئەتڵەسی ڕەنگاوڕەنگ دەربارەی شێوەكانی ماتوور و باڵۆن و عەتر و گیاندارانی دەریا و میللەتانی دێرین كۆدەكاتەوە. ئەتڵەسەكانی فیكرەت گوڵدانچی كە دەگەنە سەروو دوو سەد بەرگی تایبەتی لە حەفتاكانی بەغدادا كۆمەڵە كتێبێكی هێند گرنگ و ئاوازە دەبن، لە هیچ كتێبخانەیەكی وڵات و لە هیچ سەنتەرێكی زانستیدا وەچنگ ناكەون. كتێبخانەكەی دەبێتە هۆیەكی گەورەی شانازی ئەو، هەر كەس ئەو كتێبە دەگمەنانە دەبینێت، سەرسامانە دەڵێت «وای خوای گەورە، وای بابەگیان... فیكرەت بەگ تۆ چیت دروستكردوە». بەڵام لەگەڵ ئەو كتێبخانە گەورە و خولیا شێتانەیەشدا بۆ ئەوەی ببێت بە پیاوی زانست، گوڵدانچی لە هیچ یەكێک لەو بوارانەی جێگای بایەخی بوون، نەبوو بە كەسێكی دیار و بەرجەستە. غەمی بەخێوكردنی ماڵ و منداڵ بەجۆرێک لە مەسەلەی كڕین و دابەشكردنی گەنم و ئارددا نوقمیدەكەن، كاتێكی زۆر كەمی بۆ خولیا ڕاستەقینەكانی خۆی دەمێنێتەوە. ئەوە وادەكات سەردەمانێک وەک پیاوێكی بێدەنگ و مۆن و غەمگین دەربكەوێت كە كەس لەماڵەوە بەدروستی نازانێت بیر لە چی دەكاتەوە. لەسەرەتای حەفتاكاندا ژنەكەی تووشی سیل دەبێت، پێدەچێت سەرقاڵی فیكرەت بە دونیا تایبەتییەكەی خۆیەوە و نوقمبوونی لە ناو كتێب و وەزیفەدا هۆیەكی گرنگی ئەو دەردەی ژنەكەی بن. «قەمەرخان» ی ژنی بێزار لە تەپوتۆزی ئەو هەموو كتێبە نەخوێندراوەیە، لە بێیاری و هاودەمیدا، هاوڕازی خۆی تەنیا لای دراوسێكان دەدۆزێتەوە، هێند لە كاتی برنج

بـژاردن و فاسـۆلیاجنین و بامـێ قنچککردنـدا لەگـەڵ ژنانـی گەڕەکـدا کۆدەبێتـەوە، تـا لـە خانمێکـی نەخۆشـەوە ئـەو دەردە سـامناکە دەگرێـت. قەمەرخـان بـۆ دوو سـاڵ لـە خەستەخانەیەکی تایبەتـدا لـە دەرەوەی بەغـداد لـە دونیـا جیادەکرێتـەوە، لـەو ماوەیـەدا فیکـرەت گوڵدانچـی وەک هەمیشـە سـەرقاڵی سـەفەر و کۆبوونـەوە و گەورەکردنـی کتێبخانەکەیەتـی کـە سـاڵ دوای سـاڵ ڕەفەکانـی بـە تـەواوی ماڵەکـەدا دەکشـێت و شـوێنێکی خاڵـی جێناهێڵێـت. لـە مـاوەی شـازدە سـاڵ ژن و مێردایەتیـدا، فیکـرەت گوڵدانچـی سـێ منداڵـی لـە قەمەرخـان دەبێـت، کوڕێکـی چاوشـین و قـژزەرد کـە کـوڕە گەورەیەتـی و نـاوی نـزار فیکرەتـە لەگـەڵ دوو کچـدا، گەورەکەیـان پـڕوشـە و بچکۆلەکەیـان سەوسـەنە کـە کچێکـی لاواز و نەخۆشـە کـە زۆر درەنـگ پێدەگرێـت.

سـاڵێک قەمەرخـان لـە قەرەنتینـە داخراوەکـەی خۆیـدا لـە بیمارسـتانی تایبەت بە نەخۆشـییەکانی سـینە و سـیدا مرد، کوڕە گەورەکەی چواردەسـاڵ تەمەنـی بـوو، پڕوشـە دوازدە و سەوسـەن فیکـرەت تەنیـا پێنـج سـاڵان بـوو. دوای مردنـی دایکیـان خێزانەکـە بەسـەردەمێکی گەلـەک ڕەش و بە ڕۆژگارێکی گەلێـک تاڵـدا تێپـەڕی. براکەیـان گەنجێکـی سـەر بـەدەرەوە بـوو، سـاڵانی هـەرزەکاری خـۆی بـە شـێوەیەکی شـێتانە و جەنجاڵ لـە کوچەکانـی بەغـدادا بردەسـەر، کوڕەکـە لـە شـازدە سـاڵیدا مەیخۆرێکـی لێزانـی لێدەرچـوو، هـەر زوو تێکـەڵ بـە گروپێکـی دەمـۆڵ و زوڕنـا بـوو لەوانـەی لـە یاریگاکانـدا بـۆ هاندانـی تیپـە وەرزشـییەکان کۆدەبوونـەوە، لەوێشـدا تابڵێـی زینـدوو و چالاک و پڕجـۆش بـوو. سـەرەڕۆیی و گەنجێتـی شـێتانەی نـزار فیکـرەت، هیـچ لـەوە ناگۆڕێـت ببێتـە هاوڕێیەکـی نزیکـی خوشـکەکانی. کوڕەکـە لەوانـە نییـە تـەواو پشـتبکاتە خێزانەکـەی و تەنیـا دوای ئارەزووەکانـی خـۆی بکەوێـت، هەمیشـە ئـەوەی لەبەرچاوبـووە کـە دوو خوشـکی هەیـە و دەبێـت لـە بیریـان نـەکات. هەڵبـەت وەک باوکـی ئەهلـی کتێـب نییـە، بـەڵام کـە لەسـاڵی حەفتاوشەشـدا

تاقیكردنەوەی بەكالۆری دەدات، پلەیەكی هێند بەرز وەردەگرێت دەیخاتە ئەندازەی تەكنۆلۆژی. ئەو وێنانەی دواتر سەوسەن فیكرەت لە یادەوەری خۆیدا بۆ نزاری هەڵگرتووە، پێكڕا نیگاری كوڕێكی چاوشین و قژزەردن كە بەزەردەخەنەیەكی هەمیشەییەوە سەری بەرزكردۆتەوە و بەدەستێك جلی زانكۆوە بەڕێگادا دەڕوات. منداڵەكانی فیكرەت گوڵدانچی دوای مردنی دایكیان خولیایەكی بێمانای ئاودان و بەخێوكردن و جوانكردنی باغچە بچكۆلەكەی ماڵیان دەكەوێتەسەر. نزاریش ئەوكاتانەی لە یاریگاكاندا خەریكی هاواركردن نییە، لە ماڵەوە ئیش لە باغەكەدا دەكات. « هەندێك ڕۆژ وام هەستدەكرد هەموو گیانی لە هەڵاڵەدا زەرددەچێتەوە» سەوسەن فیكرەت دواتر وای دەگووت. دەبێت بڵێین كە فیكرەت گوڵدانچی پەیوەندییەكی زۆر خۆش و هارمۆنی لەگەڵ كوڕەكەیدا نەبوو، كە بەردەوام باوكی بەوە گوناهباردەكرد كە سەرقاڵی زۆر و بێباكی بەرامبەر ئازارەكانی دایكی هۆكاری گەورەی كۆچی دوایی ئەو بوون. كە شەڕی ئێران هەڵگیرسا نزار فیكرەت ئەو ساڵە لە كۆلیژی ئەندازە دەرچووبوو، لەو دەمەدا بۆ یەكەمجار فیكرەت گوڵدانچی بیری لەوە كردەوە كە بە خێزانەوە بگەڕێنەوە بۆ نیشتیمانی ڕاستەقینەی خۆی لە باكوور. خوێندنەوەی زۆر لە بواری مێژوودا هەستێكی پێشوەختی بە كارەساتەكان تیا دروستكردبوو. كە سەدام حوسەین هاتەسەركار و بۆ یەكەمجار وەك دیكتاتۆرێك لە بالكۆنێكی بەرزەوە سەرەتای سەرهەڵدانی دونیایەكی نوێی ڕاگەیاند، فیكرەت گوڵدانچی لەناو حەشاماتە شێتەكەدا سەرسامانە وەستابوو و سەیریدەكرد. خوێندنەوەكانی گوڵدانچی لە ژیاننامەی دیكتاتۆرەكاندا پێیدەگووت ڕۆژگاری زۆر تاریك و دوورودرێژ بەڕێوەیە. هەستێكی ناوەكی و زەنگێكی قایم لە دڵیدا ئاگاداریدەكردەوە كە ئەو ئاهەنگانەی ئێستا، سەرەتای ساڵگەلێكی ترسناك و تاریكن. ئەو ڕۆژە كاتێك گوڵدانچی لە پاسێكی دووقاتی كۆندا لە «مەیدان»ـەوە

بەرەو «بەیاع» بەناو دەنگی هوتاف و مۆسیقای ئاهەنگگێڕاندا بەڕێکەوت لە خەیاڵی ئەوەدا بوو کە پێش هەموو کارەساتەکان بکەوێت و بەجۆرێک لە جۆرەکان ئیشەکەی خۆی بگوازێتەوە بۆ بەشی تەموین لە باکوور. ئەوەدەم نزار فیکرەت لە پۆلی سێیەمی کۆلیژی ئەندازە بوو، نیازەکەی باوکی تووشی شۆکێکی گەورەی کرد، مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو کوڕەکە پێی سەخت بێت ساڵی داهاتوو بەتەنیا لە بەشی ناوخۆیی بەسەریەرێت، بەڵکو نەیدەتوانی ئاسان دەست لە هاوڕێ بەغدادییەکانی هەڵگرێت و واز لە هاتوچۆی یاریگاکان بهێنێت، بەڵام لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەو پەیوەندییە دڵدارییە توندەی بوو بە ئەسیل یەلمازەوە کە ئەگەر بیانگوازتبایەتەوە بۆ شارێکی تر درێژەپێدانی نەکردە و دژوار دەبوو. کوڕەکە هیچی لەوە نەدەزانی کە فیکرەت گوڵدانچی پێشبینی شەڕێکی ترسناک و گەورە دەکات. قووڵبوونەوەی لە مێژووی خۆرهەڵات و شەڕی تایەفە کۆنەکانیدا ئەو هەستەی تیا سەوزکردبوو کە هاتنی دیکتاتۆرێکی تازە کە مەیلێکی ترسناکی بۆ خۆدەرخستن هەیە، بەبێ ڕودانی شەڕێکی گەورە تێناپەڕێت. لەو ماوە درێژەی ژیانیدا لە شارێکی دەریائاسای وەک بەغدادا لەوە تێگەیشتبوو کە ئێستا هەموو شتەکان بۆ دەرکەوتنی کارەساتێکی گەورە کامڵبوون. بێئەوەی بوێرێت ترسەکانی لای نزاری کوڕی ئاشکرابکات، هۆی خولیاکانی خۆی گێڕابووەوە بۆ ئەوەی هێدی هێدی پیردەبێت و ناتوانێت زیاتر لەگەڵ کاروباری چڕ و بێپشووی دائیرەدا سەرقاڵ بێت. نیازەکەی لای هەریەک لە نزار و پڕوشە شۆڕشێکی ڕاستەقینەی دروستکرد، هیچیان ئامادەنەبوون پێکڕای ژیانیان لە یەکێک لە شارە بچوک و بێگیان و چەپەکەکانی باکووردا بەسەر. پڕوشە لە هەمووان توڕەتربوو، سۆنگەی توڕەبوونەکانیشی هەمانشێوە عاشقانە بوو. ئەو لە هاوینی حەفتاو هەشتەوە، چەند ڕۆژێک دوای جەژنی لەدایکبوونی هەژدەساڵەی خۆی لە یەکێک لە باغە

گەورەکانی بەغدادا پەیوەندی لەگەڵ کوڕی ئەفسەرێکی بەرزی سوپادا بەستبوو کە ناوی «نەشئەت نیعمە» بوو. کوڕەکە بەجۆرێک ڕێک و سەر ڕاست بوو، پەیمانی دابووە پرۆشە لە ماوەی ساڵێکدا بیخوازێت و بیکاتە خێزانی خۆی، ئێستا گەر بگەڕابانایەتەوە بۆ کوردستان هەموو خەونەکانی بەبادەچوو و دەبایە بۆ هەتاهەتایە لەو عەشقە جیاببێتەوە. تاکە کەسێک کە بەباوکی گووت بۆ هەرجێگایەک بڕۆیت لەگەڵتدا دێم، تا مردن لەگەڵتدا دەبم و هیچ کات... هیچ کات بەجێتناهێڵم، سەوسەنی کچە بچوکی بوو. تاکە منداڵی زۆر نزیک لە گوڵدانچییەوە سەوسەن بوو، دوای مردنی دایکیان فیکرەت گوڵدانچی کچە بچکۆلەکەی خستە ژێر چاوەدێرییەکی زۆر تایبەت و بایەخێکی وەها بێوێنەی پێدا، خەڵکانێکی زۆر لەو باوەڕەدا نەبوون کەسێکی وەک ئەو کە بە ئەهلی کتێب ناسراوبوو، بتوانێت بەو چەشنە سەرپەرشتی کچێکی منداڵ بکات. کچەکە لە منداڵییەوە کەمخوێنی و لاوازی لەگەڵدا بوو، ئێسکەکانیشی بە ئەندازەی پێویست بەهێزنەبوون تا بەرگەی هەموو ماندووبوونێک بگرێت. لەبەرئەوە ترسێکی هەمیشەیی لەگەڵدا بوو. منداڵەکە تەنیا دوای مردنی دایکی بەتەواوەتی پێیگرت و کەوتە سەرزمان. چونکە باوکی بەردەوام بە کوردییەکی ساف قسەی لەگەڵدا دەکرد، زمانی قسەکردنی بە کوردی لە زمانی خوشک و براکەی ڕوونتر و بێگەردتربوو. فیکرەت گوڵدانچی بەجۆرێک لە جۆرەکان توانی وێنەیەکی تەواو ئەفسانەیی دەربارەی کوردستان و شارەکان و هاوینەهەوارەکانی لەسەری کچە بەستەزمانەکەدا بچێنێت، کە زۆرجار زیادەڕەوییەکی نادروستی تێدابوو. لە ئەلبومەکانی گەنجێتی خۆیدا دیمەنی چیا بەفراوییەکان و گوندە خەوتووەکانی نێو دارستان و چەمی گەورەی پڕ ماسی پیشانی کچەکەی دەدا، بێئەوەی هیچی دیکەی بۆ باسبکات. کچەکە بەجۆرێک گەورەبوو، ناوی شارەکانی وەک هەولێر و هەڵەبجە و ئامێدی، ناوی هاوینەهەوارەکانی وەک سۆلاف و

سەرسەنگ و گەلی وەک شوێنی ئەفسانەیی و خورافی دەهاتنە بەرگوێی. فیکرەت گوڵدانچی کە ڕاستەوخۆ نەیدەوێرا بە منداڵەکانی بڵێت جەنگی ترسناک و سەردەمانی زۆر تاریک بەڕێوەن، لە قسەکردنەکانیدا بەچپەوە بۆ سەوسەنی درکاند کە ساڵانی داهاتووی ئەم وڵاتە گەلێک خوێناوی دەبن.

پرۆشە فیکرەت لە ساڵی یەکەمی زانکۆدا شوویکرد، باوکی تەواوی شووکردنەکەی وەک شتێکی منداڵانە سەیردەکرد. ئەو لەلای سەوسەن دەیگووت «من دەزانم پرۆشە بەختەوەر نابێت». بەڵام ئەوەی دواتر سەوسەن فەرامۆشی نەکرد، ئەو قسە درێژانەی فیکرەت گوڵدانچی بوو دەربارەی جەنگ. گوڵدانچی لەسەر چەندەها کتێب و ئەتڵەسی گەورە گەورە بۆ کچەکەی ڕوونکردەوە جەنگ چییە، نیگاری شارە وێرانەکانی پیشاندا، سوپاکان لە کاتی مارشکردندا، سەربازەکان بە خۆیان و خودە ئاسنینەکانیانەوە لە سەنگەردا، لوولەی ترسناکی تۆپەکان کاتێک لێشاوی ئاگریان لێدێتەدەرەوە. تەقینەوەی خومپارەکان لە گۆڕەپانی جەنگدا، هەلاهەلابوونی سەربازان، مردنی بە کۆمەڵ، نیگاری گەنجانی بریندار لە قوڕ و لیتەی بەرەکاندا، گوردانی چەقیو لە بەفردا، ئەفسەرانی برسی و کزۆڵە لە سەهۆڵبەندانی زستاندا، دیلەکان لە تابووری دوورودرێژدا، شارانی سووتاو، ژەنراڵانی ماندوو لە دوکەڵ و باروتدا.

زەحمەتە مرۆڤ تێبگات بۆ فیکرەت گوڵدانچی هێندە مەراقی بووە باسی جەنگ بۆ کچێکی نەخۆش و منداڵکار بکات. گوڵدانچی هەر لەسەرەتاوە بە چەشنێک لە چەشنەکان کۆی ترسەکانی ناو ڕۆحی خۆی بۆ سەوسەن گواستەوە، منداڵەکە لە تەمەنێکی ناسک و زووەوە ئەو هەستەی تێدا دروستبوو کە لە وڵاتێکی سامناک و شوێنێکی ترسناکدا دەژی. بەر لەچەند مانگێک لە بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکانی ئێران بۆ بەغداد کچەکە تووشی ئەو دەردە دەبێت بەردەوام سەیری کتێبەکانی

جەنگ و وێنەی سەربازی کوژراوی ناو ساڵنامەکانی شەڕی جیهانی بکات. بینینی بەردەوامی ئەو وێنانە سەوسەن تووشی غەمۆکی و نینۆک خواردن و سوڕاندنەوەی بێهودە و کەمخەوییەکی بەردەوام دەکەن، لەو دەمەوە فێری ئەوە دەبێت کە سەیری وێنەکان بکات و بە ڕۆح بچێتە ناو دیمەنەکانەوە و تەواوی ئەو هەستانە بژی کە وێنەیەک دەیگوازێتەوە، سەوسەن لە منداڵییەوە بەجۆرێک فێری خوێندنەوەی وێنە دەبێت، دەتوانێت لەگەڵ نیگای هەموو وێنەیەکدا قووڵ تێکەڵ بێت و بڕواتە ناو جیهانە داخراوەکەیەوە. سەیری دیمەنەکانی جەنگ دەکات و لە ناویدا ونەبێت، سەیری وێنەکانی سروشت و شوێنە ئەفسوناوییەکانیش دەکات و دیسان لە ناویاندا وندەبێت، بەڵام ئەوەی ئازاری دەدات ئەوەیە کە نەدەنگی ناو وێنەکان دەبیستێت و نە بۆنی ناو وێنەکان دەکات، چەند ئاسان دەچێتە ناو وێنەکانەوە، چەندە بە ڕوونی دیمەنەکان لە بەردەمیدا بەرجەستە دەبن و دەبنە جیهانێکی ڕاستەقینە و زیندوو، هێندەش هەست بە کپی و بێبۆنییەکی گەورە دەکات. دواتر ئەو خولیایەی بۆنی مردووی ناو وێنەکان بکات لە ناویدا دەبێتە ئارەزوویەکی نهێنی.

کاریگەری نیگارەکانی شەڕ لەسەر کچەکە کوشندەدەبن، بە چەشنێک باوکی ناچاردەبێت بۆ ئەوەی دیوەکەی تری ژیانیشی پیشان بدات، دەرگای ژووری کتێبخانەکەی بۆ بکاتەوە تا زیاتر ئەتڵەسە ناوازەکانی گوڵ و ماسی و باڵندەکانیش ببینێت... سەوسەن گوڵدانچی لەو ژوورەدا وێنەی بەندەر و شار و سەرزەمینی زۆر دەبینێت کە لە کتێبەکانی باوکیدا خەوتوون. کاریگەری بینینی وێنە جوانەکان لەسەر سەوسەن وەها غەمرەوێنە کیژەکە تا ئەو شەوەی فڕۆکەکان بەغدایان بۆردومانکرد زۆر لە هاوسەنگی سروشتی خۆی بەدەست دەهێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگدا ژیانی خێزانی گوڵدانچی بە ڕێگایەکی تەماوی و تاریکدا دەڕوات و ژیانیان بەرەو غەم لادەدات و بەرەو پەشێویی دەگۆڕێت.

## ٥

ئەو هەواڵەی کە کامەرانی سەلما و مەنگوڕی بابەگەورە قوتابییەکی زانکۆیان بە چەقۆ بریندارکردوە، بەیانی ڕۆژی دووەم خێرا بڵاوبووەوە. نزیکی دوو ساڵ بوو مەنگوڕ لە بەزمی لەوجۆرەوە نەئالابوو، لەبەرئەوە هەواڵەکە زۆر زوو لە قەیسەرییەکان و ناو چایخانەکانەوە گەیشتە هەموو دوکاندار و کاسبەکانی بازاڕ، کە پێکڕا مەنگوڕی بابەگەورەیان دەناسی. سەعات یازدە هەواڵەکە بە سێ جۆری جیاواز لای خالید ئاموون بوو. هەر سێ چیرۆکەکە بەشێوەی جیاواز باسیان لە شەڕە چەقۆی دوو گەنج دەکرد کە لەسەر کچێکی بەغدایی بەشەڕهاتوون. خالید ئاموون لە منداڵییەوە لە ناو دەنگۆ و درۆی کاسباندا دەژیا، دەیزانی چۆن حیکایەتەکان تێکەڵ بە خەیاڵ و خواست و غەریزەی پیاوانی برسی ناو بازاڕ دەبن. بەوەدا ناوی کچێکی غەریبی بەغدایی لە مەسەلەکەدا بوو، دڵی بەتەواوی ترسا، زۆربەی ژنانی شاری دەناسی، جگە لە سەوسەن فیکرەت و خوشکەکەی کچی غەریبی بەغدایی تر لە شاردا نییە شایستەی ئەوەبێت شەڕەچەقۆی لەسەر بکرێت. لە نێوان یازدە و یازدەونیودا کۆمەڵێک تەلەفونی بەولاولادا کرد تا لە ڕاستی شتەکان تێبگات. دواجار هەواڵێکی دەستکەوت کە تەواو دڵی ترسان. کەسێکی نزیک لە مەنگوڕی بابەگەورەوە کە هەتا ئەو بەیانییەش لەگەڵیدا بەرچایی خواردوە پێیگووت کە مەسەلەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کچی پیاوێکەوە

هەیە بە ناوی فیکرەت گوڵدانچی کە ماوەیەکە لە بەغداوە گەڕاوەتەوە بۆ شار و خانوویەکی کڕیوە و دوو کچی جوانی هەیە، دوو کچەکە ئێستا لێرە و لەوێ عاشقیان بۆ پەیدا بووە. کابرا هەموو ئەو شتانەی مەنگوڕ بۆی باسکردبوو، بەهەمان ڕیزبەند و وردی، بەهەمان وشە و داڕشتنەوە بۆ خالید گێڕایەوە. ئاموون چەند جارێک ئەوەی پێدووبارەکردەوە کە کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی خۆی دوور و نزیک لە مەسەلەکەدا نەبووە و ئاگای لە حیکایەتەکە نییە و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی دڵداریشی لەگەڵ لایەنەکانی بەزمەکەدا نییە. کابرا کە دڵنیابوو قسەکانی نرخێکی تایبەتیان لای ئاموون هەیە پێیگووت «ئەوەی من تێگەیشتووم، کچە بەستەزمانەکە تائێستا ناوی کامەرانی سەلمای هەر نەبیستووە».

خالید ئاموون ئێستا دڵنیابوو سەوسەن فیکرەت ئاگای لەم شەڕە نییە کە دوو هەتیوی پڕوپووچ کردوویانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دڵی دەلەرزی. دوای تەلەفونەکە دەرگای دوکانەکەی داخست و بە قیاتە چکۆلانەکەی گەڕایەوە بۆ ماڵێ، گەرچی ئەمڕۆ دونیا وەک ڕۆژانی پێشوو سارد نەبوو، بەڵام هەستی بە لەرزێکی کوشندەکرد لە لەشیدا، هەستیکرد شتێک لە ناوەوە لەرزی لێدەهێنێت. لە دڵی خۆیدا ئەوەی دووبارەکردەوە «ژنان بەمجۆرە عاشق نابن... قەت خۆشەویستی ئاوها شێتیان ناکات». لەو ساتەدا پڕ بەدڵ حەزیدەکرد هەر یەک لە کوڕە بریندارەکە و کامەرانی سەلما لە نزیکەوە ببینێت.

خالید ئاموون گەنجێکی زۆر جوان نەبوو، پیاوێکی سپیکەلانەی باریک و قژ کورت بوو، چەناگەیەکی باریکی هەبوو کە درێژییەکی نائاسایی بەدەموچاوی بەخشیبوو، جووتێک چاوی بادەمی گەورە، بەڵام جووتێک بڕۆی باریک و درێژیش کە ڕوخساری کەسێکی غەمۆکی و گومانکاریان دەدا بە نیگاکانی. ئەستەم بوو مرۆڤ تەنیا بەسەیرکردنی ڕوخساری بزانێت هەست بەچی دەکات. تاکە شتێک وای لێدەکرد لای ژنان کەسێکی

سەرنجراکێش بێت ئەو ئاڵۆزییەی ناو نیگای بوو، ئەو چاوانەی کە ئاسان نەدەخوێنرانەوە، بەدیوێکدا لە فریشتەیەکی دەستخەڕۆ و بەدیوێکی دیشدا لە پیاوکوژێک دەچوو بۆ دەرفەتێک بگەڕێت دەستی خۆی بوەشێنێت. هەر کەس سەیریبکردبایە دەیزانی لەیەککاتدا دەتوانێت هەم ناسک و هەم دڵڕەقیش بێت. ئەوەی کە هەرگیز نەداری نەبینیوە و ڕۆژگاری هەژاری نەژیاوە، ئاسان لە ڕوخساریدا نەدەبینرا، واهەردەکەوت وەک ئەوەی ئەمرۆ بەسەر ماڵ و ساماندا کەوتبێت و ڕابوردووی پڕبێت لە ڕۆژانی ناخۆش، هەندێکجار جوڵە و تەماشاکردنەکانی شتێک لە شپرزەییان پێوە دیاربوو ئەوەیان دەشاردەوە کە ئەم گەنجە کوڕی یەکێک لە خێزانە داراکانی شارە. هەندێک لە کڕیارە ژنەکان سەرەتا وایاندەزانی ئیشکەرێکی کرێگرتەیە نەوەک خاوەنی ڕاستەقینەی ناودارترین کۆگای شار، بەڵام کە دەمی دەکردەوە، دەنگی جۆرێک لەرە و چەشنێک سەدای تێدابوو، وای لە هەرکەس دەکرد ئاوڕیداتەوە، وایدەکرد باوەڕی پێبکەیت و حەزبکەیت زیاتر قسەبکات و گوێبگریت. هەندێک لەوانەی لە نزیکەوە توڕەبوونەکانیان بینیوە دەزانن لە کاتی توڕەبووندا تۆنێکی وشک و بێزەنگ دەکەوێتە سەر دەنگی، تۆنێکی سارد کە موچڕکە بە لەشی ئادەمیدا دەهێنێت. کەم کەس ئەو دەموچاوەی دووەمیان لە خالید ئاموندا بینیبوو، کچان وەک کوڕێکی هێمن سەیریاندەکرد کە شتێک شەرم و بێدەنگی زۆری تێدایە. بەڵام خالید ئاموون دەیتوانی بە چەشنێک پڕ ڕق بێت خۆشی لێیدەترسا و سڵی لێدەکردەوە. ئەو لە نێو قەیسەرییەکاندا فێربوویوو چۆن هەستەکانی خۆی بشارێتەوە، ڕقی لە زۆربەی دوکاندارەکانی هاوسێی بوو، خۆشی بە هیچ یەک لەو هاوڕێیانە نەدەهات کە لەگەڵیاندا دەیخواردەوە، بەڵام دەیتوانی هەموو ئەو هەستانە بشارێتەوە و هیچیان دەرنەخات. لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ سەوسەن فیکرەتدا شتێکی ترە، هەستدەکات هێزێکی لە توانای خۆی

گەورەتر یاری پێدەکات.

تا دوێنێ کێشەی هەرە گەورەی خالید ئاموون ئەوەبوو، چۆن خۆشەویستی خۆی بۆ سەوسەن فیکرەت ئاشکرابکات، ئێستا کێشەیەکی گەورەتری هەیە... ڕق. لە ئێوارەدا شوشەیەک شەربەتی ناسر و پاکەتێک بسکیتی هەڵگرت و چوو بۆ بیمارستان، قاوش بە قاوش و ژوور بە ژوور گەڕا، جەنجاڵی و پێکدادان و قەرەباڵغی ناو ساڵۆنەکان دەرفەتی ئەوەیان پێبەخشی بە ئاسانی لە ناو بەشەکاندا بسوڕێتەوە و لە سستەر و تیمارپێچەکان پرسیاربکات. یەکەمجاربوو لە ژیانیدا خۆی وەک گەنجێکی پوکاوە و کەساس دەهاتە بەرچاو، چاکەتێکی قاوەیی کەمێک درێژ و بلوسێکی زستانەی ملداری لە بەردابوو کە پتر تەنهاییان ئاشکرادەکرد. کە گەیشتە بەر قەرەوێڵەکەی مەنسور، خەڵکێکی زۆری بینی بۆ دیدەنی بریندارەکە هاتبوون، لە ناو هەموویاندا لە کوڕە زامدارەکە نزیکبووەوە و بەقووڵی سەیریکرد، هێند قووڵ و بێدەنگ لێیڕوانی سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا. لەگەڵ مەنسور ئەسریندا پێکەوە سەیری یەکدیان کرد، مەنسور پێشتر ئەم کوڕەی نەبینیبوو، بەڵام بێئەوەی بیریکاتەوە، تەنیا لە شێوەی نیگاکردن و غەمگینیدا تێگەیشت کە یەکێکە لە عاشقەکانی سەوسەن فیکرەت. نیگای شتێکی تایبەتی تێدابوو کە دوێنێ ئێوارە لە چاوانی کامەرانی سەلماشدا بینیبووی، شتێک نزیکدەبێتەوە لە شێتی، لە کڵپەکردنێکی کتوپڕ. کەسیان پێویستیان بەوە نەبوو هیچ بڵێن، خالید ئاموون هەستیکرد لە ناخی دڵەوە ئاواتەخوازە ئەم بریندارە بمرێت، شەربەتەکەی دانا و بەدەنگێکی سارد گوتی «ئومێدم وایە، زوو شیفات بێت».

خالید ئاموون هاتبوو ببینێت و بزانێت ئەم کوڕە لە چی دەچێت. گەنجێکی لاواز و سادەبوو کە بە کاریگەریی برینەکەی دوێنێ و نەشتەرگەرییەکەی شەو ڕەنگ زەرد و نیوەگیان دەردەکەوت، بەڵام لەگەڵ

ئەو کەمۆشییەدا هێشتا جوان دەینواند، ئێستا دڵنیابوو ئەم مەنسوری ئەسرینە کەسێکە دەبێت مرۆڤ ئاسان وەرینەگرێت، تەواو تێگەیشت بۆ کامەرانی سەلما ویستوێتی بیکوژێت. لە دڵی خۆیدا گووتی «خودایە چەند لە عاشق دەچێت». کوڕەکە جۆرە نیگایەکی ڕۆمانسیانەی هەیە کە لەم شارەدا بۆ خۆشەویستی زۆر پێویستە. بەسەرزەنشتەوە بەخۆی گووت «خەوتنی زۆر لەگەڵ قەحبەکاندا، ڕوخساری عاشقی لێسەندوومەتەوە».

شەپۆلی خێراخێرای میوانەکان کەم کەم لە قەرەوێڵەکە دووریانخستەوە، سالۆنەکە پڕبوو لەو ژنانەی لەبەر خۆیانەوە فرمێسکیان دەڕشت و دۆعایان لە سەبەبکاری برینداربوونەکە دەگرت، هەموو پور و پورزای زل زل بوون کە عەبای شۆڕ و بۆنی کەڕووی بەر بەلۆعە و سەرمای دەرەوەیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنایە ناو خەستەخانەکەوە. کە ژمارەی میوانەکان کەمێک زۆربوون، خالیدی ئاموون بەدەرفەتی زانی بێدەنگ بڕواتە دەرەوە. لە سالۆنەکەدا فەراشێکی زەبەلاح پەنجەرەیەکی گەورەی کردەوە و تکایکرد میوانەکان کەمێک لەسەرخۆ قسەبکەن. خالید ئاموون لە نیهانی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە بۆ ئەم لە عاشق ناچێت، ئاخۆ عاشقان لە بنەڕەتدا ڕوخسارێکی جیاوازتریان هەیە؟ دڵنیابوو ئەو سەوسەن فیکرەتی لەم کوڕە خۆشتردەوێت، گووتی « ئەگەر کامەرانی سەلما واهەڵەشە و شێتانە ڕەفتاری نەکردبایە، لەوانەبوو مەنگوڕی بابەگەورە ئەم کوڕە پەشیمانبکاتەوە». بەڵام پاش کەمێک دووردڵی گووتی «هیچ کەسێکم نەدیوە ئاوها لە عاشق بچێت، خوای گەورە من بۆ وا نیم». لەبەر دەرگای خەستەخانەکەدا جارێکی تر هەستیکردەوە کە لەرزێکی کوشندەی لێدێت، لە ماشێنەکەدا بەر لەوەی بەرەو ماڵەوە لێخوڕێت بەدەنگی بەرز گووتی «بەر لە شەوی شەممە دەبێت بچمە پێشن. هەرکەسێک زووتر لەوانی تر قاچ دانێت شانسی زۆرتری هەیە». وایگووت، بەڵام لە ڕۆحیدا هەستی بە لاوازییەکی گەورە کرد.

٦

خۆشی و بەختەوەرییەکانی خێزانی گوڵدانچی دەرهەق بە دەرچوونی نزار فیکرەت لە کۆلێژی ئەندازە ماوەیەکی زۆری نەخایەند. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگدا کوڕەکە بە پلەی ئەفسەری یەک ئەستێرە، گوازرایەوە بۆ کەتیبەی چاکسازی ماشێن و کەرەستە سەربازییەکان لە فەیلەقی دوو. هەڵبەت نزار فیکرەت دەیتوانی ئاسانتر لە هاوتەمەنانی خۆی لە سوپا هەڵبێت. خۆشەویستی هۆی سەرەکی چوونی نزار فیکرەت بوو بۆ جەنگ. یان دەبایە بڕوات بۆ جەنگ یاخود بە پێشنیارەکەی باوکی ڕەزامەند بێت و بەخێزانەوە بگوازنەوە بۆ باکوور تا ئاسان نەکەوێتە دەست ئەو تیپە تایبەتیانەی لە سەرتاسەری وڵاتدا هەڵاتەکانی شەڕیان تیریاران دەکرد. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگدا فیکرەت گوڵدانچی جارێکی دی هەوڵێکی دیکەی دایەوە، کوڕ و کچە گەورەکەی بخاتە سەر ئەو بڕوایەی بگوازنەوە بۆ یەکێک لە شارەکانی کوردستان، بەڵام نزار فیکرەت نەیدەتوانی بیر لەوەبکاتەوە کە دەتوانێت بە هەڵهاتوویی لە شارێکی باکووردا بژی. نزار فیکرەت دەیویست خۆی وەک فیداکارێکی بێوێنەی خۆشەویستی نیشانبدات، بەجۆرێکی بێمانا ئەوە چووبووە سەرییەوە کە چوونی بۆ جەنگ گەورەترین بەڵگەی خۆشەویستییە. سەوسەن فیکرەت هەموو قسەکانی نزاری گوێ لێبوو، کە ئاشکرا وێنەیەکی ڕاستەقینەی لەسەر جەنگ نەبوو... وارێکەوت چەند ڕۆژێک

بەر لە گواستنەوەی نزار بۆ بەشی پێشەوەی بەرەکانی شەڕ، پرۆشەی خوشکی شووبکات. نەشئەت کە کوڕێکی شەرمن و کەمدوویوو، ئەوکات پتر لە ساڵێک بوو سەربازبوو، کاتێک پرۆشەی گواستەوە ئاهەنگەکەیان یەکێک بوو لە ئاهەنگە گەورەکانی ئەو وەرزە، باوکی نەشئەت ژەنراڵێکی بەرزی سوپا بوو هەر بەو پێودانە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی بەرزی دەوڵەت و بەرپرسانی حیزبی بۆ ئەو ئاهەنگە داوەتکردبوو. فیکرەت گوڵدانچی گەرچی خۆشی فەرمانبەرێکی بالای دەوڵەت بوو، بەلام لەناو ئەو خەڵکە لووتبەرز و پلەبەرزەدا، خۆی نامۆ و نەگونجاو و بچوک دەبینی. لە ئاهەنگەکەی پرۆشەدا، لە ئەفسەرە بەرزەکانی هێزی دەریاییەوە تا فرۆکەوانە چالاکەکانی جەنگ بەشداربوون، ئاهەنگەکە وەک شایی میرزادەیەک ئەفسانەیی بوو، بەجۆرێک دواتر هیچ یەک لە سەوسەن فیکرەت و پرۆشە ئەو ئێوارەیەیان یادنەکرد کە سەمای زۆر تێدا کرا، گۆرانیبێژی بەناوبانگ گۆرانیان تیا گووت و پیاوەکان شەرابی زۆریان تیا نۆشی. نەشئەت گەرچی ماڵێکی گەورەی بۆ زەماوەندەکەی خۆی کڕیبوو، بەلام پرۆشە دەبایە دوای شووکردنیشی زۆربەی کات بەهۆی کەش و هەوای جەنگەوە لە ماڵی گوڵدانچی باوکیدا بمێنێتەوە. باوکی نەشئەت لەو ئەفسەرە فانەتیکانە بوو کە بەشداریوونی کوڕەکەی لە جەنگدا بە ئەرکێکی ڕۆحی و ئەخلاقی دەزانی. کوڕەکە گەنجێکی ئەسمەری چاوڕەش بوو کە ترسێکی گەورەی لە هەیبەتی دایک و بابی هەبوو کە هەردووکیان لە ماڵیشەوە وەک ژەنراڵی ڕاستەقینە لە گۆڕەپانی جەنگدا ڕەفتاریاندەکرد. ئەوەی کچێکی کوردی هەڵبژاردبوو بیکاتە خێزانی خۆی، سەرەتا خێزانەکەی تووشی خورپە و دڵتەنگی کرد، ئەوان خێزانێک بوون باپیرانیان لە ڕیزی پێشەوەی ناسیونالیستە عەرەبەکانی وڵاتدا بوون، ئێستا کوڕێکیان لە ناکاو ژنێکی کورد دەهێنێت، ئەوە هەواڵێک بوو لیوا نیعمەی تووشی دوودڵی و پەشۆکان کرد... کورد

لە کولتووری خێزانەکەدا وێنەی کۆمەڵێک درندەی کێوی و بێئامانیان هەبوو. کوڕەکە گەرچی لە زۆر شتدا لاواز و زەبوون دەردەکەوت، بەڵام لە مەسەلەی ژنهێناندا شتێک لە خۆگری و پتەوی نیشاندا کە کەس چاوەڕوانی نەبوو، حیکایەتی ئەو خۆشەویستییە درێژەی ساڵێک زیاتر بوو بە کاغەز و تەلەفون و یەکدی بینینی کورت کورت درێژەی هەبوو، لە خەیاڵی کوڕەکەدا ڕەهەندێکی وەها پیرۆزی وەرگرتبوو کە نەدەکرا ڕێگابدات مێژووی سیاسی خێزانەکە ڕێگربێت لە بەردەمیدا. ئێوارەیەکیان بە دەنگێکی ڕۆشن و زمانێکی ڕوون بە جەنابی لیوای گووت، کە لە ماڵیشەوە لە ژێر ڕۆبە ئاوریشمییەکاندا هەر کراس و پانتۆڵی خاکی لەبەردەکرد «ئەوەی ژنەکەم کورد بێت، مانای ئەوە نییە کە منداڵەکانی من عەرەبی ڕاستەقینە دەرناچن. سوێندی کوڕێکی دڵسۆزت بۆ دەخۆم هەموو شتێک دەکەم بۆ ئەوەی منداڵەکانم بە ڕۆح و بە زمان عەرەب بن». پرۆشە فیکرەت لە مانگی یەکەمی شووکردنییەوە، لەبەر سەختی شەڕ و نەبوونی مۆڵەت و جەنگی بەردەوام لەبەرەکاندا، بەشی زۆری کاتەکانی بەتەنیا یاخود لە ماڵی باوکیدا دەبردەسەر، سەوسەن لەوکاتەوە دەیتوانی ببینێت خۆشەویستی تا چ ئەندازەیەک مرۆڤ لە لێواری کارەسات نزیکدەکاتەوە. پرۆشە لەو ماوەیەدا حەسرەتێکی زۆری بۆ مێردەکەی دەخوارد، لە یەکێک لە مۆڵەتەکاندا پێشنیاری ئەوەی بۆ نەشئەت کرد کە یان لە ڕێگای پەیوەندییەکانی باوکییەوە هەوڵبدات بیگوازنەوە بۆ جێگایەک لە پشتی بەرەکان و دوور لە شەڕ یاخود لە ڕێگای خزمەکانی خۆیانەوە لە باکوور هەڵبێن و لە ڕێگای ئێرانەوە بەرەو دەرەوە سەفەربکەن، بەڵام کوڕەکە نەیدەتوانی بچێتە ژێر باری هیچ یەک لەو دوو داواکارییە، لە ڕوویەکدا خۆی خاڵی نەبوو لە حەماسەتی نیشتیمانپەروەرە گێلەکان، بەسەرێکی دیش دەیزانی کارێکی لەو چەشنە پاشەڕۆژی سیاسی و سەربازی باوکی دەخاتە مەترسییەکی گەورەوە و

لەوانەیە بە تیاچوونی تەواوەتی ئەو کۆتایی بێت. ئەو چەند مانگەی کە لە سەنگەرەکانی ڕیزی یەکەمدا ژیابوو، چەندەها چیرۆکی دەربارەی ئەو ئەفسەرە گەورانە بیستبوو کە تیربارانکراون، هەتا دەربارەی ئەو ڕووداوانەش حیکایەتی بیستبوو کە ژنی ئەوجۆرە کەسانە گیراون و بەدەستەجەمعی لە لایەن کۆماندۆ تایبەتەکانی سەرۆکەوە لاقەکراون. ئەوانە هۆ و بەهانەیەکی گەورەبوون تازە زاواکە دۆزەخی جەنگی لە دۆزەخی هەڵهاتن پێباشتربێت.

کاتێک ئاگری جەنگ بڵێسەی سەند سەوسەن فیکرەت چواردەساڵ بوو، کە نزاری برای گوازرایەوە بۆ بەرەکانی جەنگ نزیک ئیلام کچەکە هێدی هێدی تووشی بێخەوییەکی گەورە بوو، بەشی زۆری شەوانی لە کتێبخانەکەی گوڵدانچییدا دەبردە سەر، لەوێ بەدەم خواردنەوەی قاوەی عەرەبی و بۆنکردنی گوڵی مێخەک و خۆ ڕاوەشاندن لەسەر کورسییە جۆلانێناساکەی باوکی، لە خوێندنەوەی کتێبەکاندا قووڵ بووەوە. کتێب لای سەوسەن شتێک بوو دەیتوانی هەموو جیهان لە خۆبگرێت، هەموو جیهان، تەنیا دوو شت نەبێت «بۆن» و «دەنگ»، سەوسەن چاوی لێکدەنا و شتەکان تا دوا سنوور لە بەرچاوی بەرجەستەدەبوون، لەخەیاڵیدا ڕەنگ و شێوە و جوڵەی هەموو مەخلوقاتی ناو کتێبەکانی دەبینی، بەڵام ئەوەی دەیترساند بێدەنگی کتێبەکان بوو... ترسناکترین شتی دونیا لای سەوسەن بێدەنگی کتێب بوو. لەگەڵ ئەوەی لە ناو هەموو کتێبێکدا سەدان دەنگ قسەدەکات، بەڵام کە هەڵیدەگرتن، کە سەیری وێنەکانی دەکردن، کە گوێی دەنا بە بەرگەکانیانەوە، نە هیچی دەبیست و نە هیچی بۆن دەکرد. سەوسەن لە منداڵییەوە هەر کتێبێکی دادەخست، لەگەڵ داخستنی کتێبەکەدا چاوی لێکدەنا و هەموو شتێکی دەبینی، شارەکانی دەبینی کە با بە ناویاندا هەڵدەکات، ئەسپەکانی دەبینی کە غار دەدەن، شەمەندەفەرەکانی دەبینی تورە بە نێو چیاکاندا

دەڕۆن، پاڵەوانەکانی دەبینی لەسەر پێخەفی مەرگ فرمێسک لە چاویان دێتەخوارێ، عاشقەکانی دەبینی کە باوەشدەکەن بە یەکدا، بەڵام گوێی لە هیچ نەبوو، کتێبەکان و وێنەکان گەردوونێکی گەورەی بێدەنگ بوون. سەوسەن لە کتێبەکانەوە یەک شت فێربوو، ڕقی لە جەنگ بێت و پێشی سەرسام بێت. هەر لەو دەمەدا خولیای خوێندنەوەی ژیانی گەڕاڵە گەورەکان کەوتەسەری، هەر لەو دەمەدا خەونی بەوەوە بینی مێردێکی گەڕاڵی هەبێت، پڕبێت لە حیکایەت دەربارەی هەموو کونج و کەلێنێکی دونیا. شەوێکیان لە کاتێکدا بە چەشنێکی منداڵانە لە کورسییەکەی باوکیدا خۆی ڕادەژەند، بە پرۆشەی خوشکی گووت « گەر مێردەکەت خۆشدەوێت وای لێبکە نەچێت بۆ شەڕ، پێیبڵێ با بڕوات بۆ سەفەر، چونکە شەڕ هەموو پیاوەکان، هەتا باشترینیان دەگۆڕێت بۆ کامێشێکی گەورە گەورە». ئەو بۆچوونە مایەی گفتوگۆیەکی توند و دوور و درێژ بوو لە نێوان خوشکەکاندا. هیچ مەخلوقێک نەبوو وەک پرۆشە فیکرەت خێرا بگری، بە جۆری هەنسکۆکە و ئەسرینوان بوو، هەموو بە ئەمیرەی گرینۆکان ناویاندەنا. بابی و خزمەکانی پێیان وابوو دوای شووکردنی باشتردەبێت، بەڵام کە بووشە خاوەن مێرد هەر خاتوونی گرینۆکان بوو. پرۆشە بەدەم فرمێسکەوە بە خوشکەکەی گووت «ئەوەی وا لە نەشئەت دەکات بڕوات بۆ جەنگ، دڕندەیی نییە، بەڵکو خۆشەویستییە». دواتریش گووتی «تەنیا پیاوە زۆر عاشقەکان دەچن بۆ شەڕ». ناکۆکی و ناتەبایی خوشکەکان بە چەشنێک بوو، دەبایە باوکیان بکەوێتە نێوانیانەوە. پرۆشە لای وابوو سەوسەن بێڕەحمانە دەرهەق بە مێردەکەی ئەو قسەدەکات. فیکرەت گوڵدانچی لە چەند دانیشتنێکی تایبەتدا لەگەڵ کیژە بچوکەکەیدا هەوڵیدا ئەوەی تێبگەێنێت کە لەوانەیە عەشق نەوەک خواستی مرۆڤکوژی، یان دڵسۆزی بۆ دیکتاتۆر پیاوان بنێرێت بۆ جەنگ. گووتی « لە وڵاتی ئێمەدا هەندێک پیاو پێیان باشترە بمرن یان وەک

درندە دەرکەون، لەوەی لە خۆشەویستیدا کەمتەرخەم دەربکەون». بەڵام کچەکە بە سەرسەختییەکی بێوێنەوە گووتی « ئەوەی لە پێناوی ژنێکدا بڕوات بۆ شەڕ، لای من گەمژەیەکە وەکو ئەوانی تر، بگرە لە هەموو ئەوانی تر گەمژەتریشە». فیکرەت گوڵدانچی بە کچەکەی گووت « زۆربەی سەربازانی دونیا بە خۆشی خۆیان ناچن بۆ شەڕ. بەڵکو ئازارەکانی هەڵهاتن زۆرجار لە ئازارەکانی جەنگ قورسترە، بۆیە خەڵکی هەندێکجار جەنگیان پێخۆشترە. هەندێ کەسیش بۆ ڕزگارکردنی ئازیزەکانیان لە ترس و دڵەڕاوکێ دەچن بۆ شەڕ، دەبێت تۆ باوەڕت بەوەبێت... دڵنیام ڕۆژێک گەورەبوویت و یەکێکت خۆشویست باشتر تێدەگەیت». کیژەکە بە ساردییەکەوە کە تا ئەندازەیەک دڵی باوکی ڕاچڵەکاند گووتی «هیچ کات کەسم هێند خۆشناوێت لە پێناویدا باوەڕ بە شەڕ بهێنم... سوێندت بۆ دەخۆم ڕقم لە هەر پیاوێک دەبێت وابیربکاتەوە... من تا ئەمڕۆ تەنیا ڕقم لەو پیاوانەیە کە سیر دەخۆن یان قژیان چەوردەکەن و بۆ دواوە هەڵیدەدەنەوە، بەڵام لە ئێستاوە ڕقم لەو پیاوانەش دەبێت کە لە پێناوی خۆشەویستیدا دەچن بۆ جەنگ». ئاشکرا ڕقی کیژەکە لە جەنگ شێوەیەکی زۆر پرەنسیپ ئامێزی وەردەگرت، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ دەکەوتە سەروو هەموو شتێکی ترەوە. بەڵام لەگەڵ ڕقیشدا لە جەنگ، خانمە بچکۆلەکە مەیلێکی سەیری نیشاندا بۆ بیستنی هەموو شتێک و زانینی هەموو هەواڵ و وردەکارییەک کە لەبەرە داگیرساوەکانی پێکداداندا دەهاتن... وەک ئەوەی بە دیوێکی دیدا لەزەت لە تەماشاکردن و بیستنی هەواڵەکانی جەنگ ببینێت.

لەساڵی ١٩٨٣ دا نەشئەت نیعمە کوژرا و تەنیا دوای شەش مانگ لاشەکەی لە زۆنگاوەکانی باشووردا دۆزرایەوە.

٧

کامەرانی سەلما لەوانە نەبوو بزانێت چۆن تەعبیر لە خۆشەویستی بکات. مەنگوڕی بابەگەورە بە فیکرەت گوڵدانچی گووت «موسیبەتی هەرە گەورەی ئەم کوڕە ئەوەیە نازانێت هەتا نامەیەکی خۆشەویستیش بنوسێت، بەڵکو ڕاستت دەوێت هەتا نازانێت بەڕاستی نامەیەکیش بخوێنێتەوە، کوڕەکە خوێندەواری تەواوی نییە، بەلام نەخوێندەواریش نییە. لە ڕاستیدا گەر دەتەوێت کچەکەت تووشی دەردەسەری خوێندەواران نەیەت، کامەران باشترین کەسێکە کچەکەتی بدەیتێ... باشترین زاوا بۆ کچێکی جوانی وەک خانمی بچوکی ئێوە، کەسێکە سیفاتی زۆری نەبێت، بەڵێ ئێوە لە من بپرسن، سیفاتی زۆر سەر لە مرۆڤ دەشێوێنێت. کچەکەتان پێویستی بە مێردێکە تەسلیمی جوانییەکەی ببێت... من دەزانم کوڕەکە لە گەنجیدا مێردێکی باش دەرناچێت، بەلام ڕاستت دەوێت، لە پیریدا دەبێتە یەکێک لە باشترین پیاوانی ئەم شارە، من کەسێکی درۆزن نیم، ڕقیشم لە هەر شتێکە لە قوونی درۆزنەکانەوە بێتەدەرێ. هیوادارم ناوبانگی خراپم نەبێتە مایەی ئەوەی وابزانن شتەکان بە خراپی دەگێڕمەوە، مەزەبی من خراپ گێڕانەوەی تێدا نییە... ئێمەی پیاو دوو جۆرین، هەمانە لە گەنجیدا لەگەڵ ژنەکانماندا باشین و هەشمانە لە پیریدا باشدەبین. بەلام باشترین پیاو ئەوانەن کە لە دواییدا دەبنە مێردی باش، من ئەوەم لە ژنانی زۆر قەیرە بیستووە.

هەموو ئەو پیاوانەی لە گەنجیدا دەستەوەستان و بێبەشن، لە پیریدا خەڵکانی تووڕە و ناحاڵی دەردەچن، بتەوێت و نەتەوێت بەوجۆرەیە، هەموو کەسێک چەند ساڵێکی گەمژەیی لە ژیانیدا هەیە... هەر کەسێک زوو چەموشی خۆی تێپەڕێنێت، دەتوانێت زوو ببێتە پیاو، بۆیە کامەرانی سەلما لەو کەسانەیە کە عومر دەیانکات بە پیاو... ئەو لە توخمی چەقۆ وەشێنانی چەشنی سەعدی مەلا سابرێن و کەریمی دایە گوڵشەن و عومەری مام پەپولەیە، کە جاران چەقۆکێش بوون و ئێستا قومارەکەی لێدەرکەیت خەڵکێکی باشیان لێدەرچووە... بەندە خۆشم لەو تیپ و توخمەم، هەر لەو تیپ و توخمەم».

فیکرەت گوڵدانچی بە تەواوەتی نەیدەزانی ئەم پیاوە چی دەوێت و باسی چی دەکات. بە جۆرێکی تەماوی تێگەیشت یەکێک هەیە دەیەوێت کچەکەی بخوازێت. مەنگوڕی بابەگەورە نزیکی چارەکێک بوو هاتبوو، چارەکێک بوو سەیری دیکۆری ناوماڵی گوڵدانچی دەکرد، سەیری پەیکەرەکانی بودا و ئێکۆنە تەختەکان و دەمامکە ئەفریقییەکان و پەیکەرەکانی مەسیحی دەکرد، ئەوە لە پاڵ دەیەها تابلۆی خەتدا کە هەندێک سورەتی قورئانیان لەسەر نەخشکرابوو، هەندێکی دیشیان وێنەی جیاواز جیاوازی هەندێک مزگەوت و فۆتۆگرافی هەندێک مەرقەدی نەناسراوی لەسەربوو.

دیوارەکانی ژوورەکەی گوڵدانچی بەجۆرێک سەیربوو، مەنگوڕ کەمێک بەلاغەتی ئاسایی خۆی لەدەستدا و لەو خاڵەوە دەستی پێکرد کە کامەرانی کوڕی سەلما دۆڵان بەتەواوەتی نازانێت نامە بنوسێت. لە ڕاستیدا نەدەبایە لە وەسفی عاشقێکی وەها شەیدادا لەوەوە دەست پێبکات. بەجەهەنەم کە نازانێت نامە بنوسێت، بەشی هەرەزۆری پیاوی ئەم شارە لەوانەن لە ژیانیاندا نامەیان نەنوسیوە، دائیرەی پۆست بێئیشترین و بێماناترین فەرمانگەی شارەکەیە، بۆ دەبێت مرۆڤ لە

ناساندنی عاشقێکی وا دڵسۆزدا لەوەوە دەست پێبکات کە خەت و قەڵەمی تەواو نییە.

مەنگوڕ لە ساتی یەکەمەوە هەستیکرد خراپ دەستی پێکردوە. پەشۆکانێکی کتوپڕ و ونبوونێکی لە ناکاو وایان کردبوو لەوێوە دەست پێبکات. بە درێژایی ڕێگا بیری لەوە دەکردەوە گەر کامەرانی سەلما بیزانیبایە نامە بنوسێت، بیزانیبایە وەک عاشقانی تر تەعبیر لە خۆی بکات، لەوانەبوو هیچ یەک لەم کێشانەی تووش نەیەت. ئەوەی لە گەنجیدا مەنگوڕی خستە سەر ڕێگای چەقۆوەشاندن، بێزمانی بوو... ئەوەی بەهرەیەکت نەبێت لە قسەکردندا، دەتکات بە چەقۆکێش. هەستیدەکرد کامەرانیش بە هەمان ڕێگادا دەڕوات، ئەو ڕێگایەی ئەو لە گەنجییەوە پێیدا هاتووە. بەر لەوەی لە تەمەنی سیوپێنج ساڵیدا مامۆستایەک بگرێت، یارمەتیبدات وشەی نوێ فێرببێت و گوزارەکانی ڕێکبکاتەوە و نەرێتی قسەکردنی خۆی باشتربکات، لە ناوەوە هەمیشە پەشۆکاو و نائارام بوو. جارێک بە مامۆستاکەی گووت «بەشی هەرە زۆری شەڕەچەقۆکانی ژیانم، بەهۆی ترسەوە بوون لە قسەکردن». مەنگوڕ چوار ساڵ بە نهێنی وانەی خوێندبوو، چوار ساڵ بێئەوەی بهێڵێت هیچ کەس پێیبزانێت. لە منداڵییەکی زووەوە دایکی بەدەردەکەی دەزانی، ئەوەی نەیدەتوانی قسەبکات و قژی خۆی ڕادەکێشا و سەری بە دار و دیواردا دەکێشا نیشانەی لاڵ بوونێکی ڕۆحی بوون. لە گەنجیدا لە کاتی شەڕەکاندا زوبانی وەها لە دەمیدا گیریدەکرد و لە گەرویدا کڵافەدەبوو، خەریکبوو دەیخنکاند. دایکی بەردەوام پێیگوتبوو «ئەو گرێیە لە زمانتدا دەتکوژێت». کە بەڕێکاوەبوو بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی، خەیاڵی لای ئەو دەنگ و هاوارە زامدارانەبوو کە لەکاتی شەڕدا گەروی دەگرن، هەندێک هەناسەی تاساو و وشەی خنکاو کە بەربینی دەگرن و نایەنەدەرێ، ئەوە تووشی تێکچوونی گەورەی دەکرد، هەمیشە ساتێک

بەرلـەوەی تێکەڵـی شـەڕبێت، شـتێکی لێدەهـات وەک پەرکـەم... جۆرێـک لـە نوسـانی گـەروو، نەجوڵانـی زمـان و هەڵنەهاتنـەوەی مەلاشـوو. ئێسـتا پتـر لـە سـی سـاڵ بـوو لەگـەڵ چەقۆکێـش و قومارچییەکانـی ئـەم شـارەدا تێکەڵاویبوو، بێئـەوەی کـەس بکوژێت، لەگـەڵ ئـەو هەمـوو بەزمـە ترسـناکەدا کـە بینیویێتـی دەتوانێـت شـانازی بـەوەوە بـکات کـە مەنگـوڕی بابەگـەورە کەسـی نەکوشـتووە. هیـچ شـتێک لـەوە خۆشـتر نییـە مـرۆڤ پیاوکـوژ نەبێت. ئـەوە لەزەتێکـە تەنیـا ئەوانـە دەیزانـن کـە وەک ئـەو هـەردەم لەسـەر ئـەو هێڵـە وەسـتاون کـە مرۆڤـی ئاسـایی لـە پیاوکـوژ جیادەکاتـەوە، هێڵێکـە کـەم کـەس وەک ئـەو دەتوانێـت ماوەیەکـی درێـژ لەسـەری بوەسـتێت، بێئـەوەی بکەوێـت... بەرامبـەر کامەرانـی سـەلما هەسـتی بـە سـۆزێکی زۆر کـرد، حەزیدەکـرد ئەویـش بتوانێـت تـا هەتاهەتایـە لەسـەر ئـەو هێڵـە بوەسـتێت و نەکەوێـت. دڵنیابـوو کامـەران لـە دڵـەوە کوڕێکـی تابڵێیست پاکـە، لـە دڵـی خۆیـدا گووتـی «چەقۆکێشـێکی کـۆن لـە هـەر کەسـێکی تـر باشـتر خەڵـک دەناسـێت، ئێمـە شـارەزای دڵیـن». بیریکـردەوە گـەر ژنـی بهێنایـە و منداڵـی ببایـە ئێسـتا زارۆکـەی لـە تەمەنـی کامەرانـدا بـوو، بـەڵام دڵنیابـوو هیـچ باوکێـک حەزنـاکات کوڕەکـەی وەک کامـەران بێـت. نـا نەیدەویسـت کوڕەکـەی بکەوێتـە نـاو دونیـای قومارچـی و چەقۆکێشـانەوە، سـۆزی بـۆ کامەرانـی سـەلما وەک سـۆزی بـاوکان نییـە، شـتێکی تـرە... زۆر بێگـرێ و بـێ داواکارییـە. خۆشەویسـتی بـاوک پـڕە لـە داواکاری سـەخت. هەناسـەیەکی هەڵکێشـاو خۆشـحاڵ بـوو کـە بـاوک نییـە.

دوێنـێ شـەو دوای بریندارکردنـی مەنسـوری ئەسـرین هەسـتیکرد شـتەکان تـەواو بـە پێچەوانـەی تەگبیـری ئـەوەوە دەڕۆن. دڵنیابـوو گـەر کامـەران وەک عاشـقێکی غەمگیـن و دڵشـکاو بـژی، گەنجێکـی ترسـناکی لێدەردەچێـت. بـە خـۆی گـووت «کوڕەکـە لـەو مەعدەنەیـە کـە نایەوێـت بدۆڕێـت، هـەر کەسـێکیش نەیەوێـت بدۆڕێـت، شـتی خراپـی لێدەوەشـێتەوە». دەسـتیکرد

بە گیرفانی شەرواڵەکەیدا و هەستیکرد چەقۆی پێ نییە. ئێستا دوو ساڵ بوو شتێکی زۆر تایبەتی نەبایە چەقۆی هەڵنەدەگرت، بەڵام هەر کاتێک دەستی بە گیرفانیدا دەکرد، دەستی بەر ئەو بەتاڵییە غەمگینە دەکەوت. ئێستا جیهان بە چەشنێک گۆڕاوە ناتوانێت ئاسان چەقۆ هەڵبگرێت، کەچی هەمیشە هەست بە شوێنە خاڵییەکەی دەکات، هەر کات دەست بە گیرفانەکانیدا دەکات، دەستی دەچێت بەو بۆشاییە گەورەیەدا. لە مێژبوو ترسی لەوە نەمابوو کەس لە لاکۆڵانێکدا پەلاماریبدات و بیداتە بەر چەقۆ، دوا دوژمنی ڕاستەقینەی «قولی داود» بوو، ئەویش چوار ساڵ لەوەوبەر لە پێشمەرگایەتیدا تیاچووبوو... دوای ئەو دوژمنێکی وەها گەورەی نەبوو لێیبترسێت. ئێستا دەیویست ئیشێکی باش بۆ ئەم کوڕە بکات، بیپارێزێت، نەهێڵێت بخلیسکێت.

دوێنێ شەو بە کامەرانی سەلمای گووت «ئەم شێتییەی تۆ هەموو شتێکی تێکدا، باوەڕناکەم کچێکی ناسکی وەک ئەو کیژەی گوڵدانچی هەروا ئاسان بێتە ژێر باری ئەوەی شوو بە یەکێک بکات کە وەک تۆ بە چەقۆوە دەچێت بۆ خوازبێنی. کامەران تۆ منداڵیت... تۆ هیچ شتێک لە ژن تێنەگەیشتوویت، هەموو ئەو ناسکییەی لەدەرەوە دەیبینیت هیچ نییە جگە لە توێکڵێکی تەنک، ناسکییەکەیان لە سەرتوێژی ماست، لە توێکڵی پیاز تەنکترە، هیچ کەس نییە بزانێت بیر لە چی دەکەنەوە... من گەر بمزانیبایە چۆن بیردەکەنەوە، سەد ژنم دەهێنا... بەڵام سەیری دەموچاوی ژنی ئەم شارە دەکەم و هیچی تیا ناخوێنمەوە، نازانم چۆن بیردەکەنەوە و بیر لە چی دەکەنەوە. تێدەگەیت، ئێستا نازانم ئەم سەوسەن فیکرەتەی تۆ ئاوها لە حوزنا قوونی خۆت بۆ شین و مۆرکردۆتەوە، بە چیرۆکی ئەمشەو بزانێت چۆن بیردەکاتەوە... ئێستا دوای شەڕە چەقۆکەی ئەمشەو، ئیشەکە خراپتر بوو... دۆعابکە ئەو کوڕەی ئیبراهیم ئەسرین نەمرێت، من قەت دڵم بەم کوڕ و کاڵانەی

زانکۆ ناسـووتێت، ئـەوان لـە توخمێـک و ئێمـەش لـە توخمێکـی تریـن، بـەڵام وامەزانـە کـە مـن و تـۆ لەنـاو چەقـاڵ و بەقاڵـی بـازاڕدا خۆمـان بـە شـت دەزانیـن، خەڵکـی تریـش هەمـان حیسـابمان بۆدەکـەن. ئێسـتا وەک بیسـت سـاڵ لەمەوبـەر نییـە، ئەوانـە گـەر لـەڕووش قسـەنەکەن، لـە ژێـرەوە وەک حەیـوان، وەک مەیمـون سـەیری مـن و تـۆ دەکـەن، شـارەکە پڕبـووە لـە خەڵکـی خوێنـدەوار کـە ئێمەیـان لـە حوشـتری عەمامـە بەسـەر لا سـەیرترە... بـەڵام گـەر ئـەو کوڕەی ئیبراهیـم ئەسـرین نەمرێـت لەوانەیـە شـتەکە ڕاسـتبکەینەوە».

کامەرانـی سـەلما دۆڵانـی، هەمیشـە دوای ئەمجـۆرە پێکدادانـە خوێناویانـە پەشـیمان و غەمگیـن دیاربـوو. مەنگـوڕی بابەگـەورە لـە حاڵەتـی کوڕەکـە تێدەگەیشـت، پێیگـووت «لەبەرئـەوەی تـۆ کەسـێکی باشـیت وەهـا غەمگیـن دەبیـت، مـن تاقیمکردۆتـەوە، مرۆڤـی بـاش دوای شـەڕ غەمگیـن دەبـن، بەڕەحمـەت بـن کاروانـی دایـی و عولـەی مـام غەنیـش وابـوون، دوای چەقۆوەشـاندن هەرچییـەک بایـە غەمگیـن دەبـوون، هـەزار ڕەحمـەت لـە قەبریـان هەردووکیـان دڵێکیـان هەبـوو لـە وێنـەی نەبـوو... بـەڵام باوکـم ڕۆ... ئـەوەی چەقـۆ لـە سـنگی چـەپ بدەیـت... شـێتیش شـتی وا نـاکات، هەتـا شـینەی پورخەنانیـش کـە شـێتترین چەقۆکێشـە لـە مێـژووی ئـەم شـارەدا شـتی وای نەدەکـرد... خـوای گـەورە، تـۆ شـەڕکردن لـە کـوێ فێربوویـت؟». پرسـیارەکەی بێمانابـوو، کامەرانـی سـەلما شـەڕ لـە کەسـەوە فێرنەبوویـوو، تـا ئێسـتا چـوار کەسـی بریندارکردبـوو، بێئـەوەی خـۆی چەقۆیەکـی بەربکەوێـت. سـەرەتا لەگـەڵ دوو هاوڕێیـدا قوتابییەکـی پەیمانگای مامۆسـتایانیان بریندارکـرد، کـە لەسـەر بەشـە میـرات لەگـەڵ بـرا گەورەکەیـدا کەوتبـووە کێشـەوە و ئـەو ڕایسـپاردبوون تەمێبکـەن، دواتـر لـە بـەر دڵـی قوتابییەکـی ئامادەیـی پیشەسـازی کـە دوور بـەدوور دەیناسـی، چەقـۆی لـە مامۆسـتایەکی بەشـی میکانیـک دابـوو، دواجاریـش شـەوێک کـە لـە ژێـر

زەمینەکەی «ئوتێلی باوەجان» هاتبووەدەری، لەگەڵ «ئەکەی گوڵناز» و دوو چەکلی دۆستیدا بووبوو بە شەڕی، کە کوڕەکە بە لوسکەیەکی بێغیرەت تێگەیشتبوون و ویستبوویان ئەو شەوە چی لە قوماردا بردۆتەوە لێیبسەنن. ئەوە یەکەم شەڕی ڕاستەقینەبوو کامەرانی سەلما دۆڵانی تێوەبگلێت و مەنگوڕ لە نزیکەوە بیبینێت. ئەو شەوە بە ڕاستی تێگەیشت کە ئەم کوڕە بەهرەیەکی گەورەیە، شێوەی شەڕکردن و پەلاماردانی «یوسف کەویار»ی هێنایەوە یاد، بەناوبانگترین چەقۆکێشی شەستەکان، کە لە ساڵی حەفتاوچواردا لە بۆردومانێکی فڕۆکە دەوڵەتییەکاندا لە ناوچەی پشدەر تیاچوو. ئەو نزیکی و لێکچوونە هۆیەکی گەورەی ئەو مەحەبەتە بوو کە مەنگوڕی بەرەو ئەو گەنجە کێشکرد. مەنگوڕ ئەو شەوە گوتی «من لە ڕاستیدا نازانم تۆ چەند ئەم سەوسەن فیکرەتەت خۆشدەوێت... نازانم. ئەوەندە هەیە هەستدەکەم لەو کاتەوەی بیستووتە کەسێکی تر هەیە حەزی لە کیژەکەیە ئاوا گڕتگرتووە. من پیاوێکی شارەزا نیم لە خۆشەویستیدا، بەڵام وائێدەکەم ئەمجۆرە گڕگرتنانە زۆر پەیوەندیان بە عەشقەوە نەبێت. ڕاستت دەوێت، من زەمانێکی زۆرە چاو دەگێڕم و لەم شارەدا عاشقی ڕاستەقینە نابینم، سی ساڵە ئەم شارە عاشقی ڕاستەقینەی تیا دروست نەبووە، دوای خوالێخۆشبوو «ئەنوەر زیواڵ» شتێکی تری وەک ئەو پەیدا نەبۆتەوە... ئەو گەورەترین عاشق بوو من بینیبێتم، دوای ئەو درۆیە، عاشقی ترم نەدیوە... ئەویش لەوانە بوو کە بۆ یار تک تک فرمێسک لە قوونی دەهات... خوێن بۆ حەبیبە دادەنیشت. حەزی لە ڕەخشەی کچی عاسم ئاغا کردبوو، کچەکە بە گاڵتەوە پێیگووت دەبێت پێنج ساڵ لە بەر قاپی ماڵەکەماندا وەک سەگ دانیشێت و نەجوڵێت، تێدەگەیت، پێنج ساڵ هەڵترۆشکێن، ئینجا شووی پێدەکەم... ڕەخشە خۆی بە کچە ئاغا دەزانی، لای وابوو هەموو دەڤەری شاربازێڕ موڵکی باوانێتی. ئەنوەر زیواڵ فەرمانبەرێکی

داماوبـوو لـە مەلاریـا... لەوانـەی بـۆ ڕژانـی دەرمانـی مێشـووله، دێ بـە دێ دەگـەڕان... لـە یەکێـک لـە سـەفەرەکانیدا ڕەخشـە دەبینێـت و شـێتی دەبێـت... تێدەگەیـت... مـن منـداڵ بـووم، تەمەنـم چـوارده سـاڵ بـوو کـە بینیـم، لەیەکـەم نیـگاوه تێگەیشـتم چـۆن عەشـق کردویتـی بـە زوخـاڵ... پێنـج سـاڵ لەبـەردەم ماڵـی ڕەخشـەدا کـەوت، خەڵـک و خـوا کەپریـان بـۆ دروسـتکرد، نانیـان بۆدەبـرد، جلیـان بـۆ دەهێنـا. هەمـوو دونیـا هەوڵیـدا پەشـیمانیبکاتەوه، بـەڵام ئیشـەکەی خـۆی لـە مەلاریـا جێهێشـت و لەبـەر قاپـی ئافرەتەکـەدا وەکـو سـەگ کـەوت... ئـەوه عاشـق بـوو... سـێ مانـگ بەرلـەوەی پێنـج سـاڵەکە تەواوبـکات، شـەوێکی بەفرویـاران لـە بـەر قاپـی ژنەکـەدا ڕەقبـووەوه، کـەس بـە فریـای نەکەوتبـوو... تـا عاشـقی وانـوزه درێـژ لـەم دەوروعەیامـەدا نییـە».

کامەرانـی سـەلما بـە غەمـەوه گووتـی «ئەگـەر سەوسـەن فیکرەت داوام لێبـکات، پێنـج سـاڵ لـە بـەر دەرگای ماڵیانـدا بوەسـتم... دەتوانم بوەسـتم».

لـە ڕاسـتیدا مەنگـوڕ هـەر لەسـەرەتاوه دەرهـەق بـە حیکایەتەکـەی کامـەران دوودڵ بـوو، هەسـتیدەکرد کـۆی حەزەکـە ئومێدێکـی ئەوتـۆی لێناکرێـت. بـەڵام هیـوای وابـوو بتوانێـت کار لـە فیکرەت گوڵدانچی بـکات، بـە جۆرێکـی ئاسـایی و بێبـەزم و ڕەزمـی خۆشەویسـتی کیژەکـە بـە مێـرد بـدات. بـە کامەرانـی گـووت « ڕاوکـەری بـاش گوللـەو باروتـی خـۆی لەمـلاولا سـەرف نـاکات، تـۆ لـەو توخمـە نیـت بتوانیـت کچەکـە لـە کـۆڵان و پەناپاسـاردا بگرێـت تـا نامـەی بدەیتـێ یـان قسـەی لەگەڵـدا بکەیـت... ئـەم چەقۆبازییـەت لەبـەر ئەوەیـە ناتوانیـت لـە کچەکـە نزیـک ببیتـەوه. مـن خـۆم لـە ژیانمـدا بەوجـۆره عاشـق نەبـووم چەقـۆی بـۆ هەڵگـرم، بـەڵام هەمـوو چەقۆوەشـێنە بەناوبانگەکانـی ئـەم شـارەم ناسـیوه، هەمـوو لەبـەردەم ئافرەتـدا ترسـنۆک بـوون... هـەر کچێکـی دەیتوانـی بـە یـەک شـیره هەموویـان بکاتـە کونـەوه، دەیتوانـی وایـان لێبـکات شـەڕواڵەکانیان پڕبکـەن لـە میـز. مـن خـۆم یوسـف

کەویاری گەورەم بینیوە، لەگەڵیدا ژیاوم، دەزانم چەند شەرمی لە ژنان دەکرد... تۆ یوسف کەویارت نەدیبوو، لەبەرئەوە نازانیت چ بەهرەیەک بوو، چ ئازاییەکی خواکرد بوو. بەڵام ئێمە پیاوانی ئەم شارە کە لەم کوچە و کۆڵانە تەسک و تروسکانەدا لەدایک دەبین، ئەو گێرەمان تیادەردەهێنن بتوانین لەگەڵ ژندا قسەبکەین... من دەزانم تۆش دەردی هەموو چەقۆکێشە بەناوبانگەکانت هەیە، نەخۆشییەکەی تۆ دەردێکە لە زەمانی سورەی مەرجان خان و ئیدەی سەی گوڵ و فارسی مەجید پەشمەکەوە لەناو چەقۆکێشاندا بڵاوبۆتەوە، لە چل و پەنجاکاندا ئەم شارە زەلالەتی بوو بە دەست ئەوانەوە، بەڵام هەموویان دایکیان ژنی بۆ هێنان، چونکە کەسیان غیرەتی ئەوەیان نەبوو قسە لەگەڵ ژنێکدا بکەن. لەوە دەچێت عیللەتێک بێت پەیوەندی بە ئاو و هەوای شارەکەوە هەبێت».

تاکە ئومێدی کامەرانی سەلما ئەوەبوو فیکرەت گوڵدانچی و کچەکەی بە خوازبێنییەکی ڕەسمی ڕەزامەندبن. ئەو شەوە مەنگوڕ گووتی «باشترە سەوسەن و باوکی بە بەسەرهاتی ئەمشەو بزانن... ئێستە کاتی ئەوەیە کچەکە تێبگات کەسێک هەیە لە پێناوی ئەودا خوێن لە قوونی خەڵک دەهێنێت... بەوەدا تۆ نازانیت کاغەزی دڵداری بنوسیت، ئەوەی ئەمشەو دەبێت بە جۆرێک لە کاغەز، کچەکە ئەگەر وریابێت دەتوانێت شتەکە بخوێنێتەوە... بەڵام گرێ کوێرەکە ئەوەیە نازانین ئاخۆ لە بەغدا خەڵک چۆن دڵداری دەکەن... من یەکێک دەناسم دەڵێن لە بەغدا دڵداری زۆر کردوە، مامۆستای عەرەبییە، هەموو شتێک لەو وەردەگرم و گەر زانیم شتەکە ئابڕوچوونی تێدا نییە، بە ئیشی پیاوی بێحەیا دەرناچێت، سبەی شەو خۆم دەچم بۆ لای گوڵدانچی».

بۆ ڕۆژی دوایی مەنگوڕی بابەگەورە ئەو مامۆستایەی دۆزییەوە کە لە چایخانەی گوڵبەهار، بەردەوام بە دەنگی بەرز باسی دڵداری و

سەرکێشـییە گەورەکانی خـۆی لەگـەڵ ژنانـی پایتەختـدا دەکـرد؛ پیاوێکـی سـمێڵ باریکـی باڵابەرزبـوو، کـە بـەردەوام بـە چاکەتێکـی خۆڵەمێشـی و هێلەکێکـی ڕەشـەوە لـە ئێوارانـدا دەردەکـەوت. ئـەو تـەواوی بەغـدای وەک جێگایـەک وێنادەکرد کە کوچەیەکی تیا نییە پیاوی تیا نائومێد بێت... کابـرا شـارەزایەکی گـەورەی سـوچ و کەلەبـەرە شـەهوەتییەکانی پایتەخـت بـوو، گەرچـی زۆر کـەس بـە قەپۆزێکـی زۆر بلـێ و درۆزنیـان دەزانـی، بـەڵام تائـەوکات ئەدرێسـێکی نەدابـوو درۆ دەرچێـت، مامۆسـتا لـە ماوەیەکـی کەمـدا وەک شـارەزاترین سۆزانیناسـی پایتەخـت لـە شـاردا ناوبانگـی دەرکردبـوو. خەڵـک لـە کاتـی سـەفەری بەغدادا مشـورەت و ئامۆژگارییـان لێوەردەگـرت . کـە گوێـی لـە چیرۆکەکـەی «مەنگـوڕی بابەگـەورە» و حیکایەتـی قوتابییـە بریندارەکـەی زانکـۆ گـرت، بـە دەنگـە گەورەکـەی گووتـی «هێـی بابەگـەورە گوێبگـرە، فیکـرەت ئیحسـان گوڵدانچـی یەکێـک بـوو لـە پیـاوە عاقڵەکانـی پایتەخـت... گـەر شـتەکانیش قەبـووڵ نـەکات، وەک ئەم بەرازجنسـانەی ئێرە نایـکات بـە گوڵمـەز و تـەپ و تـۆز... بـڕۆ لەسـەر مـن، دەزانـم بـە دەسـتی بەتـاڵ و پاشـەڵی پیسـەوە نایەیتـەوە... بـەڵام تـۆزێ عەقـڵ و هۆشـی زیاتـر لەگـەڵ خۆتـدا بـەرە... تـۆزێ عەقـڵ و هۆشـی زیاتـر». قسـەکانی مامۆسـتا تینێکیـان دایـە مەنگـوڕی بابەگـەورە بـە شـتێک لـە بـڕواوە بچێـت بـۆ ماڵـی فیکـرەت گوڵدانچـی.

## ٨

لە بەیانی ڕۆژی دووەمدا خالید ئاموون، بێئەوەی دوکانەکەی بکاتەوە چوو بۆ چایخانەی «پەپولەی ئازاد». دوێنێ ئێوارە کامەرانی سەلما لەوێ بینرابوو. بیریکردەوە کە دەبێت کابرا چ چاونەترسێک بێت، دوای ئەو بەزمە وا ئاشکرا خۆی دەربخات... چ بێسڵ و دەستوەشێنێکی بێڕەحم بێت؟ کوڕەکە بە ئاشکرا دوژمنێکە دەبێت ئاموون حیسابی تایبەتی بۆ بکات، هەستیکرد ئەم کامەرانی سەلمایە دەبێت لە جنسی ئەو پیاوانە بێت کە تا دەکەون مل ناگێڕنە دواوە، ئەگینا چ مانایەکی هەیە، بە مەبەستی کوشتن کەسێک برینداربکەیت و دواتر بێترس و بێحیساب دەربکەویت و سڵ لە هیچ دەرەنجامێک نەکەیتەوە. هەر ئەوەی بە مەبەستی کوشتن چەقۆی لە سنگی چەپی مەنسور ئیبراهیم دابوو، نیشانەی ئەوەبوو کە دوژمنێکی ترسناکە و دەتوانێت هەر کەس بکوژێت... شەو کە هەواڵی پێگەیشت کامەرانی سەلما لە چایخانەی پەپولەی ئازاد بینراوە و چای خواردۆتەوە و باسی ئەوەی کردوە کە هیچ کەس جگە لەو نابێت بە مێردی خاتوونی سەوسەن فیکرەت، خولیایەکی گەورەی تێدا دروست بوو، بیبینێت.

چایخانەی پەپولەی ئازاد لەسەرەتای حەفتاکاندا جێگای کۆبوونەوەی شاعیرانی ناکام بوو، هەموو دەهاتن لەوێ بەدەم گوێگرتن لە کاسێتی گۆرانیبێژە کلاسیکییەکانەوە لە ئاهـ و سکاڵای ناو شیعردا نوقم دەبوون

و حیکایەتی ئازارەکانی خۆیان دەگێڕایەوە و لە خواردنەوەی چای ڕەش و دوکەڵی جگەرەدا خۆیان دەخنکاند، بەڵام لەسەرەتای هەشتاکانەوە ڕوخساری شوێنەکە زۆر گۆڕا، بوو بە شوێنی کۆبوونەوەی چەند گروپێکی جیاواز لە خەڵک، وەک وەستایانی کاشی، شۆفێری پاسە نەفەربەرەکان، هەندێ مامۆستای خانەنشین، چەند دەلاڵێکی خانوو کە نوسینگەی خۆیان نەبوو و لەوێ کاروباری کڕین و فرۆشتنیان جێبەجێدەکرد، جگە لە پێڕێک لە ترسناکترین چەقۆوەشێنەکانی شار. کامەران یەکێک بوو لەوانەی زۆربەی کاتەکانی لەو چایخانەیەدا دەبردەسەر. کوڕەکە بێئیشێکی ئەبەدی بوو، لە زەمانێکەوە کە لە قوتابخانەی سەرەتایی هەڵهاتبوو، ڕۆژێک نەچووبووە ژێر باری کارێکەوە، خێزانەکەشیان وەها دەوڵەمەند نەبوو بتوانن بەجۆرێک دەستی بگرن هەژاری پێوەدەرنەکەوێت، بەڵام بەختێکی بێوێنەی لە قوماردا هەبوو، کە زۆر شەو سەرسەختترین قومارچییەکان لە ئاستیدا دەستەوەستان دەمانەوە.

خالید ئاموون کە چووە چایخانەکەوە، بۆنی چایەکی زۆر کوڵاو و هالاوی ساردی هەندێک قاڵبی سەهۆڵ کە یەکێک لەسەر تەختێکی گەورە دەیشکاندن چوو بە ڕوویدا. چایخانەیەکی گەورە و پاکوتەمیز دیاربوو، گەرچی زۆر قەرەباڵغ بوو بەڵام شوێنەکەی کەمێک بێدەنگ هاتە بەرچاو. دوای سەعاتێک دانیشتن توانی کامەرانی سەلما لە نێوان چاخۆرەکاندا بناسێتەوە. گەنجێکی ئێجگار جوان بوو، بە قژێکی خاوی قەترانی و سمێڵ و ڕیشێکی قەڵەمی ڕەشەوە، پێستێکی شەرابی و جووتێک چاوی قەشەنگ. بێئارامی و توڕەیی و نادڵنیاییەکی زۆر لە دیمەنیدا دەبینرا. لە دڵی خۆیدا گووتی «دەبێت ئەمە چی بێت... تۆ بڵێی لە سوپا هەڵنەهاتبێت؟ دەبێت ڕاکردووی جەنگ نەبێت؟». ئەو بیرۆکەیەی کە دەشێت لە جەنگ هەڵهاتبێت و بتوانێت بەجۆرێک لە جۆرەکان بەگرتنی بدات، کەمێک ئارامیکردەوە. بەڵام خالید ئاموون خۆشی لە سوپا

هەڵهاتبوو، بەوە دەژیا کە دەفتەری خزمەتکردنی سوپای بەپارەیەکی زۆر لە خانەی سەربازگری گشتییەوە بەساختە مۆرکردبوو، بەجۆرێک کەس نەیدەزانی هەڵهاتووی جەنگە، بەڵام گەر بگیرێت و یەکێک بە تەواوەتی بچێتە بنج و بناوانی چیرۆکەکەی ئەوسا تووشی بەڵایەکی گەورە دەبێت. کامەرانی سەلما بێباک چای دەخواردەوە و تاوڵەیدەکرد، بەجۆرێک لە یارییەکەدا نوقم بوو، هەستی بە چاوی خالید ئاموون نەدەکرد کە بەو چەشنە ورد سەرتاپای دەپشکنی. خالید ئاموون ئێستا هەستیدەکرد لەبەردەم ئەم دوو گەنجەدا شانسێکی ئەوتۆی نییە، هەردووکیان لەم شۆختر و سەرنج ڕاکێشترن، ڕاستە هیچیان بە ئەندازەی ئەم لەگەڵ ئافرەتدا نەخەوتوون، بەڵام دڵنیابوو ئەو ژنانەی دێنە کۆگاکەی ئەم لەو ژنانە نیین کە مرۆڤ عاشقیان بێت یان ئەوان عاشقی کەس بن، سروشتی یاریکردن لەگەڵ ژنانی کۆگاکەدا شتێکی ترە، بەڵام سەوسەن فیکرەت لەو کچانەیە کە مرۆڤ یان دەبێت شێتانە عاشقی بێت یاخود دەستی لێهەڵگرێت و لە بیرخۆی بەرێتەوە. بیری لەوەکردەوە کە ئەگەر سەوسەن فیکرەت تەواوی ڕووداوەکە ببیستێت، دەشێت چۆن بیر لەم کامەرانی سەلمایە بکاتەوە، هەوڵیدا دەموچاوی سەوسەن لەجۆرە ساتێکی وەهادا بهێنێتەوە پێشچاوی خۆی، بەڵام نەیتوانی. کە لە کاتی تاوڵەکردن و چاخواردنەوەدا بەوردی لێیڕاما، کوڕەکە بێئەندازە جوان بوو، شتێک لە کێوێتی و ڕامنەکراوی تێدایە کە هەر ئافرەتێک لە ڕیشەوە دەهەژێنێت، لەگەڵ مەنسور ئەسریندا نمونەیەکی تەواو جیاوازە. ئەسرین کوڕێکی ناسکی شارییە، کە شتێکی زۆر لە ڕۆمانسییەتی تێدایە، چاوانی خۆشەویستی لێدەتکێت، باریکی و غەمزکییەکەی، باریکی و غەمزکی عاشقە بەستەزمانەکانە؛ بەڵام کامەرانی سەلما بەهەمان پلە بەزەیی و ڕەحمی مرۆڤ ناجوڵێنێت، لە جانەوەرێکی دڕ دەچێت، بەڵام جانەوەرێکی قەشەنگ، جانەوەرێک پاڵ بە ئافرەتەوە دەنێت بچێتە ناو گرەوی

ڕامکردن و دەستەمۆکردنییەوە یاخود بچێتە سەر خولیای خۆشاردنەوە لە ژێربالّی و دالّدە وەرگرتن لە ئامێزیدا. بەلاّم ئەی ئەم چییە؟ خالید ئامۆون چییە؟. دلّنیابوو لە ڕوخساریدا سیحرێکی وەها دلّڕفێنی نییە بیکاتە کەسێک کچەکە بەچاو نوقانەوە شووی پێبکات، هێند هەیە لە هەردووکیان دەولّەمەندترە، لە هەردووکیان باشتر دەتوانێت خەونەکانی کچە بهێنێتەدی، چاوانیشی نهێنییەکی تێدایە کە ژنان حەزی پێدەکەن، بێدەنگتر و ئالّۆزترە، جگە لەوەی پاشەڕۆژی لە هەردووکیان مسۆگەرتر و مالّی لە هەردووکیان ئارامترە. کێ چووزانێت، کێ دەلّێت کیژەکە لەو توخمە نییە کە حەزی بەجۆرە ژیانێکی بێدەردەسەرییە، لەگەلّ مێردێکی گەنج و پارەداردا، کێ دەلّێت ڕاستەوخۆ ئەم هەلّنابژێرێت. دواتەوە ئەم دەتوانێت بەدرۆش بیسەلمێنێت کە لەسوپا ئازادکراوە و دەردی سەربازی بەدواوە نییە، ئەوە یەکێکە لە هەرە خالّە گرنگەکانی هاوسەرگیری لەمڕۆدا... بەلاّم لە ناخی دلّەوە دەیزانی گەر کیژەکە لە ڕۆحیشیدا وەک ڕوخساری دەرەوەی ڕۆمانسی بێت، ئەوا ژیانی لەتەک ئەمدا سارد و مردوو دەنوێنێت... کچ هەیە بۆ ئەوەی یەک سەعاتی ڕۆمانسیانە بژی، هەموو ژیانی خۆی دەکات بە قوربانی. بەلاّم ئێستا هەستیدەکرد مەترسی هەرە گەورەی پێشدەمی ئەو کامەرانی سەلمایە. گەر سەوسەن فیکرەتیش ڕازی بێت شووی پێبکات، شتەکان بێدەردەسەرییەکی گەورە تێناپەڕن. بەلاّم لە دلّی خۆیدا سوێندی خوارد کە ئاسان سەوسەن فیکرەت نەدات بە دەستەوە.

لە تەنیشتییەوە گەچکارێکی پیر ماستاوی دەخواردەوە و باسی نرخی وەستای گەچکاری لە شارەکانی تردا دەکرد. خالید ئامۆون بێئەوەی زۆر خەیالّی لای فەزا و قسەکانی ناو چایخانەکە بێت، بیری لە ڕێگایەک دەکردەوە ئەم کوڕە لە پێشدەم خۆی لادات و لە سەوسەنی دووربخاتەوە. کوڕەکە قەد و بالاّیەکی بێوێنەی هەبوو، پتەوییەکی گەورەی ماسولکە و

ئەستوورییەکی سەرنجڕاکێشی مل و ناوشان، بە جۆرێک خالید ئاموون لە بەردەمیدا ڕیوەڵە و بێجورم دەینواند. ئێستا کە سەیریدەکرد دڵنیابوو لەبەردەمیدا هیچ شانسێکی نییە. هەستیکرد ئەمڕۆ ڕۆژێکی ڕەشە لە ژیانیدا، لە دڵی خۆیدا گووتی «ئاخۆ دەبێت سەوسەن فیکرەت عاشقی تریشی هەبێت؟». بەڵام بەر لەوەی کەس هەستی پێبکات دەبایە هەستێت و چایخانەکە بەجێبهێڵێت. بۆ یەکەمجار لە بەردەم ئەو چایخانەیەدا بیری لە کوشتنی کامەرانی سەلما کردەوە.

# ٩

پڕوشە لە پرسەی مێردە گەنجەکەیدا تووشی هەرەسێکی دەروونی قورس هات و وای لێهات فێی توند و چەند نۆبەتێکی هیستیریی بیگرێت. دوای تەواوبوونی پرسەکە، پڕوشە بەتەواوەتی گەڕایەوە بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی، بەڵام هێند غەمگین و تەنیا و لاوازبوو شتێکی لەو پڕوشە قەشەنگەی جاران نەدەچوو کە ساڵێک لەوەوبەر لە زەماوەندەکەیدا نیوەی پایتەختی سەرسامکردبوو، کە لەگەڵ فیکرەتی باوکیدا لە تاکسییەک لەبەردەم دەرگای ماڵی خۆیاندا وەستا و سەوسەن ڕایکرد بۆ ئەوەی جانتا و کەلوپەلەکانیان لێوەربگرێت، پڕوشەی وەک مەخلوقێکی غەریب هاتە بەرچاو کە جێگای بەزەییەکی زۆرە، بەڵام ئەوە ڕێگای ئەوەی لێنەگرت بەو خوشکە بریندارەی بڵێت، کوژرانی مێردە گەنجەکەی بەهۆی خۆشەویستی ئەوەوە بووە، لەبەرئەوە دەبێت تا ماوە دڵسۆزی یادگارییەکانی بێت و لەوەفادا شوو بە کەسێکی دیکە نەکات. ئەگەرچی قسەکانی سەوسەن بڕێک لە ڕاستیان تێدابوو، بەڵام فیکرەت گوڵدانچی، سەوسەنی بێبەزەیی و دڵڕەق هاتە بەرچاو. فیکرەت ویستی کەمێک لەگەڵ کچە بچوکەکەیدا قسەبکات، تا بەوجۆرە بەرابەر خوشکەکەی دڵڕەق نەبێت، بەڵام خانم بەجۆرێک لە بێباکییەوە گوتی « کچ کە عاشق بوو، دەبێت تا کۆتایی لەگەڵیدا بڕوات، تاکۆتایی». ئەمشێوە بیرکردنەوەیەی سەوسەن، باوکی لە دڵەوە زۆر ترسان. سەوسەن لەو

ساڵە گەرمانەی هەرزەکاریدا، لەگەڵ هەموو ناسکی و جوانیدا، نەخۆشی و لاوازیی و سەرئێشەی هەمیشەیی وازیان لێنەدەهێنا، زۆربەی کاتەکان تەنها و غەمگین دیاربوو، بەردەوام بە تراکسوتێکی پەمەییەوە یان لە ژوورەکەی خۆیدا یان لە کتێبخانە گەورەکەی باوکیدا خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو، خولیایەکی سەیری هەبوو لەسەر باڵندە و گوڵ و ئاسەوارە گەورە و کۆنەکانی دونیا شت بخوێنێتەوە، زانیارییەکانی لە هەندێک بواردا گەیشتبووە ئاستی زۆر بڵند. بەدەگمەن نەبێت گوێی لە گۆرانی نەدەگرت، شەوانیش تەنیا ئەو کاتانە سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد کە لاشەی کوژراوەکانی جەنگی پیشاندەدا. کیژەکە لەگەڵێک شتدا بێبەزەیی دەردەکەوت، لەزەتێکی شاردراوەشی لەوە دەبینی ئازاری خوشکەکەی بدات. لەگەڵ نەخۆشییە نادیارەکانیشدا، عەزیمەت و ئیرادەیەکی گەورەی هەبوو. کچێک بوو لەوانەی ئاسان رای خۆیان دروستدەکەن، بەڵام زۆر بە زەحمەت دەیگۆڕن. ئەو هێز و ڕەقێتییە گەورەیەی لەگەڵ ئەو ڕوخسارە منداڵانە و ناسکەیدا نەدەگونجا، گەرچی هەردەم نەخۆش دیاربوو، بەڵام شتێک لە هێزی تێدابوو کە بۆ خانمێکی ناسک و منداڵکاری وەک ئەو نائاسایی و ترسناک دەردەکەوت. ڕوخساری لە فریشتەیەکی نەخۆش دەچوو، قژێکی زەردی کورت، دەموچاوێکی وردیلانە، دوو چاوی گەشی بێئەندازە کاڵ، بەڵام ڕەنگێکی سپی و هەڵبزرکاو. ئەو ڕەنگ پەڕین و لاوازییەی بەدیمەنییەوە بوو لە جوانی و سیحریان زیادکردبوو، هەر کەس دەیبینی وایدەزانی ئاووهەوای گەرم و خنکێنەری ئەم شارە گەورەیەی پێناکەوێت. جارێکیان کە نزاری برای بە مۆڵەت لە بەرەکانی جەنگەوە گەڕایەوە و خوشکە ئازیزەکەی خۆی لە کاتی ئاودانی گوڵەکاندا لە چیمەنەکەدا بینی، سەرنجیدا کە کیژە منداڵەکەی دوێنێ هێدی هێدی خەریکە گەورەدەبێت و مەخلوقێکی زۆر جوانی لێدەردەچێت. بە باوکی گووت دەبێت زۆر ئاگاداری ئەم کچەبێت،

ئەمجۆرە جوانییە خەڵکێکی زۆر بەدبەختدەکات. فیکرەت گوڵدانچی سەرنجی ئەوەی دا کە نزار بایەخێکی گەورە بە سەوسەن دەدات. نزار هەندێک ئێوارە لە ژووری دانیشتنەکەدا، یان لە چیمەنەکەدا، یاخود لە باڵکۆنی دیوی ئەو دیوی قاتی سەرەوەدا، باسی جەنگ و ژیانی ناو سەنگەرەکان و شەوانی پەلامار و دیمەنی کوژراو و دیلەکانی بۆ سەوسەن دەکرد. شتێک سەوسەن تێینەدەگەیشت ئەوەبوو نزاری برای بۆ لەو جەهەنەمە هەڵنایەت. چیرۆکی خۆشەویستی و ئەو شتانەی بە درۆیەکی گەورە دەزانی، کیژەکە سووک و ئاسان باوەڕی بە خۆشەویستی نەبوو. ڕۆژێک سەوسەن، نزاری داوەتکردە ناو کتێبخانەکەوە و هەوڵیدا لە ڕێگای وێنە و نەخشە و زانیارییە جوگرافییەکانەوە براکەی تێبگەیێنێت کە دونیا چەند گەورەیە و زەوی چەندە بەرینە، بەجۆرێک مرۆڤ پێویست ناکات وا هەستبکات دیلی جێگایەکە. جیهان لای سەوسەن بەجۆرێک گەورە و کراوە بوو مرۆڤ خۆی نەبێت هیچ بەربەستێک نەیدەتوانی ڕێگای لێبگرێت. لە ڕێگای نەخشە و کتێب و ڕێنما گەورەکانی ناو کتێبخانەکەوە هەوڵیدا نزار تێبگەیێنێت کە دەتوانێت لە بری ئەوەی بۆ جوانی کچێک خۆی بە کوشت بدات لە سیحری گەورەی ئەم دونیایەدا خۆی ونبکات، کتێبی گەورەی ماسییە ناوازەکانی پیشاندا، کتێبی شوێنەوارە گەورەکانی سەر زەمین، کتێبی نهێنییە سەیرەکانی جیهان، کتێبی تایبەت بە ئەتیلیەی نیگارکێشە بەناوبانگەکانی دونیا، جلدێکی مەزنی هەزار لاپەڕەیی دەربارەی پەیکەرە ناوازە و کۆنەکان، بەندێکی لە چەرمگیراوی تایبەت بە ئاسەواری شارە نغرۆ و ڕووخاوەکان و دەیان شتی دیکە کە بێسنووری جیهان و زەمان نیشاندەدەنەوە. ئەوەی سەوسەن فیکرەتی سەرسامدەکرد گەورەیی جیهان بوو، کچەکە ئاشکرا مرۆڤی وەک شتێکی بچوک دەبینی کە دەتوانێت ئاسان خۆی لەم دارستانە مەزنەدا بشارێتەوە. گاڵتەی بەوە دەهات کە براکەی لە پێناوی

خۆشەویستی ژنێکدا دونیای وەها لە پێشچاو بچوکبۆتەوە. ڕێنماییەکانی سەوسەنی منداڵ سوودی نەبوو، نزار بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ جەنگ، بە خوشکەکەی گووت «سەوسەن ڕاستییەک هەیە بیرت نەچێت، سیحری مرۆڤ، لە سیحریَ هەموو گەردون گەورەترە».

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ دا نزار کوژرا و لە تابووتێکی داپۆشراو بە ئاڵای عێراقدا مەیتەکەی گەیشتەوە بەردەرگای ماڵی گوڵدانچی، کارەساتی کوژرانەکە لە خێزانی گوڵدانچیدا ژیانی سەر لەبەر هەڵگێڕایەوە. دوای مانگێک بەسەر پرسەکەدا گوڵدانچی هەستیکرد لەم شارە گەورەیەی بەغدادا، هیچ شتێکی نییە بۆی بژی و کچەکانیشی هیچیان نییە بیانبەستێتەوە، ئەوکات کۆی خێزانەکە بە برین و کۆستێکی گەورەوە بڕیاریاندا بگەڕێنەوە بۆ باکوور. تەنیا شتێک بیتوانیبایە ئازاری کوژرانی کوڕەکە لای فیکرەت هێوربکاتەوە گەڕانەوەبوو بۆ لای برا و خوشکەکانی، بۆ بێشکەی دێرینی منداڵی و گۆڕەپانی کۆنی گەنجی... لە هەفتەی یەکەمەوە فیکرەت گوڵدانچی ئاسوودەیی و هێمنییەکی ڕۆحی تێگەڕایەوە، پڕوشەی کچیشی بەو دونیا نوێ و خزمە دڵگەرمانە دڵخۆشبوو. خزمەکانیان بەجۆرێک پشتیان گرتن و لە دەوریان کۆبوونەوە، کاتێکیان بۆ تەنهایی و حەسرەت و غەمخواردن نەما، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو کۆمەک و هاوکارییەدا سەوسەن دوای هەفتەیەک هەستیکرد ئەم شارە تاراوگەیەکی گەورەیە، شارێکە لە ناو ڕەشەبا و گەرما و تەپوتۆزی خۆیدا نوقمبووە و دوور لە هەموو دونیا لە شوێنێکی چەپەک و لاتەریکدا بیرچۆتەوە، هەر لە هەفتەی یەکەمەوە تێگەیشت کە تا کۆتایی لەم شارەدا وەک یەکێک دەژی بەرەو دەرەوەی ژیان دوورخرابێتەوە.

## ١٠

فیکرەت گوڵدانچی مەنگوڕی بابەگەورەی وەک شتێکی ترسناک هاتە پێش چاو کە هەوڵێکی زۆر دەدات دیوە ڕاستەقینەکەی خۆی و دەموچاوە زێرەکییەکەی نەبینرێت، شتێک لە فێڵ لە سەیرکردنی مەنگوڕدا هەبوو نەدەشاردرایەوە، فیکرەت لە ژیانی دوور و درێژیدا ئەم نیگاکردن و قسەکردنەی لە بەرپرسە دەوڵەتییەکان زۆر بینیبوو، کە زۆربەیان کەسانی لەجۆری مەنگوڕبوون و فێری هەندێک ئەتەکێتی تایبەتی بووبوون، بەڵام هەستیکرد مەنگوڕ خۆی زۆر ئەزیەت دەدات تا باش دەربکەوێت. کە دوای زەحمەتێکی زۆر تێگەیشت ئەم پیاوە هاتووە گفتێکی سەرەتایی دەربارەی شووکردنی کچەکەی وەربگرێت، کەمێک پەشۆکا، وەخت بوو تورەبوونێکی کتوپڕ و ناوەخت بیگرێت، بەڵام وەک پیاوێکی سەبوور پێکەنی و بە کەمێک شەرمەوە پەنجەی ڕاوەشاند و بەدەنگێک کە لەرەی خەجاڵەتییەکی تێدابوو گووتی «دەمەوێت ئەم کامەرانی سەلمایە ببینم... دەمەوێت ببینم، تا نەیبینم هیچ شتێک ناڵێم... ها من دەبێت ببینم... ئینجا گیانی من...... ئینجا قسەدەکەین.. شێر لە بێشەدا ناکرم» . مەنگوڕی بابەگەورە دڵنیابوو فزولێکی زۆری لای خاوەن ماڵەکە بۆ بینینی کامەرانی سەلما چاندوە، ئەوە زۆر دڵخۆشیکرد. بەڵام ئاشکرا فیکرەت بەختەوەر نەبوو ئاسکترین کچی خۆی لە ڕێگای کەسێکی وەهاوە بدا بە شوو، مەنگوڕ شتێکی ترسناکی تێدابوو جێگای متمانە و بڕوا

نەبوو. هەر ئەو شەوە كاتێك سەوسەن فیكرەت هەواڵی خوازبێنیكارەكەی خۆی بیست وەك گەمەیەكی پڕ گاڵتە و جەفەنگی دەست پێكردبێت بە بێباكییەوە گووتی « دڵنیام شووی پێناكەم... بەڵام زۆر حەزدەكەم ببینم». دواتر بە پرۆشەی خوشكی گووت « دۆعام بۆ بكە كوڕێكی جوان بێت، حەزدەكەم یارییەكی نۆد زۆر درێژی لەگەڵدا بكەم». ئەو كات هیچ شتێكی دەربارەی برینداربوونی مەنسور ئەسرین نەدەزانی.

مەنگوڕی بابەگەورە بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. لە ڕێگا بەردەوام بیری لە «حەسەنی پورە مەهتاب» دەكردەوە، یەكێك لە چەقۆ كێشە كلاسیكییەكانی شار كە خۆی ژنی نەبوو، بەڵام هەموو ژیانی بۆ خوازبێنكردن و داوای ژن بۆ خەڵكانی تر تەرخانكردبوو، بەر لە مردنی یەكێك بوو لە خوازبێنیكارە بەناوبانگ و گەورەكانی شار. مەنگوڕ زۆر جار ئەو قسەیەی حەسەنی دەهاتەوە یاد كە لە سەرەتای هەموو شاییەكدا دەیگووت «مەلعونە ئەو كچەی لەم شارەدا لە دایك دەبێت... مەلعونە ئەو كوڕەی ژنی تیا دەهێنێت، مەلعونن ئەو ژن و مێردەی تا مردن تێیدا دەمێننەوە». هەستیكرد ئەو سەوسەنە بەستەزمانە، ئەو كچە غەریبەیە زۆر شت لە سەر ئەم شارە نازانێت و دەشێت لە نێوان ئەم دوو عاشقە بێمێشكەدا سەردەرنەكات و ونببێت. گووتی « ئەم شارە لە ئەنوەر زیواڵ بەولاوە عاشقی تیا دروست نەبووە، هەموویان درۆدەكەن... قەسەم بە خودا هەموویان درۆدەكەن، بەڵام لەگەڵیدا دەڕۆم، بزانم تا كوێ دەكات... هەتیوەكە شتێكی تێدایە ناكرێت دەستی لێبەردەیت». ئەو نەیدەتوانی وەك حەسەن بێت، ناتوانێت ژیانی لە خوازبێنكردندا بۆ ئەم و ئەو بباتە سەر، بەڵام دەتوانێت تاسەر لەگەڵ ئەم چیرۆكەدا بڕوات، دڵی بێمانا بەم كوڕە دەسووتێت، زۆربەی چەقۆكێشە تەمەندارەكانی شار، گەنجێك یان دروان لە مێژوویاندا هەبووە كە وەك باوكێكی دڵسۆز دەستیان گرتوون. گەر خۆی لە گەنجیدا یوسف كەویار دەستی نەگرتبایە، چی

دەردەچوو؟ دەکوژرا یاخود یەکێکی دەکوشت و دەبایە تا دەمرێت لە هەڵهاتندا بایە. ئاه خوایە بەڵام ئەم لە کوێ و یوسف کەویاری گەورە لە کوێ؟. ئێستاش کە تەمەنی لەسەروو چلوپێنجەوەیە، زۆر شەو خەو بە یوسف کەویارەوە دەبینێت، چەقۆگرتنەکەی، زەردەخەنەکانی لەکاتی شەڕدا، ڕۆیشتنی بە شەقامەکاندا، ئەخلاق و دادەپەروەرییەکەی، ئەو دەستەسرە ڕەشەی دەیخستە بەر پشتێنەکەی، ئەو نیگایانەی لە کاتی دۆمینەدا سەیری بەرابەرەکەی پێدەکرد. تاکە شتێک لە ژیانیدا بتوانێت بیکات ئەوەیە دەست لە کامەران بەرنەدات... ژیانی خۆی بە جۆرێک بێمانا و پوچە هیچی نوێی تیا سەوز نابێت، تاکە شتێک لە ژیانیدا مانای هەبێت، هەوڵبدات ئەم خەونە بۆ کامەرانی سەلما بهێنێتە دی. بەڵام ئەو فیکرەت گوڵدانچییەی وەک پیاوێکی سەیر هاتە پێشچاو، لەو پیاوانەی بە کچەکەیان دەڵێن «خۆت بڕیاربدە... خۆت هاوسەری ژیانت هەڵبژێرە»، خوای گەورە شتی وا چەند بێمانایە، گەر وانەبایە زۆر ئاسانتر بوو، ڕازیکردنی فیکرەت گوڵدانچی ڕەنگە لە ڕازیکردنی کچەکەی ئاسانتر بێت. لەوە دڵنیانەبوو کە ئایا هەموو ژنانی دونیا ئەوەیان پێخۆشە خۆیان هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن؟ زۆربەی ژنانی دونیا ناتوانن بە غەریزەی خۆیان پیاوی باش و خراپ لە یەکتر جیابکەنەوە «قەسەم بە خوا ناتوانن جیاییبکەنەوە» لە دڵی خۆیدا مەنگوڕی بابەگەورە وایگووت.

ئەو شەوە کە گەڕایەوە بۆ ماڵ و خەوت، تا بەیانی خەوی بە یوسف کەویار و حەسەنی مەهتاب و کامەرانی سەلماوە بینی. بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو، کامەران لێفەکەی لەسەرلادا و بە ئاگای هێنایەوە و پێیگووت «شتێکی خراپ لە گۆڕێیە، پۆلیس بە دوامدا دەگەڕێت... دوێنێ شەو لە ماڵی ئێمە بوون». مەنگوڕ بە سەر و ڕوخساوی ترشاوی بەیانیانەوە گووتی «زیاد لە بیست ساڵە پۆلیس بەدوای حوسەین قەرە و ڕەسوڵی مام چاوەشدا دەگەڕێن و نەیانگرتوون، نیوەی پیاوی ئەم

شارە فایلێکیان لای پۆلیس هەیە... لەم شارەدا گەر پۆلیس سەعاتی یەکەم نەتگرێت، ئیتر تادەمریت ناگیرێیت، باشترین شت لە پۆلیسی ئەم شارەدا ئەوەیە کە دوای تێپەڕینی یەک ڕۆژ بەسەر هەر شتێکدا حیکایەتەکەیان لە بیردەچێتەوە... قەسەم بەقەبری مردووی هەردووکمان جۆرە بەشەرێکن هیچیان لە بیر نییە، مێشکیان لە مێشکی سمۆرە خاڵیترە».

کامەرانی سەلما لەوانە نەبوو زۆر لە پۆلیس سڵبکاتەوە، بەڵام لەوانەش نەبوو خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام مەنگوڕ هەرگیز ترسی لە پۆلیس نەبووە، بەدرێژایی ژیانی بیری نییە پۆلیس لە هەقی هیچ چەقۆکێشێک یان دەمانچەکێشێکی ڕاستەقینە هاتبێت، هەمیشە باوەڕی وابوو کە ترسنۆکەکان دەبن بە پۆلیس. مەنگوڕی بابەگەورە پێیگووت کە شتێک لەوە گرنگتر نەوەیە کە فیکرەت گوڵدانچی دەیەوێت ببینێت، دەیەوێت بزانێت ئەم جوامێرە کێیە کە هاتۆتە خوازبێنی کچەکەی. کامەرانی سەلما ئاواتی دەخواست شتەکان بەوجۆرە نەڕۆن، بتوانێت سووک و سادە دەستی کچەکە بگرێت و ببێت بە ژنی بێئەوەی بەم ڕێگا دووروودرێژەی خوازبێنی و بیرکردنەوە و دوودڵیدا بڕوات. بەدرێژایی ئەو بەیانییە مەنگوڕی بابەگەورە لەسەر وردەکارییەکانی دەرکەوتن و خۆدەرخستنی لەبەردەم فیکرەت گوڵدانچیدا قسەی بۆ کرد، پێیگووت «ئەو گوڵدانچییە پیاوێکی بێمێشک نییە، لە منی ببیستە، پیاوێکی زیرەکە. خەڵکی زیرەکیش من و تۆیان خۆش ناوێت، تا ئێستا هیچ پیاوێکی زیرەکم نەبینیوە منی خۆشبوێت، لەبەرئەوەی وادەزانن ئێمە لە زیرەکییەکەیان تێناگەین... چەندە من و تۆ لەوە دەترسین ترسنۆک دەربکەوین، ئەژنۆمان لە شتی وادەشکێت و سەرشێت دەبین، پیاوی زیرەکیش وەهایە، کەللەیی دەبێت یەکێک زیرەکییەکەی نەبینێت. قەسەم بە ئەسحابە، خەڵکی زیرەک لە حاڵەتی وەهادا تێکدەچن و سەر و

لاقی خۆیان تێکەڵدەکەن... ئاە کامەران دۆڵانی... لەو کاتەدا دەبن بە گەمژەی تەواو... لەو کاتەدا من و تۆ لەوان عاقڵترین... من پیاوی زۆر عاقڵم بینیوە تەواو بەلەسەبووە... بەشەر وەهایە... عاقڵترین پیاویش شتێک هەیە بەلەسەیدەکات، عاقڵەکان بەوە بەلەسەدەبن تێیان نەگەیت چەند عاقڵن».

هەردووکیان تەواوی ئەو ڕۆژەیان لە گەڕان و خۆئامادەکردن و جل هەڵبژاردندا بۆ پێشهاتەکانی داهاتوو بردەسەر. ئەو بێئەندازە خۆیان مەستکرد، لەماڵی «مستەفا سەوزە» تا درەنگ لەگەڵ کەسانێکی مەست و قومارچیدا شەرابیان خواردەوە، باسی هەموو شتێکیان کرد، باسی جەنگ لە پێشی پێشەوەی هەموو قسەکانیاندا بوو. مەنگوڕ ڕای وابوو «سیاسەت ئەو شتە پیس و پۆخڵەیە کە ئینسان ناتوانێت قوونی خۆی لێپاکبکاتەوە». هەرکات باسی سیاسەت گەرم بووایە مەنگوڕ پێکەکەی هەڵدەداو دەیگووت «باسی یاری بکەن، باسی کچی دینار و وەلەدی کوپ بکەن... واز لە سیاسەت بهێنن». مەنگوڕ بەدەنگە منگنەکەی باسی ژنێکی کرد کە لە پشت مێردەکەیەوە عەشقبازی دەکات، یەکێک گووتی «بەقەبری باوکم مێردەکەی خۆی ئاگای لێیە و قسەناکات»، بەڵام مەنگوڕ گووتی «وانییە... ئێمەی پیاو کۆمەڵێ حەیوانی خۆشباوەڕین... کۆمەڵێ حەیوانی نەفامین ئەو شتانە بەتەواوی ناچێتە مێشکمانەوە، شەهابی بەهە ئازاترین کوڕی ئەم شارەبوو، ژنەکەی ناپاکی لێدەکرد، شەهاب بەچاوی خۆی دەیبینی و باوەڕی نەدەکرد، تا دواجار ژنەکەی لەگەڵ هەتیوێکدا هەڵهات و یەک کەس دوای ئەوە نەیبینییەوە... بە قەبری عەزیزی هەمووما‌ن... ئێمە جگە لە حەیوانی خۆشباوەڕ هیچی تر نین... پیاو تاکە حەیوانێکە لەسەر ئەم ئەستێرەیە کە خۆی بە زیرەک دەزانێت، لەبەرئەوە لە هەر حەیوانێکی تر بێمێشکترە».

ئەوشەوە پێکرا قسەیان لە نیازی کامەرانی سەلما کرد بۆ ژنهێنان. مەنگوڕی بابەگەورە جۆش و خرۆشێکی شێتانەی لە کامەرانی سەلمادا بینی، هێزێک هەرگیز بەو ڕوونییە لە خۆیدا نەیبینیوە. مەنگوڕ لە ناوەڕاستی هەموو مەستەکاندا هەستا و گوتی «قەسەم بە خوا، گەر لە پێناوی ئەوەدا سەد مردوم لێ مردووە، دەبێت وابکەم ئەم کوڕە بە نیازی خۆی بگات... بابخۆینەوە لەسەر شەرەفی مەردترین کوڕی شارەکەمان، کامەرانی سەلما»، هەموو چەپڵەیان بۆ لێدا... شەرابیان هەڵدا، تریقە و فیکەیان تا درەنگ دەگەیشتە ئاسمان. ئەو شەوە کامەرانی سەلما هەستی بە دڵنیایی و هێزێکی گەورە کرد، ئەوە وای لێکرد بەختەوەربێت، مەست بێت، پێبکەنێت و زیاتر و زیاتر بخواتەوە.

١١

مەنسـور ئیبراهیـم ئەسـرین دوای پێنـج ڕۆژ مانــەوە لــە خەسـتەخانە گەڕایــەوە بـۆ مـاڵ. ئــەوەی جارێکـی دی شــەقام و کـۆڵان و پاسـارییە کزەکان دەبینێـت دڵخۆشـیکرد، بـەڵام هەسـتی بـە لاوازییەکـی گـەورە کـرد، بەجۆرێـک بەزەیـی بـە خۆیـدا هاتــەوە. هەسـتیکرد لـەوە لاوازتـرە کـە خـۆی لـە خـۆی تێـدەگات، لـە هەمـوو مەخلوقاتەکانـی تـری دونیـا لاوازتـرە. کـە لــە تاکسـییەکە دابــەزی و دەسـتیان گـرت، دڵنیابـوو لاوازییەکـەی تەنیـا پەیوەنـدی بـە برینەکەیـەوە نییـە، بەڵکـو پەیوەنـدی بـە ڕۆحییـەوە هەیـە. ئـەوەی کـە تـا ئێسـتا دەژی و زینـدوە غەمگینیکرد، بیـری لای ئـەوە نەبـوو چـۆن تۆڵـە لـە کامەرانـی سـەلما بکاتـەوە، بەڵکـو بیـری لای ئەوەبـوو چـۆن بەسـەر ئـەو بەتاڵییـە ناوەکییـەی خۆیـدا سـەریکەوێت. بۆنـی ئـەو کۆڵانــە مەلعونـە، کپـی ئـەو کوچەیـە کـە بەدرێژایـی زسـتان بەجۆرێـک شـێدارە مرۆڤ وادەزانێـت لــە نـاو هەورێکـدا دانیشـتووە، بۆنـی سـنەوبەرە شـێدارەکان، دیمەنـی ئـەو دار هەنجیـرە نەخۆشـانەی لە سـیاجی حەوشـەکانەوە وەک مردوو بەسـەر دیوارەکانـدا شـۆڕدەبنەوە، هێنـدەی هەسـتی خنکانێکـی کتوپڕیـان تیـا دروسـتدەکرد، هەسـتی گێژییــەک کــە پەیوەنـدی بــە تێنەگەیشـتنی دونیـاوە هەبـوو، ئولفـەت و ئارامیـان تیـا نەخولقانـد. ئەوانـەی لـە بـەردەرگا پێشـوازیانکرد زۆربەیـان خـزم بـوون، مـام و خـاڵ و خاڵۆزاکانـی ئیبراهیمـی ئەسـرین. خێزانێکـی گـەورە کـە پێیوابـوو ناتوانێـت لـە هیـچ شـتێکدا پشـتیان

پێیبەستێت، هەستیکرد دۆستێکی ڕاستەقینەی لەم دونیایەدا نییە. لە نێو میوانەکانیدا «ساقی مەحمود» ی ناسییەوە، ئەو گۆرانیبێژە ناسراوەی کە خەریکە وردە وردە دەچێتە ساڵەوە. لە منداڵییەوە جۆرە سۆزێکی لەگەڵ ئەم پیاوەدا هەیە، نا لەبەرئەوەی زۆر حەزی لە دەنگێتی، بەڵکو لەبەرئەوەی شتێک لە بێباکی قووڵی تێدایە... بێباکییەکی ترسناک... زۆرجار هەمان ڕیشەی بێباکی لە خۆیدا هەست پێدەکات، بەڵام ئێستا دەیویست لە جێگایەکدا بە تەنیا پاڵبکەوێت و بیربکاتەوە. ترس لەو هەموو دەنگەدەنگە لە ناوەوە دڵی دەگرت، دڵنیابوو هیچ کەسێک لەم شارەدا نییە بتوانێ کۆمەکی کەسێکی بەدبەختی وەک ئەو بکات، لەبەرئەوە پێیوابوو ئەم ئاهەنگەی خزمەکانی دەیگێڕن هێندەی تر غەمگینیدەکات و وادەکات بەزەیی بە خۆیدا بێتەوە. لە ناکاو هەستیکرد لە هەموو شتێکی ماڵی خۆیان غەریبە، لە حەوشەکەیان، لە گوڵدانە گەورەکانی باوکی، لە پاسارییەکان، لە هەتاوی دزەکردوی زستان بۆ ناو ژوورەکان... پێشتر بینینی ئینجانەی گوڵ، سەرنجدان لە درەختی بەردار و تەماشاکردنی جلی سەر تەنافەکان، لای ئەو ئاماژەیەکی قووڵ بوون بۆ جوڵە و ژیان و زیندوێتی، ئەوەی مرۆڤەکان بەردەوامن، خۆشحاڵیدەکرد، بەڵام ئێستا هەستیکرد خۆی لەو مەخلوقە لاوازانەیە کە ناتوانێت بەردەوام بێت. کە چووە ژوورێ یەکەمجار چاوی بە تابلۆیەکی گەورە کەوت، نیگارێکی دێرینە، وێنەی چەند باڵندەیەکی تەنیا کە لە سەر قەفەزێکی خاڵی سەیری ئاسۆیەکی دووردەکەن، ئەوە یەکەمجاربوو هەستبکات باڵندەکان بیردەکەنەوە ئاخۆ بفڕن یان بگەڕێنەوە ناو قەفەزەکە. چەندەها ساڵ بوو ئەو تابلۆیەی دەبینی، بەجۆرێک وەک بەشێکی ئەبەدی دیوارەکەی لێهاتبوو، تابلۆکە وەها بەو جێگایەوە نوسابوو، وەک هەموو ئەو شتانەی لە ناو ڕەوتی ئاسایی شتەکاندا نوقمدەبن، بووبوو بە ژێر شەپۆلی کوشندەی دیمەنە دووبارە و ئەزەلییەکانەوە. لە چاوتروکانێکدا خۆی وەک

تابلۆکە بینی... وەک شتێک کە هەمیشە لێرە لە ناو شتەکاندا بووە و کەس نەیبینیوە. خۆشی بووبوو بە بەشێک لە هەموو شتەکان، بە بەشێک لەم کۆڵانە، بەشێک لەو شارە، بەشێک لە خەڵک، پەڵەیەکی ئادەمی وەک هەموو پەڵەکانی تر... لە قووڵاییدا خۆشحاڵ بوو کە ئەو خەنجەرەی بەرکەوتووە، هەستیدەکرد ئەو خەنجەرە بەر بۆشی و بەتاڵی ژیانی کەوتووە، بەر ئەو هیچییە کەوتووە کە لە ناوەوەیدا دەژی. لاوازییەکەی لەوەوەبوو کە نەیدەزانی چی بکات... هەستیکرد حیکایەتی وەک عاشقێک ئێستا بە هەموو شاردا بڵاوبۆتەوە، بێئەوەی لە ڕاستیدا خۆی دڵنیابێت چی لە باردایە. کە خۆی لە ناو جەنجاڵی خوشک و پور و ئامۆژن و پورزا و خاڵۆزاکانی باوکیدا بینی، کە ئەو هەموو جۆرە عەترەی هەست پێکرد تێکەڵ بە شین و ساردی ژوورەکە دەبوون، گێژییەکی لە ناکاو دایگرت، بۆ ئێستێک فەرشە شینەکەی بەرپێی وەک حەوزێک هاتە بەرچاو، کە ژمارەیەک گوڵی سەرئاوکەوتوو لە ناویدا مەلەدەکەن. بۆنی مریشکی کوڵاو و هاڵاوی ئەو مەنجەڵە فاسۆلیا گەورانەی پورێکی ڕێیدەکرد، ئەو هەستی بێزارییەی تیا گەورەترکرد... هەستیکرد لە بری ئەوەی تورەبێت دڵی بەبرینەکەی خۆی خۆشە... ئەو برینەی کە تا دەمرێت لاوازی خۆی بیردەخاتەوە. دڵنیابوو کە سەوسەن فیکرەتی خۆشدەوێت، بەڵام خۆشەویستییەک نییە بتوانێت لە پێناویدا چەقۆ بوەشێنێت. ئێستا دڵنیابوو پیاوانی لاواز بەجۆرێکی تەواو جیاواز لە پیاوانی ئازا عاشق دەبن... دڵنیاشبوو خۆی لە توخمی پیاوە لاوازەکانە... پیاوە زۆر لاوازەکان. بە ئەندازەیەک لاوازە نازانێت دەتوانێت لە ژیانیدا چی بکات، هەتا ئەوەی کۆلێژ تەواوبکات و ببێت بە دەرچوویەکی بەشی بایۆلۆژی مایەی قێزبوو لەلای، ببێت بە کەسێک کە لابوری هەیە، ببێت بە مامۆستایەکی لاوازی بایۆلۆژیا، یان بە فەرمانبەرێک لە بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ یان پاراستنی سامانی

ئازەڵداری... خۆی لە هەموو ئەو ڕۆڵانەدا وەک کەسێک دەبینی کە شایستەی بەزەیی و پێکەنینە. ئەوەی وەک عاشقێکی لاواز بژی و بتلێتەوە، خۆی وەک کەسێکی شکستە ببینێت کە ئازارەکانی خۆی بە زەویدا ڕادەکێشێت، نمایشێک بوو زیاتر لەگەڵ ڕۆحیدا دەگونجا... لەکاتێکدا تەواوی خزمەکانی مەرا و هوریایەکی بێسەروبنیان لە هەموو ژوورەکانی ماڵەکەدا دروستکردبوو، لە کاتێکدا هەندێکیان لەسەر چەند قاپێکی سەفەری پاقلاوەیان دەخوار و هەندێکی دیکەیان بە پێوە پەرداخی شەربەتیان پێبوو، ژنەکان لە گەرمەی دەنگەدەنگدا بوون لەسەر چۆنێتی دروستکردنی قاڵبێک کێکی گەورە بە ڤانێلاو کرێمەوە، مەنسور ئەسرین دوور لە هەموو خولیا و خەیاڵاتی ئەوان لە خۆی دەپرسی ئاخۆ خۆشەویستی بۆ سەوسەن فیکرەت هێندە قووڵە کە لە پێناویدا بمرێت؟.. بە چاکەتە کۆنەکەیەوە کەمێک لە ناو ماڵەکەدا گەڕا، لە پڕێکدا بە کامەرانی سەلما زۆر سەرسامبوو، ئەو هەرگیز توانای وای لە خۆیدا شک نەدەبرد لە پێناوی خۆشەویستیدا چەقۆ لە یەکێک بدات. لە دڵی خۆیدا گووتی «ئەو عاشقێکی لە من گەورەترە... من هیچ نیم لە بەردەم ئەودا، ئەو هەزارجار لە من باشترە». دڵنیابوو گەر سەوسەن بە چیرۆکەکە بزانێت لەبری ئەوەی بەزەیی پێدابێتەوە پێکەنینی پێدێت... لە ناخی دڵەوە حەزیدەکرد سەوسەن هیچ شتێک دەربارەی ئەو شەوە نەزانێت، هیچ شتێک.

کاتێک لەسەر ئەو قەرەوێڵەیە دانیشت کە بۆیان ئامادەکردبوو، هەستی بە دەستی قورسی پیاوێکی باڵابەرزکرد، پیاوێک کە گەلێک بە ویقار دەینواند، بە سمێڵێکی ماش و برنج و ڕوخسارێکی چرچ و گۆنایەکی قوپاوەوە، مەنسور ئەسرین ناسییەوە، ساقی مەحمود بوو بە خۆی و چاوە شینەکانییەوە کە هەمیشە بریسکەیەکی قووڵی ژیان لە ناویدا دەدرەوشایەوە... لێیپرسی «حاڵی برینەکەت چۆنە؟.». نەیزانی چی

وەڵامبداتـەوە، ئـەو گۆرانیبێژێکـی ناسـراو بـوو... بـەو گۆرانییانـە بەناوبانـگ بـوو کـە لەگـەڵ تیپێکـی میللیـدا تۆماریکردبـوون. گۆرانییەکانـی پڕبـوون لەوشـەی بازاڕی، بـەڵام ئـەوەی مرۆڤێـک هەیـە لـەم شـارەدا دەتوانێـت وەک شـایەر بـژی، شـوێنی حورمـەت و ڕێـزی گـەورەی مەنسـور بـوو... شـارەکە لـەوە بەڕێزتربـوو کـە مـرۆڤ ئاسـان بتوانێـت تیـا ببێـت بـە شـایەر. مەنسـور سـەری بەرزکـردەوە و گووتـی « سـاقی... عاشـقی تـرت بینیـوە، لەسـەر عەشـق کوشـتبێتیان؟» . گووتـی «هەمـوو شـتێک لـەم کەلاوەیـەدا بـووە بـە تەمسـیل، لـە مـن بپرسـە، لـە مێـژە ڕووداوی وەک ئەمـەی تـۆ ڕووی نـەداوە... بۆیـە چیرۆکەکـەی تـۆ بەڕاسـتی کاری تێکـردم» . بـە هێمنـی دەمـی لـە گوێـی مەنسـور نزیککـردەوە و چرپانـدی «کارێـک دەکـەم خەڵـک ئاسـان حیکایەتەکـەی تـۆ لـە بیـر خۆیـان نەبەنـەوە... بۆەسـتە دەبێـت وەک عاشـقێکی ڕاسـتەقینە بچیتـە مێـژووی ئـەم شـارەوە، سـاقی مەحمـود نیم گەر شـتێکی گـەورەم بـۆ نەکـردی» . مەنسـور ئەسـرین هەسـتی بـە ڕاچڵەکانێکـی ناوەکـی قـووڵ کـرد، ئـەوەی هەمـوو شـار وەک عاشـقێکی گـەورە بیناسـن، لـە دڵـەوە دەیترسـاند، ئـەوە حیکایەتێکـە دواتـر پیریـش بێـت کـەس لـە بیـری ناچێتـەوە، هەتـا بـۆ نەوەکانـی دواتریـش جـێ دەمێنێـت... ئێسـتا دڵنیابـوو ئـەو چەقۆیـە بـۆ هەتاهەتایـە ژیانـی گۆڕیـوە. لـە ناخـی دڵـەوە ویسـتی تـکا لـە سـاقی مەحمـود بـکات، هیـچ شـتێکی بـۆ نـەکات و لێیگەڕێـت لەگـەڵ ئازارەکانیـدا تـەنیـا بـژی، بـەڵام نەیتوانـی هیـچ بڵـێ، چونکـە دروسـت نەیدەزانـی سـاقی مەحمـود دەیەوێـت چـی بـکات.

## ١٢

لە ئێوارەی هەمان ئەو ڕۆژەدا کە مەنسور ئەسرین لە خەستەخانە هاتەدەرێ. خالید ئاموون بۆ ئەوەی چیرۆکی خۆشەویستییەکەی باسبکات سێ خزمی نزیکی خۆی کۆکردەوە، هەر سێکیان کەسانی ناوداری ناو عەشرەتی ئاموون بوون. سەلامی ئاسنگەر، قەلەندەر ئاموون، لەتیف ئاموون. سێ پیاو کە هەر سێکیان ڕابوردوویەکی پڕ و ژیانێکی جەنجاڵ ژیاون، سەلامی ئاسنگەر گەورەترین چەک فرۆشی شار بوو، بە نهێنی بازرگانی چەکی سووکەڵەی دەکرد، قەلەندەر ئاموونیش بەرپرسی کۆنی تۆپخانەکانی شۆڕش بوو، لە ساڵانی شەست و حەفتادا ناوێک بوو لە تەواوی کوردستاندا ناسرا بوو، لەتیف ئاموونیش مامۆستایەکی سەرەتایی کە دەمێ ساڵە وازی لە قوتابخانە هێناوە و خەریکی کڕین و فرۆشتنی ئوتۆمبیلی کۆنە. سێ پیاو کە خالید ئاموون دەزانێت گەر کۆببنەوە چ پیڕێکی ترسناکیان لێدەردەچێت. هەر سێکیان سێ گرنگترین عەقڵی عەشرەتی ئاموون بوون، هەر یەکەیان کۆمەڵێک مەدالیای نەبینراویان بە سنگەوەیە، وەک ڕەمزی ئیشکردنێکی بێوچان و دووربودرێژ بۆ ئاموونییەکان. ئەوەی عەشرەتی ئاموون بە سەرتۆپی هەموو عەشرەتەکان دەزانن و شێخەکانی ئاموون لە پلەوپایەی پیاوە هەرە گەورەکانی مێژوودا تەماشادەکەن خاڵی سەرەکی و هاوبەشی نێوان هەر سێکیانە. خالید ئاموون بەر لەوەی بانگیانبکات بیرێکی تەواوی

کردبووەوە و لە ناو زیاد لە دە ناودا ئەو سیانەی هەڵبژارد، لەبەرئەوەی هەر سێکیان لە ئاموونییە فانەتیک و دەمارگیرەکان بوون، کە شەرەفی هەر پیاوێکی ئاموونی وەک شەرەفی تایبەتی خۆیان سەیردەکەن. خالید لە ژوورێکی کپدا کە سۆپایەکی داگیرساوی زۆر گەورە و گەرمی تێدابوو، بە وردی و ڕاشکاوانە باسی دڵی خۆی و عەشقی لە ناکاوی سەوسەن فیکرەتی بۆ کردن، چیرۆکی شەڕە چەقۆی ژێر زەمینەکە و ئەو دوو عاشقە سەرسەخت و بەهێزەی لە پێشدەمیدا وەستاون. دڵنیابوو هیچ یەکێ لەم سێ پیاوە گاڵتە بە چیرۆکەکەی ناکەن، بەڵام دڵنیاش بوو کەسیان هەڵشەنین و هەنگاوی پەلە نانێن. دوای بیرکردنەوەیەکی درێژ هەر سێ پیاوەکە بڕیاریاندا کە باشترە سەرەتا بچنە خوازبێنی کچەکە و چاوەڕوانبکەن هەنگاوەکانی داهاتوو بەرەو کوێ دەڕوات، هەر سێکیان گووتیان کە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ بەوجۆرە دەست پێدەکات.

لە شەوی داهاتوودا دوای کۆبوونەوەیەک کە پتر لە بیستوپێنج پیاوی ناسراوی عەشرەتی ئاموونییەکانی تێدابوو، لەسەر سفرەیەکی درێژ کە پڕبوو لە قەلی برژاو، مریشکی ئاخنراو بە برنج، کفتەی گەورە، تاوە قیمەی بادەماوی، لەگەنی چیا ئاسای پلاو، بڕیاریاندا کە پێنج پیاو هەڵبژێرن بچن بۆ خوازبێنی سەوسەن فیکرەت. واتە جگە لەو سێ کەسەی سەرەوە، سەی گەرەمی ئاموونی، سەرعەشرەتی ئاموونییەکان بڕیاریدا نوێنەرێکی تایبەتی خۆی بخاتە ڕیزی خوازبێنیکەرانەوە و لە پاڵ ئەواندا فەوزی بەگیشی دانا، تا وەک قسەزانترین کەسی خێڵەکە قورسایی خۆی بخاتە نیشەکەوە.

ئەوە یەکێک بوو لە شەوە جەنجاڵەکانی ژیانی خالید ئاموون. چەندین ساڵ بوو، هەمیشە شەوانی پێش خوازبێنی پیاوان لەسەر سفرەیەکی درێژ کۆدەبوونەوە تا وەفدی خوازبێنیکردن هەڵبژێرن، لەو چەند ساڵەدا خالید ئاموون چەندین جار لەو ئێوارەخوانانەدا بەشداریکردبوو، لەو جۆرە

دانیشتنانەدا هەمیشە دەچووەوە ناو خۆی و بێئەوەی هیچی گرنگ بڵێت لە سوچێکەوە چاوەدێریدەکرد. ئاموونییەکان عەشرەتێکی گەورەبوون، لەسەرەتای سەدەی بیستدا وازیان لە وڵاغداری و دروستکردنی پەنیری پێستە و قەل بەخێوکردن هێنابوو تا بگوازنەوە بۆ شار، بەڵام وەک عەشرەتێکی یەک دەست هاوپەندی خۆیان نەدۆڕاندبوو، دوای ماوەیەکی دوورودرێژ لە شاردا هێشتا نەریتی خێڵەکی خۆیان پاراستبوو، بە چەشنێک عەشرەتەکانی تر بەخیلیان پێدەبردن، سەرە گەورەکانی خێڵەکە چ لای دەوڵەت و چ لای حیزبە سیاسییەکان حورمەت و سەنگی خۆیان هەبوو. بەوە ناسرابوون کە هەفتانە پیاوانی خێڵ بە نۆرە لە ماڵێک کۆدەبنەوە و خوانی گەورە دەڕازێننەوە، لەو داوەتە گەورانەدا بەردەوام قاپ بە ئاسمانەوە بوو، سینی ئەم دەستە و دەستی دەکرد، سوراحی جۆراوجۆر دەهات و دەچوو. خالید ئامورن لەو دانیشتن و کۆبوونەوانەدا هەستی بە دڵنیاییەکی گەورە دەکرد، هەستی ئەوەی هێز و پشت و پەنایەکی گەورەی هەیە ناوەوەی دادەگرت... ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو بەڕاستی داوای یارمەتی لە ئاموونییەکان بکات. بەدرێژایی سێ ساڵی ڕابوردوو هیچ کات ڕێکەوتی نەکردبوو، ئاموونییەکان لە مەسەلەی ژن و ژنخوازیدا شکست بهێنن، قورساییان لە بازاڕ و لە ژیانی سیاسیدا هۆیەکی گەورەی ئەو سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکانەیان بوو، ئەمە جگە لەوەی سەی کەرەمی ئاموونی وەک سەر عەشرەت کەسێکی دیپلۆمات و لێزان بوو. ئەو شەوە کە خوازبێنیکەرە ئاموونییەکان چوون بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی، فەوزی بەگ بە پۆزی پیاوێکی پیری خوێندەوارەوە، نەوەک بەپۆزی عەشرەتچییەکەوە لە پێشی هەموویانەوە بوو، فەوزی بەگ یەکێک بوو لە هەرە قسەزانەکان، کەسێک بە وردەکارییەکی زۆرەوە وشەکانی هەڵدەبژارد و زیادەڕۆییەکی گەورەی لە دەرخستنی کوردی زانیدا دەکرد و هەوڵی گەورەی دەدا داڕشتنەکانی لە توانای کەسانی

ئاسایی بەدوور بن. هەموو ناوبانگی فیکرەت گوڵدانچییان وەک پیاوێکی خوێندەوار بیستبوو. بەڵام فەوزی بەگ خۆی لە هەر زانایەکی دونیا بە زیرەکتر دەزانی، پێی وانەبوو فیکرەت گوڵدانچی بە عیلم بتوانێت بیگرێت، دڵنیابوو فیکرەت گوڵدانچی وەک ئەو سێ جار شاهنامەی نەخوێندۆتەوە و وەک ئەویش زۆربەی بەشەکانی «رسالة الغفران» ی مەعەرری لە بەر نییە. ڕاستە زانین و زانستەکەی فەوزی بەگ گەلەک کلاسیکی و کۆنەباوبوو، بەڵام فەوزی بەگ باوەڕی بە بوونی زانستێکی جیاواز نەدەکرد کە لە خەیام و حافزی شیراز و جەلالەدینی ڕۆمی تێیپەڕاندبێت، هیچ جۆرە تێگەیشتنێکی بۆ ئەو زانست و زانینانە نەبوو کە لە خۆرئاواوە دەردەچوون، مەسەلەکە هەر ئەوە نەبوو کە تێیان نەدەگەیشت، بەڵکو پێیوابوو زانستەکانی خۆرئاوا عەقڵ لە گرێژەنەدەبەن و لە سەر ئاسنەڕێی خۆی دەریدەکەن. شەوی خوازبێنییەکە، فیکرەت گوڵدانچی لەدەرەوە بوو، کە هاتەوە و ئەو هەموو پیاوە نەناسەی لە ماڵی خۆیدا بینی، بۆ ئێستێک لە بەرچاوی میوانان شپرزە و پەشۆکاو دەرکەوت. پیاوانی قسەزانی عەشرەتی ئاموون بە زمانە شیرینەکەی خۆیان هێوریانکردەوە و لە گەڵیدا کەوتنە باسی ڕوداوە سەیرەکانی دونیا، گوڵدانچی بە وردی گوێی لە فەوزی بەگ گرت کە زوو زوو هەندێ بەیتی فارسی تێهەڵکێشی قسەکانی دەکرد و بە شێوە خوێندنی پیاوە کۆنەکان نمونە و حیکایەتی دەربارەی پێویستی تێکەڵاوبوون و نزیکبوونەوەی ئادەمیزادەکان لە یەکتر دەگێڕایەوە. فیکرەت گوڵدانچی زوو لە قسەکانی فەوزی بەگەوە تێگەیشت کە لە بەردەم پیاوێکدایە کە گرنگترین مەرجەعی ڕۆشنبیریی لەلای هێشتا حیکایەتەکانی کلیلەو دیمنەی بەیدەبایە، خێرا ئەوەشی خوێندەوە کە ئەمانە پێڕێک خوازبێنیکەرن و بۆ داوای یەکێک لە کچەکانی هاتوون. کە زانی ئەم پیاوانە بۆ خوازبێنی خانمی بچکۆلە هاتوون، ماوەیەک بێدەنگی قورس

دایگرت و دواتر بێئەوەی دوودڵ بێت گوێتی هەر لەم هەفتەیەدا کوڕێکی دیش داوای دەستی کچەکەی کردوە، ئێستا شتەکان لە خەیاڵی خۆیی و خانمە بچکۆلەشدا کەمێک ئاڵۆز و تێکەڵ دەردەکەون لە بەرئەوە دەبێت ماوەیەکی درێژیان بۆ بیرکردنەوە بدەنێ... پیاوانی ئاموون خۆیان وا دەرخست کە گەلێک بە گفت و تێفکرینی فیکرەت گوڵدانچی خۆشحاڵن، هەر پێنجیان وەک پێنج پیاوی بەختەوەر خۆیان نیشاندا، هەمیشەش پیاوانی ئاموونی لە بۆنەکاندا و لە پێشدەم خەڵکدا خۆیان بەختەوەر نیشاندەدا... هەر پێنجیان ناوی کامەرانی سەلمایان دەزانی، دەشیانزانی بۆیە وا بە خێرایی هاتوون تا ڕێگا لە کامەرانی سەلما بگرن، بەڵام ڕوخساریان بە هیچ جۆرێک ئەو نهێنییەی ئاشکرا نەکرد... کە دوایی ڕۆیشتن، فیکرەت گوڵدانچی بیری لە فەوزی بەگ کردەوە، هێندەی وەک کەسێک هاتە پێشچاوی مایەی بەزەییە وەک کاراکتەرێکی ڕۆشنبیر نەهاتە بەرچاوی... فیکرەت گوڵدانچی بەدرێژایی ژیانی گاڵتەی بەوانە هاتووە کە زۆر هەوڵدەدەن خوێندەوار دەربکەون... «هەموویان نەخوێندەوارن»، فیکرەت گوڵدانچی بەر لەوەی بچێتە ژێر جێگاکەوە و لێفەکە بەسەر خۆیدا بدات، لە نیهانی خۆیدا وابیریکردەوە.

## ١٣

سەوسەن تەنیا لە کۆتایی هەفتەدا دوای گەڕانەوەی مریەم لە زانکۆ، بە برینداربوونی مەنسور ئەسرینی زانی. مریەم وەک ڕەشەبا هەر بەجلی زانکۆوە خۆی کرد بە ماڵی فیکرەت گوڵدانچیدا، دڵنیابوو ئەو کچە بێهۆشە تا ئەوکات هیچ شتێکی لەسەر ئەو ڕووداوە نەبیستووە. بە زمانە پڕ هەڕەشەکەی خۆی کە لە دایکییەوە «مەعسومە گوڵدانچی» بۆی مابووەوە، بە دەنگە کەمێک گڕ و پیاوانەکەی لە چەند چرکەیەکدا تەواوی چیرۆکەکەی بۆ سەوسەن و پڕوشە گێڕایەوە و بە سەوسەنی گووت «تۆ چ کچێکی گێژ و گەمژەیت، لەدەرەوە خەڵک لەسەر تۆ شەڕەچەقۆ دەکەن و تۆش لێرەدا، خاتوونەنی بابوونەنی لە ناو ئەم کتێبانەدا دانیشتوویت و ئاگات لە هیچ نییە... من لە ژیانمدا مەخلوقێکی بێباکی وەک تۆم نەبینیوە... کچم نەخۆشی یان پێمبڵێ چ دەردێک لە دڵتدایە بە ئێمەی داماو ناخوێنرێتەوە... بەڕاستی من تێناگەم... کە بیر لە تۆ دەکەمەوە تەواو تووشی سەرئێشەدەبم». مریەم لە گێڕانەوەی حاڵی مەنسور ئەسریندا وێنەکارییەکی گەورەی کرد و گووتی کە کوڕەکە چوار ڕۆژ بێهۆش بووە، هیچ کەس بە تەمای نەبووە، دکتۆرەکان دەستیان لە ژیانی شتووە و تەنیا موعجیزەیەکی خودایی بە هانایەوە هاتووە و ڕزگاریکردوە. دواجاریش گووتی ئەوەی مەنسور ئەسرینی بریندارکردوە، کوڕێکی شەلاتی و نەخوێندەوار و چەقۆکێشە بە ناوی کامەرانی سەلماوە. سەوسەن فکیرەت بێئەوەی زۆر خۆی بە وەڵامدانەوەی مریەمەوە سەرقاڵبکات، بەساردییەکی گەورەوە گووتی «بۆ دەبێت من بزانم پیاوان چی دەکەن... بۆ پێتوایە، دەبێت سەری خۆم

بە شەڕی دوو کەسی نەفامەوە بنێشێنم، کە نایانناسم». وەڵامەکەی بۆ مریەم سنوورە ئاساییەکانی بێباکی دەبەزاند و گەلێکیش بێڕەحم و دڵڕەق دەینواند. مریەم جارێکی دی دەستی ڕاوەشاند و بەدەنگی بەرز گووتی «مەنسور ئەسرین کوڕێکی زۆر ناسکە... تێدەگەیت... من دەچم بۆ لای، سڵاوی تۆشی بۆ دەبەم... چونکە دەزانم ئێستا هەر قسەیەک لە تۆوە دڵی ئەو کوڕە بەستەزمانە چەند خۆشدەکات... تێدەگەیت، دەبێت هەستی ئەوەت هەبێت، کە ئەم مەخلوقە ناسکە لە بەر تۆ خەریک بووە بمرێت... لەبەر تۆ... ئاخر هەر کچێکی تر بێت دەستدەکاتە ملی کوڕە و دەڵێت... عەزیزم هەر ئێستا بمبە بۆ خۆت... کە من ئەوەندە قەدر و قیمەتم لای تۆ هەیە، من موڵکی تۆم... بەڵام تۆ... تۆ سەوسەن خان، من هیچ لەو شتانە تێناگەم کە بەسەرو کەللەتدا تێدەپەڕن... هیچ حاڵی نابم».

سەوسەن فیکرەت گەلەک ماندوویبوو، بێئەوەی مریەم یاخود پرۆشە شتێکی تایبەتی لە دەنگیدا بخوێننەوە گووتی «خوای گەورە، پیاوان بۆ وەها گەمژەن... مریەم... تۆ پێمبڵێ پیاوان بۆچی وا بێمێشکن... بۆ بە من دەڵێیت... من کە هیچ نازانم... دوای ئەوە من ئەو کوڕەم بە لاوە سەیرترە، کە چەقۆکانی لە مەنسور داوە... ئەوە هەمان کوڕە کە چوار شەو لەمەوبەر هاوڕێیەکی خۆی نارد بۆ خوازبێنم... ئەویش وەک مەنسور ئامادەی قوربانییە... وانییە... هەردووکیان وەکو یەک وان... هەردووکیان وەکو یەک وان».

هەواڵی خوازبێنیکردنی کامەرانی سەلما بۆ سەوسەن کەمێک مریەمی شپرزەکرد، سەیری لێهات سەوسەن هەر دووکیان لە یەک ئاستدا دەبینێت. سەوسەن کە قسەیدەکرد مرۆڤ هەستی ئەوەی هەبوو کە هێندە ناسکە وەک توحفەیەکی کریستال ئێستا نا کەمێکی دی دەشکێت، بەڵام ئەو ناسکییە لە ئەندازەبەدەرەی هاوشانی ناسکی دڵ نەبوو، بە شتێک لە

غەمگینی و هێمنییەوە گووتی «ئاخ مریەم... لێگەڕێ... من شوو بە هیچ یەک لەم دوو پیاوە ناکەم کە لەسەر خۆشەویستی شەڕدەکەن... تێدەگەیت... لەوە تێناگەم مانای چی پیاوان لەسەر خۆشەویستی شەڕبکەن... مەستدەکەم، شتەکان پەیوەندیان بە منەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە هەیە ئەو پیاوانە نازانن دونیا چییە... ئاخ مریەم... هەر پیاوێک بزانێت دونیا چییە لەسەر کچێک شەڕ ناکات... ها، هەر پیاوێک بزانێت دونیا چەند گەورەیە، لەسەر کچێکی نەخۆشی وەک من چەقۆ ناوەشێنێت... وانییە».

پرۆشە دڵنیابوو «بیرۆکەی گەورەیی دونیا» کە لەسەری سەوسەندا سەوزبووە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو ئەنسکلۆپیدیا و فەرهەنگ و ئەتڵەسە جۆراوجۆرانەی لە منداڵییەوە لە ناویاندا دەژی، بەڵام مەکرێکی کچانەشی لە قسەکانیدا دەبینی کە خاڵی نەبوو لە شەڕانگێزی. ئێستا هەموو لە تایەفەی گوڵدانچیدا لەو باوەڕەدابوون کە ئەم کیژە هەرچەند گەلێک ناسکە، بەڵام گەر بیەوێت دەتوانێت زۆر دڵڕەق بێت. دەبێت بڵێم کە پرۆشە بە دڵسۆزییەکی گەورەوە، بە مەراقی کچێکەوە کە نایەوێت هیچ لە باوکی بشارێتەوە، هەموو هەواڵێکی گرنگی سەوسەنی بۆ فیکرەت دەگێڕایەوە. لەو کاتەوەی هاتبوون بۆ شار و دوای بڕیاری سەختی سەوسەن بۆ وازهێنان لە خوێندن، کچەکە وادەردەکەوت کاراکتەرێکی ناوازەتری لە کاراکتەری ئاسایی هەبێت، هەندێ ڕۆژ تا شەو درەنگ لە ناو کتێبخانەکەی باوکیدا دەمایەوە، هەندێجار باوکی ڕادەسپارد هەندێک کتێبی تایبەتی بۆ پەیدابکات، جارێکیان داوایکرد ئەتڵەسی جیهانی کۆنی لە یەکێک لە کتێبخانەکانی بەریتانیاوە بۆ بکڕێت، ئەتڵەسێک کە کیشوەرە نغرۆکان و خەزێنە ژێر ئاوکەوتووەکان و مەملەکەتە بەباچووەکان و شوێنەکانیان نیشاندەداتەوە، جارێکیش داوایکرد فەرهەنگی بەردەزێڕ و خشڵە گرانبەها و یاقووتە دەگمەنەکانی بۆ پەیدابکات. بەوەدا

گوڵدانچی ئاسیاوێکی دێرینی لە دەرەوەی وڵات هەبوو، خۆشبەختانە هەر بەرگێک لەو کتێبە گرانبەهایانەی داوابکردایە لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بەدەستی دەگەیشت، بەجۆرێک لە ماوەی چەند مانگێکدا فەرمانبەرەکانی دائیرەی پۆست گوڵدانچییان لە هەر کەسێکی دیکەی شارەکە باشتر دەناسی، ئەو پیاوە بە ویقارە باڵابەرزە سەروڕیش سپییە کە هەردەم بە هەفتەیەک یان زیاتر بەر لە گەیشتنی کتێبەکان سەردانێکی دائیرەی پۆستی دەکرد بۆ ئەوەی فەرمانبەرەکان لە گەیشتنی «ڕوزمەیەکی گرنگ» ئاگاداربکاتەوە. سەرەتا باوکی وایدەزانی کچەکە یەکێکە لەو توندڕەوانەی دەیەوێت بە ڕێگای تایبەتی خۆی لە زانستدا قووڵ ببێتەوە، بەڵام سەوسەن ڕۆژێکیان پێیگووت «بابە، من زانستم بۆ گرنگ نییە، لەداهاتووشدا هیچ کات زانستم بەلاوە گرنگ نابێت... بەڵام مەبەستمە بزانم دونیا چی تێدایە». دیارە کچەکە لەوە منداڵتر بوو باوکی بوێرێت بە تەنها بینێرێت بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵام بۆ ئەوەی وەک باوکێکی ڕێگر و ناحەز دەرنەکەوێت ڕۆژێک لەسەر نانخواردن پێیگووت «سەوسەن گەر بەڕاستی لە تواناتدایە بەرگە بگریت، دەتوانم هەوڵێک بدەم بۆ ئەوەی سەفەربکەیت و بڕۆیت بۆ دەرەوەی وڵات، گەر دەزانی بەوە ئاسوودە دەبیت بڕۆ؛ لەوێ بە ئارەزووی خۆت دونیا ببینە، من لاریم نییە و ڕێگریت ناکەم». کچەکە بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی «بابە من لەوە لاوازترم کە تۆ تێمدەگەیت... تۆ زوو لە یادیدەکەیت کە من کچێکی نەخۆشم، دواتەوە تۆ پارەت نییە، تێدەگەیت سەفەرێکی وەها پارەیەکی زۆری دەوێت، ئینجا چی بە تۆ دەڵێن... ها چیت پێدەڵێن گەر کچێکی گەنجی وەک من بە دونیادا بەرەڵابکەیت. نازانی تۆ لە چ شارێکدا دەژیت؟.... بیرت لەوە کردۆتەوە چەندە بریندارتدەکەن... گەر من بە تەنیا بڕۆم شەرەفی هەموو گوڵدانچییەکان دەکەوێتە بەر تانە، ئاە گەر من وەک کچێکی خراپ ناوم بڕوات، ئەوکات پڕوشەش شووناکات، ڕەنگە

ئامۆزا و پورزاکانیشم شوو نەکەن... وانییە بابە. گەر من بڕۆم ئیتر ناتوانم تۆش ببینم، ناتوانم کتێبخانەکەش ببینمەوە». باوکی دڵنیابوو کچەکە لەسەر هەقە، دڵنیاش بوو سەوسەن لەوە بێقەوارە و کەم تواناترە هەموو ژیانی لە سواری کەشتی و فڕۆکە و شەمەندەفەرەکاندا بباتەسەر. ئەو هەر ئەو ڕۆژە بەباوکی گووت « فیکرەت گوڵدانچی، من دەزانم دونیای ڕاستەقینە، لەدەرەوەی ئەتڵەسەکان و وێنەی ناو کتێبەکان چۆنە. بەڵام دەمەوێت تێبگەم خەڵک چۆن دونیا دەبینن... دونیا خۆی زۆر خۆش نییە، بەڵام ژیان لەگەڵ ئەوانەدا کە دونیایان بینیوە، دانیشتن لەگەڵ ئەوانەدا دڵم ئاسوودەدەکات... من کچێکی نەخۆشم، بابە... گەر بەرامبەر خۆم دڵڕەق نەبم ناتوانم بژیم».

سەوسەن فیکرەت ئەو گوزارەیەی زۆر بە کاردەهێنا «من کچێکی نەخۆشم... من کچێکی نەخۆشم». هەموو دەیانزانی کە بەرامبەر خۆی زۆر دڵڕەقە. مریەم ئەو ڕۆژە بەو سروشتە تووڕە و نائارامەی خۆیەوە بە سەوسەنی گووت « تۆ لە عومرێکدایت، دەبێت شتێک لە سۆز و هەستت تێدابێت... دەبێت دڵت بە حاڵی خۆشت بسووتێت، من لە تایەفەی گوڵدانچیدا کچێکی نەرم نەدیوە وەک تۆ خوێن سارد بێت... خوایە گەر تێبگەیشتمایە چی لەو دڵە خاڵییەی تۆدا دەسووڕێتەوە... چی؟.... بەڵام پرۆشە تۆ پێمبڵێ، تۆ فریامبکەوە، ئەم کچە چ دەردێتی... بە ڕاست کچانی لە بەغدا گەورە دەبن هەموو وەهان؟ دەبێت هەموو هەمان دەردیان هەبێت ؟... زۆرجار کە ئەم بێباکییەی دەبینم خەریکە لە هۆش خۆم دەچم...». ئەو ڕۆژە کە مریەم لەلای ئەوانەوە هەستا بچێت بۆ سەردانی مەنسور ئەسرین، سەوسەن لە بەر دەرگاکەوە بانگیکردەوە، لە یەکێک لە ئینجانەکانی باوکیدا گوڵێکی سپی پچڕی و دای بە مریەم و گووتی «ئەو گوڵە بدە بە مەنسور ئەسرین، بەڵام پێیبڵێ دڵی زویر نەبێت و بە هەڵە لەم گوڵە بچکۆلانەیە تێنەگات، من دەزانم پیاوان چ

حیكایەتێكی دووروودرێژ و بێمانا لە گوڵێكی وەها دروستدەكەن... گەر دەتوانیت تكای لێبكە تا بۆ هەتاهەتایە من لەبیر خۆی بباتەوە، چونكە پێدەچێت دواجار من شوو بە كەسێكی تر بكەم».

ئەوە یەكەمینَ گوڵ و دواهەمین گوڵ بوو سەوسەن فیكرەت لە ژیانیدا پێشكەش بە مرۆڤێكی بكات.

## ١٤

هەواڵی خوازبێنیکردنی کتوپڕی یەکێک لە ئامووزنییەکان بۆ سەوسەن فیکرەت، لە شاردا دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو، لەوانەیە ناوبانگی چیرۆکەکەی سەوسەن فیکرەت لە بنەڕەتدا بگەڕێتەوە بۆ ئەو خوازبێنیکردنە و ڕووداوەکانی دوای ئەو. بەڵام جگە لەو خوازبێنییە دوو شتی کتوپڕ لە بەرەی مەنسور ئەسرینەوە ڕوویاندا بوونە مایەی زیاتر بڵاوبوونەوەی حیکایەتی خانمی سەوسەن و خوازبێنیکەرە شەیداکانی. یەکێکیان ئەو شیعرە ناسکەبوو کە یەکێک لە شاعیرە هاوچەرخە گەنجەکان لە گۆڤارێکی ئەدەبیدا بڵاویکردەوە و ستایشی عاشقێکی تێدادەکات کە لە ژێر زەمینێکی چڵکندا لە پێناوی عەشقدا ئامادەبووە بمرێت، کابرا شیعرەکەشی بە ڕوون و ئاشکرا پێشکەش بە مەنسور ئەسرین کردوە، لەوەش بترازێت ساقی مەحمود لە هەمان هەفتەدا لەو تەلەفزیۆنە تەنها و لۆکاڵەوە کە بەرنامەی بۆ ئەو دەڤەرە بڵاودەکردەوە، گۆرانییەکی پەخشکرد، بە شێوەی لاوک و حەیرانە دێرینەکان چیرۆکی هەمان ڕووداوی دەگێڕایەوە، ساقی لە گۆرانییەکەیدا لە چەندین جێگادا ناوی سەوسەن فیکرەت دەهێنێت و گۆرانییەکەی پڕکردوە لە دێڕی وەک «سەوسەنەکەی خۆم»، «سوسەی دڵەکەم»، «سەوسەن ئامان» و «سەوسە باوانم».
گۆرانییەکانی ساقی مەحمود گۆرانی بازاڕیی ڕاستەقینەبوون، لەوانەی لە مەزاتخانەی هەموو شارەکانی کوردستان لەسەر کاسێت تۆماردەکران

و دەفرۆشران، شۆفێری پاسە ناوخۆیی و ئەوانەی لە نێوان شارەکان و سەر هێڵە دەرەکییەکان کاریاندەکرد، گوێگری ڕاستەقینەی ساقی بوون. دەبێت بڵێم شیعرەکەی مستەفا هەژار و گۆرانییەکەی ساقی مەحموود مەسەلەی خوازبێنیکردنەکەی سەوسەن گوڵدانچیان گۆڕی بۆ کێشەیەکی گشتی کە ساڵانێکی درێژ هەموو خەڵکی شار پێوەی سەرقاڵبوون.

هەواڵی خوازبێنیکردنی ئاموونییەکان مەنگوڕی بابەگەورەی گەلێک سەغڵەتکرد، تادەهات شتەکان سەختتر دەهاتنە پێشچاوی. ئێستا دەیزانی شانسی کامەرانی سەلما تا بێت بچوکتر دەبێتەوە، ئەو ڕۆژەی ئاموونییەکان هەواڵی خوازبێنییەکەی خۆیان بڵاوکردەوە، دوای چەند سەعاتێک هەواڵەکە گەیشتە کامەرانی سەلماش، هەواڵەکە کەمێک رایچڵەکاند و تێیگەیاند ئەمە شەڕێکی سەختترە لەوەی ئەم سەرەتا دەیبینی، بەڵام دڵنیابوو ئەمیش هەروا ئاسان بەردەمی کەس چۆڵ ناکات. ئەو کات کە هەواڵەکەی بیست لە چایخانەی پەپولەی ئازاد دۆمینەی دەکرد، لە بەرچاوی هەمووان سوێندی خوارد کە تا ڕۆحی تێدا بێت لەگەڵ هەموو هێزێکدا شەڕدەکات و ئامادەیە تا کۆتایی بجەنگێت. هەر ئەو ڕۆژە بە هێمنی لە چایخانەکە هەستا، پولەکانی دانا و چوو بۆ لای مەنگوڕی بابەگەورە. لە ڕاستیدا ئەو هێزە نارەکییەی کامەرانی سەلما دوای بیستنی هەواڵەکە پیشانیدا هێزێکی ڕاستەقینە و تەواوەتی نەبوو، گەنجەکە لە ناوەوە هەستی بە لاوازییەک کرد پێشتر لە خۆیدا نەیبینیبوو. کاتێک مەنگوڕی بابەگەورە چاوی پێیکەوت و هەندێ ئاڵوگۆڕی سەر ڕوخساری خوێندەوە، تێگەیشت ئەم گەنجە بەستەزمانە بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا ترسێکی قووڵ چۆتە ڕۆحییەوە. کامەرانی سەلما هەوڵیدەدا گەلێک شەڕانگێز و توند دەربکەوێت، بەڵام مەنگوڕی بابەگەورە گووتی «ئاموونییەکان عەشرەتێکی بەهێز و گەورەن، من خۆم خالید ئاموون دەناسم، دەزانم چ هەتیوێکی مەکردار و فێڵزانە... چەند ساڵێکە

لە بازاڕدایە، ئەوەی بەوجۆرە چاوی خستۆتە سەر سەوسەن فیکرەت، شتێکی عاجباتییە، من وەک کەسێکی بێخێر تێیگەیشتووم، بە قەبری مردووی هەمووومان بەردەوام حیسابی پاشەڵێکی چڵکنم بۆ کردوە، حیسابی دەرپێیەکی بۆگەن کە هیچی تیا بەستە نییە. هەر وەک کەسێک بینیومە کە دڵی بەو ژنە هەرزانانە خۆشە کە لە پشتی کۆگاکەدا بە هەندێک عەتری بێبۆن و سووراوی هەرزان یان بە تۆزە دینارێک لەسەر فەردەی جلە تورکییەکان دەیانگەوزێنی... بەڵام وەها جوانناس بێت حەز لە سەوسەن فیکرەت بکات... نا... شتی وا ناچێت بە خەیاڵمدا. هیچی لە جوانناس ناچێت، پتر لە قاچاغچییەک دەچێت پارەی خورابێت، شێوەی سەیرکردن و وەستانی شتێکی تێدایە مرۆڤ تووشی ژانە سک دەکات. باوەڕناکەم کچێکی وەک سەوسەن فیکرەت، سەروچاوێکی وەهای خۆشبوێت... یان... نازانم... لەوانەشە. بەدرێژایی ژیانم زۆربەی ئەو قسانەی لەسەر ئافرەت کردومن هەڵەبوون، بەڵام ئەوەی ترسناکە ئامۆنییەکان بە هەموو چەک و تفاقی خۆیانەوە چوونەتە پشتی... لە سیودووساڵی ڕابوردوودا هیچ ئامۆنییەک لە مەسەلەی ژن و ژنخوازیدا نەیدۆڕاندوە، ئەوەی من بزانم و لە بازاڕدا بڵاوە ئامۆنییەکان تا ئێستا نەچوونەتە خوازبێنی کچێک و بۆیان نەبێت. لەبەرئەوە گەر ئێمە بچینە شەڕەکەوە دەبێت بزانین شەڕێکی ڕاستەقینەیە کە کلکی شێری تیا دەقرتێت... ئامۆنییەکان وەک ئەو هەتیوە ڕیوەڵەیەی زانکۆ نین... ئەوان عەشرەتێکی گەورەن، خەڵکێکی زۆر شەڕانیان هەیە کە دەست بە قوونی سەگدا دەکەن، لە منی وەربگرە... گەر بزانین شەڕەکەمان پێناکرێت، دەبێت پەشتەماڵێکی باش ببەستین و هەر زوو بەر جوڕنەکە چۆڵبکەین... تۆ خۆت دەبێت پێمبڵێیت من چی بکەم... ڕابکەم یان بوەستم».

کامەرانی سەلما گووتی «تۆ دەڵێیت چی، مەنگوڕ... تۆ بیت لە

شـوێنی مـن چـی دەکەیـت؟... مـن ناتوانـم هـەروا ئاسـان وازبهێنـم».
مەنگوڕ دەیگووت «یوسـف کەویار بـە ڕەحمـەت بێـت دەیگووت ـ شـەڕ بەبێ تـرس خـۆش نییـە ـ. لـە شـەڕی ڕاسـتەقینەدا پیـاوی وەکـو ئێمـە لـە پێشـدا ئەژنـۆی دەلەرزێـت، لەوانەیـە لـە دوایشـدا ئەژنۆمـان هـەر بلەرزێـت، دوائـەوە کـێ چوزانێـت، گـەر سەوسـەن فیکـرەت بڕیـار بـۆ تـۆ بدات، ئـەوکات حیسـابی ئامووننییـەکان پاکـە، یەکسـەرە حیسـابیان پاکـە. حەیفـە هـەر لـە ناوەڕاسـتی ڕێـگادا وەک قەلـی گرگـن بـاڵ شـۆڕبکەین و بڵێیـن تـەواو، وەکـو قەتێـی نەخـۆش بچینـەوە کونەکـەی خۆمـان... ڕاسـتە ئامووننییـەکان بەهێـزن، بـەڵام بەهێزتریـن لایـەن ئەوەیـە کـە سەوسـەن هەڵیدەبژێرێـت، گـەر سەوسـەن تـۆی بـە دڵ بێـت، ئـەوا حیسـابیان پاکـە... بۆیـە دەبێـت بەردەوامبیـن... خوازبێنیکەرانـی خۆمـان بنێریـن... وا بجوڵێینـەوە وەک ئـەوەی هیچمـان نەبیسـتووە، بـە ناموسـی دایکـی خـۆم و خـۆت، هەندێجـار گوێیەکـی کـەڕ لـە چەقۆیەکـی تیـژ چاکتـرە... یەکەمجـار گـوێ کەڕەکـەی خۆمـان دەدەینـە ئامووننییـەکان، دواتـر سـەیردەکەین بزانیـن چـی دەبێـت».
کامـەران لـە ناخـەوە وەک گیانەوەرێکـی برینـداری لێهاتبـوو، گەرچـی دەیویسـت خـۆی خۆگـر و بێبـاک دەربخـات، بـەڵام هەمـان ئـەو دۆخـە نائارامە دایگـرت بـوو کـە بـەر لـە بریندارکردنـی مەنسـور ئەسرین تیـا دەژیا. کامەران بەپێچەوانـەی مەنگـوڕەوە پێیوابـوو کـە خالیـد ئامـوون دەبێـت تێبـگات سـەروکاری لەگـەڵ خەڵکێکدایـە کـە دەتوانـن دەسـت بوەشـێنن، ئامـادە و لەسـەرپێن بـۆ شـەڕ. شـتێک لـە کامەرانـدا بوو پتـر هانیدەدا بجوڵێت، دەسـت بوەشـێنێت، خـۆی دەربخـات... بـەڵام مەنگـوڕ دڵنیابوو ئەمجـۆرە نمایشـانە لـە بـەردەم ئامووننییەکانـدا وەک وروژاندنـی کـورەی زەردەواڵـە وایـە، زۆری ویسـت تـا ئـەوەی لـە کامـەران گەیانـد کـە شـەرکەری ڕاسـتەقینە مەخلوقێکی بەسـەبرە، گووتـی «مـن عومـرم لەگـەڵ شـەڕکەرەکاندا بردۆتـە سـەر، هیـچ کـەس وەک ئەوانـەی بـە چەقـۆ شـەڕدەکەن پێویسـتیان بـە سـەبر نییـە،

ئەوان شەڕکەری ڕاستەقینەن... گوێبگرە کوڕەکەی سەلما نۆڵان، تۆ زۆر عەزیزی لەلام، چەقۆ هەڵگرتن و چەقۆکێشی شتێکی قورسە، تێدەگەیت یوسف کەریاری گەورە لە فیشەک تەقاندندا دەست ڕاستێکی بێوێنەبوو، بەڵام شەرمیدەکرد دەمانچە لە دوژمنەکەی دەربهێنێت. ئێمە لە شەڕدا ئەخلاقمان هەیە، تۆ جارێ هێشتا تەواو لە نیشەکە تێنەگەیشتوویت، ئەو بەیانییەی عونیلی سەبەی قەیماغیان کوشت، براکەی دەمانچەیەکی پەرەلێلی خستە بەر پشتێنەکەی، گووتی «عونیل، باپێت بێت، کەس ئەمڕۆ بەم ئەبونەلقە حیزانە شەڕناکات، تێدەگەیت دوایی دەتکوژن، ئەمە وەکو ئەوە وایە بچیت بۆ شەڕ و چەکت پێ نەبێت». دەبێت بڵێم کە عونیل لە چەقۆکێشە شارەزاکان بوو، وەک یوسف کەریار وابوو، خەریکە بڵێم لەویش چەقۆپەرستتر بوو، هەموو ئەوانە چەقۆیان لە هەر چەکێکی تری دونیا لا عەزیزتر بوو، هەموو ڕایان وابوو کە کەسی ئازا ئەوەیە کە دوور بە دوور شەڕناکات. شەڕ یەعنی ئەوەی لەش بەر لەش بکەوێت، خوێنی بەرامبەرەکەت ببینیت، چاوت لێیبێت کاتێک لێت نزیکدەبێتەوە، گوێتان لە هەناسەی یەک بێت. ئەو ڕۆژە عونیل دەیزانی دەیکوژن، هەموو دەمانزانی گەر دەمانچەی پێبووایە نەیاندەوێرا توخنیبکەون... کوڕێکی وەهابوو شاخ سامی لێدەکرد، بەڵام کە هاتەدەرەوە یەکە یەکە بە هەمووانی گووت لە چەقۆیەک زیاتر هیچی تری پێ نییە، لەسەر سوچی دوکانەکەی مام شاهیر کوشتیان، سێ دەمانچە تەقەیان لێکرد، سێ دەمانچە، ئاوها بوو... بە ڕۆژی نیوەڕۆ کوشتیان... ژمارەیەکی زۆر لە چەقۆکێشە ڕەسەنەکان ئاوها کوژران... هەموو دەیانزانی دەکوژرێن، هەموو دەیانزانی کە سەردەمی چەقۆ بەسەر چووە، بەڵام دەمارێکی ڕەقی ئازایەتی دەیخرۆشاندن، زۆربەیان تا مردن لە چەقۆ زیاتر چەکێکی تریان هەڵنەگرت... منیش لەو توخم و چیزەیەم، هەرچییەکیش دەناسم لەو توخم و چیزەیەن، حەزدەکەم تۆش ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمانچە هەڵنەگرێت،

تفەنگ چەکی پیاوی ترسنۆکە... لەبەرئەوە بزانە تۆ تا ئێستا سەروکارت لەگەڵ خەڵکی دەستەوەستاندا بووە، بەقەبری مردووی هەموومان، شکم لە ئازایەتی تۆ نییە... مەگەر مەلاییکەت بزانێت من چەند حورمەت و تەقدیرم بۆ ئەو ئازایەتییە هەیە... بەڵام سوێندت دەدەم، بە شەرەفی سەلمای دایکیشت دەتخەمە بەر وەعدی خۆت، کەسانی بەستەزمانی وەک کوڕەکەی ئیبراهیم ئەسرین مەکە بە پێوەر، ئامووشییەکان خەڵکی دڕن، یاریکردن لەگەڵیاندا سەبر و فێڵی دەوێت. نامەوێت وەک عونیل و سمەی دادە بێدوگ بتکوژن... من ئێستا عومرم لە پەنجا نزیک دەبێتەوە، ئەوەی کە دەڵێم هەموو شتێکت بۆدەکەم بەڕاستیمە و درۆت لەگەڵ ناکەم، من تا ئەم عومرە نە ژنم هێناوە و نە کوڕم هەیە... تۆ وەک کوڕی خۆم سەیردەکەم... ئەم مەسەلەیەی تۆ بۆ من وەک مەسەلەی ژیان و مردن وایە، خۆت دەزانی. گەر بتەوێت لە ماوەی چوار سەعاتدا بیست لە باشترین چەقۆکێشەکانی هەموو ئەم ناوچەیەت بۆ کۆدەکەمەوە، بەڵام هەموو شتێک کات و وادەی خۆی هەیە. دەزانم گەر شتێکت لێبێت، لە کوژرانی یوسف کەویار قورستر لەسەر دڵم تەواودەبێت... ئێمە تەنیا سەرو چەقۆیەکمان پێیە، ئامووشییەکان خەتەرن... دەبێت بە زیرەکی قوون لە ئاگرەکە نزیکبکەینەوە... بەڕاستیمە... دەبێت یارییەکی پاک و تەمیزیان لەگەڵدا بکەین. دەبێت چاوەڕوانبین، هەرکات دەرفەتمان بۆ گونجا زیرەکانە دەست بوەشێنین، دڵنیام گەر سەبرمان هەبێت، ساتێک دێتە پێشێ دەتوانین بیانشکێنین... بەڵام ئێستا دەبێت بیر لە دڵی سەوسەن گوڵدانچی بکەینەوە، شتێک نەکەین وەک دوو جانەوەری بەرەڵا بمانبینێت».

دەبێت بڵێین کە کامەرانی سەلما لەگەڵ سەبر و هێمنییدا کێشەیەکی زۆری هەبوو، لەو جۆرە مرۆڤانەبوو کە ئاگرێک دەچێتە خوێنیانەوە و بە زەحمەت دەستەمۆدەکرێن، بەڵام کاریگەری مەنکوڕ لەسەری گەورە

بوو، ئەو تاکە کەسێک بوو دەیتوانی جڵەوبیکات، دەیزانی دەرچوونی لە قسەی مەنگوڕ مەترسی گەورەی بەدواوەیە. ئەو ئێوارەیە کە مەنگوڕی بەجێهێشت ڕاستەوخۆ چوو بۆ بارێکی بچوک، کەمجار بە تەنیا دەیخواردەوە، بەڵام هەرجارێکیش هەستی بە لاوازی بکردایە دەچوو بۆ ئەو بارە بچوکە و لەوێ وەک عارەقخۆرێکی نەناس خۆی مەستدەکرد. لەوانە نەبوو بتوانێت وەسفی دۆخی خۆی بکات، یان لە ناخی خۆیدا زۆر لە سروشتی سۆزەکانی ڕابمێنێت، گەر یەکێکی خۆشبویستایە دەیزانی و گەر ڕقیشی لە یەکێک بووایە دەیزانی، هەڵچوونەکانی لە نێوان ئەو دوو جەمسەرەدا دەهاتن و دەچوون، توانای ئەوەی نەبوو وەسفی ئەو شتانەبکات کە لە دڵیدا دەگوزەرێن، لەبەرئەوە خۆشی و غەمگینییەکانی توندتربوون. ئێستا هەموو ئومێدی ئەوەبوو کە لە چاوپێکەوتنی فیکرەت گوڵدانچی و کچەکەیدا سەرنجێکی وەها جێبهێڵێت بتوانێ لە شەڕەکەدا بە ئارەزوویەکی ڕاستەقینەوە بمێنێتەوە، بەڵام گەر سەوسەن ڕاستەوخۆ بیکاتە دەرەوە، یان گەر بەڕاستی مەنسور ئەسرین هەڵبژێرێت، یاخود بڕیار بۆ سامان و شان و شکۆی ئامونییەکان بدات، هەموو ژیانی بە برینداری دەمێنێتەوە... هیچی بۆ نامێنێتەوە، ئەوە نەبێت شێتانە خۆی فڕێبداتە هەر شەڕە چەقۆیەکەوە کە دێتە سەر ڕێگای تا دواجار یەکێک بە مردن لەدەست ئازارەکانی ڕزگاریبکات... لە ڕاستیدا نەیدەزانی چەند سەوسەنی خۆشدەوێت، هیچ پێوەرێکی بۆ ئەوە پێ نەبوو، هیچ وشەیەکی نەدەزانی باسی دڵی خۆی پێبکات، بەڵام دەیزانی گەر سەوسەن شوو بە یەکێکی دی بکات، دەبێت پەلەبکات، زۆر زۆر پەلەبکات بۆ ئەوەی بەزووترین کات لە شەڕە چەقۆیەکدا بکوژرێت و ڕزگاری بێت.

## ١٥

شیعرەکەی مستەفا هەژار و گۆرانییەکەی ساقی مەحمود لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا مەنسور ئەسرینیان گۆڕی بۆ پاڵەوانێکی ئەفسانەیی، بەوەدا شارەکە لە مێژبوو هیچ چیرۆکێکی دڵداری ڕاستەقینە نەژیابوو، پێدەچێت لەو سەردەم و زەمانەدا پێویستی بە وێنەی عاشقێکی ناسک بووبێت کە بەڕاستی بۆ خۆشەویستی بمرێت. گۆرانییەکەی ساقی مەحمود لە ماوەیەکی کورتدا لە هەموو شوێنێکدا دەگوترایەوە، مەنسور ئەسرین بێئەوەی بیەوێت لە ناکاو لەسەر هەموو زارێک بوو. ئەو ناوبانگە کتوپڕە و ئەو بڵاوبوونەوە خێرایەی چیرۆکی برینداربیەکەی، گەلێک دۆستی نزیک و هاوسۆزی بۆ مەنسور دروستکرد، هەتا هەندێک لە شاعیر و مۆسیقاران بەتایبەت سەردانیانکرد. کە کامەرانی سەلما و خالید ئاموون چوونە خوازبێنی سەوسەن، هەموو شار پێکڕا چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد لە هەنگاوی داهاتوودا مەنسور ئەسرینیش دەست هەڵبهێنێت و خوازبێنیکەرانی خۆی بنێرێت. کەمتەرخەمی و لاوازی مەنسور تا ئەندازەیەکی زۆر هەموانی سەرسامکرد، بە جۆرێک کار گەیشتە ئەوەی دەبایە ئیبراهیمی باوکی و فەرید ئەسرینی مامی دوو بە دوو لەگەڵیدا بدوێن تا ڕازیبکەن بچێتە سەر هێڵی داواکاران. لەڕاستیدا دوای سەردانەکەی مریەم، مەنسور هەستی ئەوەی لادروستبوو کە هەر هەوڵ و هەنگاوێک لەو بارەیەوە بێهودەیە، بەڵام گوشاری هاوڕێ و خزمەکانی،

گوشاری ساقی مەحمود و گورانیبێژەکانی دۆستی، گوشاری شاعیرە گەنجەکانی شار، پێکڕا هێزێکی ئەوتۆیان خستە سەر مەنسور بیر لەوەبکاتەوە بە هەموو توانای خۆیەوە بچێتە ناو کێبڕکێ گەورەکەوە. چەند ڕۆژێک ماڵی مەنسور ئەسرین لە هەرە ماڵە قەرەباڵغەکانی شار بوو، گەلێک لە ڕۆشنبیران و خوێندکارانی زانکۆ لە پشتی مەنسور وەستابوون، هەموو پەیتا پەیتا سەردانی ئەویان دەکرد، گەر بهاتبایە و ئاغای ئەسرین لەوە زیاتر لاوازی بنواندایە، هەمووان تووشی نائومێدییەکی گەورە دەبوون، بۆیە هەموو خزمانی ئەسرینیش پێکڕا پێیان وابوو کە مەنسور ڕێگایەکی دیکەی لە بەردەمدا نییە ئەوە نەبێت تا کۆتایی لەگەڵ چیرۆکەکەدا بڕوات.

گەر ئەو فشارانە نەبوونایە، پێنەدەچوو مەنسور ئەسرین لەهەمان ئەو دەمەدا بنێرێتە خوازبێنی سەوسەن فیکرەت.

گروپی خوازبێنیکەرانی مەنسور ئەسرین لە هەموو گروپەکانی تر گەورەتر بوو، جگە لە ئیبراهیم ئەسرین و براکەی، دوو شاعیری بەناوبانگ و ساقی مەحمود و مامۆستایەکی زانکۆ و هەندێ کەسی دیکەشی تێدابوو. دەبێت بڵێین کە ئەوانیش لە خوازبێنی خۆیان وەڵامێکی ئاشکرایان دەست نەکەوت.

فیکرەت گوڵدانچی کە شەپۆلی یەک لە دوای یەکی خوازبێنیکەران پەشۆکاندبووی، لەوە دەترسا شتەکان بە ئاقارێکی تاریکدا بڕۆن و لەدەست دەربچن. ئەو شەوە لەدوای ماڵاوایی ئیبراهیم ئەسرین و هاوڕێکانی ترسێکی کتوپڕ دایگرت و داوای لە کچەکانی کرد شتەکانیان کۆبکەنەوە، بۆ ئەوەی بە خێرایی و نهێنی شار چۆڵبکەن و بگەڕێنەوە بۆ بەغداد. بەڵام ئەو شەوە سەوسەن بە ماکسییەکی شینەوە، بە دەنگە هەمیشە ئارامەکەیەوە کە لە کاتی ئاسایی و تووڕەییشدا یەک تۆنی هەبوو، باوکی دڵنیاکردەوە و گووتی «گەر تۆ لێگەڕێیت، من تەنیا کەسێکم دەتوانم ئەم مەسەلەیە

چارەبکـەم و نەشـزانم چـۆن چارەیدەکـەم». هێـز و ئازایەتـی کچەکـە فیکرەت گوڵدانچی سەرسامکرد، پێشتر کچەکە بە هیچ تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەی ژیانـدا تێنەپـەڕی بـوو، هەستیکرد ئەمـە یەکەمیـن ئەزمونـە کچەکە پیایدا تێپەڕدەبێت، لەبەرئـەوە لێگـەڕا پێیـدا بـڕوات.

مەنسـور ئەسـرین هێنـدە ئازایەتـی تێدابـوو بـە ئاشـکرا لای هەمـووان بڵێت هیچ شتێک دەربارەی سۆز و هەستەکانی ئـەو خانمـە بەرامبەر خۆی نازانێـت. لـە دوای ڕووداوی چەقۆکـەوە، هەسـتێکی قووڵـی لاوازی لـە خۆیدا دەدۆزییـەوە کـە پێشـتر هەستی پـێ نەکردبـوو، هەسـتیکرد دوای چەقۆکـە بـە جۆرێکـی تـر بیـر لـە خۆشەویسـتی کچەکـەی گوڵدانچـی دەکاتـەوە، ئـەوکات کـە بیسـتی کـوڕی یەکێـک لـە ئامووزنییـەکان خوازبێنـی سەوسـەن دەکات، تێگەیشـت هێـدی هێـدی ئـەم عەشـقە بـەرەو جـۆرە جەنگێکـی گـەورە وەردەگەڕێـت، ئـەوەی بتوانێـت لـە یـەک کاتـدا عاشـقیش بێـت و شەڕکەریش بێـت، ئەرکێکـی سـەخت بـوو. ئـەوەی بتوانێـت عاشـق بێـت و پڕپیش بێت لـە ڕق و تووڕەیـی ئاسـان بەیەکـەوە نەدەگونجـان، بـەڵام ترسێکی گـەورەی هەبـوو ئـەوە ئاشـکرابکات. چـی دەبێـت گـەر بڵێـت نایەوێـت لەگـەڵ عاشـقەکانی تـری سەوسـەن فیکرەتـدا بچێتـە جەنگـەوە... چـی دەبێـت؟. لـەم شـارەدا کـە مـرۆڤ عاشـق بـوو، دەبێـت ببێـت بـە ڕەقیبـی چەندەهـا خەڵکـی تـر. سـەیری لێهـات کـە خۆشەویسـتی لـە قووڵاییـدا بـەو چەشـنە بـە کینـەوە گرێـدراوە. دڵنیابـوو کـە کامەرانـی سـەلما دۆڵانـی خۆشـناوێت، بـەڵام کڵپەیەکی کینـە لـە کامەرانـدا هەبـوو ئـەم لـە خۆیدا نەیدەبینـی. ئـەو سـاتەی هاتـەوە پێشـچاو کـە کامـەران پەلاماریـدا، لـە چاویـدا ئـەو کینـە گـەورە و قووڵـە هەبـوو کـە کینەیەکـی ئاسـایی نەبـوو، کینەیەکـی بێسـنوور کـە تەنیـا لەگـەڵ خۆشەویسـتیدا دروسـت دەبێـت. هەسـتیکرد بـەوەدا ئـەم ئەوجـۆرە کینەیـەی تێدا نییـە، ناتوانێـت بەڕاسـتی عاشـق بێـت، دڵنیابـوو سەوسـەن فیکرەتـی خۆشـدەوێت، بـەڵام چـۆن ؟ خۆشەویسـتی هەمیشـە

نیوەی لە کینە دروستبووە، ئەمیش ئەو نیوەیە لە خۆیدا نانۆزێتەوە، ئەو ڕۆحە جەنگاوەرەی نییە کە بیجوڵێنێت. بەدەستی بووایە هەموو ئەو ڕەوتەی دەگێڕایەوە دواوە بۆ ئەوەی نەهێڵێت ساقی مەحمود ئەو گۆرانییە بڵێت کە ئەم تێیدا وەک شەهیدێک دەردەکەوێت. ئەو ماوەیە بڕیاریدا نەچێتەوە بۆ زانکۆ، هەستیکرد پێویستی بەوەیە ساڵێک پشوویدات، زۆربەی شەوان لە ژوورە بچوکەکەی خۆیدا دەمایەوە و هیچی نەدەکرد، دەیتوانی ماوەی درێژ لەسەر جێگاکەی خۆی بمێنێتەوە و هیچ نەکات. هەمیشە گوێی لە دەنگی خوشکەکانی بوو کە قسەدەکەن بێئەوەی بزانێت چی دەڵێن، دڵنیابوو هەموو باسی ئەم دەکەن، لە ماڵەوە، لە زانکۆ، لە ناو خزماندا، لە کۆڵان، کچانی شار، شاعیرەکان، پۆلیسەکان... هەموو کەس... ئەوەی بەردەوام خەڵک باستبکەن و تۆ نەزانیت دەڵێن چی، ئازارێکی گەورە بوو، دەیزانی هەموو ئەو قسانەی لە بەردەمیدا دەیکەن ئەو قسانە نییە کە لە پشتەوە دەیکەن، بەڵام نە ڕێگای هەبوو، نەتواناشی هەبوو بزانێت چۆن باسیدەکەن. مەنسور نەسرین لە دڵی خۆیدا گووتی «جەهەنەم ئەوەیە خەڵک هەموو باستبکەن و تۆ نەزانیت دەڵێن چی». ئەو شتەکانی وادەبینی وەک ئەوەی ئەو پشتگیرییە گەورەیەی کە دەکرێت، بۆ کەسێکی دی بێت کە دوور و نزیک پەیوەندی بەمەوە نییە. لە دڵی خۆیدا گووتی «ساقی مەحمود من ناناسێت، مستەفا هەزاریش... هیچیان بە تەواوەتی نازانن لەو شەوەدا چی ڕوویداوە...». گرنگترین شتی ئەو شەوە ئەو کینە قووڵە بوو لە چاوی کامەرانی سەلمادا، ئەو کینەیەی کە ئەم ناتوانێت لە دڵی خۆیدا بیدۆزێتەوە... بەڵام بۆ ئەوەی خەڵک وەک عاشق تێیبگەن، دەبێت وا خۆی نیشانبدات کە ئەویش دەتوانێت شەڕ بۆ خۆشەویستی بکات... دەبێت بەردەوام بێت... هیچ ڕێگایەک و هیچ چارەیەکی تری نییە، کە ڕقێک نیشانبدات کە تیا نییە، ئیرادەیەک دەربخات کە نییەتی.

## ١٦

گەر لەدوورەوە سەیری ماڵی سەوسەن فیکرەتت بکردایە گەلێک ئارام دەینواند، بەڵام هەموو ماڵەکانی دونیا لەدەرەوە ئارام دەنوێنن، چی لە ناوەوە دەگوزەرێت، ئەوەیان کەس بە دروستی نازانێت. ئەو ئێوارەیەی کە فیکرەت گوڵدانچی و دوو کچەکەی لە تاکسییەکدا چوون بۆ ماڵی خەندە گوڵدانچی پووری سەوسەن، هەر سێکیان گەلێک ئارام و لەسەرەخۆ دیاربوون، شتێکیان پێوە دیار نەبوو نیشانەی پەشۆکان و شپرزەیی بێت، بە هەنگاوی ئارام دەڕۆیشتن، بە نیگای هێمن سەیری چواردەوەری خۆیان دەکرد و بەزەردەخەنەی ناسک وەڵامی هەموو خەندەیەکیان دەدایەوە. لە ڕاستیدا کۆبوونەوەکە بەهۆی چەژنی لەدایکبوونی کچەزایەکی خەندەوە بوو کە تەمەنی دەبوو بە دوو ساڵ بەڵام بۆنەیەکی ڕاستەقینەش بوو، گوڵدانچییەکان پێکەوە کۆببنەوە و قسەیەک لەسەر ئەو سێ خوازبێنیکەرە بکەن کە داوای سەوسەنیان دەکرد. گوڵدانچییەکان گەرچی لە مێژبوو لە شاردا دەژیان، بەڵام هیچ کات وەک ئێستا نەکەوتبوونە سەر زاران، ئەوەی ئەم کچە لاواز و نەخۆشە کە بەردەوام بەدەست سەرئێشە و کەمخوێنییەوە دەناڵێنێت بەو خێراییە هەموو شاری بە خۆیەوە سەرقاڵکردوە مایەی ناڕەحەتی زۆربەی کچەکانی دیکەی بنەماڵەی گوڵدانچی بوو، کە جگە لە مەخلوقێکی لاوازی ڕەنگپەڕیو هیچی دیکەیان تێدا نەدەبینییەوە شایستەی ئەو هەموو سەرسامی و دەنگەدەنگەبێت.

دەبێت بڵێم ئەوەی لە پڕ کچێکی غەریب لە شارێکی ترەوە بێت و ببێتە مایەی شەڕەچەقۆ لە نێوان کۆمەڵێک گەنجدا مایەی بێزاری و برینداربوونی زۆربەی خانمانی شار بوو، کە پێکڕا وایان هەستدەکرد تانەیەکی قورس لە نرخ و جوانیان دراوە. بەڵام سەوسەن فیکرەت خۆی لەوە دڵسافتر بوو هەست بەو شتانە بکات یان لە دڵی بگرێت. مەسەلەکە ئەوە نەبوو سەوسەن لەو شتانە تێنەگات، بەڵکو هێند هەبوو گەر هەستیشی پێبکردایە پەرچەکردارێکی پێچەوانەی نیشان نەدەدا کە بۆنی شەڕانگێزی لێبێت. سەرەتا کە لە بەغدا هاتبوونەوە زۆربەی گوڵدانچییەکان و نەوەکانیان وەک کچێکی لووتبەرز دەیانبینی، بەڵام هەموو زوو تێگەیشتن کە کەمدوویی و تەنهاییەکەی پەیوەندی بە لووتبەرزییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئەو کچێکە بە ئاسانی بابەتێک نادۆزێتەوە بۆ قسەکردن... هەر کاتیش بیەوێت قسەبکات، بەدەنگێکی لاواز، کە خاڵی نییە لە ئاوازێکی ناوەکی باسی جۆرە جیاوازەکانی گوڵەباغ، باسی شێوە شورای هەندێک شاری کۆن، باسی جەشنی بەلەمە کۆنەکان و جل و بەرگی جەنگاوەرە فارس و عەرەبە دێرینەکان دەکات. لە ڕاستیدا کچەکە دەیتوانی لەسەر هەموو ئەو شتانە قسەبکات کە ئەوانی تر نەیاندەزانی و بە پێچەوانەشەوە هیچی ئەوتۆی لە هەموو ئەو شتانە نەدەزانی کە ئەوانی دی دەیزانن. ژووری دانیشتنەکەی خەندە گوڵدانچی ژوورێکی گەورە بوو، دیوارەکانی سەرجەمی وێنەی پیاوان و ژنانی پیری خێزانی گوڵدانچی بوو، لە باپیرە و نەنکە گەورەکانیان، لەو وێنانەوە بیگرە کە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی هەرەسی عوسمانییەکان تا ئەو وێنانەی بە مۆدێلە سەرەتاییەکانی کامێرای ڕەنگاوڕەنگ گیرابوون. چەندەها گوڵدانی گەورە و باڵندەی شوشە و قۆری کریستاڵ لەسەر ڕەفەکان دانرابوون. خەندە گوڵدانچی لە گەنجییەکی زووەوە حەزی لە کۆکردنەوەی قۆری بوو، بەجۆرێک مێردەکەی

بـەردەوام پێیدەگـووت «دەبایـە لەسـەرەتاوە شـووی بـە چایچییـەک بکردبایـە». شـتێک لـە ژوورەکـەدا بـوو سەوسـەنی سەرسامدەکرد، هەوایـەک و بۆن و بەرامەیەکی دێرین، هەناسـەی سـەردەمێک کە بـە پاکژی لەوێدا هەڵگیرابوو. سەوسەن هەرجارێک کە دەهاتـە ئـەو ژوورەوە دەیگـووت «ئاه پـورە خەنـدە، لـەم ژوورەدا هەمـوو دەبێـت سـووک قسـەبکەین، چونکـە واهەستدەکەم شتێکی کۆن لێرەدا خەوتـووە». قەنەفـە گـەورە دێرینـەکان، مێـزە تەختـەکان کـە پێدەچـوو دەسـتێکی نهێنـی بـەردەوام ئسـپەرتۆیان بکاتـەوە، دوو ڕەفـەی سـیرامیکی پیرۆزەیـی کـە شـکۆ و جوانـی دەورو زەمانێکـی تریـان لـە ژوورەکـەدا پەخشـدەکردەوە. ئـەو شـتانە فـەزای ژوورەکەیـان گۆڕیبـوو بـۆ فـەزای مۆزەخانەیـەک کـە تەنیـا بۆنـە و بۆنـە دەرگاکانـی دەکرێتـەوە... مێردەکـەی پـورە خەنـدە، پیاوێکـی بێدەنـگ بـوو، هەمیشـە سـەر پـڕ خەیـاڵ و ئاڵـۆز دەینواند، پێدەچوو کابـرا بێدەنگییەکـەی نـاو ناخـی خـۆی بەخشـی بێـت بـەو ژوورە. کـە یەکەمجـار هاتـن بـۆ ماڵـی پـورە خەنـدە و گـەڕانـەوە، سەوسـەن لـە تاکسـییەکەدا باسـی ئـەو هەسـتەی بـۆ باوکـی کـرد، فیکـرەت گوڵدانچـی گـوتـی «شـتێکی سـەیر نییـە، ڕۆحـی مـرۆڤ زوو ڕەنگـی شـوێنەکان دەگرێـت و شـوێنەکانیش زوو ڕەنگـی ڕۆحـی مـرۆڤ دەگـرن». بـەڵام ئەمـڕۆ ژوورەکـە بەجۆرێـک لـە بەرچـاوی ئـەو گەورەبـوو، تـا خەڵکـی تێدەهـات هەسـتیدەکرد زیاتـر و زیاتـر خەڵـک دەگرێـت. هەفتەیـەک بـوو هەمـوو گوڵدانچییـەکان لـە پرسـیاری سـێ خوازبێنیکـەرە شـەیداکەی سەوسـەندا بـوون، ئـەو ئێوارەیـە پێکـڕا لەسـەر داوای فیکـرەت گوڵدانچـی لـەوێ کۆبووبوونـەوە بـۆ ئـەوەی شـتێک زانیـاری لەسـەر ئـەو بابەتـە بگۆڕنـەوە. چەنـد ڕۆژێـک بـوو کوڕانـی گوڵدانچـی، شـێرزادی عیـزەت گوڵدانچـی و هوشـیاری پـورە خەنـدە و نەبیلـی پـورە مەعسـوم، بـازاڕ بـۆ هەواڵـی ئـەو سـێ داواکارە دەگـەڕان. سەوسـەن ئەوجـۆرە گـەڕان و پرسـیارکردنەی بـە شایسـتەی جەفەنـگ و پێکەنیـن دەزانـی...

ئەوەی سێ گەنجی وەها بە قامەت و قیافەت بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ دوکانە و دوکان بازاڕ بگەڕێن مایەی شەرم و شورەیی بوو. سەوسەن تێنەدەگەیشت چۆن ڕێگا بە خۆیان دەدەن بچنە جێگای چاوی ئەو، دواتەوە چۆن مرۆڤ لە ڕێگای قسەی بازاڕەوە دەتوانێت مرۆڤێکی تر هەڵسەنگێنێت، ئەمە جگە لەوەی پیاوانی ئەم شارە هەموو بە شێوەیەک لە شێوەکان لە یەکتر دەچن. سێ کوڕە پوورەکەی سەوسەن وەک هەموو گوڵدانچییەکانی تر باڵابەرزبوون، ویقارێکیان تێدابوو سروشتی و خۆڕسک دەینواند، بەردەوام قاتیان لەبەردەکرد، بۆینباخیان دەبەست، هەر سێکیشان یەکجۆر زانیاریان پێبوو، دانیشتنەکەشیان بەوە کردەوە کە کامەرانی سەلما، هەتیوێکی چەقۆکێشی بێڕەحمە کە هەموو شار وەک قومارچییەک و شەرابخۆرێکی بێخێر و بێمرووەت دەیناسن کە عومری لە چایخانە و قومارخانەی ئوتێلەکاندا دەباتەسەر. شێرزادی عیزەت گوڵدانچی کە لە پۆلی چواری قانون بوو، بەردەوام لە قسەکردنیدا هەوڵیدەدا وەک پارێزەرێک قسەبکات کە باشەی ئامۆزاکەی خۆی دەوێت، بەردەوام دەیگووت «ئامۆزای عەزیزم، شتەکان بۆ ئەوەیە کە تۆ نەکەویتە داوی کەسێکەوە نرخت نەزانێت». هەندێک لە پورزا و ئامۆزاکان سۆزێکی زۆریان لەگەڵ مەنسور ئەسریندا هەبوو، ناوبانگی وەک عاشقێکی گیانفیدا گەیشتبووە هەموو کچانی بنەماڵەی گوڵدانچی و پێکرا وێنەی عاشقێکی شەیدایان تێدا دەبینی کە خەیاڵی هەموو کچێک دەجوڵێنێت، جگە لەوەی مریەم بە قەرەباڵغی و دەنگە تۆفانئاساکەی خۆی و بە خۆتێکەڵکردنە ڕاستەوخۆ و دابەزینە بروسکەئاساکانی بە چەشنێک لە قازانجی مەنسور قسەیدەکرد، هەمووانی ناچارکرد بە ڕاستی بیر لە بەڵگەکانی بکەنەوە. ئەوەی مەنسور کوڕێکی گەنج و جوان و خوێندەوار و عاشق و خاوەن پاشەڕۆژە یەکێک بوو لە چەکە گەورەکانی مریەم. بەڵام پیرەکانی بنەماڵەکە و هەندێک لە کوڕەکان بەپێچەوانەوە خالید

ئامونیـان بـە مێردێکـی گونجاوتـر و چاکتـر بـۆ کچێکـی ناسـکی وەک سەوسەن دەزانـی. عیـزەت گوڵدانچـی لەسـەر ئـەوە سووربوو کـە خزمایەتـی لەگـەڵ ئامونییەکانـدا نـاو و جێـگای هەمـوو گوڵدانچییـەکان بەجۆرێکـی بێوێنـە بەهێـزدەکات، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە بەپێـی پرسـیار خالیـد ئامـون دەتوانێـت ژیانێکـی بێگرفـت بـۆ کچەکـە دابینبـکات، هەروەهـا جـودا لـە هـەردوو داواکارەکـەی تـر دوور لـە زمانـی چەقـۆ و شـەڕ هاتۆتـە داوای کچەکـە. مریـەم گوڵدانچـی بەدرێژایـی دانیشـتنەکە تـەواو بـە پێچەوانـەوە ڕای وابـوو پیاوانێـک کـە کۆگای فرۆشـتنی کەرەسـتەی ژنانەیـان هەیـە، چەشـنە توخمێکـن چاکتـرە کـچ لەمەسـەلەی شـووکردندا بیانخاتـە ئـەولاوە، زۆربەیـان شـوێنی متمانـە نیـن و هەڵبژاردنیـان بـۆ ئـەو ئیشـە، تەنیـا پەیوەنـدی بـە قازانجـە زۆرەکەیـەوە نییـە و مەبەسـتی تریشـی لـە پشـتە. هەمـوو دەیانزانـی مریـەم باسـی چـی دەکات، هەمـوو قاقـا پێدەکەنیـن، هەمـوو سـەیری سەوسـەنیان دەکـرد کـە لەگـەڵ لاوازییەکەیـدا، لەگـەڵ ئـەوەی هەمـوو باسـی ئـەو دەکـەن، پتـر لـە تارماییـەک دەچـوو لـە ناوەڕاسـتیاندا ونبووبێـت. سەوسـەن نزیکـی سـاڵێک دەبـوو هاتبـووە ئـەم شـارە، بـەڵام لای گوڵدانچییـەکان هێشـتا وەک غەریبەیـەک وابـوو کـە کەسـیان نازانـن بەتەواوەتـی چـۆن بیردەکاتـەوە. ڕاسـتە بـەردەوام لەگـەڵ کچـە گەنجەکانـی بنەماڵەکـەدا دەچێتـەدەرێ، بـەڵام جگـە لـە زوو ماندووبوونەکـەی و ئـەو سەرئێشـە هەمیشـەییەی لەگەڵیایەتـی زۆربەیـان شـتێکی ئەوتـۆی دەربـارە نازانـن. هەمـوو دەزانـن دەبێـت مانگانـە دووجـار بچێـت بـۆ لای پزیشـک. لـەوە بترازێت کەسیان زانیارییەکـی ئەوتـۆ گرنگیـان دەربـارەی نییـە. دەبێـت بڵێیـن کـە پێکڕای گوڵدانچییـەکان پڕوشـەیان لەسەوسـەنی خوشـکی لاباشـتر بـوو، پڕوشـە زۆر سـادەتر و کراوەتـر و ئاسـاییتر دەردەکـەوت، بـەڵام هـەر کەسـێک یەکجـار لەگـەڵ سەوسـەندا بـە بـازاڕدا بگەڕابایـە، هەسـتی بـەو کاریگەرییـە قووڵـەی جوانـی ئـەم کچـە لەسـەر پیـاوان دەکـرد. لـە ڕاسـتیدا

سەوسەن لەو شێوە کچانە نییە کە بە لەشی گۆشتن و شێوەی مەکیاجکردن و بالای پڕەوە سەرنجی پیاوان کێشبکات، کچەکە تابڵێی لاوازە، هەتا جووت مەمکێکی بینراویشی نییە، هەموو سیحرەکەی شتێکە لە دەموچاویدا، لە وەستانیدا، لەو سێبەری تەنهاییەی لەسەر ڕوخسارێتی، ئەوەی هەموو کەس لە نیگای یەکەمەوە دەزانێت کچێکی نەخۆشە بێئەندازە جوانیکردوە، جگە لە قژی کە بێئەندازە پڕە، بەجۆرێک دیمەنێکی ناکۆکی لەگەڵ دەموچاوە منداڵانە و بچوکەکەیدا دروستکردوە، ناکۆکییەک کە جوانییەکی زۆر تایبەتی داوەتێ. ئەوەی کە مرۆڤ واهەستدەکات ئێستا نا کەمێکی دی لە هۆش خۆی دەچێت بووە بە نەخشێکی ڕۆمانسی بۆی. چەند شەوێک لەوەوبەر لەداوەتێکدا سەوسەن گوێی لێبوو نەشمیلی پورە فەزیلە لە ناوەڕاستی هەموو کچەکاندا دەڵێت «هەر تێبگەیشتمایە پیاوان حەزیان لە کوێی کردوە... بە مەقاشیش پلێ گۆشتی لێناگریت، ڕەزای مرێ، دەڵێیت مردوە بەسەر ئەرزا دەڕوات». سەوسەن زۆرجار ئەو قسانەی دەبیست، بەڵام وەها بوو وەک ئەوەی نەیبیستێت، ئەو شەوە لە هەموو کچەکان نزیک بووەوە و بەدەنگە ناسکەکەی خۆی گووتی «پیاوان گەمژەن، حەزیان لەو کچانەیە کە پێدەچێت بمرن... خەم مەخۆ پوورزا گیان، هەندێکیان حەزیان لە من نییە، بەڵکو حەزیان لەو مردنە نزیکەیە کە لە مندا دەیبینن». ئەو شەوە لە ماڵی پورە خەندە کە هاتە قسە هەمووان بێدەنگ بوون، دەنگی لەو دەنگە ناسکانەبوو کە لە بێدەنگی تەواوەتیدا نەبایە، مرۆڤ نەیدەتوانی تەواو گوێی لێبێت. گووتی «هەمووتان کامەرانی سەلما وەک شەیتانێک تەماشادەکەن، من نازانم کامەرانی سەلما چۆنە... تا ئێستا نەمبینیوە، بەڵام ئەوەی ئێوە وەک شەیتان سەیری مرۆڤێک دەکەن، ڕاست نییە. ئەوەی واقسەدەکەن وەکو ئەوەی ئەوانی تر هەموو لە کامەرانی سەلما باشترین، ڕاست نییە. ئەوەی قومار دەکات، یان چەقۆ

دەوەشـێنێت شـتێکی خراپـە، بـەڵام ئێمـە هەموومـان خراپیـن... مـن لـە هەمـووان خراپتـرم، چونکـە ناتوانـم هـەروا شـوو بـە هیچیـان بکـەم و ناتوانم دەستیشـیان لێبـەردەم... وانییـە، ئێمـە هەموومـان خراپیـن... کەسمان لـە کامەرانـی سـەلما باشـتر نیـن». فیکـرەت گوڵدانچـی قاقـا پێکەنـی، دڵنیابـوو هیـچ کـەس لەوەوبـەر نەیوێـراوە بـە عیزەتـی بـرای بڵێـت «تـۆ خراپیـت» «تـۆ لـە چەقـۆ کێشـێکی سـەرخۆش باشـتر نیـت». ئـەوە چاوقایمییەکـی گەورە بوو کە زنجیرەی ڕێز و ویقاری لە بنەماڵەی گوڵدانچیدا تێکدەدا.

کچەکـە بـەو هێمنییـەی خۆیـەوە کـە سـەرنجی هەموانـی ڕادەکێشـا بەردەوامبوو«هەرچـی پیـاوی ئـەم شـارەیە دواجـار وەکـو یەکـن، شـتی بچـوک لـە یەکیـان جیادەکاتـەوە کـە نرخێکی وەهایان نییـە... ئا شتی زۆر بچـوک، کـە مـن نازانـم چیـن... بـەڵام هەموویـان لـەم شـارە زیاتـر شـاری تریـان نەبینیـوە... هەموویـان وەک یەکـن، هـەر سـێکیان لای مـن وەک یەکـن... مـن هـەر سێکیانم وەک یـەک خۆشـدەوێت». پـورە مەعسومەی بـە دەنگـە گـڕ و گرمەئاسـاکەی، کـە لـە دەنگـی پیاوەکانـی تایەفـەی گوڵدانچـی نێرتـر بـوو، بـە مەڕەشـەوە گـوتـی «بـەڵام ناتوانیـت شـوو بـە هـەر سێکیان بکەیـت... تێگەیشـتیت... دەتوانیـت تەنیـا شـوو بـە یەکێکیـان بکەیـت».

هەمـوو وایاندەزانـی ئـەو دەنگـە گرمـەکارەی پـورە مەعسـوم، هـەر ئێسـتا سەوسـەن دەشـکێنێت، بـەڵام بـە هێمنـی سـەیریکرد و گـوتـی «لـە ئێسـتادا شـوو بـە هیچیـان ناکـەم، بـەڵام بـۆ پاشـەڕۆژ نازانـم... پـورە مەعسـوم. پاشـەڕۆژ خـۆی بڕیـار دەدات، شـوو بـە چەندیـان دەکـەم». وەڵامەکـەی بـە ئەندازەیـەک سـەیربوو هەموانـی بێدەنگکـرد. هەمـوو دەیانزانـی کیژەکـە تەنیـا بوکەشوشـەیەکی نەخـۆش و لاواز نییـە، بەڵکـو ئیرادەیەکـی گەورەشـی تێدایـە، دەشـیانزانی فیکـرەت گوڵدانچـی زۆری بـەلاوە گرنگـە خانمـە بچکۆلەکـەی ماڵـی بـەو چەشـنە بەهێزبێـت. هەمـوو چاوقایمـی کچەکەیـان دەگێڕایـەوە بـۆ جۆرێـک لـە لاوازی باوکەکـە، بـەڵام هەمـووش دەیانزانـی

لە نێوان گوڵدانچی و سەوسەندا ڕێزێکی قووڵ و شاردراوە هەیە کە هەردووکیان بە وردی سنوورەکەی دەپارێزن.

ئەو ڕۆژە مەراسیمی جەژنی لەدایکبوونەکە بە هێمنی ڕۆی. لە کاتی مۆم کوژاندنەوە و کێک خواردن و دیاری کردنەوەدا هەموو بێدەنگی و لەسەرەخۆیی سەوسەن سەرسامیکردن... ئەوکات هیچ کەس نەیدەزانی سەوسەن بیر لە چی دەکاتەوە، نە لە بنەماڵەی گوڵدانچیدا، نە لە بەرەی داواکارە مەستەکانیدا و نە هیچ کەسێکی دیکەش لە دونیادا.

## ١٧

سەوسەن فیکرەت بڕیاریدا هەر سێ داواکارەکە لە ڕۆژێکدا ببینێت. یەکێکیان لە بەیانیدا، ئەوی دیکەیان لە ئێوارەدا، سێهەمیش لە شەودا. خالید ئاموون یەکەمین کەس بوو کە دەبایە سەعات یازدەی ڕۆژی دیاریکراو لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی ئامادەبێت. چەند دەقیقەیەک بەر لەوادەی خۆی، هاوڕێ بە دوو ئوتومبێلی پڕ لە پیاوان و خزمانی ئاموونی گەیشتە بەردەرگا، ئەوان لە بەردەرکی ماڵی فیکرەت گوڵدانچی دایانگرت و ماڵاواییان لێکرد و ڕۆیشتن. چەند ڕۆژ بوو ئاموونییەکان هەموو هەوڵێکیان دابوو بۆ ئەوەی پاڵپشت بۆ داواکەیان کۆبکەنەوە و گوڵدانچییەکان لە هەموو لایەکەوە بخەنە ژێر گوشاری خۆیان. پارێزگاریان تێکەیاندبوو، فیکرەت گوڵدانچییان بۆ لای قایمقامی شار بانگکردبوو. هەموو شتێکیان بۆ ئەم ساتە ئەنجام دابوو، بۆیە هەموو چاوەڕوانی دەرەنجامی باشیان لەم چاوپێکەوتنە دەکرد.

خالید ئاموون کە چووە ژوورەوە بۆ ساڵۆنە گەورەکەی ماڵی گوڵدانچی، جوانی مۆبێل و تایبەتمەندی دیکۆرەکان و پڕی ژوورەکە لە کتێب و تابلۆ و پەیکەر و شتی ئەنتیک سەرسامیکرد، پێشتر لە ژیانیدا جۆرە ژوورێکی لەم چەشنەی نەبینیبوو. سەیری لێهات کە بێنەوەی فیکرەت گوڵدانچی خۆی پێشوازیبکات، کچێکی گەنجی دی بۆ ژوورێکی تر لە قاتی سەرەوە ڕێنماییکرد. ژوورەکە کتێبخانەیەکی ئێجگار گەورەبوو، دڵنیابوو کەمتر لە

دە هەزار کتێب لەو ژوورەدا نییە، هەتا دیکۆری سەقفەکەش کۆمەڵێک کتێب بوو کە هەر لەسەرەوەڕا بە هەندێک پەت و دەزووی ڕەنگاوڕەنگ هاتبووە خوارێ. ژوورەکە کەمێک تاریک بوو. سەوسەن گوڵدانچی لە کراسێکی زەردی کاڵدا کە پڕبوو لە خەتی سپی ناسک لەو پەڕی ژوورەکەدا لەسەر کورسییەکی چەرمی کۆن و گەورە چاوەڕوانیدەکرد، جگە لە ملوانکەیەکی ڕەش هیچ خشڵێکی تری پێوە نەبوو، هەتا گوارەیەکی هەرزانیشی نەکردبووە گوێی. خالید ئاموون پتر لە چلوپێنج شەو بوو سەوسەنی نەبینیبوو، بە چەشنێک جوان هاتە بەرچاوی، بەزەیی بەدڵی خۆیدا هاتەوە. دیاربوو ئەو جێگایە بە تایبەت چاککراوە تا سەوسەن هەر سێ چاوپێکەوتنە گەورەکەی ژیانی لەوێدا ئەنجامبدات. جگە لەسەوسەن کەسی تر لەو ژوورەدا نەبوو، بەڵام خالید ئاموون هەستیکرد یەکێکی تر کە نابینرێت ئاگاداری هەموو دانیشتنەکەیە، سووسەکردنێکی ناوەکی بوو کە هیچ بەڵگەیەکی نەبوو، بەڵام خۆی بەجۆرێک ڕێکخست کە ئاگادارە یەکێک بە نهێنی چاوەدێریدەکات. سەوسەن گەلێک نەرم و نیان بوو، پێدەچوو پێشوەخت بیری لە هەموو جوڵەیەک و قسەیەکی خۆی کردبێتەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو شتێکیشدا بە چەشنێک ناسک و خۆشەویست بوو، خالید ئاموون ئامادەبوو هەموو شتێک لە پێناویدا دابنێت. کە لەسەر کورسییەکە دانیشت، هەستیکرد سەوسەن بەوردی سەیریدەکات، لە دڵی خۆیدا گووتی «ئێستا دەزانێت من پیاوێکی جوان نیم، ئەوە نیم کە ئەو خەوی پێوە دەبینێت». بەڵام بەخێرایی هەوڵیدا بەسەر ترسەکانیدا سەربکەوێت و خەندەیەکی گەورەی گرت کە کەمجار دەیتوانی بیگرێت. سەوسەن بە هێمنی لەسەر کورسییە چەرمەکەی خۆی دانیشتبوو، کەس نەیدەتوانی ئاماژەیەکی تایبەتی لە شێوەی دانیشتن و سەیرکردنەکەیدا بدۆزێتەوە. سەوسەن بە هێمنییەکەوە کە خالید ئاموونی سەرسامکرد گووتی « بەڕێز خالید ئاموون، حەزمکرد

یەکەم کەس تۆ ببینم، لەبەرئەوەی زۆربەی کەسانی خێزانەکەم تۆ وەک داواکارێکی باش باسدەکەن. بەڵام من نازانم تۆ کێیت... وەختە هیچ شتێکت لەسەر نەزانم... هیچ شتێک... دواجار من کچێکی نەخۆشم، گەر شوو بە هەرَ کەسێک بکەم، دەبێت زۆر شتی لەسەر بزانم».

خالید ئاموون بە ئەدەبێکی زۆرەوە گووتی «سەوسەن خان. هەقی خۆتە، لەسەر هەمووومان، هەموو شتێک بزانیت».

نەیدەویست لەقسەکردندا زۆر بڕوات، ترسێکی هەبوو قسەکانی هەندێ شت ئاشکرابکەن کە نایەوێت سەوسەن بیانبینێت. سەوسەن گووتی «تاکە شتێک کە سەیرە، ئەوەیە تۆ بۆ ئاموونییەکان دەخەیتەکار... پارێزگاری شار، جێگرەکەی، هەموو ئەوانە... خۆت دەزانیت ئەو شتانە دڵی کچێکی نەخۆشی وەک من بەڕاستی دەشکێنێت. من کچێک نیم بە زۆر بۆ کەس بم...».

خالید ئاموون بیریکردەوە، کیژەکە بە جۆرێک ناسکە هەر مەخلوقێک بەزۆر بیەوێت بیبات بۆ خۆی، دەیشکێنێت... لەو بوونەوەرە ناسکانەیە کە تەنیا خۆی دەبێت بجوڵێت، هەر شتێکی بەرکەوێت، لەوانەیە بکەوێت و بشکێت. بەسەردانەوانەوە گووتی «سەوسەن خان... من کوڕی عەشرەتی ئاموونیم، ئەوان دەزانن تۆ چ داواکارێکی زۆرت هەیە، مەسەلەکە هەمووی ئەوەیە من نامەوێت تۆ بدۆڕێنم... لە پێنج مانگ لەمەوبەرەوە کە تۆم بینی، گووتم ئەوە ئەو کچەیە کە من لەم دونیایەدا بۆی دەگەڕێم. من پێشتر هیچ ڕێگایەکم نەبوو کە باسی خۆمت بۆ بکەم... من تکام لە ئاموونییەکان کرد پشتم بگرن، چونکە بۆ یەکەمجارە لە ژیانمدا عاشق دەبم، زۆربەی ئاموونییەکان دەزانن من تەواو نیم، دەزانن چوار مانگە دوکان و کاسبییەکەم هاتۆتە کزی».

سەوسەن پرسی «نازانم، دەتوانم بپرسم، کزبوونی کاسبییەکەی تۆ، چ پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە؟»

خالید ئاموون ئێستا بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا هەوڵی دەدا، لە بەردەم کەسێکدا وەک عاشق دەربکەوێت: «پەیوەندی ئەوەیە کە من هێندە بیر لە تۆ دەکەمەوە، ناتوانم بیر لە شتەکانی تریکەمەوە، وەک جاران ئارەزووم نەماوە، جاران خۆشییەکی زۆرم لە کاسبی دەبینی، ئێستا بە جۆرێک گۆڕاوم خۆم ناناسمەوە، ناتوانم خەریکی هێنانی کەلوپەلی نوێ بم، پەیوەندیم لەگەڵ قاچاغچییەکاندا کزبووە، چوار مانگە سەفەری بەغدام نەکردوە، چوار مانگە هیچ کراسێکی نوێ یان عەترێکی تازەم نەهێناوە... هیچ شتێک... خانم هیچ شتێک... لەبەرئەوەی تەنیا بیر لە تۆ دەکەمەوە».

سەوسەن بە ئەسپایی پرسی «بەڵام چۆن بیر لە من دەکەیتەوە؟»

خالید ئاموون چاوەڕوانی ئەم پرسیارەی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستیکرد ناتوانێت وەڵامیداتەوە، دوای کەمێک وەستان گووتی «شتێکی قورسە، وەک ئەوەی دەستێک بەردەوام بتخنکێنێت، هەستێکە لە سەرتدا دووبارەدەبێتەوە، شتێکە وەسف ناکرێت، وەک شتێک بۆی بگەڕێیت و نەیگەیتێ».

دڵنیابوو نەیتوانیوە تەعبیر لە خۆی بکات، دڵنیابوو. بەڵام دەیزانی سەوسەن فیکرەت بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە بانگی نەکردوە، ڕەنگە تەنیا ویستبێتی ببینێت بزانێت بە ئەندازەی دوو داواکارەکەی تر جوانە، یاخود تێبگات چۆن قسەدەکات، یاخود هەر شتێکی تر کە ئەم خەیاڵی بۆی ناچێت. سەوسەن کەمێک دەنگی گۆڕی، شتێک لە پرسیارەکەیدا بوو کە خالید ئاموون بە تەواوەتی ماناکەی بۆ دیاری نەکرا: « خالید ئاموون، حەزدەکەم بزانم تۆ چیرۆکی شەپەچەقۆی ژێر زەمینەکەت بیستووە یان نا؟»

«خانم هیچ کەسێک نییە، ئەوەی نەیبیستبێت»

« دەمەوێت بزانم تۆ ئامادەیت لە پێناوی مندا چەقۆ لە کەسی تر

بدەیت... یا نا؟».

خالید ئاموون چاوەڕوانی ئەو پرسیارەی نەدەکرد، سەری بەرزکردەوە بۆ ئەوەی بە ڕوونی سەیری ڕوخساری سەوسەن بکات کە تاریکی کتێبخانەکە سێبەرێکی تۆخی خستبووە سەر، هەستیکرد ئەستەمە هیچ لە دەموچاوی سەوسەندا بخوێنێتەوە. بە هێمنی گووتی «ئەوەی لە پێناوی تۆدا ئامادەی شەڕ و مردنم گومانی تێدا نییە. سەوسەن خان تۆ تەنیا کەسێکی دەتوانیت وا لە من بکەیت شەڕانی و بێڕەحم بم...».

سەوسەن دووبارە پرسی «دەتوانێت لە پێناوی مندا کەس بکوژیت؟».

خالید ئاموون گووتی «دەتوانم... بێئەوەی دوودڵ بم... بێئەوەی بیربکەمەوە ...».

سەوسەن بە غەمگینییەوە پرسی «بۆ لە پێناوی کچێکی نەخۆشی وەکو مندا، ئامادەیت خەڵک بکوژیت؟... دەبێت هۆکەی بگەڕێتەوە بۆچی؟ هەست ناکەیت، پەیوەندی بەوەوە هەیە ژیان لەم شارەدا مرۆڤ دەخنکێنێت. هەست ناکەیت، ئەم شارە زۆر زۆر بچوکە، شوێنێکە مرۆڤ لێرەوە چاوی لە دونیا نییە. ئەوەی کە کچێک دەتوانێت کۆمەڵێک پیاو شێتبکات، پەیوەندی بە شارەکەوە هەیە، بەم شوێنە بچوکەوە کە دڵی مرۆڤ دەگوشێت؟».

خالید ئاموون سەری داخست و گووتی «ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە من دەتوانم لە پێناوی تۆدا بێڕەحم بم».

سەوسەن لە جێگاکەی خۆی هەستا، ئێستا خالید لە بەر ڕۆشنایی پەنجەرەکەدا لە نێوان کتێبەکاندا ڕوونتر دەیبینی، ئەو ڕەفتە زەردەی ملی، ئەو تەوقە سپییانەی گوڵێکی چکۆلانەیان بە قژییەوە ڕاگرتبوو، ئەو گەردنە بەرزەی، ئەو ملوانکە ڕەشەی هەندێک لە دەنکە باریکەکانی وەک چرووی دوپشک دەدرەوشانەوە... ویستی هەستێت، بەڵام جورئەتی نەکرد. سەوسەن دوای کەمێک گەڕان بەناو کتێبەکاندا، چووە پشتی

کورسییەکەی خالید و پرسی «دەتوانیت لە پێناوی مندا کامەرانی سەلما و مەنسور ئیبراهیم بکوژیت؟». خالید ئاموون کەمێک راچڵەکی، نەیدەزانی کچەکە دەیەوێت بەرەو کوێی بەرێت، چی دەوێت و دەیەوێت بگاتە چی. نەیدەزانی چی وەڵامبداتەوە. خالید ئاموون کەمێک چاکەتی قاتە خۆڵەمێشییەکەی چاککرد، بە ئەسپایی پاڵیدا بە پشتی قەنەفەکەوە و بێویستی خۆی گووتی « رقم لە هەردووکیانە. خۆزگە دەخوازم هیچیان لەسەر ئەم دنیایە نەبوونایە. هەتا دەمرم رقم لەو دوو پیاوە دەبێت... وادەزانم ئەوانیش بەرامبەر بە من هەروان». وشەکان بە رقێکی گەورەوە لە زاری هاتنەدەرێ، خۆشی لەو کینە لە ناکاوەی خۆی سەرسامبوو، دڵنیابوو دەتوانێت ئەو دوو کورەی تر بکوژێت، لە یەکەم ساتەوە چیرۆکەکەی بیستووە توانایەکی ترسناکی کوشتن لە خۆیدا هەست پێدەکات، بەڵام پێشتر لەگەڵ خۆشیدا وەها ئاشکرا نەیدرکاندووە. گەرچی دڵنیابوو قسەکانی سەوسەن فیکرەتیان تووشی پەشۆکانێکی کتوپڕ کرد، بەڵام هەستی بە ئاسوودەییەکی قووڵکرد، ئەوە راستییەکی شاردراوەی ناو دڵی بوو، دڵنیابوو سەوسەن فیکرەت نیازی ئەو کوشتنەی خوێندۆتەوە، دەستی لەو ئارەزووە نهێنییە داوە، کێ چوزانێت، لەوانەیە ئەو وەڵامە تەواوی وێنەی ئەو بە باشە لای سەوسەن فیکرەت بگۆڕێت... هەستیکرد لە رێگای ئەو قسانەوە سەوسەن فیکرەت باشتر تێیدەگات، روونتر دەیبینێت، بەهێزتر دەیناسێت. بەڵام ئەم پرسیارە لە کچێکی وەها ناسکەوە گەلێک دڵڕەقانە بوو.

سەوسەن ماوەیەک لە ژوورەکەدا سوڕایەوە، وەک ئەوەی جۆرە بێباکییەکی قووڵی بەرامبەر هەموو شتەکان تێدابێت، خۆی بە کتێبەکانەوە سەرقاڵدەکرد، لە نێوان قسەکاندا بێدەنگی درێژ و قووڵی جێدەهێشت، هەندێجار لە دەرگای کتێبخانەکەوە ئەو کچەی بانگدەکرد تا چا بۆ میوانەکە بهێنێت. پرسیارەکانی گەلێک تێکەڵاوبوون، زۆربەیان

دەربارەی شتگەلێک بوون خالید ئاموون نەیدەتوانی وەڵامیانبداتەوە، هیچ پرسیارێکی ڕاستەوخۆی دەربارەی سامان و ماڵ و خانووی جیا و زێڕ و ئەو شتانە لێ نەکرد، بەڵکو پرسیارەکانی دەربارەی پەیوەندی ئەو بەسروشتەوە، پەیوەندی ئەو بە ئەستێرەکانەوە، باوەڕی بە ژیان لە هەسارەکانی تردا، باوەڕی بە ژیان لە دوای مردن و ئەو شتانە بوو. خالید ئاموون نەیدەزانی چۆن بچێتە ئەوجۆرە دیالۆگانەوە، هەستیکرد دەستەپاچە و کەم توانایە، بەڵام شێوازی قسەکردنی کچەکە، جوڵاندنەوە ناسکەکانی، شەیدایکردبوو. دڵنیابوو یەکێکی تر و لە هەلومەرجێکی تردا ئەم پرسیارانەی لێبکات، لەوانەیە ڕوونتر بتوانێت وەڵامیانبداتەوە، بەڵام ئێستا هێندە بە سیحری کچەکە سەرسامبوو، هێندە فەزای ئەو کتێبخانەیە و ناسکی ئەو و بۆنی هەناسەکانی گێژیانکردبوو، توانای بیرکردنەوەی لەو پرسیارە گەورانە نەبوو.

بەڵام دوا پرسیاری سەوسەن سەرلەبەر ژیانی خالید ئاموونی گۆڕی، ئەوە ئەو پرسیارە گەورەیە بوو کە سەوسەن چەندین ساڵ بوو بیری لێدەکردەوە، ئەو پرسیارەبوو کە دەیویست لە هەر کەسێکی بکات کە دێتە داوای، بە هێمنی گووتی: «خالید ئاموون گوێبگرە، پرسیارێکت لێدەکەم وەڵامەکەی بۆ ژیانی من و تۆش زۆر گرنگە، زۆر شت لە ژیانی من و ئەم چیرۆکەدا لەسەر ئەم وەڵامە دەوەستێت: گەر بەسەفەرێکی درێژ بتنێرم بۆ دوور، بۆ زۆر دوور لەم شارە، سەفەرێکی چەند ساڵە.... سەفەرێک تێیدا دڵنیا نەبیت، کاتێک دێیتەوە من ژنی تۆم... من بۆ تۆم... یاخود من زیندووم و ماوم، دەچیت ؟ باش بیری لێبکەرەوە، کە دەگەڕێیتەوە دڵنیانیت من ژنی تۆم یان نا... دڵنیانیت من شووت پێدەکەم یان نا... دەڕۆیت یاخود نا؟»، خالید ئاموون ویستی شتێک بڵێ، بەڵام سەوسەن پێشیگەوت و گووتی «نا خالید ئاموون، وەڵامم مەدەوە... ئەوە پرسیارێکە دەبێت بیری لێبکەیتەوە... زۆر زۆر بیری

لێبکەیتەوە... من ئەمڕۆ تۆم بۆنەوە بانگکرد ئەو پرسیارەت لێبکەم... خالید ئامموون بڕۆرەوە بۆ ماڵێ، دەتوانی چەند ڕۆژێک یان چەند هەفتەیەک بچیت بۆ گوندەکان... بۆ شارێکی تر... بۆ ئوتێلێک لە بەغدا و بیربکەیتەوە. هەرکاتێک گەیشتیتە بڕیارێکی تەواو، وەڵامەکەت بخەرە سەر کاغەزێک و بە کەسێکدا بۆم بنێرە، لە ئێستادا تەنیا دەمەوێت بیربکەیتەوە».

کە خالید ئامموون لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی هاتەدەرەوە، ماندوو و ڕەنگپەڕیو دیاربوو، هەموو بینیان نائومێدییەکی قورس لەسەر ڕوخساری بوو، تا گەیشتە سەر شەقامەکە گەلێک چاوی نهێنی چاوەدێریاندەکرد، لەویادا وەک کەسێک ونبووبێت وەستا، پێدەچوو سەرمای ناوەڕاستی زستانیش هێندەی تر تەزاندبێتی، وەک بیەوێت خۆی بشارێتەوە لە ناکاو ئاراستەی خۆی گۆڕی و بەرەو باکوور سەرکەوت، لە شەقامێکی تەسک و چکۆلانەدا کەمێک وەستا، لەویادا تاکسییەکی ڕاگرت و بەدوودڵییەکی زۆرەوە سواربوو، بە پەشۆکاوی قسەی لەگەڵ شۆفێرەکەدا کرد، هیچ کەس نەیدەزانی چی لە خەیاڵیدا دەگوزەرێت، هیچ کەسیش تا بەیانی ڕۆژی داهاتوو هەواڵێکی ڕاستەقینەی دەربارەی چاوپێکەوتنەکە نەبیست... تەنیا دوای بیست و چوار سەعات، کە مەنگوڕی بابەگەورە کەوتە گێڕانەوەی چیرۆکەکە هەموو تێگەیشتین چی لە نێوان سەوسەن فیکرەت و خوازبێنیکەراندا ڕوویداوە.

## ١٨

مەنگوڕی بابەگەورە لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەی باوەجاندا چیرۆکەکەی بۆ هەمووومان گێڕایەوە، ئەو بەو دەنگە منگن و پشتملە کووڕەیەوە، لە ناوەڕاستی هەموواندا وەستاو گووتی «وەک دەزانن کامەرانی سەلما دواهەمین کەس بوو کە دەبێت بچێت بۆ لای کچەکەی گوڵدانچی، پێشتر هەر دوو داواکارەکەی تر سەردانی ماڵی گوڵدانچییان کردبوو... من گووتم بەقەبری مردووم ئێمە تیاچووین، گووتم بە ناموسی عەزیزی هەمووومان حیسابمان پاکە، ئەگینا بۆ کچەکە ئێمەی خستۆتە دوای دواوە، سێ ڕۆژ بوو، من هەواڵی ناخۆشم دەبیست، سێ ڕۆژ بوو شوێنم بە خۆم نەدەگرت... هەموو دەیانگووت گوڵدانچییەکان، بڕیاریانداوە کچەکەیان بدەن بە خالید، هەموو واقسەیاندەکرد کە شتەکە بڕاوەتەوە، کە زانیم ئامووتییەکان کاکی موحافیزیان خستۆتە سەر خەت هیوا بڕاوبووم... هیوام بە چی بمێنێت، من و موحافیزیان نەگووتووە. کامەرانی سەلما تەنیا منی هەبوو غەمی بخوات... منیش پیاوێکی بێدەسەڵات نیم، بەڵام گەر خۆیان مەسەلەکە بەجۆرێک لە جۆرەکان ببڕێننەوە و کچەکە ڕازی بێت، ئەوا لە قەندیلدا ڕاوە حوشتر ناکرێت... وانییە عەزیزی من، یوسف کەویار دەیگووت پیاوی ئازا ئەوەیە لە شەڕی دۆڕاو ڕابکات».

هەموو دەیانگووت «مەنگوڕ بەردەوام بە، مەنگوڕ باسی ئەوە بکە سەوسەن فیکرەت چی بە کامەران گووتووە».

مەنگوڕ دەیزانی قسەکانی لە تەواوی شاردا بڵاودەبێتەوە، لەبەرئەوە بە شەوق و زەوقێکی زۆرەوە بۆ هەموومانی گێڕایەوە و گووتی « کە کامەرانی سەلما ڕۆی من دڵم لە مستمدا بوو، تا بەردەرگای ماڵی فیکرەت گوڵدانچی لە گەڵیدا چووم... دونیا شەو بوو، بە ناموسی هەرچی مەلایکەتە، من لە بەر سەرما خەریک بوو زریکەم دەکرد، بەڵام کامەرانی سەلما گوێی لێ نەبوو... باکی بەسەرما نەبوو. من بەزەیم بە کوڕەکەدا دەهاتەوە، وا سەیری مەکەن... کوڕێکە پێشتر لەگەڵ ژناندا سەروو سەودایەکی نەبووە، لەو مەسەلەیەدا هەر زۆڵێکتان بگرم لەو لێزانترن... کوڕەکە لە یەککاتدا دەترسا و دڵیشی خۆش بوو. کە لەبەردەرگاکە سەیرمکردەوە بە جۆرێک جوان و بۆشناخ بوو، مەپرسن. دڵنیابووم قۆزێتییەکەی لەو جۆرەیە ژنان لە هەموو گوناهێکی دەبوورن... پیاوی ناشیرین گەر گوناهی بەئەندازەی موورویەک بێت، ژنان لێیدەکەن بە کێوێک، بەڵام بەس خودا دەزانێت بۆ پیاوی جوان چ لێیوردەن... بەس خودا دەزانێت. کە چووە ژوورێ من چاوم پڕبوو لە فرمێسک بۆی، حەزمدەکرد لەگەڵیدا بڕۆم تا کۆمەکیبکەم... بەڵام مەرجەکە وەها بوو، هیچ داواکارێک بۆی نەبوو کەس لەگەڵ خۆیدا بەرێت... هەر کەسێک مەرجەکەی بشکاندایە حیسابی پاک بوو»

هەموو بەیەک دەنگ هاواریان لێکردەوە «مەنگوڕ، دەمانەوێت بزانین لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی چی ڕوویدا... دەمانەوێت ئەوە بزانین، بەس قسەی پروپوچ بکە بە ناویدا»

مەنگوڕ دەیگووت « گوێبگرن کە کامەرانی سەلما دەچێتە ژوورێ، تێدەگەن... کە دەچێتە ژوورێ، فیکرەت گوڵدانچی خۆی پێشوازی ناکات، کچێکی جوانی تر پێشوازیدەکات، پێشی دەکەوێت، بەسەر قادرمەیەکی زۆر کەشخەدا سەری دەخات... من خۆم ئەو قادرمانەم بینیوە، خۆم بینیومە، دەزانم چ ڕیزە قادرمەیەکی جوانە، کامەرانی سەلما دەچێتە

کتێبخانەیەکی گەورەوە، وەکو باسیدەکات هەزاران کتێبی تێدابووە، هەزاران کتێبی گەورە گەورە، سەوسەن لە ژوورێکی وەهادا پێشوازیدەکات، کراسێکی زەردی لەبەردا دەبێت، لەوانەی خەتی سپیان تێدایە... کچەکە لەویادا زۆر بە حورمەتەوە تەوقە لەگەڵ کامەرانی سەلما دەکات، زۆر بە حورمەتەوە چا و میوە دەخاتە بەردەمی، بە کامەرانی سەلما دەڵێت: تۆ لە شارێکی چکۆلانەدا لەدایک بوویت، گەر لە شوێنێکی تری دونیادا لەدایک ببوویتایە، لەبەر کچێکی وەک من، لەبەر خانمۆچکەیەکی نەخۆشی وەک من چەقۆت لە کەس نەدەدا. سەوسەن سەرزەنشتی کامەرانی سەلما دەکات، تا دەتوانێت سەرزەنشتیدەکات، بەڵام ئەوەی من لە قسەکان تێگەیشتم ئەوەیە کە هەمووی لۆمە و گازەندەی دۆستانەبوون. خانمە بچکۆلەکە لەگەڵ گلەییەکانیدا دەڵێت گەر تۆ گەورەیی دونیات بزانیبایە ئاوا ئاسان چەقۆت نەدەوەشاند، باش گوێبگرن... ئا لێرەدا، ئالێرەدا سەوسەن هەڵدەستێت و ئەتڵەسێکی زۆر گەورە دەردەهێنێت، ئەتڵەسێک کە هەرچی شتێک لەسەر زەوی هەیە، هەتا بچوکترین گوندیش، هەتا دوورترین کوێرە قۆخەڵەی دونیاشی لەسەرە. کچە بەدبەختەکە ماوەیەک خۆی هیلاکدەکات تا گەورەیی دونیا پیشانی کامەرانی سەلما بدات، هەموو بەحرە گەورەکانی پیشاندەدات، هەموو کیشوەرەکان، کۆمەڵێک شاری سەیر کە شوێنەواری کۆنیان تێدایە، کتێبێکی بەقەدوقەوارەی لەسەر کەشتی و کەشتیسازە کۆنەکان دەخاتە بەردەست. کامەرانی سەلما کە خۆی عەشق لە قوونی دەچۆڕێت، بە لوتفی کچەکە ئەوەندەی تر پەکی دەکەوێت... کە کچەکە ئەو هەموو نەجیبی و ناسکییە دەردەخات، کامەرانی سەلما لەویادا دەکەوێت... ڕاستەوخۆ ئەژنۆ دادەدات و دەکەوێتە سەر چۆک، وەک منداڵێک دەستدەکات بە گریان و دەڵێت تکام وایە شووم پێبکەیت، دەڵێت ناتوانم ئەوە بخەمە خەیاڵمەوە کە تۆ دەشێت بۆ کەسی تر بیت. پێیدەڵێت، من کوڕێکی دەوڵەمەند نیم،

من قومارچیم، چەقۆکێشێکی نامەردم، کەسێکی تووڕەم، بەڵام لەگەڵ تۆدا مێردێکی باش دەبم. کچەکە بێئەوەی شپرزەبێت، وەک خۆی بۆ هەموو شتێک ئامادەکردبێت، دەستی دەگرێت و هەڵیدەستێنێتەوە، بە ناموسی دایکم وایە، خۆی دەستی دەگرێت و هەڵیدەستێنێتەوە، هەتا ماوەیەکی درێژیش دەستی لە دەستیدا دەبێت... گوێیگرن، یادی بەخێر کاتی خۆی جەمالی عەنبەر دەیگووت، دوو دەقیقە دەستت لە دەستی کچێکدا بێت، یەعنی ئیشەکە تەواوبووە، یەعنی هەموو شتێک بڕاوەتەوە، کامەرانی سەلما دەڵێت، کچەکە دەقیقەیەک زیاتر دەستی لە دەستیدا بووە».

مەنگوڕ کەمێک بێدەنگ دەبوو و هەرچی لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەدا کۆبووبوونەوە دەمانگووت «ئەی دوایی چی... ئەی دوایی چی، مەنگوڕ... ئەی دوایی چی».

مەنگوڕ دەڵێت «یوسف کەویار دەیگووت شەڕ بە پرسیار دەست پێدەکات و بە پرسیار تەواو دەبێت. شەوەکەی کامەرانی سەلماش بە شتێک کۆتایی دێت کە باوەڕناکەن. شتێک لە چاوەڕوانی کەسدا نییە، کچەکە پرسیارێک لە کامەرانی سەلما دەکات، پێیدەڵێت ئامادەیت بەسەفەر بڕۆیت بۆ شوێنێکی زۆر دوور، سەفەرێک بۆ مەملەکەتێکی تر کە لەوانەیە چەند ساڵ بخایەنێت، بەمەرجێ کە هاتیتەوە ئەوەت زامن نەبێت کە من ببم بە ژنت یان بتوانم شووت پێبکەم یان هەر لە ژیاندا مابم».

یەکێک دەڵێت «خوای عالەم، دەیەوێت بکات بەچی؟ دەیەوێت کوڕە بەستەزمانەکە بۆ کوێ بنێرێت؟». یەکێکی تر دەڵێت «ئەم کچەتیوە چی لەسەردایە، مەنگوڕ، تۆ بڵێ چی لەسەردایە؟»

مەنگوڕ بە خێرایی قسەکان وەردەگرێتەوە و دەڵێت «ئالێرەدا کامەرانی سەلما عاقڵییەک دەکات لێم ڕانەدەبینی، دەم ودەست لە

کچەکەی گوڵدانچی دەپرسێت: خانم، بەر لەوەی وەڵامبدەمەوە، پێمبڵێ ئەم پرسیارەت لەوانی تریش کردوە یان ئەم پرسیارە هەر بۆ منە... بۆ منی بەدبەخت. کچەکە بە ئەرزو ئاسمان سوێندی بۆ دەخوات کە تا ئێستا بە چاوێکێ جیاواز سەیری هیچ یەک لەداواکارەکان ناکات، هەر سێکیان لای ئەو وەکو یەک وان و هیچ یەکێکیانی هەڵنەبژاردوە، ئەوە پرسیارێکە لە هەر دوو داواکارەکەی تریشی کردوە، دەشڵێت شتەکان هەمووی لەسەر ئەو وەڵامە بەندە کە لە دەمی ئەوان وەریدەگرێتەوە، تکاشدەکات بیر لە پرسیارەکە بکاتەوە و ئەوسا وەڵامبداتەوە... ئێوە دەڵێن چی... ها... شتەکان ئاوها بوون... بە ناموسی ئەولیا کامەرانی سەلما کاتێک هاتەدەرێ ماوەیەکی درێژ قسەی بۆ نەدەکرا، من بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەو بەر سەرمایەدا هەڵدەلەرزیم و چاوەڕوانمدەکرد... ئەوەی لە حیسابمدا نەبوو قسەی لەوجۆرە بوو، دەمگووت ئێستا بە کوڕە بەستەزمانەکە دەڵێت، کوا ماڵت، کوا ماشێنت، کوا کارو کاسبیت... تۆ قوونێکی بێخێر، باسی ژنهێنانی چی دەکەیت. بەڵام ئەوەی پرسیاری وەها بکات، عەقڵم بۆ شتی وەها نەدەچوو».

هەموو ئەوانەی لە ژێر زەمینەکەی ئوتێلی باوەجاندا بووین، بە خرۆشانێکی زۆرەوە پرسیمان «ئەی مەنگوڕ تۆ دەڵێیت چی... تۆ چۆن لەم مەسەلەیە تێدەگەیت، تۆ تەفسیرت چییە؟»،

مەنگوڕ بە ئارامی لەسەر کورسییەک بەرامبەرمان دانیشت و گووتی «تاکە تەفسیرم ئەوەیە کچەکە لە کچی ئەم شارە ناچێت، لەو جۆرە نییە هەر چاویان بە لووتی یەکەم خوازبێنیکەر کەوت دەیکەن بە هەلهەلە لێدان... شتێک لە عەقڵیایەتی بە کەسانی وەک ئێمە ناخوێنرێتەوە، هێشتا زووە کەس قسەی ڕاست و دروست بکات، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەم بەشەدا کەس لە خوازبێنیکەران بە ڕاستی دەرنەچوون... تاکە براوەی ئەم یارییە تا ئێستا هەر ئەو کچە عەیارەی گوڵدانچییە».

١٩

مەنسـور ئەسـرین گەلێـک بیـری لـە هەمـوو چاوپێکەوتنەکـە کـردەوە، هەمـوو ئـەو زانیارییانەشـی بەراوردکـرد کـە ساقی مەحمود لە بـازاڕ دەربارەی یەکتـر بینینەکانـی سەوسـەن لەگـەڵ دوو داواکارەکـەی دیدا کۆیکردبوونـەوە. ئێسـتا چ بـەرەی کامەرانـی سـەلما و چ ئامۆنییـەکان بـەوردی چیرۆکـی خۆیـان لـە هەموو لایـەک دەگێڕایـەوە، بـەڵام ساقی مەحمـود و ڕاوێژکارەکانی دیکـەی مەنسـور پێیـان وابـوو ئـەوان تـەواوی چیرۆکەکـەی خۆیـان بـە نهێنـی بهێڵنـەوە، چونکـە ئاشـکرا نەکردنـی چیرۆکەکـە، جـۆرە پەشـۆکان و دوودڵییـەک لـە هەمـوو لایەکـدا دروسـتدەکات کـە پێدەچێـت مایـەی ئەوەبێـت پتـر بکەونـە هەڵـەوە. مەنسـور لـە ئێـوارەی چاوپێکەوتنەکـەدا سـەیری لێهـات کـە سەوسـەن گۆرانییەکـەی ساقی مەحمـودی بیسـتبوو و شـیعرەکەی مسـتەفا هەژاریشـی خوێندبـووەوە، بـەڵام زۆربـەی قسـەکانی لەگـەڵ مەنسـوردا دەربـارەی «گەورەیـی دونیـا» بـوو، دەربـارەی ئـەو دوورگـە دوورانـەی سـەرتاپایان درەختـە و ئـەو بەنـدەرە شـینانەی ئاسـمانیان لەبـەر باڵنـدە نابینرێت. مەنسور لـە عاشـقە درۆزنـەکان نەبـوو، بـە ڕێزێکـی زۆرەوە گـوتـی « سەوسـەن، مـن لـە گەورەیـی دونیـا زۆر دەترسـم، مـن لـەو کەسـانەم کـە ژیانـی ئـەم شـارەیان پێخۆشـە، نامەوێت زۆر دووربکەومـەوە» . سەوسـەن گـوتـی «هـەر دڵێـک جیهـان لـە گەورەییـدا نەبینێـت، بـە هەژاریـی دەمێنێتـەوە». بـەڵام مەنسـور وەک عاشـقە منداڵـکارەکان وابـوو، هـەروا بـە

سادەییەوە گووتی «جیهان تەنیا ئەو کاتە گەورەیە کە تۆ لێمەوە نزیک بیت، گەر تۆ دووربیت، هەموو زەمین بچوکە». ئاشکرا کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی لەو قسانە تێنەدەگەیشت، ئەو بە پێچەوانەی ژنانی دیکەوە وا دەردەکەوت وەک ئەوەی قسەی عاشقانە کەم بیبزوێنێت. بە غەمگینییەوە گووتی «تۆ بۆیە منت خۆشدەوێت، چونکە جیهانت نەبینیوە، شارە دوورەکان و دارستانەکان و میللەتانی ترت لە نزیکەوە نەبینیوە. خۆشەویستی قسەیەکی پڕوپوچە گەر تۆ نەزانێت چەند هەلی گەورەت بۆ ژیانی تر و خۆشەویستی تر لە بەردەستدایە... دەبێت شاری تر و ژنی شوێنی تر ببینیت، ئەوسا دەزانیت بەڕاستی منت خۆشدەوێت یاخود نا». کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی ڕای وابوو پیاوان بۆیە ژندەهێنن بۆ ئەوەی چاو لە گەورەیی دونیا داخەن، بۆ ئەوەی هەستی دیکە تاقی نەکەنەوە. مەنسور ئەو چەندجارە کەمەی لەوەوبەر لەگەڵ سەوسەندا قسەیکردبوو، ئەو دیوە ڕەقەی لەم خانمە ناسکەدا نەبینیبوو. ئەو ڕۆژە لەگەڵ کراسە زەردەکەشیدا، لەگەڵ ئەوەی گەلەک لەسەرەخۆ و بە دەنگێکی هێمن دەدوا، هەستیکرد ئەم خانمە بەجۆرێک لە جۆرەکان هێشتا ئامادە نییە بۆ شووکردن. بە ئەزمونی خۆی هەستیدەکرد ئەو کچانەی ئامادەن بۆ شووکردن شتێکیان تێدایە لە سەوسەندا نییە، جۆرە پەشێوییەک، جۆرە کرانەوەیەکی لەناکاو، شێوە دڵخۆشییەک یان غەمگینییەکی کتوپڕ کە هیچی لەگەڵ ئەو هێمنی و ساردی و خۆگرییەی سەوسەندا ناگونجێت. کچەکەی گوڵدانچی هەمان ئەو پرسیارەشی لە مەنسور کرد کە لە دوو داواکارەکەی دی کردبوو، مەنسور ئێستا نەیدەزانی چی بکات. لەگەڵ گەڕانەوەیدا هەستیکرد بە جۆرێکی سەیر و شێتانە ئەو کچەی خۆشدەوێت، هێندەی خۆشدەوێت بە سەعات بۆی بگری، بەڵام کیژەکەی گەلێک تەلیسماوی و ئاڵۆز و نەگیراو هاتە پێشچاو. کیژێک بوو ناسکییە زۆرەکەی، باریکی و ڕەنگە

کاڵ و نیگا بیمارەکانی بانگیاندەکردی، بەڵام شتێکی نادیاریشی تێدابوو وایدەکرد باوەڕبکەیت کیژێکی سارد و بێباکە و غەمێکی ئەوتۆی بۆ هیچ شتێک نییە. ساقی مەحمود کە مەنسوری بەو حاڵە بینی گەلێک دڵی بۆی سووتا، سەعات پێنجی ئێوارە بوو، دونیا تەواو تاریک بوو، پێکەوە سوار تاکسییەک بوون و لەبری ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە بردی بۆ «بنکەی تیپی هەرزاڵ بۆ مۆسیقای میللی» تا لەوێ پێکەوە بە هێمنی قسەبکەن. ئاشکرا کوڕە بەستەزمانەکە نەیدەزانی چ بڕیارێک بدات، هەستێکی هەبوو کە کیژەکەی زۆر دووردەست بینیوە و واتێدەگات کە هەرگیز بۆ ئەم نابێت. دەبێت بڵێم کە تێوەگلانی ساقی مەحمود گەرچی بەشێکی گەورەی لە پێناوی دڵی ئیبراهیم ئەسریندا بوو، هۆیەکی دیکەشی کینەیەکی قووڵی ساقی بوو بەرابەر مەنگوڕی بابەگەورە، ساقی لە گەنجییەوە ڕقی لە مەنگوڕ و خێڵە چەقۆکێشەکەی هاودەمی بوو، لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکاندا دەمانێک کە هەردووکیان گەنج بوون، چەند جارێک لە ئاهەنگەکاندا بەزمی گەورەیان بووبوو، مەنگوڕ ئەو زەمانە خۆی وەک دوژمنێکی سەرسەختی کۆمۆنیستەکان پیشاندەدا، هەمووش دەیانزانی ساقی مەحمود هەواداری کۆمۆنیستەکانە، مەنگوڕ سڵی لەوە نەکردبووەوە جارێک ڕوو بەڕوو پێیبڵێت «تۆ لۆتییەکی شیوعیت». ئەوەی ئەوکات وایکرد بێدەنگبێت، فشاری حیزب و ڕۆحی هونەرمەندەکەی ناوی بوو، ڕاستە دوای هەرەسی شۆڕشی بەرزانی مەنگوڕ لە شاییەکدا دەستیکردبووە ملی و داوای لێبووردنی کردبوو، بەڵام ساقی مەحمود هەرگیز لە دڵەوە لەگەڵ مەنگوڕدا ئاشت نەبووەوە. ئێستا نە ساقی مەحمود شیوعی بوو و نە مەنگوڕیش مەیلی سیاسەتی مابوو، بەڵام تێوەگلانی مەنگوڕ لە بریندارکردنی کوڕەکەی ئیبراهیم ئەسریندا ئەو برینانەی کولاندەوە و ئەو کینەیەی جارانی تیا زیندووکردەوە. پرسیاری کچەکەی گوڵدانچی ساقی مەحمودیشی پەرێشانکردبوو، ئەو

بـە سـمێڵە سپی و چـاوە شـینەکەیەوە هەمـوو دووردڵــی و پەشـۆکانێک ئاسـان لەسـەر ڕوخسـاری دەبینـرا. مەنسـور ئەسـرین بـە سـاقی گـووت « خۆشەویسـتیم بـۆ ئـەو خانمـە زۆر گەورەیـە، ئەمـڕۆ گـەر وەک مـن بتدیبایـە، وەک مـن لـە نزیکـەوە سـەرنجی ئـەو ناسـکییەت بدایـە، ئـەو لاوازییـە سیحراوییەت لـە چـاو و دەنـگ و هەسـتان و دانیشـتنیدا هەسـت پێبکردایـە، دەتزانـی باسـی چـی دەکـەم. ڕۆحێکـە وەک ئـەوەی ئـاو ڕوونـی خـۆی و تـەم تەنکـی خـۆی و تاریکـی نهێنـی خـۆی خسـتبێتە نـاو... کـە لـە نزیکییـەوە دەوەسـتیت ناتوانیـت خۆشـت نەوێـت. لـە منـی پرسـی: تـۆ دەتوانیـت وەک کامەرانـی سـەلما لـە پێنـاوی خۆشەویسـتی منـدا خەڵـک بکوژیـت؟. مـن گووتـم: خۆشەویستی تـۆ ڕێـگای ئـەوەم لێدەگرێـت، ئـازاری مرۆڤەکانـی تـر بدەم. لێیپرسـیم: ئـەی ئەگـەر ناچاربوویـت لـە پێنـاوی منـدا بچیـت بـۆ شـەڕ، ببیـت بەسـەرباز، لـە خـۆت ببوریـت و بڕۆیـت بـۆ کوشـتار لەگـەڵ ئێرانییەکانـدا، دەچیـت یـا نـا؟. مـن نەمزانـی چـی وەڵامبدەمـەوە، خـۆی هەسـتیکرد نازانـم چـی وەڵامبدەمـەوە. پێیگووتـم: ئـەو کەسـەی ئـەم یارییـە دەکات دەبێـت وەڵامـی ئـەو پرسـیارانە بداتـەوە، ئاخـۆ ئامادەیـە لـە پێنـاوی خۆشەویستەکەیدا بمرێـت یـان نـا ؟ ئامادەیە بچێـت بـۆ شـەڕ یاخـود نـا؟ ئامادەیـە سـەفەری زەمینـی دوور بـکات؟ ئامادەیـە بەبـێ هیـواش درێـژە بـە خۆشەویسـتییەکەی بـدات؟. دواتـر بـە هەمـوو ناسـکی خۆیـەوە گووتـی : ئـەی ئەگـەر مـن داوات لێبکـەم کامەرانـی سـەلما و خالیـد ئامـوون بکوژیـت تـۆ چـی دەکەیـت؟. هێنـد ناسـک بـوو، وشـەکان وەهـا سیحراوی لەلێـوی کەوتنـە خـوارێ، وەک ئـەوە نەبـوو باسـی کوشـتن بـکات. بێئـەوەی بزانـم، بێئـەوەی بیربکەمـەوە وەڵامێکـم دایـەوە کـە هەمـوو عاشـقێکی دونیـا لـە دێـر زەمانـەوە دەیدەنـەوە و گووتـم: خۆشەویسـتی تـۆم لـە خـۆم و دونیـا لا گرنگتـرە، هیـوادارم ئـەوە مەرجـی تـۆ نەبێـت، بـەڵام گـەر بزانـم ئـەوە خۆشەویستی مـن دەسـەلمێنێت، هەمـوو شـتێ دەکـەم. بـرادەر نازانـم

چۆن وامگووت، بەڵام دڵنیابە لەو کاتەدا قسەکان لە ناخی دڵمەوە دەهاتنەدەرێ».

مەنسور ئەو شەوە لە هەر کاتێکی دی باریکتر و لاوازتر دیاربوو، بەدەنگێک قسەیدەکرد تۆنی پەشۆکانێکی قووڵی پێوەبوو، لاوازییەک لە هەناسەدان و دەست جوڵاندنیدا بوو مرۆڤ بەزەیی پێدادەهاتەوە. دیاربوو بای زستان زۆر یاری بەقژی کردوە، هەر کەدەتبینی هەستتدەکرد بە ناو سەرمایەکی زۆردا تێپەڕیوە، وەک ئەوەی لە ڕۆحیدا بەفرێکی زۆر باریبێت. گەرچی لە گرنگترین چاوپێکەوتنی ژیانی دەهاتەوە، بەڵام جلەکانی گەلێک سادەبوون، کەمێک ریشی هاتبوو، کەمێک پەرتبوون و ناتەبایی بە هەموو شتێکیەوە دەبینرا، ساقی مەحمود زۆر هێزی دایەبەر، سەرەتا تەنیا نیازی بوو ئەو ڕۆحی لاوازییە لە مەنسور ئەسریندا بکوژێت، بەڵام نەیدەزانی چۆن دەست پێبکات. ژوورەکەی تیپی هەرزاڵ شوێنێکی ساردبوو کە ئەو تەنیا عەلادینە بچکۆلەیە گەرمی نەدەکرد کە ساقی دایگیرساند. مەنسور ئەسرین هەستیدەکرد سەرمای ژوورەکە زیاتر ئازاریدەدات، سەرمایەک بوو ژێر زەمینەکەی خدرۆ دوویاری بە یادهێنایەوە، ئەو ساتەی هەستی بە ئازاری چەقۆکەی کامەرانی سەلما کرد لەسەر سنگی. ساقی مەحمود گەرچی گۆرانیبێژبوو، گەرچی لەگەڵ جوزەلە و دەفدا گۆرانی دەگووت، گەرچی گۆرانییەکانی زۆربەیان بەزمساز و سەرگەرمکەر بوون، بەڵام لە ژیانی خۆیدا کەسێکی هێمن بوو، لە جێگایەکی تایبەتی بوتڵێکی عارەقی دەرهێنا کە دیاربوو پێشتر کەمێکی لێخوراوەتەوە و گووتی «مەگەر بە یارمەتی عارەق باش بیریکەمەوە. چاوی ساقی من تا مەست نەبم ناتوانم شتێکی باش بڵێم. بەڵام کوڕی من تۆ ئێستا وەک ڕەمزی خۆفیداکاری عاشقان وایت، هەر دەورووزەمانێک یەکێک وەک ڕەمزی عاشق دەردەکەوێت، ئەو ڕووداوەی ژێر زەمینەکەی خدرۆ دوویار تۆی کرد بە کەسێکی تر... شارەکە و

کچ و کوڕەکانی پێویستیان بە شتێکە، پێویستیان بە یەکێکە باسیبکەن و چاوی لێبکەن... ئێستا گەر تۆ بڵێیت، من عاشقم، بەڵام سوپاس، لە ماڵی خۆمدا دادەنیشم، عەشقم تا بەردەرکی ماڵی خۆمان بڕدەکات و ئیتر بەسمە... دەزانیت چی دەبێت ؟ دەزانیت چی دەقەومێت؟ . هەرچی سیحرێک لە دەوری ناوی تۆ دروستبووە بەتاڵ دەبێتەوە...» .

ساقی مەحمود پێکێک عارەقی تێکرد و هەڵیدا و گووتی «کچەکەی گوڵدانچی لەوانە نییە، بەس بیەوێت شوویکات، زۆربەی کچی شار دەیانەوێت شوویکەن و خواحافیز... بەڵام ئەم کچە لەو جۆرە نییە، ئەوەی وا دەریکەویت کە دوودڵیت، کە ناتەوێت قوربانی گەورە بدەیت، وادەزانم کیژەکەت لە دەست دەدات» .

ساقی مەحمود قومێکی لە عارەقەکە دەدا و جگەرەیەکیشی لەگەڵدا دادەگیرساند و دەیپرسی: «بەڵام مەنسور ئەسرین بە ڕاستی... بە ڕاستی تۆ ئەم کیژەت خۆشدەوێت؟» .

مەنسور بە غەمگینی گووتی «ئەوەندەم خۆشدەوێت دەترسم توانام و بەختم خیانەتم لێبکەن... دەترسم ئەم خۆشەویستییە هەموو لاوازییەکانم دەربخات، دەترسم بەجۆرێک بێهێزبم نەتوانم شەڕی بۆ بکەم... بەجۆرێک بڕمبکات لە خۆشەویستی، ئەو کینەیەم تێدا نەبێت کە هەموو عاشقێک پێویستی پێیەتی» .

ساقی مەحمود جگەرەکە بە لێوییەوە بوو، کەمێک گڕی عەلادینەکەی زیادکرد و بێئەوەی جگەرەکەی دابنێت گووتی «ئەمەیان تەنیا خۆشەویستی نییە، شەڕێکی گەورەیە. من لەو دەقیقەیەوە کە چیرۆکەکەم بیست، زانیم مەسەلەکە هەر خۆشەویستی نییە، بەڵکو شەڕە... بەڵام هەر تاقمە و بەچەشنی خۆی دەیکات. مەنگوڕی بابەگەورە و تاقمەکەی تەنیا چەقۆبازیدەکەن، ئەو سەگسارانە جگە لە چەقۆ وەشاندن هونەرێکی تریان پێ نییە، مەنگوڕ خۆی سەگێکی دڕ و بێویژدانە. تۆ

لە من بپرسە، سەردەمێک بەس خودا دەزانێت چۆن و چەند ئازاری خەڵکی ئەم شارەیان دەدا، تێدەگەیت خەریک بوو بتکوژن... من ئەوەم لەبیرناچێتەوە... تۆ کوڕی نزیکترین هاوڕێی من، شەمپانزییەکی وەک مەنگوڕ بتداتە بەر چەقۆ... هەروا سووک و سادە، لەسەرچی؟ لەسەرئەوەی کچێکی وەک خۆتت خۆشدەوێت. ئەو قەبیلەی مەیمونە لە چەقۆ زیاتر هیچی تر نازانن... ئێستا کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی، وادەزانێت هاتۆتە ناو شارێکەوە پیاوەکانی هەموو وەک سەگ وەهان... هەموو هەقێکیش دەدەم بەو کچە گەر هەمووومان وەک کۆمەڵێک وەحشی و جانەوەر سەیربکات. خانمەکە وەک تۆ دەڵێیت لە ناو کتێب و زانستدا گەورەبووە، ئەم سەگبازارەی نەدیوە، نەیبیستووە یەکێک بێت و هەموو شتێک بکات بە ئاهەنگی مەیمون و مەسەلەی ژن و ژنخوازی بەو جۆرە بگۆڕێت بۆ بەزمی کۆمەڵێک سەگ...».

ساقی مەحمود کە تووڕە دەبوو، چاوانی زیاتر دەدرەوشانەوە. مەنسور بە وردی گوێی لە ساقی گرت و بەغەمگینی گووتی «دەزانم، دەبێت ئەو توانایە لە خۆمدا دروستبکەم کە دڕیم، بتوانم دەست بوەشێنم... گەر وانەکەم شانسم نییە».

ساقی پتر سوور دەبووەوە، جگەرەکەی دادەگرت و کەمێک سنگی پاکدەکردەوە و دەیقرغاند و دەیگووت «ئینجا ئەم ئامووزیانە... تێدەگەیت... کە هیچ نین جگە لە عەبدی پارەکانیان، قەبیلەیەکن لەسەر بەرماڵی دینار نوێژدەکەن... بەس خودا دەزانێت چەندە لە پیاوانی دەوڵەتەوە نزیکن، چەندە لەگەڵ ئاسایشی دەوڵەتدا دەستیان هەیە، من گۆرانیبێژێکم خەریکە بەساڵدا دەچم، بەڵام عەقڵم هەیە، کە گۆرانی دەڵێم چاوم ئیشدەکات، تێدەگەیت، لە ئاهەنگەکاندا کە دەیکەمە بەزم، هۆشی خۆم ناخەوێنم... خەڵکی دەڵێن دەنگم پیربووە، دەڵێن تۆنەکانم بەڕاستی وەک جاران بۆ دەرنایەت، هەستانەکانم وەک جاران

نەماون... هەمووی ڕاستە، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە هەموو وەخت بە دڵ گۆرانی ناڵێم... کە ئەو سەگسارانە دەمبەن و ناچاردەبم بۆ پارەی مەعیشەتەکە فووی پیا بکەم، لە دڵەوە نایڵێم، شتێک نەمجوڵێنێت ناتوانم لە دڵەوە بیڵێم... دەیانبینم... هەموو قەبیلە ساختەچییەکانی ئەم شارە دەبینم... ژنە بەڕێز و مێردە باشەکانیان، چەند لەو ئەمنە عەرەبانەوە نزیکن... نابێت سەوسەن بکەوێتە داوی ئەوان...».

ساقی مەحمود هەر کات لە دڵەوە قسەیبکردایە، پاکییەکی قووڵ لە ناویدا دەدرەوشایەوە، قژە ماش و برنجییەکەی، ئەو نوسانە کەمەی دەنگی کە بە کاریگەریی خواردن و جگەرە دروستبووبوو، ئەو چەمینەوە کەمەی بە حوکمی پیری تیا دەردەکەوت زیاتر تایبەتمەندییان پێبەخشیبوو... بەدرێژایی ژیانی بە جلی کوردییەوە دەسوڕایەوە، هەمیشە بۆنی توتن و جگەرە و عارەقی لێدەهات، هەموو وەک گۆرانیبێژێک دەیانناسی کە لەکاتی گۆرانییەکانیدا پێناکەنێت، کە خەڵک بە ئاوازەکانی دەهاتنە جۆش، ئەو وچانەکانی بە کاردەهێنا تا زیاتر قوم لە عارەقەکەی بدا، لە سەر هەر شانۆیەک بایە دەبوو لە پشت پەردەکانەوە شوێنێک بۆ بوتڵی مەییەکەی سازبکات. زۆر دەیخواردەوە، بەڵام کەس بەدەمەستی پێوە نەیبینیبوو، کەچی تووڕەبوونەکانی خێرابوون، هەمیشە بەجۆرێکی کتوپڕ سوور هەڵدەگەڕا. هەموو دەیانگووت پیری ساقی مەحمودی جوانتر کردوە، چرچە قووڵەکانی دەموچاوی زیاتر سیمایان لە سیمای هونەرمەند نزیککردبووەوە. ئەو شەوە گووتی «بەشی هەرە زۆری ئێمە نازانین چیمان دەوێت، بەڵام کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی دەزانێت چی دەوێت، ڕەنگە ئێستا باوەڕم پێ نەکەن، بەڵام کچەکە شتێکی دۆزیوەتەوە کە ئێمە لە ژیانی خۆماندا ونمانکردوە، کچەکە دەزانێت دەڵێت چی و چی دەپرسێت، ڕەنگە تاکە ژنێک بێت لە ژیانمدا بینیبێتم کە دەزانێت چی دەوێت، من عومرم لەم بەزمی مەیموونەدا بردۆتەسەر، خەڵکی ئەم

شارە زۆربەیان لە مۆش و گۆشی خۆیان بەخەبەر نین و نازانن چییان دەوێت... لەم شایی چەقەڵەدا کەس نازانێت بۆچی هەڵدەپەڕێت... بەڵام ئەم سەوسەن گوڵدانچییە لە توخمێکی ترە، بۆیە هەر هەڵەیەکی بچوک شانسی ئێمە لەلای ئەو دەکوژێت، کچەکە بۆ ئاوازێک دەگەڕێت... گەر شتێکی تری بۆ بژەنین سوودی نییە... دەبێت بزانین کە دەیەوێت گوێی لە چی بێت، گەر وانەبێت ئێمە دۆڕاوی یەکەمین».

ئەو شەوە تا درەنگ قسەیانکرد، لەسەر ئەوە تەبابوون کە مەنسور بە سەوسەن بڵێت «ئامادەم لە پێناوی تۆدا بڕۆم بۆ دوورترین شوێنی زەمین... بێئەوەی ئومێدی ئەوەم هەبێت کە دەگەڕێمەوە، تۆ بۆ من بیت». ئەوە ئەو ڕستە سیحرییە بوو کەسەوسەن داوایدەکرد، ئەو ڕستەیە بوو کە دەبایە مەنسور ئەسرین لە دڵەوە بیڵێت.

## ٢٠

لەو هەفتەیەدا چاوەڕوانییەکی گەورە باڵی بەسەر هەموو شاردا کێشا، هەموومان بە جۆرێک لە جۆرەکان سەرگەرمی بیرکردنەوە لە مانای قسەکانی کچەکەی گوڵدانچی بووین، بەڵام لەو ڕۆژانەدا هەواڵێکی ئەوتۆ گرنگ لە ماڵی ئەوانەوە نەهاتەدەرێ. خەڵکانێکی زۆر شاهیدبوون کە سەوسەن گوڵدانچی لەگەڵ باوکیدا دوو جار لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستەوە لەگەڵ ژمارەیەکی دەرەوەی وڵاتدا تەلەفۆنیکرد، هەر دوو جارەکە سەوسەن کراسێکی سپی لەبەرداو و ملوانکەیەکی ڕەشی لە ملدا بوو، هەر دوو جارەکە لە تاکسییەکی کۆندا لەبەردەم پۆستەدا دابەزی و هەر بەهەمان تاکسیش گەڕایەوە بۆ ماڵێ. لەو دوو هەفتەیەدا هەمووان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد سەوسەن وەک جاران لەگەڵ کچانی دیکەی خێزانی گوڵدانچیدا لە بازاڕ و قەیسەری و کوچەی کۆنەفرۆشەکاندا دەربکەوێت، بەڵام پێدەچوو کچانی بنەماڵەی گوڵدانچی بەهۆی ڕەشەبا و سەرما و ئالەباری ئەو وەرزەوە هەموو چوونە دەرەوەکانیان دواخستبێت. کەسانێک کە خۆیان بە دۆستی نزیکی گوڵدانچییەکان دادەنا هەوڵێکی زۆریان دا شتێک دەربارەی بیرکردنەوە و بڕیاری سەوسەن لە ئاسیاوەکانیانەوە بزانن، بەڵام ماندووبوونیان بە هەدەر ڕۆی، چونکە گوڵدانچییەکانیش نەیاندەزانی سەوسەن چۆن بیردەکاتەوە. هەتا پڕوشەی خوشکیشی زانیارییەکی ئەوتۆی لەسەر نیازی سەوسەن نەبوو. هێند هەبوو لەدوای چاوپێکەوتنی

داواکارەکان سەوسەن بەتەواوەتی کشایەوە بۆ ناو کتێبخانەکە، لە جاران زیاتر چای دەخواردەوە، لە جاران زیاتر بایەخی بە ئینجانەی گەڵاچاکان دەدا، زیاتر حێل و شەکری بەکاردەهێنا. زۆربەی کات لە کتێبخانەکەدا لەسەر کۆمەڵێک نەخشەی گەورە ئیشیدەکرد، دەیەها ئەنسکلۆپیدیای گەورە و ئەتڵەسی تایبەتی بە جوگرافیای هەموو کیشوەرەکانی سەرزەمین لەسەر مێزەکەی کەڵەکەبوبوون، بە گەلێک ڕاستە و پرگال و ڕۆژمێری کۆن شتگەلێکی حیسابدەکرد کە کەس بەدروستی نەیدەزانی چین. بەڵام لەجارانیش زیاتر تووشی سەرئێشە دەبوو، زیاتر حەبی دەخوارد و ڕەنگ پەرپووتر دەردەکەوت. شەوانیش تەنیا کاتێک دەچووە ژێر جێگاکەوە کە هەمووان خەوتبوون و کەس ئاگاداری نەبوو. ئەو هەفتەیە فیکرەت گوڵدانچی زۆر بەوردی چاودێری هەموو ڕەفتارەکانی کیژەکەی کرد، هەتا خۆشی بە پێچەوانەی عادەتی خۆیەوە زۆر کەم لە ماڵ چووەدەرێ، دیارە سەختی زستان ڕۆڵێکی گەورەی لە قەتیسبوونی فیکرەتدا هەبوو، بەڵام بەشێکیشی ئەوەبوو کە دەیویست لە نزیکەوە ئاگاداری سەوسەن بێت، کە هێدی هێدی بۆ باوکەکەش وەک تەلیسمێکی گەورەی لێدەهات. دوای هەفتەیەک فیکرەت گوڵدانچی بۆ یەکەمجار چووە کتێبخانەکەوە، هەر کات فیکرەت گوڵدانچی لەبەردەم کچەکەیدا دەوەستا، وەک ئەوەبوو لە بەردەم بوکەشوشەیەکدا بوەستێت کە خۆی ڕۆحی کردوە بەبەردا. فیکرەت ئاگاداری ئەوە بوو کچەکەی چ پرسیارێکی لە داواکارەکان کردوە، دوای دوو شەویش لە چاوپێکەوتنی داواکاران داوای لە باوکی کرد لە ڕێگای برادەرەکەیەوە لە ئینگلتەرە، یەکێک لە هەرە گەورەترین و گرنگترین فەرهەنگە تایبەتییەکانی باڵندەی لە دونیادا بۆبێت، لەگەڵ چەند ئەتڵەسێکی زۆر گران کە دابەشبوونی مەل و پەلەوەرەکان لەسەر زەوی نیشاندەدەنەوە. بەوەدا باوکی بەدروستی نەیدەزانی کیژەکە چی دەوێت، بۆ ڕۆژی دوایی بە تاکسییەک بردی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پۆست تا

خۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هاوڕێ دێرینەکەیدا قسەبکات. بەڵام سەوسەن تا ئەوکاتەش شتێکی ئەوتۆی لای باوکی نەدرکاند پیشانی بداتەوە چی لە خەیاڵدایە. ئاشکرا کچەکە خواستێکی قووڵی تێدابوو، شتەکانی خۆی بە نهێنی بهێڵێتەوە، بەڵام فیکرەت گوڵدانچی هەستیکرد وردە وردە کێشەکە دەچێتە جێگایەکەوە دوور نییە بەرەو مەترسی گەورە بڕوات. ئەو شەوە کە چووە ژوورەکەی سەوسەن و لە قەنەفە چەرمەکەی خۆیدا بەرامبەری دانیشت، وەها خۆی دەرنەخست کە هاتووە شتێکی تایبەتی لە کچەکەی دەربهێنێت، ماوەیەک لە کتێبێکی کۆندا دەربارەی «پاشا دێرینەکانی فارس» شتێکی خوێندەوە و دواتر لەسەرەخۆ لەسەر دوا هەواڵەکانی شەڕی عێراق و ئێران قسەیانکرد. هەردووکیان بەردەوام لە دوو ڕادیۆی جیاوازەوە گوێیان لە هەواڵەکانی جیهان دەگرت، خولیای سەوسەن بۆ ئەوەی وەک پیاوە پیرەکان گوێ لە دەنگوباسی ڕادیۆ بیانییەکان بگرێت، هەردەم مایەی سەرسامی فیکرەت گوڵدانچی بوو. سەوسەن لە هەموو شتێکدا پێچەوانەی پرۆشە بوو، جیاوازییەکانیان بە چەشنێک بوو لە دوو نەیار دەچوون. پرۆشە بە هوشیارییەوە بێئاگایی لە جیهان هەڵبژاردبوو، کچێکی گەلێک دڵناسک و ڕۆحبەکوڵ بوو، نە حەزی بەدەنگوباس بوو و نە دەیویست بزانێت لە دونیادا چ باسە، پرۆشە جگە لە شتە بچوکەکانی دەوروپشتی بایەخێکی ئەوتۆی بە هیچ نەدەدا، لەو کاتەوەی هاتبوونە شار، هەموو خەیاڵی لەسەر جوانکردنی دیکۆرەکان و پاککردنەوەی شتە ئەنتیک و توحفەیاتەکانی باوکی بوو. پاککردنەوەی ڕۆژانەی ماڵ و شتنی بەردەوامی پەردەکان و پاکڕاگرتنی شێتانەی حەوش و هەیوانەکە بەشێک بوو لە ڕیتواڵێکی دەرونی قووڵ کە ئەگەرچی زۆر کامەرانی دەکرد، بەڵام لەگەڵ گەنجی و قەشەنگی ئەودا نەدەگونجا. پرۆشە کەدەچووە بازاڕیش گەڕان بەدوای قاپی قەشەنگ و سفرەی تایبەتی و تابلۆی ناوازەدا، خولیای هەرە گەورەی بوو. ئەمە جگە لەوەی هەموو جلە سەربازی و

قاتە مەدەنییەکانی مێردە گەنجەکەی و براکەی بە خاوێنی لە دۆڵابێکدا هەڵگرتبوو، کە ناوی نابوو «دۆڵابی یادگارە تاڵەکان». بەوەدا خوشکە بچوکەکەی بە شتێک لە لووتبەرزی لە خوشکەکەی دەڕوانی، بەردەوام شتێک دەهاتە پێشێ وای لە پڕوشە دەکرد دەستبکات بە گریان. بەوەدا کچەکە بەدەگمەن کتێبێکی بخوێندبایەتەوە، بەدەگمەن بایەخی بە دەنگوباس بدایە، هیچ شتێکی لەسەر مێژووی دونیا نەدەزانی، ئیدی سەوسەن هەمیشە بۆنەیەکی دەدۆزییەوە برینداربیکات، بەشێوەیەک فیکرەت گوڵدانچی بەردەوام بەڵام بێدەرەنجام لە هەوڵی ئەوەدا بوو پەیوەندی دوو خوشکەکە ئاسابیبکاتەوە.

ئەو شەوە گوڵدانچی دوای ئەوەی باسی دوا هەواڵەکانی دونیای لەگەڵ سەوسەندا کرد، لە کیژەکەی پرسی ئاخۆ سەبارەت بە خوازبێنیکەران گەیشتۆتە بڕیارێکی تایبەتی؟. سەوسەن گووتی «گرنگترین بڕیارێک پێیگەیشتبم ئەوەیە ئەو سێ کەسە بەستەزمانە ڕزگاربکەم... ئەوان دەبێت من و ئەم شارە و ئەم دونیا بچوکەی ئێرە لە بیربکەن. هەرسێکیان شایستەی ئەوەن یارمەتیانبدەم، منیان بە جۆرێکی شێتانە خۆشدەوێت، سێ گەنجن و سێ دڵی گەرمیان هەیە... شوویکەم بە هەر یەکێکیان دڵی ئەوانی تر دەشکێت. بەڵام ئەوان منیان بۆیە خۆشدەوێت چونکە هیچ شتێک دەربارەی دونیا نازانن... ڕۆژێک کە شتێک دەربارەی دونیا فێربوون، لەوانەیە ئیتر منیان خۆش نەوێت... ئیتر ئەو کات ڕقیان لە یەکتر نابێت».

فیکرەت گوڵدانچی بە تێفکرینێکی قووڵەوە قاچی خستە سەر قاچی و گووتی « ڕق ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دڵی مرۆڤدا نامرێت... دڵی بەشەر دەتوانێت ڕق بە جۆرێکی باشتر لە خۆشەویستی هەڵگرێت، ئەزموونی من لەگەڵ ژیاندا پێمدەڵێت، خۆشەویستی شتێکە دێت و دەڕوات، بەڵام ڕق ناڕوات، یان زۆر بەزەحمەت دەڕوات... ڕەنگی دەگۆڕدرێت، بەڵام لە

ناوناچێت».

سەوسەن بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە گووتی «هۆکەی ئەوەیە مرۆڤ لە جێگای خۆی ناجوڵێت، گوڵدانچی... مانەوەی دوورودرێژ لەیەک جێگادا، کینە دروستدەکات... مرۆڤ گەر کۆچبکات، گەورەیی دونیا تاقیبکاتەوە، کاتی بۆ شتی بچوک نامێنێت».

«هەڵبەت کچم، زانیارییەکانی تۆ لەسەر مرۆڤ هێشتا وەک پێویست قووڵ نین. مرۆڤ مەخلوقێکی گەڕۆک نییە، مرۆڤ چەند دوور بڕوات هەر دەگەڕێتەوە بۆ نیشتیمان، پێمبڵێ: بۆ سەندباد لەدوای هەموو سەفەرێک دەبوو بچێتەوە بۆ بەغداد، بۆ یۆلیسیۆس دەبوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی؟. تۆ هەموو ئەو تێکستانە دەناسیت و لە منداڵییەوە بیستووتن... خۆشەویستی و ڕق لە کوێ بن، مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆئەوێ».

سەوسەن کتێبەکەی داخست و بۆ ئێستێک دەستی خستە سەر سنگی و وەک بەزەحمەت بتوانێت هەوا هەڵمژێت، هەناسەیەکی وەرگرت و وەک شتێک لە خۆی دووربخاتەوە دەستی جوڵاند و گووتی «گوڵدانچی گوێم لێبگرە، ئەگەر ئەو سێ پیاوە لەم شارەدا بمێننەوە، دەکەونە گیانی یەک، تۆ نازانیت چەند ڕقیان لە یەکە. من دەتوانم هەر سێکیان ڕەتبکەمەوە، من عاشقی کەسیان نیم... واناڵێم لەبەرئەوەی تۆ باوکمیت یان شەرمدەکەم... بەڵکو لەبەرئەوەی دڵی من بەجۆرێک لە جۆرەکان خاڵی دروستبووە... بەڵام ئەوان هەر سێکیان کوڕی باشن، هەر یەکەیان جوانییەکی تێدایە ئەوی تریان نییەتی، هەر سێکیان دەتوانن ببن بە سێ مێردی دڵسۆز. دڵنیاتدەکەمەوە گوڵدانچی هەر سێکیان دەبن بە سێ مێردی باش، ڕەنگە بۆ هەر کچێکی دی لە پور و ئامۆزاکانم مێردی زۆر باش بن، بەڵام گوڵدانچی من بەجۆرێکی تر دروستبووم. لە ئێستادا من هەر یەکێکیان هەڵبژێرم دووانەکەی تر بە حەسرەتەوە دەکوژم... لەوانەیە ئەم حەسرەتە لە کۆتایشدا هەر بمێنێت، بەڵام باشتر وایە

بڕۆن... بەڵکو لە جێگایەکی زەمینـدا بوەسـتن، بەڵکو لـە دوورگەیـەک یان شارێکی دونیادا ژنێکی دی ببینن و عاشقی ببن و لـەوێ نیشتەجێبن و من لە یادبکەن. من نازانم ئاخۆ دەگەڕێنەوە یا نا... بەڵام لە ئێستادا باشترە دووریکەونەوە... من تەنیا ئەوەم بۆدەکرێت دووریان بخەمەوە، بۆ ئەوەی جیهان ببینن، بۆ ئەوەی گەر گەڕانەوە شتێکی ئەم دونیا گەورەیەم بۆ بهێنن شادمبکات، یان تۆ لەو باوەڕەدا نیت من شایستەی ئەوەبم کەسێک بڕوات و لەوسەرەوە شتێکی ئەم دونیایەم بۆ بهێنێت، ها بە شایستەی ئەوەم نابینیت؟». گوڵدانچی سەری بادا و گوتی «نا سەوسەن، تۆ شایستەی ئەوەیت. بەڵام من دەپرسم بۆ واز لە چیرۆکی ئەم شووکردنە ناهێنیت و خۆت بڕۆیت، لەم کتێبخانەیە وەرە دەرەوە و بڕۆ. من باوکتم، هەموو شتێک دەکەم بۆ ئەوەی بۆ هەر جێگایەک بتەوێت سەفەربکەیت». سەوسەن بێئەوەی بیریکاتەوە و بوەستێت گوتی «گوڵدانچی من هەندێجار کە لەگەڵ خودادا قسەدەکەم دەڵێم، خودایە بۆ زەویت وەها گەورە دروستکرد، بۆ کیشوەرەکان بەمجۆرە بەرین و دەریاکان بەو چەشنە بێسنوورن. بۆ مرۆڤ لەم گەردونە گەورەیەدا مەحکومە بە بینینی هەندێ شوێنی چکۆلانە، مەحکومە بە دیلی لە یەک ماڵ و لە یەک شار و یەک بستە زەویدا. باوکە من دەزانم، من هەتاهەتایە لەم قەفەزەدا دەبم، من باڵم نییە. نامەوێت زۆر بیر لە مۆکان بکەمەوە، بەڵام سەیرمکە من کچێکی نەخۆشم و باڵم نییە. یەکێکی وەک من کە تەنیا باوکێکی پیر و بەدبەختی هەیە ناتوانێت ببێت بە دونیادیدە. ناتوانم تۆ و ئەم کتێبخانەیە جێبهێڵم... ناتوانم. لەبری ئەوە دەمەوێت شوو بە پیاوێک بکەم کە بۆنی دونیای لێدێت، بۆنی ئەم ئەستێرەیەی لێدێت، کە دەست لە دەستی دەدەم دەبێت بزانم کە دەستی بەر گوڵە سەیرەکان کەوتووە، بزانم لە ئاوە دوورەکاندا دەموچاوی شتووە، کە دەست لە سنگی دەدەم هەوای دارستانە دوورەکانی

تێدابێت. هەستبكەم لەسەر ئەم ئەستێرەیە ژیاوە. من بەزەیم پیایاندا دێتەوە كە دەڕۆن... كە ئەم شارە بەجێدەهێڵن، بەڵام گەر تامردن لەم شارە بچكۆلەیەدا بژین، ئەوكات زیاتر بەزەییم پیایاندا دێتەوە... بەزەیم پیایاندا دێتەوە كە بەجلی سەربازییەوە بیانبینم، بە خۆیان و پۆستاڵ و بێرییەكانیانەوە بچن بۆ جەنگ و وابزانن ژیاون. مرۆڤ گەر یەك ڕۆژیش بچێت بۆ جەنگ تا مردن بۆنی باروتی لێدێت. باوكە، من ماوەیەكی درێژە بیر لەوە دەكەمەوە گەر لێرە بژین، چییان بەسەردێت... دەبن بە فەرمانبەرێكی بچوك، یان دەبنە دوكاندارێك كە بەدیار بۆدرە و عەترەوە پیردەبێت، یان لە شەڕە چەقۆیەكدا دەكوژرێت... باوكە، من چەند بیری لێدەكەمەوە ناتوانم گوناهی وەهایان بەرامبەر بكەم، ناتوانم لە ژیانێكی وەهادا گیریانبكەم. سبەی دەڕۆن یان دوو سبەی یان هەر ڕۆژێكی دی... هەموو هیوام ئەوەیە كە تا ماندوودەبن زەوی بگەڕێن... گەر هەرگیز نەگەڕانەوە ئەوا من لە دڵەوە دۆعایان بۆدەكەم بەختەوەربن... ئەوان خۆیان نازانن كە چ ژیانێكی پوچ دەژین، هیچ مرۆڤێك لەم شارەدا نازانێت چ ژیانێكی پوچ دەژی، هیچ مرۆڤێك... بەڵام باوكە، كاتێك بڕۆن و دونیاببینن، منیان لە بیردەچێتەوە... لە قووڵایی دڵەوە حەزدەكەم منیان بیربچێتەوە، بەڵام گەر منیشیان بیرنەچێتەوە هەر بەختەوەردەبم، چونكە ئەو كات ئیتر دڵنیادەبم كە عاشقی گەورەم هەیە، عاشقێك بینینی دونیا، بینینی ژنە جوانەكانی سەر زەمین منی لە بیر نەبردۆتەوە. گەر لە شارە دوورەكاندا بۆنی خاكی تر و درەختی تر هەستیكردن، ئەوكات گوڵدانچی ڕەنگیان دەگۆڕێت، ژیانیان دەگۆڕێت، ئیتر كاتێك دەگەڕێنەوە بۆ ئێرە دەبن بە كەسێكی تر... بەڵام دڵنیام زۆر كەس تێم ناگەن، نە لێرە و نە لەدەرەوە... زۆر كەس تێم ناگەن. ئا باوكە لە هەر شتێك گرنگتر ئەوەیە ببینم كە ئەوان دوای ئەوەی دونیا دەبینن چۆن سەیری من دەكەن... ها... ئاخۆ من كچێكم دوای بینینی

دونیاش مرۆڤ هەر دەتوانێت عاشقم بێت... ئەوە لە پرسیارەکانی تر گەورەترە. من نازانم، چۆن دەتوانم خۆشەویستی پیاوێک قەبووڵبکەم کە هیچ لە دونیا نازانێت؟».

بیرۆکەکەی سەوسەن، فیکرەت گوڵدانچی زۆر سەرسامکرد. پێشتر حیکایەتی ئافرەتێکی نەبیستبوو بەو چەشنە لە مەراقی وێنەی خۆیدا بژی، ئەوەی تێبگات داواکارەکانی چۆن دەیبینن دوای ئەوەی جیهان دەبینن، سەیرترین تاقیکردنەوەیەک بوو مەخلوقێک خۆی بۆ تەرخانبکات. پێشتر تەنیا ئەو مرۆڤانەی بینیبوو کە بایەخێکی ئەوتۆ بە وێنەی خۆیان نادەن، یاخود بە وێنەی یەکەمی خۆیان ڕازی دەبن و تادەمرن پێوەی دەژین. بەڵام ئەوەی سەوسەن پێیوابێت ئەو مرۆڤانەی جیهانیان نەبینیوە ناتوانن بەڕاستی هیچ ببینن، بڕوایەکی نائاسایی بوو. فیکرەت گوڵدانچی هەمیشە باوەڕی وابووە کە جیهان ئاوێنەیەکی گەورەیە، بەڵام چەشنە ئاوێنەیەکە مرۆڤ بۆ ئەوەی وێنەی خۆی تیا بدۆزێتەوە دەبێت بچێتە ناوی، تەنیا ئاوێنەیەکە لە مدیوەوە وێنەی خۆمان نابینین، بەڵکو دەبێت بڕۆینە ئەودیوی و لە ناویدا مەلەبکەین، ئەوانەی کە دەچنە ناو ئاوێنەکەوە شتەکان بە جۆرێک دەبینن جیاوازە لە بینینی ئەوانەی کە نەچوونەتە ئەو دیو ئاوێنەکە. بەڵام سەوسەنی کچی ئەوەتەی لەدایکبووە لەو کتێبخانەیەدا دەژی، کچەکە ناتوانێت ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دونیاوە بکات. کچەکەش وەک ئەو دیلی ئەو کتێبخانە گەورەیە بووە. ئێستا دڵنیابوو هیچ زیندانێک لە زیندانی کتێبخانە قایمتر و تاریکتر و ئەستوورتر نییە، هەر کەس یەکجار کەوتە زیندانی کتێبخانەوە ئیتر تا مردن ناتوانێت بێتەدەرێ. لە دڵی خۆیدا گوتی «کتێب تەنیا زیندانە مرۆڤ لێیدەرناچێت». لە نیهانی خۆیدا گوتی کچەکە دەیەوێت هەموو دونیا لە ڕێگای کتێبەوە بناسێت، ئەو بۆ پیاوێک دەگەڕێت لە کتێبێکی گەورە بچێت، بتوانێت سەیری چاوی بکات و دونیای لە ناودا بخوێنێتەوە.

فیکرەت لەو شەوەدا وابیریکردەوە، بۆ ئەوەی کچەکەی بژی دەبێت لەو زیندانە بێتەدەرێ. ئێستا دڵنیابوو تەنیا لەسەر حیسابی وێرانبوونی ئەم کتێبخانە گەورەیە، سەوسەن دەتوانێت ببێتەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی کە لە ماڵێکی ئاساییدا ژیانێکی ئاسایی بژی. دوای ئەو هەموو ساڵە، ئێستا ڕقی لە کتێبخانە گەورەکەی خۆی بوو... زۆر زۆر ڕقی لێیبوو. هەستیدەکرد ئەم شارە خۆشەویستی کتێب و فێربوونی تیا کوشتوە... دڵنیابوو هەموو ئەو زانستانەی لە ژیانیدا کۆیکردونەتەوە سوودێکیان نییە... جگە لەوەی مرۆڤ دەخەنە ناو زیندانێکی گەورەوە، لەم شارەدا سوودێکی ڕاستەقینەیان نییە... ئەو شەوە بەجۆرێک لە زانست و کتێب تووڕەبوو، دەیتوانی ئاسان هەموو کتێبەکان بسووتێنێت.

## ٢١

هەمــوو دەمانزانــی کــە هەرســێکیان یــەک وەڵام بــە سەوســەن فیکــرەت دەدەنــەوە، هیــچ کەســێک نەبــوو لــە شــاردا چیرۆکەکــەی بیســتبێت و لــەو باوەڕەدا بووبێت یەکێک لـە داواکاران پەشیمان دەبێتـەوە، بـەڵام ئـەوکات هەمــوو واماندەزانــی پرســیارەکەی خانمــی گوڵدانچــی پرســیارێکی ســادەیە و هیچــی دیکــەی بــەدوادا نایەت. لـە ماوەی دە ڕۆژدا، لەچەنـد کاتێکی جیاوازدا، هــەر ســێ داواکارەکــە بــە ســێ نامــەی تایبەتــی وەڵامــی سەوســەنیان دایــەوە. جگــە لــە سەوســەن فیکرەت هیــچ کەســی دی نامــە ڕاســتەقینەکانی نەبینــی. سەوســەن هــەر ســێ نامەکــەی بەداخــراوی وەرگــرت و هــەر ســێکیانی بــە تەنهــا خوێنــدەوە و دوای خوێندنەوەیــان هــەر ســێکیانی لــە جێگایەکــی نهێنــی و تایبەتیــدا هەڵگــرت. ناوەڕۆکــی نامەکــەی خالیــد ئامــوون و مەنســور ئەســرین ســاڵانێکی زۆر بــە نهێنــی مایــەوە، بــەڵام نامەکەی کامەرانی ســەلما هەر هەمان ڕۆژ لــە بــازاڕ لەبەردەستی زۆر کەسـدا بـوو، هەتـا هەندێـک کـەس کۆپییەکـی نامەکەیــان پێبــوو و لــە گــوزەری هەلاجــەکان و لای شەربەتفرۆشــەکان و لــە مەزاتخانــەی گــەورە بەدەنگــی بــەرز دەیانخوێنــدەوە. تــا ئێســتاش هەندێــک کــەس ئــەو نامەیەیــان لەبــەرە، نامەیەکــی جــوان نەبــوو، بەڵکــو سادەییەکی تێدابــوو مرۆڤــی غەمگینــدەکرد. کامــەران بــە خەتــە ســادە و ناڕێکەکــەی خــۆی نوســیبووی «سەوســەن خــان، بمنێریــت بــۆ هــەر جێگایەکــی دونیــا دەڕۆم، هەتــا بــۆ ئەوپــەڕی دونیــاش، گــەر شووشــم پــێ نەکەیــت، هــەر دەڕۆم...

تـۆ چیـت دەوێـت دەیکـەم... بـە چ شـتێک دەتوانـم خۆشەویسـتی خـۆم بسـەلمێنم، دەیسـەلمێنم... بـڕۆم بـۆ هـەر جێگایـەک، گـەر لەسـەر داوای تـۆ بێـت، دوودڵـی ناکـەم. بـۆ ئـەوەی بزانیـت کامەرانـی سـەلما چەنـد حـەزی لـە تۆیـە و چەنـد دڵـی بەتۆوەیـە، بـاڵ لـە باڵنـدە و تەیروتیـور قەرزدەکـەم. بـێ ئـەوەی مەرجـم هەبێـت، شـێتی تـۆم، بـێ ئـەوەی مەرجیشـم هەبێـت، هـەر شتێک تـۆ داوایبکەیـت مـن دەیکـەم... مـن دوێنـێ شـەو بـە هاوڕێکانـی خـۆم گـووت کـە لـە ماڵـی سـدیق سـێ دایـەن دانیشـتبووین و قسـەماندەکرد، کـە مـن پێویسـت نـاکات بیربکەمـەوە... چونکـە نازانـم چـۆن بیربکەمـەوە یـان بیـر لـە چـی بکەمـەوە. مـن پێـش ئـەوەی لـەو ژوورە گەورەیـەدا تـۆ ببینـم کـە پڕبـوو لـە کتێـب، تـۆم خۆشدەویسـت، ئێسـتا کەدەزانـم تـۆ ئـەو هەمـوو کتێبـەت خوێندۆتـەوە، شـەیداتربووم... مـن بـە هەمـوو ڕەفیقەکانـم گـووت: کـە تـۆ تاقیمبکەیتـەوە، باشـترە لـەوەی تاقیـم نەکەیتـەوە... مـن حەزناکـەم زۆر بـە عەقـڵ بیـر لـە شـتەکە بکەمـەوە. مەنگـوڕی ڕەفیقـم دەڵێـت: عەقـڵ درۆزنـە و هـەر بەدرۆزنیـش دەمێنێتـەوە. ئـەو دەڵێـت: عەقـڵ هەمـوو شـتێک تێکدەدات. بۆیـە مـن بـە عەقـڵ بیـری لـێ ناکەمـەوە، تـۆ چیـت دەوێـت، مـن دەیکـەم... یـەک شـت کـە ناتوانـم بیکـەم ئەوەیـە کـە تـۆم لـە خەیاڵـی خـۆم بـۆ دەرناکرێـت... وەعـدت دەدەمـێ ئەوەیـان قـەت نابێـت... مـن قـەت سەوسـەن خانـم لەبیرناچێتـەوە، لـەوە دەرچێـت هەمـوو شـتێکی تـر دەکـەم».

هەمـوو کـەس دەیزانـی کـە مەنگـوڕ کۆمەکێکـی زۆری بـە کامەرانـی سـەلما کـردوە تـا نامەکـەی داببڕێژێـت، هـەر خۆشـی سـوور بـوو لەسـەر ئـەوەی نـاوی لـە نامەکـەدا بێـت. سەوسـەن لـە هـەر سـێ نامەکـە نیگـەران بـوو. هـۆی دڵتەنگـی و نیگەرانییەکـەی تەنیـا ئـەوە نەبـوو کـە هـەر سـێ نامەکـە «وەک ساڵانێک دواتـر خـۆی بـۆی باسـکردین» بەسـێ دارشـتنی خـراپ داڕێـژراون، بەڵکو ئەوەبوو هیچ یەک لەو سـێ داواکارە سـەرەڕۆ و جەسـوورە پاشەکشـەیان نەکـرد. ئـەوکات کەسـمان نەماندەزانـی کـە سەوسـەن بەڕاسـتی نایەوێـت شـوو

بە کەسیان بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە رامان وابوو ئەو لەدڵی خۆیدا یەکێک لە سێ داواکارەکەی بەدڵە و تەنیا لە ترسی شتێکی نادیار ناتوانێت بڕیاربدات. چەند رۆژێک دوای گەیشتنی نامەکان دووبارە فیکرەت گوڵدانچی و سەوسەنمان لە بەردەم دائیرەی پۆستەدا بینییەوە، پێکەوە چوونە ژوورەوە و دوو پێچراوەی گەورەیان وەرگرت و بە تاکسییەکی کۆن گەڕانەوە بەرەو ماڵ. دواتر زانیمان ئەو پۆستە دوو گەورەترین فەرهەنگی تایبەتی باڵندەی لە دونیادا تێدابووە. لەو ماوەیەدا ئامووزنییەکان لەلای خۆیانەوە کەسانێکیان دیاریکرد تا شەو و رۆژ چاودێری ماڵی فیکرەت گوڵدلنچی بکەن، مەنگوڕی بابەگەورەش لە بەردەم ئێمەدا وا خۆی دەنواند کە کەسانی تایبەتی داناوە هەواڵی بۆبهێنن، بەڵام زۆریەمان باوەڕمان پێ نەکرد... هەڵبەت توانای مەنگوڕ بە ئامووزنییەکان بەراورد نەدەکرا، ئامووزنییەکان خەڵکانی ئێجگار دەست رۆیشتووبوون، بەڵام مەنگوڕیش خەڵکی خۆی هەبوو کاریان بۆدەکرد، وەک قەپۆز جوقڵی و لچ قۆقز کە لە بزێوترین چەورەکانی شار بوون، هەردووکیان بەجۆرێک وریابوون، دەیانتوانی هەواڵی زۆر عاسی لە کونجی زۆر سەختەوە دەربهێنن.

ئێوارەیەک عیزەت گوڵدانچی لەگەڵ خەندە گوڵدانچی و عیسمەتی خوشکیاندا بەتایبەت چوون بۆ ماڵی فیکرەت تا تێبگەن کیژەکە چ نیازێکی هەیە، پێدەچوو گوڵدانچییەکانیش بەجۆرێک لە جۆرەکان سەبریان نەمابێت، ئەوەی بابەتی شووکردنەکەی سەوسەن لەسەر هەموو زارێک بوو بێزاریدەکردن، هەندێک لەوان ئەو دەنگۆیانەیان بۆ پاشەڕۆژی کچ و کوڕەکانی خۆیان بە هەڕەشەیەکی گەورە دەزانی. ئەوە یەکەمین دانیشتن بوو کە بەدەنگەدەنگی گەورە لە نێو گوڵدانچییەکاندا تەواوبوو، لەو کاتەوەی فیکرەت لە بەغداد گەڕابووەوە، پەیوەندییەکان هێمن و سادەبوون، بەڵام دراوسێکانی ماڵی گوڵدانچی گوێیان لە عیزەت گوڵدانچی و مەعسومەی خوشکی بوو، کە هەردووکیان بە دوو پاڵتۆی درێژ و دوو

چەتری درێژەوە بە توڕەییەوە لە ماڵی فیکرەت هاتنەدەرێ و بەدەنگی بەرز دەیانگووت «شێت بووە، خانم شێت بووە و عەقڵی فیکرەتیشی تێکداوە». بەڵام تا دوای دوو ڕۆژیش کەس بە تەواوەتی نەیدەزانی لە ماڵی گوڵدانچیدا چی بووە و چی ڕوویداوە. ئێوارەیەک دواتر لە شاردا بڵاوبووەوە کە سەوسەن داوایکردوە هەر سێ داواکارەکە بەیەکەوە ببینێت، داواشیکردوە هەر یەکێک لەداواکارەکان، یاوەرێک و کەسێکی نزیک لەگەڵ خۆیاندا ببەن. سەرەتا شتەکە تەنیا وەک داوەتێکی ئاسایی وەسفکرا، ئێوارە خوانێکی گەورە کە سەوسەن تێیدا لەسەر یەک سفرە لەگەڵ خوازبێنیکەرانیدا کۆدەبێتەوە، هەندێک شتەکە واتێگەیشتن کە کیژەکە دەیەوێت بە چەشنی کچەمیرە کۆنەکان داواکارەکانی خۆی لە نزیکەوە و ڕووبەڕوو تاقیبکاتەوە، هەندێک دەیانگووت کیژەکە بە نیازە لە ئەتەکێتی خواردن و دانیشتن و قسەکردنیان وردببێتەوە، هەندێکیش دەیانگووت کیژەکە وەما خۆی تەیارکردووە هەر سێکیان ڕیزبکات و کورت و درێژییان بگرێت و چ شتێک لە لەشیاندا دەپێورێت بیپێوێت و دواتر بڕیاری خۆی بدات. دەبێت بڵێم کە هەواڵی ئەو داوەتە هاوبەشە لە هەموو بەرەکاندا شپرزەییەکی زۆری دروستکرد، مێژووی شارەکە و نەرێتەکانی ئاسان خۆی بۆ ئەو جۆرە شتانە نەدەکردەوە. پێشتر کەس ئەوەی نەبیستبوو خێزانێک کیژەکەیان داواکاری زۆری هەبێت و بەوچەشنە هەموویان بۆسەر یەک سفرە داوەتبکەن. بەڵام بەوەدا داوەتەکە بەجۆرێکی ڕەسمی بوو، لەسەر کارتی تایبەتی نوسرابوو، کارتەکان لە بری ناوی سەوسەن ناوی هەر یەک لە فیکرەت گوڵدانچی و خەندان گوڵدانچی خوشکە بچوکی هەڵگرتبوو، کەس هەستی بە ناڕێکییەکی گەورە نەکرد. دیاربوو بیرۆکەی ئەو داوەتە لە پشت شەڕی ناوخۆی نێوان گوڵدانچییەکانەوە بووە، بەوەدا عیزەت گوڵدانچی خۆی بە پارێزەری گەورەی نیرسی گوڵدانچییە دێرینەکان دەزانی کە پێکڕا خەڵکانێکی

بێدەنـگ و بەنەریـت و موحافەزەتکاریـوون، ئـەو داوەتـەی بەناشایسـتە و دەرچوون لـە ئسـوڵ دەزانـی. وەک ئـەوەی گوڵدانچییـەکان بـە هاتنـی پـۆل پۆلـی خوازبێنیکـەران بـۆ کیژەکانیـان بەختەوەریـن و خۆشـحاڵ بـن کیژانیـان وەهـا جـۆرە سـەرنج و ئاوداریيـەک ڕابکێشـن. عیسـمەت گوڵدانچیـش لـە بـرا گەورەکـەی کەمتـر تورەنەبـوو، ڕۆژی زوبیرییەکـە ئەویـش دەسـتی بـە مێـزی هۆڵـە گەورەکـەی ماڵـی فیکرەتـدا کێشـا و گووتـی «چ ئابڕووچوونێکـە بـە کچەکانمـان بڵێـن، پیـاو لـە دەوری خۆیـان خڕدەکەنـەوە». دەبێـت بڵێـم گـەر ئـەو ڕووداوە سـەیرانە نەبایـە کـە دواتـر هاتنەپێشـێ، لەوانەبـوو خەڵکێکـی زۆرتـر دەم لـە فیکـرەت گوڵدانچـی و کیژەکـەی بکەنـەوە، بـەڵام پێشـهاتەکانی دی بـە چەشـنێک خەیاڵـی و نائاسـایی بـوون، خەڵـک زوو قسەوباسـی ئـەو داوەتـە نائاسـاییەیان لەیادکـرد. دیاربـوو داوەتکراوانیـش هەمـوو ترسـیان لـەو دانیشـتنە هەبـوو، هـەر داواکارە و بـە ئومێـدی ئەوەبـوو جارێکـی دی دانیشـتنێکی تەنیـای لەگـەڵ سەوسـەندا هەبێـت، هـەر یەکـە و کینەیەکـی شـاردراوەی بەرابـەر ئەوانـی دی لـە دڵـدا بـوو. بـەڵام ڕۆژی دانیشـتنەکە هەمـوان هەوڵیانـدا مێمنـی خۆیـان بپارێـزن و بەسـەبر دەربکـەون. مەنگوڕی بابەگـەورە بـە کامەرانـی سـەلمای گـووت «ئـەوە فرسـەتێکی باشـە، بەویقـار بـازاڕی ئەوانـی تـر بشـکێنین».

کامەرانـی سـەلما تەنیـا داواکارێـک بـوو بەجلـی کوردییـەوە چـوو بـۆ داوەتەکـە، هەمـوو کـەس دەیزانـی کـە مەنگـوڕ یاوەری ئـەوە و تـا کۆتاییـش یـاوەری ئـەو دەبێـت، کەسـانێکی نزیکیـش لـە مەنسـور ئەسـرینەوە ئـەو هەواڵانەیـان پشـت ڕاسـتکردەوە کـە سـاقی مەحمـود یـاوەری مەنسـورە. بـەڵام تـا ڕۆژی داوەتەکـە ڕوون نەبـوو ئامووزنییـەکان کـێ لەگـەڵ خالیـددا دەنێـرن. وادەی داوەتەکـە سـەعات دوازدەی یەکێـک لـە ڕۆژانـی هەینـی بـوو، هـەر شـەش داوەتکراوەکـە لـە نێـوان سـەعات دوازدە و دوازدە و چارەکدا گەیشـتنە ماڵـی گوڵدانچـی، جگـە لـە خالیـد ئامـوون کـە لەگـەڵ قەلەنـدەر ئاموونـدا

بە ماشێنێكی تویێتای نوێ گەیشتنە ئەوێ، چوارەكەی دیكە بە تاكسی گەیشتنە بەرقاپی گوڵدانچی. هەموو سەرسامبوون لەوەی ئاموونییەكان لە بری فەوزی بەگ و سەلامی ئاسنگەر، یەكێكی وەك قەلەندەر ئاموونیان هەڵبژارد كە وەك پیاوێكی شەڕانی و كەم حەوسەڵە ناسرابوو. پێكڕا پێمان وابوو، ئاموونییەكان قەلەندەریان بەرابەری مەنگوڕ دلناوەوە و بە ڕۆحی جەنگەوە چوونەتە ناو ئیشەكەوە، ئەو كات نەماندەزانی ئەو هەڵبژاردنە چ كاریگەرییەكی لەسەر هەموو بەسەرهاتەكان دەبێت. میوانەكان سەرەتا لە لایەن فیكرەت گوڵدانچی و خەندانی خوشكییەوە لە ساڵۆنە گەورەكەدا پێشوازیان لێكرا، هەموو بەجوانترین شێوە خۆیان گۆڕی بوو، هەموو هەوڵیاندا ویقار و هێمنی دەربخەن. هەر لەو ساڵۆنەدا دەبایە فیكرەت گوڵدانچی دەستبكاتە ملی كامەرانی سەلما و دەستی بگرێت و داوابكات تەوقە لەگەڵ مەنسور ئەسرینیدا بكەن، ئەو ئاشتبوونەوەیە یەكەمین و گرنگترین شتی سەرەتای دانیشتنەكە بوو. خەڵكانێكی زۆر سووسەی ئەوەیان كردبوو كە گوڵدانچییەكان دەشێت كارێكی وەهایان بەدەستەوە بێت تا وەك خێزانێكی باش و ئاشتیخواز دەربكەون. لە ڕاستیدا ئەو ئاشتبوونەوەیە هەلا و دەنگۆیەكی وەها گەورەی نەنایەوە كە چاوەڕواندەكرا، چونكە دواتر شتەكان شێوەیەك و سروشتێكی وەهایان وەرگرت، زۆربەی خەڵك شەڕی ژێر زەمینەكەی دوكانی خدرۆ دووپاریان لە بیرچووەوە. لە ساڵۆنەكەی ماڵی گوڵدانچییدا ماوەیەك جگە لە بێدەنگییەكی قورس هیچ شتێكی دی سەروەر نەبوو، ئەو ئاو و شەربەت و چكلێتە شیرینانەی پڕوشە گێڕانی، كۆمەكێكی بە داوەتكراوەكان كرد لە بێدەنگی خۆیاندا قووڵتر ببنەوە، تاكە كەسێك كە لە ژێرەوە بە نهێنی لە هەمووانی دەڕوانی خالید ئاموون بوو كە هێمنی ڕوخساری نەیدەكرد كینەی شاردراوەی دڵی داپۆشێت. كە لە ساڵۆنەكەدا دانیشتبوون جگە لە هەندێ وشەی كەم كە ساقی مەحمود و مەنگوڕ دەربارەی ساردی زستان گۆڕیانەوە هیچی ئەوتۆ

ئەوترا، کەمێک لە سەر خوتبەی مەلایەکی هەفتەی پێشوو قسەیانکرد کە هەرەشەی لە ژنانی سفور کردبوو. مەنگوڕ گورتی «مەلاکان هەق نییە قسەی وابکەن، هەر کەس بە قوونی خۆیەوە دەچێتە قەبرەوە».
قسەکانی مەنگوڕ، فیکرەت گوڵدانچی خستە پێکەنین. هەمووان ماوەیەک، نەفەری ناو یەک پاس چۆن لەگەڵ یەکدا دەدوێن، بەو چەشنە لەگەڵ یەکدا قسەیانکرد. سەوسەن یەکەمجار لەسەر مێزی نانخواردنە گەورەکە دەرکەوت، فیکرەت سەرەتا پێش میوانەکان کەوت بۆ سەر مێزێکی گەورە کە تەواو بە خواردن ڕازابووەوە، هەمووان لە هەمەڕەنگی و ناوازەیی سفرەکە سەریان سوڕما، بەڵام پێکڕا سەرنجی ئەوەیاندا بە پێچەوانەی نەریت و چاوەڕوانییەوە هیچ چەشنە گۆشتێکی باڵندە لە نێو خواردنەکاندا نییە. بێئەوەی کەس هیچ بدرکێنێت و تێبینی خۆی ئاشکرابکات، هەریەک لەسەر کورسی خۆی دانیشت. کاتێک سەوسەن هاتە ژوورێ هەمووان چەند ساتێک بوو لەسەر مێزەکە دانیشتبوون، کراسێکی سپی و جینزێکی کاڵی لەبەردابوو، ئەو هەستەی لای هەمووان بەجێهێشت کە هەر ئێستا لە کتێبخانەکەی هاتۆتە خوارێ و تا ئەوکاتە سەری بەسەر کتێبەکانەوە بووە. کەس چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد کچێکی وەها بۆ داوەتێکی وەها گرنگ نە مەکیاج بکات، نە خۆی برازێنێتەوە، نە شتێک بکات فریوی داواکارەکانی بدات، لەگەڵ ئەوەشدا سەوسەن هێشتا هەر گەلێک قەشەنگ و ناسک دیاربوو. ئەو ماندوێتییە زۆرەی، ئەو لاوازییەی، ئەو سپی هەڵگەڕانەی ڕەنگی، ئەوەی بە نیگایەکی ماندوو و بەدەنگێکی کەمێک کپ و لاوازەوە یەکەیەکە بەخێرهاتنیکردن و فەرمووی لێکردن دانیشن، هەر سێ عاشقەکەی تووشی تێکچوون و پەشۆکانێکی گەورە کرد. ئامادەبوونی لەسەر سفرەکە ئەو ترسەی لە هەمووانـدا خولقاند کە بەوردی پەیڕەوی ئەتەکێتی خواردن بن، سەوسەن چەند جارێک دووبارەیکردەوە کە هەمووان بێ هیچ کێشە و ئەتەکێتێک نان بخۆن، بەڵام ترسی میوانەکان هەر وەکو

خۆی بوو. هەر سێ داواكارەكە شتێكی كەمیان خوارد، هەر سێكیان لە بەر ئاسكی دانیشتنەكە هەوڵیاندا وادەركەون كە كەمخۆری سروشتین. هەتا مەنگوڕیش كە زۆر بەسفرەكە سەرسامبوو، دەستی گرتەوە و كەمی خوارد. دوای نانخواردن هەمووان گەڕانەوە بۆ ژووری گەورەی دانیشتنەكە. بێدەنگی پێش چا خواردنەوە و دوای چا خواردنەوە قورس و ترسناك بوو، سەوسەن نە لە كاتی نانخواردن و نە لە كاتی چا خواردنەوەدا بە شێوەیەكی تایبەتی سەیری هیچ یەك لە داواكارەكانی نەكرد. دوای تەواوبوونی چا خواردنەوە، فیكرەت گوڵدانچی ڕووی لە هەموو میوانەكان كرد و گووتی «وەك هەموو دەزانن و تەواوی خەڵكی شاریش دەزانێت، بەڕێزتان داواكاری كچەكەی منن و پێكیشەوە لەسەر ئەو مەرجە ڕەزامەندن كە سەفەرێكی درێژبكەن و هەر داواكارییەك سەوسەن بیخاتە بەردەمتان بەدوایدا بڕۆن... دیارە منیش تا ئێستا بە تەواوی نازانم سەوسەن بیر لە چی دەكاتەوە و نیازی چییە... بۆیە لەسەر داوای خۆی داوەتتاندەكەمە كتێبخانەكەی سەرەوەمان، ئەو جێگایەی ئێوە پێیناشنان و پێشتر پێكەوە لەگەڵ سەوسەندا لێیدانیشتوون. دڵنیام لەوێ سەوسەن هەموو شتێكتان بۆ ڕووندەكاتەوە». ساتێكی ئاسایی نەبوو. هەر شەش میوانەكە بە هێمنی كەوتنە دوای فیكرەت گوڵدانچی، لە ژووری كتێبخانەكە قەنەفەكان بەجۆرێك دانرابوون هەمووان بتوانن سەیری یەكدی بكەن و لە هەمان كاتیشدا ڕوویان لەسەوسەن بێت. ئەو ڕۆژە كە عاشقە شەیداكان لە شوێنی خۆیان دانیشتن، پێكڕا بەجۆرێك لە ناوەوە خرۆشابوون، نەیاندەتوانی هیچ شتێك بڵێن، سامێكی وەها سەیریان تێدابوو، وایان هەستكرد كە یەكەمجارە پێدەخەنە ئەم جێگایەوە، هەمووان ژووری كتێبخانەكەیان زۆر گەورەتر و بەرینتر لەوە بینی كە هەیە. كە دانیشتن و سەوسەن بەرامبەریان دانیشت، هەموو هەستیانكرد گرنگترین ساتی ژیانیان ئەم چركەیە و گرنگترین ڕۆژی ژیانیان ئەمڕۆیە. ویقاریان، وەستانیان، جوڵەیان

لە ناو کتێبخانەکەدا نائاسایی بوو. سەوسەن بە هێمنییەوە بەرامبەریان وەستا و دەستیکرد بە قسەکردن. بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە کە بە ئەستەم لەسەر لێوی سەمایدەکرد گووتی «ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، هەمووتان بزانن من چیم دەوێت». کەمێک لەسەر قەنەفەکەی پاڵیدایەوە و بە غەمگینییەکی زۆرەوە گووتی « بەڵام پێش ئەوە، پێش ئەوە، تکادەکەم، هەمووتان بێئەوەی دوودڵ بن، دەتوانن داواکەی خۆتان بکێشنەوە... من زویرنابم... من هیچ شتێک لە دڵ ناگرم... بگرە بۆتان بەختەوەر و ئاسوودەدەبم، چونکە من دواجار لە ئاسوودەیی ئێوە زیاتر هیچ شتێکی ترم ناوێت... من دەمەوێت رقتان لە یەکتر نەبێت». مەنگوڕ بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە گووتی «سەوسەن خان، خوازبێنی وەکو تیر وایە کە لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە... تازە مەسەلەکە لە پەشیمانی دەرچووە، تیرێکە کەوانی تێپەڕاندووە، ئەوەندەمان لەسەرە سەیربکەین و ببینین کوێ دەپێکێت». سەوسەن بێئەوەی سەیری مەنگوڕ بکات، تەماشای هەر سێ داواکارە گەنجەکەی کرد و گووتی «لەوانەیە بڵێن، ئێستا درەنگە... بەڵام من دەڵێم درەنگ نییە، بۆ ئەوەی لە خوازبێنییەک دەرچیت، هەرگیز درەنگ نییە. هەمووتان دەتوانن لە هەر کاتێکدا بێت، واز لە هەموو شتێک بهێنن، من زۆر لە هیچ کەس ناکەم... هیچ وەخت درەنگ نییە، نە ئێستا و نە بەیانی و نە دوو بەیانی و نە هیچ وەخت...». کەمێک بە ماندوویی چاوی لێکنا و گووتی «نا هیچ کات، بۆ هیچ شتێک درەنگ نییە... زەمان ناکۆتایە». هەمووان کەمێک لە دوامەمین وشەی سەرسامبوون، ساقی مەحمود بە کەمێک دوودڵی و پەشۆکانەوە گووتی «ڕاستە، زەمان ناکۆتایە». سەوسەن لەسەرەخۆ سەیری هەموانی کردەوە، مەنگوڕ ویستی شتێک بڵێت، بەڵام نەیزانی ئەو شتە چییە کە دەبێت بیڵێت، پاش ئێستێک و بە کەمێک ناکامییەوە گووتی «یوسف کەویار بە ڕەحمەت بێت دەیگووت: زەمان پردێکە هەموو

بەسەریدا دەڕۆین، ئەو دەیگووت: ئینسان بە هەڵە وادەزانێت لە ناو خانوو و سەرجادە و ژوور و ئەو شتانەدا دەژی، ئینسان لە یەک ژووردا دەژی ناوی زەمانەیە... ئەو وایدەگووت». سەوسەن دووبارە سەیری هەر سێ گەنجەکەی کردەوە و لەسەر هەمان ریتم گووتی «هەر ڕۆژێک ویستتان لە هەموو ئەم پەیمانە دەربچن، دەتوانن دەربچن. بەڵام بەر لەوەی من یەکێک لە ئێوە وەک شەریکی پاشەڕۆژی خۆم هەڵبژێرم... دەبێت ئێوە دونیا ببینن... ئێوە سێ گەنجن... هیچ شتێک لەسەر جیهان نازانن... هیچ شتێک... وادەزانن دونیا لە کۆڵانەکەی خۆتانەوە دەست پێدەکات و لەویادا تەواو دەبێت... ئەم شارە لای ئێوە وەک قەفەزی لێهاتووە... دەبێت سەرەتا بفڕن، زۆر زۆر بەرز بفڕن، دواتر بگەڕێنەوە بۆلای من... من خۆم ناتوانم بفڕم، من نەخۆشم، من کچێکی نەخۆشم، دەمەوێت لەگەڵ مرۆڤێکدا بژیم کە بزانم بەڕاستی دونیای بینیوە...».

قسەکانی بێدەنگییەکی قووڵی دروستکرد، هەمووان بێدەنگ سەیری سەوسەنیان دەکرد، کەسیان نەدەجوڵان، کەسیان هەناسەی نەدەدا، جگە لە کۆکەیەکی چکۆلانەی قەلەندەر ئامۆون کەس دەنگی لێوە نەهات. سەوسەن گووتی «من دەزانم دونیا چەند گەورەیە... لە منداڵییەوە دەزانم... لە ڕێگای ئەو هەموو کتێب و ئەتڵەس و فەرهەنگانەوە دەزانم... دەزانم چەند دەریا هەیە، لەقەراغی دەریاکاندا چەند کەشتی گەورە گەورە لەنگەر دەگرن... لەم شارە بچکۆلەیەدا، لە ناو ئەم شاخ و داغەدا ئێمە هیچ نازانین، ئەم شارە بچوکانە وادەکەن مرۆڤ گەورەیی دونیای بیربچێتەوە، بەڵام من ڕۆژێک لە ڕۆژان گەورەیی دونیام لەیادنەکردوە».
بە زەردەخەنەیەکی ماتەوە سەیری هەر سێ داواکارەکەی کرد و بۆ ئێستێک هەناسەیەکی کورتی وەرگرت و گووتی «زەوی ئەستێرەیەکی گەورەیە، ئێمە لەم شارە بچوکەدا وەکو ئەوە وایە لە سەر زەوی نەبین، وەکو ئەوە وایە نەزانین چەند جەنگەڵی گەورە و ڕووباری گەورە و

بیابانـی گـەورە لـەم دونیایـەدان... گـەر منتـان خۆشـدەوێت، یەکەمجـار دەبێت بـڕۆن و دونیـا ببینـن. مـن ناتوانـم لـەوە دڵنیابـم کـە ئێـوە بـە ڕاسـتی منتـان خۆشـدەوێت، گـەر جیهانتـان نەبینبێـت و شـوێنی تـر و نیشـتیمانی ترتـان تاقـی نەکردبێتـەوە... کـە دونیاتـان بینـی ئـەوکات هەمـوو شـتەکان بـە چاوێکـی تـر دەبینـن، منیـش بـە چاوێکـی تـر دەبینـن... تەنیـا کەسێک دەتوانێـت بەڕاسـتی بزانێـت بۆچـی دەژی کـە دونیـای بینیبێـت، کـە گەورەیـی زەویـی دۆزیبێتـەوە. یەکـەم شـت ئەوەیـە دەبێـت لـەم وڵاتـە دووربکەونـەوە، لـەم شـەڕ و شـۆڕ و کوشـتارە بەردەوامانـە دووربکەونـەوە... ئـەوەی ئـەم وڵاتـە بەجێبهێڵـن، مەرجـی منـە... بـڕۆن و بەسـەر زەویـدا بگەڕێـن. کچانـی تـر وەک مارەیـی داوای زێـڕ و مـرواری و ئەڵمـاس دەکـەن، مـن داوای سـەد باڵندەتـان لێدەکـەم... سـەد باڵنـدەی نـاوازە کـە لـە شـوێنی جیـاوازی زەویـدا دەژیـن... هـەر یەکەتـان سـەد باڵنـدە، لەمـڕۆوە تـا هەشـت سـاڵ کاتتـان هەیە بـە دونیـادا بگەڕێـن، مـن دوای ئـەوە دەتانبینمـەوە... دەتوانـن هـەر کاتێـک ویستتان سـەفەرەکەتان ببـڕن و واز لـە هەمـوو شـتێک بهێنـن و بگەڕێنـەوە بۆ ئـەم شـارە، دەشـتوانن نەگەڕێنـەوە، دەتوانـن لـە هـەر وڵاتێکـدا ئـارام بگـرن و ژنێکـی ترتـان خۆشـبوێت و بژیـن... دەتوانـن چ ژیانێکتـان پێخۆشـە و چ شـارێکتان پێخۆشـە هەڵیبژێـرن و مـن لەبیربکـەن... مـن چاوەڕوانتاندەکـەم... مـن هەشـت سـاڵ چاوەڕوانتاندەکـەم، کـە گەڕانـەوە، شـوو بـە یەکێکتـان دەکـەم... یەکێکتـان هەڵدەبژێـرم... سـەیری دڵتـان دەکـەم... دەبینـم چەنـدە ڕوناکیتـان پێیـە، چەنـد بۆنتـان پێیـە... ئـەو کات بڕیاردەدەم. ئێسـتا ناتوانـم هیـچ یەکێکتـان هەڵبژێـرم، چونکـە ئێسـتا هـەر سێکتان وەکـو یـەک وان... هـەر سـێکتان لەیـەک دەچـن... هەمـوو پیـاوی ئـەم شـارە لەیـەک دەچـن... وانییـە هەموویـان لـە یـەک دەچـن».

ئـەوە لـە هـەرە ڕسـتە کوشـندەکانی ئـەو دوانیـوەڕۆ سـەیرەبوو کـە سەوسـەن تێیـدا داواکارەکانـی خـۆی سەرسـامکرد.

## ٢٢

لە نێوارەدا هەواڵی داواکەی سەوسەن فیکرەت بە هەموو شاردا بڵاوبووەوە، سەرەتا زۆربەمان باوەڕمان پێ نەکرد، کەسمان لەو باوەڕەدا نەبووین کە هەر سێ داواکارەکە بکەونە وەها داوێکەوە، زۆربەمان شتەکەمان وەک تەڵەیەک دەبینی ئەو کیژە دایناییت تا هەر سێ کوڕەکە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. شتێک لە نیگەرانی و توڕەیی هەمووماني داگرتبوو، هەر قسەیەک دەکرا پڕبوو لە گومانی خراپ. ئەوەی هەر داواکارێک زەرفێکی تایبەتی وەرگرتووە کە وێنەیەکی سەوسەن و ناوی کۆمەڵێک باڵندەی سەیر و ناوازەی لەگەڵ کۆمەڵێک نەخشەدا تێدایە، هەمووماني ساکاند. هەر داواکارە و دەبایە نوێنەرێک ڕاسپێرێت لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا وێنە و هەواڵی ئەو بە سەوسەن بگەێنێت، هەمووان لەسەر ئەوە تەبابوون هیچ یەکێکیان بۆی نەبێت نامە بۆ سەوسەن بنوسێت، چونکە دەشێت یەکێک لە داواکارەکان لە ڕێگای فریوی وشە و ئەو فێڵبازیی و تەڵەکانەی لە ناو نوسیندا هەیە کارێکی خراپ لە سەوسەن بکات و داد و یەکسانی لە یارییەکەدا نەهێڵێت.

ئامونییەکان لە هەمووان توڕەتربوون، ئەوەی کوڕێکی بنەماڵەکەیان هەشت ساڵ لە پێناوی ژنێکدا ئاوارە بێت، داوایەکی قورس بوو ئاسان لای ئەوان قەبووڵ نەدەکرا. ئەو ڕۆژە کە میوانەکان لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی هاتنەدەرەوە، خالید ئامون لە هەمووان ماندووتربوو.

هەستیکرد هێدی هێدی خۆشەویستی ئەم ژنە لە ناوەوە خاپوریدەکات. لای ئەستەم بوو ئەم شارە و ئێشەکەی و خزمەکان و کۆبوونەوەی ئامووزنییەکان بخاتە لاوە و بەرەو دەرەوە بڕوات. ئەوەی دونیا گەورەیە یاخود بچوکە ڕۆژێک لە ڕۆژان غەمی ئەو نەبووە. لە منداڵییەوە فێربووە ئەوەندە بیر لە دونیا بکاتەوە کە پێویستی پێیەتی. دونیا لەدەرەوەی ئەم شارە لای ئەو سێبەرێکی تاریکە کە هیچ شتێکی گرنگی تێدا نییە بۆی بژی. شەرمەزارییەکی گەورەبوو چەندین ساڵ لەدوی داوای ژنێک ئاوارەبێت، ئەوە پێچەوانەی کولتووری جوامێری و پیاوەتی خێڵەکەیان بوو، پێچەوانەی ئەو شەریعەتە بوو کە ڕێگای نەدەدا ژن چارەنوسی پیاو دیاریبکات. دەبێت ئامووزنییەکانی تر چی بڵێن؟. دڵنیابوو دواجار وەک هەمیشە پشتی دەگرن، بەڵام دەشیزانی هەندێکیان تامردن وەک کەسێکی لاواز سەیریدەکەن کە لەسەر داوای ئافرەتێک بە دونیادا ئاوارەبووە. بە درێژایی ئەو شەوە لە ژوورەکەی خۆیدا مایەوە، تا درەنگ بە تەنیا لەو ڕوویەرە بچکۆلەیەدا دەهات و دەچوو، هەستیدەکرد ئەو داوایەی سەوسەن زۆر نازاری دەدا، دەیخاتە بەر ئەزمونێک لەوانەیە ڕۆحێکی ئاڵۆزتری بۆ دروستبکات. ئەوەی دونیا زۆر گەورەیە، شاری زۆر نەناسراو و سەیر هەیە، هەستێکی تایبەتی تیا نەدەبزواند. هەستیکرد گەرچی هەموو ژیانی لەم شارەدا بردۆتەسەر، بەڵام هێشتا لە زۆر شتی تێناگات. لای خۆشتر بوو لە ژیانی ئەم شارەدا نوقم بێت، نەوەک لە جیهانێکی بێسنووردا خۆی ونبکات. بەڵام دەیزانی ئەم قسانە ئێستا نرخێکی ئەوتۆیان نییە، گەر سەوسەنی دەوێت دەبێت بڕوات. نەیدەویست زۆر بیربکاتەوە، دەیزانی بیرکردنەوە بەرەو هیچ جێگایەکی نابات، ئەویش بەدرێژایی ژیانی زۆر باوەڕی بە بیرکردنەوە نەبوو، ئەویش باوەڕی وابوو بیرکردنەوە کێشەکان ئاڵۆزدەکات و چارەیان ناکات. شەوی دواتر چوو بۆ ماڵی قەلەندەر ئامۆون و بڕیاری خۆی پێڕاگەیاند کە

بەڕاستی دەیەوێت دوای باڵندەکان بکەوێت. ئەو شەوە ئامونییەکان کۆبوونەوەیەکی گەورەیان هەبوو، هەواڵەکە بە چەشنێک سەیربوو هەموو دەیانویست لە زاری خالید ئامون و یاوەرەکەیەوە ڕاستییەکان ببیستن. کۆبوونەوەکە لە ماڵی فەوزی بەگ سازکرابوو، فەوزی بەگ تەنیا کەسێک بوو هەواڵەکە خۆشحاڵیکردبوو، بیرۆکەکەی سەوسەنی بەجۆرێک لا قەشەنگ بوو هەمووانی نیگەرانکرد. ماڵی فەوزی بەگ ئەو ڕۆژە بە جۆرێکی بێوێنە جەنجاڵ بوو، چەندین ساڵ بوو هیچ کۆبوونەوەیەکی ئامونییەکان هێندە خەڵکی ڕانەکێشابوو، ژووری دیوەخانەکە بەجۆرێک پڕبوو مرۆڤ بە زەحمەت دەیتوانی هەناسەبدات، سفرەکان جار دوای جار دادەخران و هەڵدەگیرانەوە، ئاوگێڕەکان بێوچان بەڕێوەبوون. بەوەدا ژوورەکە زۆر گەورە و پڕبوو، مرۆڤ بە زەحمەت گوێی لە دەنگی هاوسێکەی دەبوو، تا ئەو ساتەی خالید ئامون و قەلەندەر گەیشتن هەمووان بێسەرەوت قسەیاندەکرد. فەوزی بەگ بە جەنجاڵییەکەی خۆیەوە پێشوازی لە هەردووکیان کرد، بەدەنگی بەرز گووتی «ئاە خالید... خالیدی کوڕم... دڵنیابە ژنێکی نایابت هەڵبژاردوە، ئەم ژنە لە ژنی ناو حیکایەتە کۆنەکان دەچێت... لە کچی پاشا کۆنەکان، هەموو ژیانم تەمەنامکردوە، ژنێکی وا ببینم... وام هەستدەکرد کە ئەو جۆرە ژنانە سێسەد ساڵیشە لە دونیادا نەماون، بەڵام خودای گەورە ویستوێتی بەر لە مردنم ژنێک لە شارەکەدا ببینم کە بەڕاستی لە پەری ناو کتێبە کۆنەکان دەچێت... خوای گەورە بە ڕاستی ئەوەی ویستووە». قسەکانی فەوزی بەگ دەنگەدەنگ و هەلایەکی گەورەیان دروستکرد. کە میوانە تازەکان دانیشتن، جۆرێک لە ئارامی گەڕایەوە بۆ ژوورەکە، میوانەکان دوای ئەوەی کەمێک پشوویان دا، قەلەندەر ئامون ڕوویکردە هەموو ئەوانەی لە دیوەخانەکەدا دانیشتوون و گووتی «ئەوەی بیستووتانە ڕاستە، ئەو کچە دەیەوێت خالیدی خزممان بروات بۆ دەرەوەی وڵات...

دەڵێت پێش ئەوەی شوو بە هیچ یەکێک لەو سێ داواکارە بکەم دەبێت دونیا ببینن... دەیەوێت کوڕەکە ماوەیەک بە دوای کۆمەڵێک باڵندەدا بگەڕێت، باڵندەی تایبەتی و ناوازە... دەبێت یەکە یەکە ئەو باڵندانە لە هەرێمی جیاواز جیاوازی دونیادا کۆبکاتەوە و لە ماوەی هەشت ساڵی دیدا بگەڕێتەوە بۆ ئێرە... کە هەر سێ داواکارەکە گەڕانەوە، سێ ڕۆژ لەگەڵ هەر سێکیاندا دادەنیشێت و دواتر بڕیاردەدات شوو بە کێ بکات... ئەوە کورتەی چیرۆکەکەیە، بەڵێ ئەوەیە، هیچی تر نییە... نا هیچی تر نییە... ئێمە دوێنێ لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی ئەو قسانەمان بیست». لەو کاتەدا سێ گەنج بە سێ سینی گەورەی شەربەتەوە بەسەر میوانەکاندا دەگەڕان. هێشتا قەلەندەر ئاموون قسەکانی تەواو نەکردبوو کە بوو بە دەنگەدەنگێکی زۆر. قسەکان توڕەییەکی کتوپڕیان دروستکرد و یەکێک گوتی «ئەم کچە خۆی بە چی دەزانێت؟...». یەکێکی تر گوتی «ئەگەر پەریزادەش بێت ئەوە ناهێنێت، هەشت ساڵ بۆی ئاوارە بیت». یەکێکیش لەو سەری هۆڵەکەوە گوتی « ها... ئەمە فیتێکی تری گوڵدانچییەکانە، کە بەدرۆ خۆیان وەک خەڵکێکی بێوەی و بێمەزەڕەت نیشاندەدەن... سوێند دەخۆم، مەسەلەکە هیچ نییە جگە لە فێڵێک بۆ ئەوەی داوای پارەیەکی زۆرترمان لێبکەن، سەروەتێکمان لێبستێنن کە ئێمە بۆ ژنهێنان نەمانداوە... دەیانەوێت دواتر بڵێن، سەیریکەن چۆن ئاموونییەکانمان هێنایە سەر چۆک. دەست دەدەم بە قورئاندا کە وایە، هەموو دەزانن ئێمە بۆ ژن دەست ناگرینەوە، چی لە گیرفانماندایە دایدەنێین، دەیانەوێت بماندۆشن». سەی کەرەم هەمووانی هێورکردەوە و گوتی «ئێمە بۆیە ماوین، چونکە هەمیشە ڕێزمان لە قسەی یەک گرتووە، حورمەتی یەکترمان لایە... تێدەگەن، قسەی ساحێب مەسەلەکە لەسەروو هەموو شتێکەوەیە... لێگەڕێن با خالید خۆی قسەبکات». خالید ئاموونی کە ئامادەبوونی ئەو حەشاماتە

سەرساميكردبوو، بێئەوەی بشڵەژێت یاخود دوودڵ بێت لە شوێنی خۆی هەستا و گووتی « بە ئیجازەی هەمووتان... بە ئیجازەی هەمووتان. تکا لە شەریەتگێڕ و ئاوگێڕەکان دەکەم تۆزێک بوەستن... عەزیزان... ئێوە ئاموونین و منیش ئاموونیم، هەموو شانازی بەوەوە دەکەین کە پشتی یەک نادەین لە زەوی... ها هەمووان شانازی بەوەوە دەکەین کاتێک باپیرانمان لە گوند دابەزینە شار، ئێمە خۆشەویستی و خزمایەتیمان نەدۆڕاند... وانییە... نەمان دۆڕاند». چاوانی خالید دەبریسکانەوە، دەموچاوی لە هەر کات باریکتر و نیگای ڕەقتر و پڕ نهێنیتر بوو، کەس تا ئەو کات ئەو دەنگە گەرمەی لێ نەبیستبوو، غەمێک لە گەرویدا بوو، هەر کەس لە ژیانیدا یەک ڕۆژ عاشق بووبێت، دەیزانی ئەوە دەردی خۆشەویستییە. گووتی «تکا لە هەموو برایان دەکەم، تفەنگ بە تاریکییەوە نەنێن. خۆتان دەزانن هەموو ژنێکی دونیا کە شوودەکات مەرجی هەیە. لەم سەر ئەستێرەیە یەک ژنم بۆ بدۆزنەوە، بەبێ مەرج شوویکردبێت. مەرج دانان لە خوێنی ئەو جنسەدایە... ئێمە هەموو پیاوین و دەزانین ئەو مەرجانە بۆ ئێمە چەند قورسن... هەیانە داوای سامانی زۆر دەکات، هەیانە بەکێشی خۆی زێڕی دەوێت، بەڵام سەوسەن فیکرەت جۆرێکی ترە. دڵنیاتاندەکەمەوە کە چاوی لە سامانی ئێمە نییە... دڵنیاتاندەکەمەوە... هێند هەیە دەیەوێت لەگەڵ کەسێکدا بژی کە دونیای بینیوە. من بڕیارمداوە بچمە ژێر باری ئەو مەرجەوە... بڕیارمداوە بڕۆم... بڕیارمداوە زەوی بەدوای ئەو باڵندانەدا بگەڕێم کە ئەو داوایاندەکات... دەزانم زۆرتان وەک شێت سەیرمدەکەن، بەڵام لە یەکەم ڕۆژەوە کە ئەو کچەم بینیوە بڕیارمداوە بۆ من بێت... بە هەر نرخێک بووە... من بیر لەوە ناکەمەوە ڕاستم یاخود هەڵەم... هیچ ئاموونییەک تا ئێستا بیری لە ڕاست و هەڵە نەکردۆتەوە. وەک هەموو ئاموونییەکی تر لە هەر کوێ بین دەبێت براوە بین... لە شار بین

یاخود لادێ... لێرە کۆگا و قەیسەریمان هەبێت، یاخود لەسەر مەرزەکان قاچاغچێتی بکەین. لە شار بین یاخود لە چیا، هەر شتێک بێت و لە هەر شوێنێک بێت ئێمە تەنیا بیرمان لە بردنەوە کردۆتەوە... ئەوە لە خوێنی ئێمەدایە، ئەوە دینی ئێمەیە، منیش ئێستا تەنیا بیر لە بردنەوە دەکەمەوە».

شتێکی سارد لە نیگایدا بوو مرۆڤی دەترساند، شتێک لەگەڵ ئەو گەرمییە قووڵەی دەنگیدا نەدەگونجا. فەوزی بەگ دووبارە هەستایەوە و گوتی «تۆ ژنێکی بێوێنەت هەڵبژاردوە، گوێم لێبگرن... گوێم لێبگرن... تۆ ژنێکت هەڵبژاردوە شوێنی حورمەتی منە، بۆیە ئەم پیاوباشانەی تورەکردوە، چونکە لە ژنەکانی خۆیان ناچێت... تێدەگەیت لە ژنەکانی ئێمە ناچێت، کە پیاو وەک مریشکی نەخۆش دەخەنە قەفەزەوە... ژنە بێمێشکەکان کە هیچ شتێک نازانن جگە لەوەی شەو و ڕۆژ بیر لەوە بکەنەوە چۆن پیاوەکانیان زیندانبکەن... ئەمە ژنێکە باڵ دەدات بە پیاو. هەموو عومرم بیرم لەوە کردۆتەوە ژنێک ببینم باڵ بدات بە پیاو، فێریبکات بفرێت... ژن تاکە مەخلوقێکە دەتوانێت یان پیاو فێری فرین بکات یا فرینی لە بیربەرێتەوە... من چل ساڵیشە وامدەزانی جنسی ئەو جۆرە ژنانەی باڵ دەدەن بە پیاو تەفروتونا بوون، ئێستا دەمەوێت پێش ئەوەی بمرم ئەو ژنە ببینم... پیرۆزباییت لێدەکەم... من پیرم باوەڕ ناکەم تا تۆ لە سەفەر دەگەڕێیتەوە بژیم... بەڵام پێتدەڵێم، هەموو شتێک بکە، ئەوە ببێتە ژنت... ژنی وا دەهێنێت مرۆڤ ساڵەهای ساڵ بۆی ئاوارە بێت. وامەزانە کارێکی نەکردە دەکەیت... هەزاران کەس پێش تۆ لە پێناوی ژنی زۆر ناشایستەدا مردون یان کەوتوونەتە زیندان... ئەو تۆ دەنێرێت دونیا ببینیت، لە هیچ مەترسە و سڵ لە هیچ مەکەرەوە... بڕۆ و گوێ لە کەس مەگرە».

کەمجار فەوزی بەگ بەوجۆرە دڵگەرم دەرکەوتبوو، وەک ئەوەی

هەواڵەکە حەسرەتێکی قووڵی لە ژیانی خۆیدا زیندووکردبێتەوە لێوی دەلەرزی. هەموو بینیان بە جۆشێکەوە بۆ ئەو مەسەلەیە دەدوێت پێشتر لە کەم کێشەدا وەها خرۆشی تێکەڕابوو. سەی کەرەمی ئاموونی کە زۆر گوێی لە فەوزی بەگ دەگرت، ڕوویکردە یەکێک لە ناڕازییەکان و گووتی «تۆ دەڵێیت چی... تۆ بۆ ناڕازیت؟». پیاوێکی چکۆلانەبوو، ناوی ئەسعەد ئاموون بوو، بەدەنگێکی بەرز گووتی «ها... بۆ ناڕازیم... هەر من نیم کە ناڕازیم... مەسەلەکە ئەوە نییە ئێمە ژنەکانمان زنجیری خستبێتە قاچمانەوە. بەڵام هەموو دەترسین خالیدمان لەدەست بچێت... شەڕ هەموو دونیای تەنیوە، کوڕەکە بۆ هەر جێگایەک بچێت دەکەوێتە ناو ئاگری بەڵایەکەوە... هەمووتان دەزانن شەڕ دونیای تەنیوە... ها... من لە ژیانی خۆی دەترسم... دوا ئەوە هەندێ باڵندە هەیە ڕاوکردنیان ئاسان نییە... هەموو باڵندەیەک ڕاوناکرێت... شتەکە لە توانای ئینسان بەدەرە... ئەو کچە دەیەوێت کوڕەکە بە کوشت بدات... تا ئێستا کەس ئاموونییەکی بەوجۆرە نەخستۆتە داوەوە». فەوزی بەگ بە توڕەییەوە گووتی «تۆ بێدەنگ بە... بێدەنگ بە... هەموو وەکو کەوی باڵکراو بەسەر ڕیقنەی خۆماندا کرکەوتووین، کەس ناوێرێت مەترێک بۆئەو دیو حەوشەکەی خۆی فجوقبکات. سەرمان لەدەرگا برد بەو دیودا وادەزانین هەموو بەڵای خوا بەسەر ئێمەدا دەبارێت... تۆ بێدەنگ بە کە ناوێریت هاوینانیش لەسەربان بخەویت، چونکە ژنەکەت وادەزانێت دەفریت... ها... تێدەگەیت... ئێمە تازە پیربووین و تاقەتی فڕینمان نەماوە، لێگەڕێ گەنجەکان بژین... بە ناوی مەحەبەتەوە باڵی کوڕەکە مەشکێنە...». ئەسعەد ئاموون گووتی « ها... من ژنەکەم خۆشیدەوێم، بۆیە ناهێڵێت هاوینان لەسەربان بخەوم. وەک تۆ نیم شەش مانگیش ونبیت لە ماڵەوە پێت نازانن. بەڵام فەوزی بەگ پێمبڵێ گەر کوڕەکە هەشت ساڵ ئاوارەی وڵاتان بوو و دواتر کچەکە شوویکرد بە یەکێکی دی

چی دەکەیت... ئەو کات هەر وەک ئێستا ستایشی کچەکەی گوڵدانچی دەکەیت؟». لەو کاتەدا خالید ئامورن هەستا و گووتی «من نامەوێت دونیا ببینم... من بەعەقڵی یەکێکەوە دەڕۆم کە کارێکی هەیە و دەبێت جێبەجێیبکات. من باڵندە لەدوای باڵندە دەیگەێنمەوە ئەم شارە، بەڵام گەر بزانم ناهەقیم بەرابەر دەکرێت، سوێند دەخۆم بە خوای گەورە کە لە کەس نابوورم... نە لە سەوسەن فیکرەت و نە لەو کەسەی کە شووی پێدەکات... سوێند دەخۆم کە نابوورم...».

تا ئەمڕۆش هەر ئامورنییەک لەو شەوەدا ئامادەبووبێت ئەو قسانەی خالیدی لە یادە، کە بەڕاستی لە قووڵایی دڵییەوە هاتنەدەرێ.

هەواڵی دانیشتنی ئەو شەوە بۆ بەیانی هەموو بازاڕی هەژاند، ئامورنییەکان لەو شەوەدا سوێندیان خوارد لە پشت خالید ئامورنەوە بن، پارەی سەفەرەکەی دابینبکەن، لە هەر شوێنێکی دونیابێت کۆمەکیبکەن، ئەوە هێزێکی گەورەی دایە کوڕەکە تا لە کۆتایی شەودا هەست بە خۆشبەختی و بەختەوەری بکات. بەر لە کۆتایی دانیشتنەکە خالید بەدەنگی بەرز گووتی «بەر لەوەی هەشت ساڵەکە تەواو بێت، بە خۆم و باڵندەکانەوە لێرە دەبم... هەشت ساڵی تر... دڵنیاتاندەکەم، چاوەڕوانمبکەن». لە کۆتایی شەودا خالید ئامورن ماڵاوایی لە ئامادەبووان کرد و گووتی ئەو چەند شەوە کەمەی بەدەستییەوەیەتی تەنیا دەتوانێت بۆ خۆ ئامادەکردن و خۆ کۆکردنەوە تەرخانیانبکات. ئەو یەکەمین کەس بوو لە پێش هەردوو داواکارەکەی دیکەوە نیشتیمانی بەدوای باڵندەکاندا بەجێهێشت.

## ٢٣

شـەوی ماڵاوایـی مەنسـووری ئەسرین شـەوێکی گەلێـک تایبەتـی بـوو، دەیان شـاعیر و مۆسـیقار و نیگارکێـش و گۆرانیبێـژ لـە چەشـن و چیـزەی جۆراوجۆر کۆبوونـەوە، گردبوونـەوەی ئـەوان لـە دەوری مەنسـور وەک وەڵامێـک بـوو بـۆ کۆبوونـەوەی ئاموونییـەکان. ئیبراهیم ئەسـرینی بـاوک گەلێـک بـەوە خۆشـحاڵ بـوو کوڕەکـەی حورمەتـی لـە نـاو کۆمەڵـە خەڵکێکـی لەوجـۆرەدا هەیـە. ئـەو شـەوە بـێ پلانێکـی ڕاسـتەقینە و پێشـوەخت، بـوو بـە ئاهەنگێکـی پـڕ بـەزم کـە لەگـەڵ سروشـتی هێمن و غەمگینی مەنسـور ئەسریندا نەدەگونجا. ئەوکات لـە نیـوەی دووەمـی سـاڵانی هەشـتادا جـۆرە شـەوی وا ڕەنگاوڕەنـگ لـە مێژووی شـارەکەدا کـەم و دەگمـەن بـوو، شـەوێک بـوو شـاعیر و مۆسـیقارەکان بـە شـێوازە بۆهیمییەکـەی خۆیـان ماڵاواییـان لـە یەکێـک دەکرد کە وەک سـەمبولی عەشـق سـەیریاندەکرد. ماڵـی ئەسـرین هۆڵێکـی گەورەیـان گرتبـوو، ژمارەیـەک لـە خزمانـی خۆیـان بانگکردبـوو، بـەڵام ڕێـژەی گـەورەی ئامادەبـووان لـە ئەهلی هونـەر و ئەدەبیاتـی شـارەکە بـوون. ئیبراهیـم ئەسـرین هەتـا جورئەتیکـرد و نامەیەکـی داوەتیشـی بـۆ سەوسـەن فیکـرەت و باوکـی نـارد تـا لـە شـەوی ماڵاواییەکـەدا ئامادەبـن، بـەڵام ئـەوان بـە نامەیەکـی هێمـن و پـڕ ڕێـزەوە وەڵامیاندایـەوە کـە گوایـە بەهـۆی ناسـاغی فیکـرەت گوڵدانچییـەوە ناتوانـن بێنـە داوەتەکـە. هەڵبـەت هەمـوو دەمانزانـی کـە هاتنـی فیکـرەت گوڵدانچـی یاخـود کچەکـەی نیشـانەیەکی خـراپ و ئامانژەیەکـی نابەجـێ دەبێـت بـۆ دۆخـی

ڕۆحی و باری دەروونی دوو داواکارەکەی دیکە. هەموو ئەوەمان پێباش بوو کە سەوسەن تا کۆتایی هەشت ساڵەکە بەیەک مەودا و لە یەک دوورییەوە بەرابەر هەر سێ گەنجەکە بوەستێت. ئەماتنیشی بڕیارێکی ڕاست و دروست بوو. بەڵام هەندێک ئامادەبوونی مریەم گوڵدانچییان بە فرسەت زانی تا هەندێک پلاری نابەجێ بگرن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەمان ئاگاداربووین و دەمانتوانی لەو شەوەدا کە پڕبوو لە خوێندنەوەی شیعری عاشقانە، پڕبوو لە پارچە مۆسیقای شێتانە حورمەتی ئاهەنگەکە ڕابگرین. ساقی مەحمود و گۆرانیبێژەکانی دی بە گۆرانییە دێرینەکان هەموومانیان خستە سەر جۆش و سەفا. مەنسور ئەسرین بەدرێژایی شەوەکە هەوڵیدەدا ڕووخۆش دەربکەوێت و خۆی وادەربخات کە لە ناوەوە ئارامییەک و هێمنییەکی قووڵی هەیە، بەڵام نەیدەتوانی. گەرچی لەگەڵ گۆرانیبێژەکاندا گۆرانی دەگووت، گەرچی لەگەڵ خەڵکدا چەپڵەی بۆ شاعیران لێدەدا، بەڵام جۆرە پەشێوییەکی تێدابوو لە چاوان ون نەدەبوو. لە کەسێک نەدەچوو بەیانی بڕوات بۆ سەفەر، لە یەکێک دەچوو لە شەقامێکی درێژدا بێئومێد ون بووبێت. چاکەتێکی ڕەش و بلوسێکی سووری ملداری لەبەردابوو، ئەوەی خوشک و پورەکانی زۆریان لێکرد کە وەک زاوایەک خۆی بگۆڕێت یان جلی کوردی لەبەربکات، بێئەنجام مایەوە. خۆی ئەوەی پێخۆشبوو بێدەنگ شارەکە جێبهێڵێت و بێئەوەی کەس بزانێت بڕوات، ویستی جانتایەکی چکۆلانە بخاتە سەر شانی و بکەوێتە ڕێ، بەڵام خواستی ئیبراهیمی باوکی کە ئاهەنگێکی ماڵاوایی بۆ بکات، چونکە نەیدەزانی ئاخۆ تا هەشت ساڵی دیکە دەژی یان دەمرێت، هۆیەکی گەورەی نەرمبوونی مەنسور بوو بۆ ئەم ئاهەنگە. شەوێک بوو شاعیرە لاوەکان بە خۆیان و بوتڵە عارەقەکانیانەوە دەهاتن و بۆهیمیترین شیعری خۆیان دەخوێندەوە، مۆسیقارەکان بە مەستی دەچوونە سەر شانۆی هۆڵەکە، گۆرانیبێژەکان چ ئاوازێ بزوێن و خرۆشێنەریایە دەیانچڕی. لە کۆتایی شەودا کە سەر مێزەکان تەواو بە قاپی زەڵاتە

و پاشماوەی لەفە و شوشەی خاڵی بیرە و پەرداخی شەریەت پڕبوو، مەنسور ئەسرین وتەیەکی ماڵاوایی خوێندەوە و گووتی «تەنیا شتێک کە دڵنیام لێی ئەوەیە کە من ژنێکم خۆشدەوێت، ئەوە تاکە ڕاستییەکە کە دەیزانم. دەزانم ئەوەش کەم نییە، من سبەی سەفەردەکەم و هەوڵدەدەم کە هەشت ساڵی تر لێرەبم، دەزانم سەفەرێکی زۆر سەختم لەبەرە، گەڕان بە جیهاندا سەختە، بەڵام هیچ شتێک لە دونیادا لە خۆشەویستی ژنێک سەختتر نییە». کە وایگووت هەمووان چەپڵەیان بۆ لێدا؛ هەمووان لەبەری هەستان، ئەو سوپاسیکردین، پورەکانی بەجلە کوردییە شۆڕەکانیانەوە باوەشیان پیاکرد و گریان، خزمەکانی یەکەیەکە ماڵاواییان لێکرد و لەدڵەوە ئومێدی باشییان بۆ خواست، هەندێک لە شاعیر و مۆسیقارەکان کە تەواو سەرخۆشبوون، توند دەستیان گووشی و پێیانگووت «شارەکە پێویستی بە تۆیە... شارەکە پێویستی بە کەسێکی وەک تۆیە، لە هەر شوێنێک بوویت ئەوەت لە بیرنەچێت». هەندێک بەڕاستی مەنسوریان لە ئامێز گرت و هەندێکیان گووتیان «شەرەفێکی گەورەیە بۆ ئێمە دوا شەومان لەگەڵ ئێوەدا بردەسەر... ئەوەمان بیر ناچێتەوە».

ئەو شەوە بەجۆرێک لە جۆرەکان لە یادەوەری هەمووانـدا مایەوە، نە تەنیا لەبەر خۆشی و ڕەنگاوڕەنگی ئاهەنگی ماڵاواییەکە، بەڵکو لەبەر هەندێک ڕوداوی دواتر... ئەو شەوە یەکەم شەوی دەستپێکردنی پێکدادانی ڕاستەقینە بوو لە نێوان خێزان و هەوادارانی داواکارە جیاوازەکاندا، لەو شەوەدا قەلەندەر ئاموون بە کلکە دەمانچە سەری مستەفا هەژاری شاعیری شکاند. ڕووداوەکە وەها بوو؛ لە کاتێکدا مستەفا هەژار و سەعید بیمار کە ئەویش شاعیر بوو لە ئاهەنگی ماڵاوایی مەنسور بەسەرخۆشی هاتنە دەرەوە، بەو شەوە درەنگە لەسەر جادەکە قەلەندەر ئاموونیان بینی کە لەسەر عەرەبانەی باقلەفرۆشێک باقلەی دەکڕی. قەلەندەر بەدرێژای

ژیانی لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە ڕۆژێک نەبووە دەمانچەی هەڵنەگرتبێت. مستەفا هەژار کە یەکێکە لە هەرە بەدمەستەکان، بینینی قەلەندەر ئاموون بە فورسەت دەزانێت و پێیدەڵێت «هێی قوولوونەدەر، واتاندەزانی دەتوانن سەوسەن گوڵدانچیش بە پارەکانتان بکڕن... ئەمجارە وادەرنەچوو... ها من دڵنیام کوڕەکەتان مریشکی مەکینەشی بۆ ناگیرێت... تێدەگەیت، ها کەچەڵی لووت بڵ، سوێنددەخۆم کوڕەکەتان ناتوانێت قەتێیەکی نەخۆشیش ڕاویکات». سەرەتا قەلەندەر ئاموون بە هێمنی لەسەر خواردنی پاقلەکەی خۆی بەردەوام دەبێت، خۆی وادەردەخات کە گوێی لە هیچ نەبووە. گەر ئێوە قەلەندەر ئاموونتان بناسیبایە، تێدەگەن ئەوە چ لە خۆبووردنێکی گەورەیە کە قەلەندەر نیشانیداوە. قەلەندەر لەشێکی زل و سەرێکی باریک و درێژی هەبوو، سەری لە هەموو لاکانەوە وەکو یەک ڕووتابووەوە، قژی بەچەشنێک تەنک بوو، لە هەموو گۆشەیەکەوە پێستە دێزەکەی سەری دیاربوو، ناوبانگی وەک بەرپرسی تۆپخانەکانی شۆڕش لە حەفتاکاندا جۆرە شانازییەکی هەمیشەیی تێدا سەوزکردبوو، بە ئاشکرا لە هەموو جێگایەک بە گۆڕی شەهیدان و بەرزانی سوێندی دەخوارد. ئەوەی شەوان دوای خواردنەوە لەبەردەم دەرگای یانەی فەرمانبەراندا پاقلەی دەکڕی و بە ڕێگاوە دەیخوارد، خوویەکی کۆنی بوو، جۆرە هەیبەت و شانازییەکی هەبوو هەندێجار ئاموونییەکانی تریشی سەغڵەتدەکرد، هەموو دەیانزانی قەلەندەر یەکێکە لە شەڕانیترین ئاموونییەکان. گەر مەستی نەبایە ئەو شەوە مستەفا هەژار نەیدەوێرا بەو چەشنە لەگەڵ قەلەندەردا تێبکەوێت. کاتێک قەلەندەر وەڵامی یەکەم ڕیزە توانج و جنێوی مستەفا هەژاری نەدایەوە، ئەوە وایکرد مستەفا زیادەڕەوییکات، دوای کۆمەڵێک توانجی زۆر، بە دەنگێکی بەرز کە زۆر کەس گوێیان لێبوو گووتی « گوێبگرە قوولوونەدەر، هیچ ئاموونییەک نییە بە خۆشەویستی ژنی هێنابێت... ئێوە قەبیلەیەکی کێوین کە تا ئێستا سڵ ناکەنەوە لە ژن فڕاندن و ژن داگیرکردن. لە هەموو قەبیلەکەتاندا

پیاوێکی تێدا نییە ژنێک عاشقی بووبێت... من باوەڕناکەم ژنەکەی تۆ تۆزقاڵێک حورمەتی بۆت هەبێت، سوێند دەخۆم بە خوای عەشق... کە ژنەکەت لە دڵەوە وەک سەگ سەیرتدەکات... وەک گەماڵێکی سەرشۆڕ و زل» . هەڵبەت ئەوە بریندارکردنێکی گەورەبوو کە ئەوەک قەلەندەر، هیچ مرۆڤێکی ئاساییش قەبووڵی نەدەکرد. ئەوانەی لە کاتی شەڕەکەدا لەوێ بوون دەڵێن قەلەندەر ئاموون بە هێمنی لوولەی پاقلەکەی فڕێدەدات و دەستی دەسڕێت و بێئەوەی هیچ قسەبکات یاخود خۆی وانیشانبدات کە نیازی شەڕێتی، بێدووبڵی و بیرکردنەوە بە هەموو توانای خۆی دەکێشێت بە دەموچاوی مستەفا هەزاردا کە یەکسەر لەسەر زەوییەکە لوول دەبێت. سەعید بیمار کە ئەوە دەبینێت یەکسەر هەڵدێتە ئەوبەر شەقامەکەوە و تاکسییەک دەگرێت و ڕادەکات. هەموو باس لەوە دەکەن کە قەلەندەر بە ئاشکرا دەمانچەکەی دەردەهێنێت و دەیخاتە سەر سەری مستەفا هەزار کە بە گریانەوە دەڵێت «ئاموونی قووندەر، خوای عەشق عەفووت ناکات... خوای عەشق عەفووت ناکات». بۆ ئێستێک هەموو وادەزانن کە قەلەندەر خەریکە فیشەکێک بنێت بەسەری مستەفا هەزارەوە، بەڵام دواجار ڕای خۆی دەگۆڕێت و بە کلکە دەمانچە دەکەوێتە سەروو چاوی... کەس نازانێت ئەو دیمەنە چەند دەخایەنێت، بەڵام دواجار قەلەندەر بە هێمنییەوە دەمانچەکەی هەڵدەگرێتەوە و بێئەوەی ورتەی لە دەم بێتەدەرێ، وەک شانازیی بەوەوە نەکات کە لە پیاوێکی ڕیوەڵەی وەک مستەفا هەزاری داوە، وەک شەرمێکی قووڵ دایگرتبێت، کەمێک عارەقەکەی خۆی دەسڕێت و بێئەوەی ئاوڕبداتەوە بەرەو گوزەری ئاسنگەران دادەگەڕێت .

ئەو شەوە مەنسور نەسرین لەگەڵ ساقی مەحمود دا چوون بۆ خەستەخانە بۆ لای مستەفا هەزار، لە ڕێگادا بەرەو خەستەخانە گفتوگۆیەک

لە نێوان ساقی و مەنسووردا ڕوویدا کە گەلێک ساڵ دواتر ساقی مەحموود بۆی گێڕاینەوە. شوێنی خۆیەتی لێرەدا بەشێکی بنووسینەوە. ساقی مەحموود ئەو شەوە لە مەنسووری پرسی «مەنسوور تا دەگەڕێیتەوە، من نوێنەری تۆم، شتێک دەکەم خەڵک یادتبکەن و تۆیان لە بیر نەچێتەوە. بەڵام ئەمشەو هەرچەند سەیرمکردیت، هەستمدەکرد بەختەوەر نیت... تۆ دوو ڕۆژی تر دەڕۆیت، دەمەوێت بەڕاستی بزانم هەست بەچی دەکەیت؟»

مەنسوور بە کەمێک تێفکرینەوە گووتی « ساقی لە ڕاستیدا شتێک زۆر لێیدەترسم ئەوەیە، دونیا لەگەڵ خۆیدا بمبات. نازانم بۆ وا هەستدەکەم وەک ئەوەی سەوسەن داوام لێبکات بڕۆم و نەگەڕێمەوە، من لە چاوانیدا ئەوەم خوێندەوە کە گەلێک بەختەوەر دەبێت گەر ئێمە ببین بە ڕێبوارێکی هەمیشەیی، وەک ئەوەی وابێت ڕزگاری ئێمە تەنیا لەوەدایە لەسەر زەوی وێڵبین. نا ساقی مەسەلەکە ئەوە نییە لە خۆیمان دووربخاتەوە، بە پێچەوانەوە هەستدەکەم ئێمە تاریکی بیردەخەینەوە، بۆیە لە من و لە ئەوانی تریش دەترسێت. من چەند ڕۆژە بیردەکەمەوە... ئەو لە هەموو پیاوێک دەترسێت لەم شارانەدا گەورە بووبێت... هەموومان تاریکی بیردەخەینەوە، هەموومان زوڵمەتی ئەم شارە و ئەم دونیایەی بیردەخەینەوە»

ساقی مەحموود بە کەمێک سەرسامییەوە سەیریکرد و گووتی «تۆ لەو باوەڕەدایت، ئەم سەفەرە تا کۆتایی ڕابکێشیت».

مەنسوور بە هێمنی گووتی «نازانم... ئێستا گرنگ ئەوەیە دەڕۆم. دیارە نە من و نە دوو دلواکارەکەی تریش کە سەوسەنمان خۆشویست بیرمان لە سەفەر نەدەکردەوە، خۆشەویستی لەم شارەدا گرێدراوی ئارەزوویەکی گەورەیە بۆ دانیشتن و ماڵ دروستکردن. کەسمان بەوجۆرە بیرمان لێ نەدەکردەوە... سەرەتا ئەم خۆشەویستییە بۆ من وەک پاکبوونەوە وەهابوو لە گوناهێکی نهێنی، ئێمە پیاوی ئەم شارە هەموو دەمانەوێت بە خۆشەویستی لە گوناهەکانمان پاک ببینەوە، هەموو هەستێکی گوناهباری

له دڵماندا هه‌یه، له پڕێكدا ده‌مانه‌وێت به خۆشه‌ویستی ژنێك ئه‌و هه‌سته بسڕینه‌وه، بڵێین سه‌یركه‌ن چه‌ند پاكین، چه‌ند مرۆڤین، ده‌توانین عاشقی ژنێك ببین... بۆ كامه‌رانی سه‌لما چه‌قۆی له مندا، ها بۆ؟ له‌به‌رئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێت له ڕێگای خۆشه‌ویستی سه‌وسه‌نه‌وه پاك ببێته‌وه، خۆشه‌ویستی پاكییه‌كی ده‌داتێ بتوانێت گوناهی تر بكات. منیش له ڕێگای مردنه‌وه له پێناوی ئه‌ودا ویستم پاك ببمه‌وه. ئه‌و كچه ناخی هه‌موومان ده‌بینێت. به‌ڵام ئه‌و ده‌زانێت ئه‌و پاكییه‌ی ئێمه بۆی ده‌گه‌ڕێین خۆشه‌ویستی ئافره‌تێك به ته‌نیا ناماندات‌ێ، مرۆڤ ته‌نیا به خۆشه‌ویستی پاك نابێته‌وه. به‌ڵێ كاك ساقی وایه، سه‌وسه‌ن له‌سه‌ر هه‌قه، یه‌كێكی وه‌ك من ته‌نیا له ڕێگای تێگه‌یشتن له گه‌وره‌یی دونیا، له‌سه‌ختی خۆشه‌ویستی تێده‌گات».

ساقی گووتی «تۆ مه‌سه‌له‌كه وا‌تێده‌گه‌یت وه‌ك ئه‌وه‌ی كۆی سه‌فه‌ره‌كه وانه‌یه‌ك بێت بۆ ئێوه تا فێری مانای خۆشه‌ویستی ببن؟»».

مه‌نسور گووتی «وانه؟ نا... شتێكی له وانه قووڵتر. ساقی من واتێده‌گه‌م هیچ ژنێك نییه له دونیادا، له ساتێك له ساته‌كاندا حه‌زی نه‌كردبێت مێرده‌كه‌ی بمرێت و به‌جۆرێكی دی زیندووببێته‌وه، زۆربه‌ی پیاوانیش هه‌ر هه‌مان ئاره‌زوویان هه‌یه. سه‌وسه‌نیش هه‌ر له‌و جۆره‌یه، به‌ڵام ئه‌و هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه ده‌یه‌وێت ئێمه بڕۆین و بمرین و به‌شێوه‌یه‌كی تر له جه‌نگه‌ڵ و ڕێگا و شاخه‌كانی ئه‌م دونیایه‌دا زیندووببینه‌وه... ئه‌و ئێمه‌ی به‌مجۆره ناوێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی ئه‌م شاره په‌روه‌رده‌یكردوین. ئێستا ئێمه چه‌شنه مرۆڤێكین توانای خۆشه‌ویستیمان تێدا نییه. ئه‌وه‌ی سه‌وسه‌ن له ژنی ئه‌م شاره جیاده‌كاته‌وه ئه‌وه‌یه ده‌زانێت هه‌موو ئه‌و هه‌ستانه‌ی له دڵی پیاوێكدا به‌رامبه‌ر ژنێك كۆده‌بێته‌وه خۆشه‌ویستی نییه، شتێكه له خۆشه‌ویستی كه‌متر... من بۆیه له‌م سه‌فه‌ره ده‌ترسم، چونكه ده‌زانم له‌م سه‌فه‌ره‌دا زیاتر خۆم ده‌بینم، زۆر زیاتر له‌وه‌ی بمه‌وێت یان بوێرم ببینم...».

ساقی گووتی «گەر ڕوخسەتم بدەیت، واتێدەگەم وەک ئەوەی تۆ ماوەیەکی درێژ لە خۆت ڕاتکردبێت و ئێستا بترسیت سەفەرەکە شتێک لە ناوتدا دەربخات کە خۆت ناتەوێت»

مەنسور بە غەمگینییەوە گووتی «ساقی سەیرم بکە، من چیتر منداڵ نیم، دوای ئەو چەقۆیەش بە ڕاستی وا هەستدەکەم کە پیربووم. من لە دوای چاوپێکەوتنەکەی یەکەمجاری سەوسەنەوە لەم شارە نەترسم، زۆر لەم شارە دەترسم... بیهێنە بەرچاوی خۆت کە دیوارەکانی ئەم شارە هەموو ئاوێنەن و تۆ لە بەردەمیاندا دەوەستیت و دەپرسیت و دەڵێیت: من کێم ؟. جارێک و دە و سەد جار دەپرسیت: من کێم؟ بەڵام دیارە دیوارەکان وەڵامت نادەنەوە... من واهەستدەکەم سەوسەن پێش ئێمە ئەو بێدەنگییەی تاقیکردۆتەوە. کەس لێرەدا ناتوانێت بزانێت خۆی کێیە. مرۆڤ لەم شارەدا تاقی نابێتەوە. مرۆڤ تا ئەم شارە بەجێ نەهێڵێت بۆی تاقی نابێتەوە کە خۆی کێیە. من بۆیە لەم شارەدا گەلێک دڵنیا دەژیام... زۆر ئاسوودەبووم... چونکە ئەم شارە یارمەتی دەدام خۆم تاقی نەکەمەوە... هیچ جێگایەک وەک ئەم شارە یارمەتی مرۆڤ نادات لە خۆی ڕابکات... ئەم شارە بەهەشتی ڕاستەقینەی من بوو. ساقی مەحمودی برام، جەهەنەم لە تاقیکردنەوە خۆشترە، ئەوەتەی هەم ڕقم لەوەیە خۆم تاقیبکەمەوە، من لەوانەم کە لە خۆیان ڕادەکەن... هەموو ئەو کەسانەی لە خۆیان ڕادەکەن زۆر حەزدەکەن تادەمرن لە یەک جێگادا بمێننەوە... منیش تا دوێنێ لەو جۆرە مرۆڤانە بووم، بەڵام چیتر... نا... چیتر ناتوانم وەکو دوێنێ بم، ئیتر ئەوە بۆ هەتاهەتایە بەسەرچوو، ئێستا بە ڕاستی دەمەوێت خۆم بدەمە دەست دونیا، خۆم بدەمە دەست ڕێگاکان و ئاوەکان، خۆم بدەمە دەست هەر نادیار و چارەنوسێک کە تووشم دێت».

## ٢٤

کێشـەی گـەورەی کامەرانـی سـەلما چۆنێتـی پارەپەیداکـردن بـوو بـۆ گەشـتە درێژەکـەی، هەمـوو دەمانزانـی سـەفەرێکی لـەو چەشـنە پارەیەکـی وەهـای دەوێـت لـە توانـای کەسـوکاری کامەراندا نییە دابینیبکـەن. لەو ڕووەوە خالیـد ئامـوون و مەنسـور ئەسـرین بەختەوەربـوون، هەردووکیـان خەڵکـی پـارەداری گەورەیـان لـە پشـت بـوو ئەرکـی سـەفەرەکەیان بۆ دابیندەکردن. بـەڵام هەمـوو سـەیرمان لێهـات کـە مەنگـوڕ و کامـەران غەمـی پارەیان پێـوە دیارنەبـوو. هەندێکمـان ئـەو بێباکییەمـان دەگێڕایـەوە بـۆ جـۆرە ڕێکەوتنێکـی نهێنـی لـە نێـوان هەردووکیانـدا، بەپێـی ئـەو پەیمانـە دەبایـە مەنگـوڕ لـە سـاڵانی سـەفەر و ڕۆژانـی سـەختیدا دەسـت لـە کامـەران بەرنـەدات، بـەڵام هەندێکـی دیکەمـان باوەڕمـان وابـوو ئـەو بێباکییـە دەگەڕێتـەوە بـۆ بـاوەڕی کامـەران بەخـۆی و بـە توانـا گەورەکانـی لـە قومـاردا کـە دەشـێت لـە هـەر شـار و گۆشـەیەکی دونیـادا کۆمەکیبـکات. بـەڵام دەبێـت بڵێیـن کـە هەردووکیـان ئـەم بابەتەیـان بـە ئاشـکرا لـە پێشـدەم هیـچ مرۆڤێکـدا بـاس نەکـرد، ئەوکاتـەش کـە پرسـیمان لـەو ڕووەوە چ پلانێکیـان هەیـە، بـە پێکەنینـەوە گووتیـان هیـچ کـەس لـە برسـا نامرێـت و خـودا خـۆی کۆمەکـی غەریبـان دەکات.

ئـەو ڕۆژە کـە چوویـن دوا هەواڵـی خۆئامادەکردنەکانـی کامەرانـی سـەلما بزانیـن، تـازە هەواڵـی شـەڕەکەی قەڵەنـدەر ئامـوون و مسـتەفا هـەژار

بـە شـاردا بڵاوبووبـووەوە، مەنگـوڕ بـە دەنگـی بـەرز گووتـی: «یوسـف کەویـاری گـەورە بەڕەحمـەت بێـت دەیگـووت تەنیـا پیـاوی بێغیـرەت دوای سـەعات یـازدەی شـەو شـەڕدەکات، مـن لێم نەبینیـووە دوای یـازدەی شـەو شـەڕیکردبێت، ئـەو کاتانـە دەیگـووت ئیـدی کاتـی خـەوە. منیـش وادەزانـم لـە دوای یـازدەی شـەوەوە مەخلوقـات هەمـوو دەبێـت سـەر بخەنـە سـەر سەرینە چڵکنەکـەی خۆیـان. کچەکـە لەسـەر هەقـە، مـن دەڵێـم ئـەو خانمـە چەنـد چیرۆکێکـی لەمجۆرەی بیستوە، بۆیـە دەیەوێـت کوڕەکان لـەم شـارە دووریخاتـەوە و بیاننێرێـت بـۆ دەرەوەی وڵات. بەڕاسـتی بەدەسـت مـن بێـت خەڵکـی ئـەم شـارە هەمـوو دەنێـرم بـە دونیـادا بگەڕێـن. مـن زۆر بیـرم لـە حیکمەتـی ئیشـی ئـەو کچـە کردۆتـەوە، خانمەکـە حیکمـەت و ویقارێکـی تێدایـە مەپرسـن. مـن کـە لەبەردەمیـدا دانیشـتم هەمـان ئـەو هەسـتەم هەبـوو کـە هەمـوو پیاوێـک هەیەتـی، مەسـەلەی شـەیدایی پیـاوان بـۆ ئـەو کاری بـە جوانییـەوە نییـە، نـا... بـەڵام خالـق... هـەر دەیبینیـت یەکسـەر لـە خـۆت دەپرسـیت ئـەم مەخلوقـە... ئـەم ڕۆحلەبـەرە... ئـەم ئیشـە نایابـەی خـودا بۆچـی دەبێـت تەنیـا ماوەیەکـی کـەم لەسـەر زەوی بـژی و بمێنێتـەوە. یەکەمجار کـە سـەیرمکرد یەکسـەر دڵـم داخورپـا و گووتـم خـوای گـەورە بـۆ دەبێـت ئـەم جوانییـە ماوەیەکـی وەهـا کـورت لـە ناومانـدا بـژی... تێناگـەم بۆ یەکسـەر خەیاڵـم بـۆ مـردن چـوو... دوایـی کـە هاتمـە ماڵـەوە کێشـام بەسـەری خۆمـدا و گووتـم : خـدری زینـدە ئـەو هەسـتە ناخۆشـە چـی بـوو لـە منـدا دروسـتبوو. پێشـتر لـە عومرمـدا ژنێکم نەبینیـوە یەکسـەر بیـر لـە مـردن بکەمـەوە. بـە ناموسـی باپیـرەم ئـەوە یەکەمجـار بووَ شتی وا لـە مـن ڕوبـدات... ئـەوە یەکەمجـار بـوو. نـا خـراپ تێمەگـەن... مەبەسـتم ئـەوە نییـە بڵێـم کچەکـە زوو دەمرێـت و ئـەو شـتانە. مەبەسـتم ئەوەیـە بڵێـم ئـەو شـێوە و نیـگارە هـەر هەقـە بمێنێتـەوە، هـەر دەیبینیـت حەزدەکەیـت ئـەو سـەر و ڕوخسـارە خەڵکـی هەمـوو دەور و زەمانێـک ببینـن، پێـت حەیـف و خەسـارە

هەروا ئاسان بڕوات و نەمێنێت، حەزدەكەیت خەڵكێك كە سەد ساڵی تریش لەدایكدەبن ببینن و بڵێن: تەحا لەو دەور و زەمانە، پەح عەجەب ڕوخسارێكیان هەبووە».

مەنگوڕ قسەی بۆ هەموومان كرد و جار جار سەیری كامەرانی سەلمای دەكرد كە بێدەنگ چای دەخواردەوە. ئێمە پرسیمان « بۆ ئەم كچە وەها دەكات؟ بۆ نایەوێت مێردێك هەڵبژێرێت و تەواو، بۆ دەیەوێت ئەم كوڕە گەنجانە ئاوارەبن؟ ئەوە چ هەقێكە مرۆڤ كەسێكی خۆشبوێت و داوای وا قورسی لێبكات؟».

مەنگوڕ بە نیگایەكی گاڵتەئامێز سەیری هەموومانی كرد و گوتی «من بزانم كچەكە هەر سێ كوڕەكەی خۆشدەوێت، ناتوانێت بڕیار بۆ كەسیان بدات. با بۆتان بگێڕمەوە، جارێكیان فەرە یەك چاو حەزی لە دوو ژن كردبوو. هەڵبەت حەزەكەی لەو جۆرە نەبوو دڵی دوكەڵبكات یان بۆكڕوزێ بكاتە ماڵە دراوسێكان... نا فەرە لەو جۆرە نەبوو، بەڵام بەڕاستی حەزی لە دووان كردبوو، لە بەرئەوەی نەیدەتوانی بڕیار بۆ یەكێكیان بدات، قوونی خۆی هەڵگرت و چوو بۆ ئێران، سیانزە ساڵ نەگەڕایەوە، كە گەڕایەوە كچەكان یەكی نیودەرزەن منداڵیان هەبوو، كە هاتەوە فەرە وەها دڵیخۆشبوو، مەپرسن. هەستیدەكرد بەو سیازدە ساڵە ژیانی خۆی ڕزگاركردوە... دوایی دەیگووت، باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی مرۆڤ بەسەر ژنێكدا سەربكەوێت، ئەوەیە سەفەربكات، ژنان لەگەڵ سەفەردا هیچیان پێ ناكرێت، ئەژنۆیان دەشكێت و تەواو. وادەزانم سەوسەن فیكرەتیش هەمان شت بێت، ئەویش ناتوانێت بڕیاربدات، بەڵام خۆی ناتوانێت سەفەربكات، لەبەرئەوە بڕیاریداوە داخوازەكانی بنێرێت بۆ دەرەوەی وڵات».

یەكێكمان لە مەنگوڕی پرسی « بەڵام مەنگوڕ ئەوە ڕەوایە. شتی وا هەقە؟».

مەنگوڕ گووتی «هیچ شتێک ڕەوا نییە، ئەوەش ڕەوا نییە پیاو لە شارێکی وا پیس و پۆخڵی وەک ئەم شارەی ئێمەدا لە دایک بێت، کە بەبازاڕدا دەڕۆیت بۆنی شێلم و کەلەرمی ڕزیو کاستدەکات. کچەکە لەسەر هەقە، دەیەوێت کوڕەکان تۆزێک شەرواڵەکانیان بتەکێنن و بجوڵێن، گەورەترین ناهەقی ئەوەیە ئێمە لەم شارەدا لەدایک بووین... بە ناموسی باپیرەم، کچەکە دەیەوێت هەڵەیەکی ئیلاهی ڕاستبکاتەوە، پێمبڵێن گەر هەر یەکێک لە ئێوە بۆتان هەبایە شارێکتان بۆ ژیان هەڵبژاردایە، ئێرەتان هەڵدەبژارد، ها ئێرەتان هەڵدەبژاد یان نا؟. دڵنیام هیچ کەللەپووتێکتان ئێرەی نەدەویست. گەر خوای گەورە لە منی بپرسیایە، ها مەنگوڕ... عەزیزی من، کوڕی خۆم، ئەوە خەریتەی دونیا و جێگایەک بۆ خۆت هەڵبژێرە، مەملەکەتێک بدۆزەرەوە قوونتی تیا بحەسێتەوە، ئەم شارەم هەڵنەدەبژارد... دوا جێگا لەم دونیایەدا هەڵمبژاردایە، ئەم شارەبوو. بەڵام کە باری تەعالا بە منداڵی سەرو گوێلاکی منی بینی، خەریتەکەی دانا و گووتی خۆت سەیرکە، یەک جێگا نەماوە، تێدەگەیت یەک جێگا نەماوە، گەر دەتەوێت فلیمەکە ببینیت، تەنیا ئەم شارە چڵکنە ماوە کە خۆشم نازانم باکووری عێراقە یاخود باشووری کوردستانە... گووتی مەنگوڕ هەر ئەو شوێنە بەتاڵە هەیە، لەویادا، گەر دەتەوێت بتەوێت، ناتەوێت من ئیشم هەیە، دونیا بۆ قوونی تۆ بەجێ نامێڵم... ئاوەها بوو من لەم شارەدا لەدایک بووم».

هاوڕێیەکمان بێئەوەی بیر لە قسەکانی مەنگوڕ بکاتەوە گووتی «بەڵام گەر کوڕەکان لەوسەری دونیا دڵیان چوو بە کەسێکی تردا، ئیتر لەوێدا هەموو حیکایەتەکە تەواو دەبێت... ئەوسا دڵنیام کچەکەی فیکرەت گوڵدانچیش لە هەموو ئەم بەزمە پەشیمان دەبێتەوە».

مەنگوڕ گووتی « ئەو شەوە کە لەماڵی گوڵدانچی هاتینەدەرەوە، بە خۆم گووت : خۆزگە منیش لە گەنجیمدا ژنێک ئاوەها مانی بداملیە

لەم شارە بڕۆم. سەیرترین شت کە ئینسان لەم شارەدا بیری دەچێتەوە ئەوەیە کە شتێک هەیە ناوی دونیایە، بەقەبری مردوم، ئینسان کە لێرە لەدایک دەبێت ئەو شتەی تیا دەردەهێنن، هەر کەسە و تەنیا بەقەد قوونی خۆی بیر لە دونیا دەکاتەوە. بەڵام گەر کامەرانی سەلما لەوسەری دونیا دڵی چوو بە کەسێکی تردا؟ تۆ لەسەر هەقی برادەر... لەسەر هەقی، بەڵام من ئەوە بە ڕەوای هەق نازانم... ئێمە هەموو بەتەمادەبین بگەڕێتەوە، ئەو دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی بگەڕێت، بەڵام دەبێت بزانێت کۆمەڵێک هاوڕێی هەیە چاوەڕوانیدەکەن...»

کامەرانی سەلما هیچی نەگووت، بێدەنگ تەماشای مەنگوڕی دەکرد و بیریدەکردەوە. مەنگوڕ لە دوورەوە سەیری کامەرانی کرد و گووتی «هێی برای من، بۆ قسەیەک ناکەیت، ئاسان نییە هەشت ساڵ دۆست و برادەری خۆت لە بیربکەیت، ئاسان نییە... دەزانم ئێشت زۆر دەبێت، دۆزینەوەی ئەو باڵندانە گەڕانی زۆری دەوێت، سوێند دەخۆم ئەو کچە خۆی دەزانێت کە باڵندەکان لە کوێ دەژین و مرۆڤ چۆن دەتوانێت پەیدایانبکات، کتێبەکانی ئەو کتێبخانەیە گەورەیە هەموو شتێکی تێدایە، بەڵام تۆ زۆر ماندوودەبیت، تۆ ناچاردەبیت بە ناو قەوم و تایەفەی جۆراوجۆردا بڕۆیت، لە هەمووشی سەختتر ئەوەیە کە دەبێت باڵندەکانت بپارێزیت... من دەڵێم خودا فرسەتت بدات. شیروانی حەپسەخان جارێکیان باوکی پێیگووت : کوڕم لە ماڵەوە دانیشە، ماڵ لە هەر شوێنێکی تری دونیا سەلامەتترە. لە بیرمە شیرۆ گووتی: باوە، بەهەشت و جەهەنەمیش هەردووکیان لە دەرەوەی ماڵن، گەر بە خۆشی خۆم لە ماڵ نەچمە دەرێ و ملی یەکێک لەو دوو ڕێگایە نەگرم، دواتر بە زۆر لە پشتێنەوە ڕامدەکێشن و لە ماڵ دەرمدەهێنن، جا بە خۆشی خۆم دەرچم باشترە. ئا... برام، ماڵ چەندە سەلامەت بێت، ئینسان هەر دەبێت ڕۆژێک دەرگاکە بکاتەوە و بڕوات. هەر دەبێت ئەوە بکات. هێی

برای من لەو بێدەنگییەی تۆ تێدەگەم... تۆش کوڕی ئەم شارەیت، سوێند دەخۆم ئەوەی لەم شارەدا قوونی لە هێلکە جووقابێت، بچێت بۆ ئەوسەری دونیاش دەزوویەکی ئەم شارە هەر بەقاچییەوە دەبێت. بگەڕێوە برام بگەڕێوە... هەموو چاوەڕوانتدەکەین. هەشت ساڵی تر گەر ئێمە و ئەم ئوتێلی پۆخڵەواتە مابووین، قەسەم بەزمێکت بۆ سازبکەم کەس نەیدیبێت... گەر سەوسەن فیکرەت شووی پێکردی باشە، گەر نەشیکرد تۆ شتێکی گەورەت بردۆتەوە... تێدەگەیت... تۆ دونیات بردۆتەوە... یوسف کەویاری گەورە بەڕەحمەت بێت دەیگووت «لە شەڕدا مرۆڤ هەرگیز بەسەر دوژمنەکەیدا سەرناکەوێت، بەڵکو بەسەر خۆیدا سەردەکەوێت». ئا بەڕەحمەت بێت ئەو وایدەگووت. گەر ئەو کچە شووشت پێ نەکات، من حورمەتی خۆم و ڕێزی خۆم بۆ ئەو خانمە نادۆڕێنم... لەبەرئەوەی کچەکە دەیەوێت هەر سێکتان بە براوە دەربچن، گەر هۆشتان هەبێت دوای ئەو سەفەرە هەر سێکتان براوەن».

یەکێکمان بە مەنگوڕی گووت «هێی مەنگوڕ، تۆ شتێکت لە بیرچووە، تۆ حیسابی تەمەن ناکەیت، حیسابی ئەو هەشت ساڵە ناکەیت کە لە عومری کوڕەکە دەڕوات».

مەنگوڕ گووتی «هەڵبەت عەزیزم کە حیسابیدەکەم... تۆ لەو باوەڕەدایت من حیساب بۆ هەشت ساڵ لە تەمەنی کوڕێکی وەک کامەرانی سەلما نەکەم، بە قوونی عەزیزی هەمووماں کە یەکەمجار قسەکانی سەوسەن فیکرەتم بیست، موچڕکێک بە گیانمدا هات خەریک بوو نوکی پێم بتەزێت، هەشت ساڵ بەدەم خۆشە. بەڵام گەر بەوردی بیری لێبکەیتەوە، کامەران قازانجێتی. گەر کامەران لێرەبێت و ئەم نوتێلەش بمێنێت، ئەوا تا هەشت ساڵی تریش ئەو لێرەدا هەر بەدیار لووتی ئێمەوە دادەنیشێت. تا هەشت ساڵی تر کوڕەکە چی دەکات؛ ها پێمبڵێن چی دەکات؟. دڵنیام کۆمەڵێک دەست یاری کاغەز لە کۆمەڵێک

چڵێتی وەک ئێوە دەباتەوە، چەند چەقۆیەکی تر لەم و لەو دەدات، لەوانەشە بیگرن بەسەرباز و بینێرن بۆ شەڕ... کێ چوزانێت؟. من دەڵێم بە قەبری هەرچی پێغەمبەری دونیایە، ئەمەی قازانجترە. گەر ئەم هەشت ساڵە لە ژیانی تەرخانبکات بۆ تێگەیشتن لە کون و کەلەبەری ئەم ئەستێرە چڵکنە، هیچ نەبێت شتێک زیاتر لە دونیا تێگەیشتووە لەوەی هەر لەنێوان ژێر زەمینی ئەم ئوتێلە بۆگەنە و چایخانەی پەپولەی ئازادا بێت و بچێت، کە لە جیاتی پەپولە ساڵ دوازدەی مانگ پڕە لە مێش و مێشولەی ئازاد... گەر بڕوات، لایەنیکەم کۆمەڵێک شەرابی تر تاقیدەکاتەوە، کۆمەڵێک چایخانەی تر دەبینێت، چیتر گوێی لە گەمژەکانی ئەم شارە نابێت کە ژیانیان لە ئاخ و ئۆفدا بۆ ژن و کچی یەک بەسەر دەبەن... هیچ نەبێت شتێک دەبینێت لەم شارەدا نییە و نایبینێت. جەمالی خەسەکۆم قەبری ئەمشەو لە هەر شەوێک ڕوناکتر بێت، دەیگووت ئەم وشەی «هیچ نەبێت» ـ لە هەموو وشەیەکی تری دونیا گرنگترە. ئا... ئەو وایدەگووت. ئینسان دەبێت زۆر ئاگای لەم وشەیە بێت. من گەر بە گەنجی بمگووتبایە « با فێری زانستێک بم، هیچ نەبێت لەم چەقۆبازییە باشترە»، ژیانم دەگۆڕا. گەر کامەرانی سەلماش نەڕوات، لەم شارەدا هیچ فێرنابێت، هیچ فێرنابێت. دوای هەشت ساڵی تریش دەڵێت گەر بڕۆشتمایە هیچ نەبێت لەوە چاکتر بوو هەموو ژیانم بەرامبەر لووتی مەنگوڕی بابە گەورە بەسەربەرم. جەمال بەڕەحمەت بێت کە ژنی یەکەمی هێنا، کچێکی زۆر ناشیرین بوو، بە قەبری ئەولیا تا ئەمڕۆش ژنێکی تری وا ناشیرینم نەبینیوە. بەڵام ئەو گووتی « هیچ نەبێت لەوە باشترە مرۆڤ تا دەمرێت تامی ژن نەکات». کە بوو بە پێشمەرگە گووتی «هیچ نەبێت لەوە باشترە بمکەن بە عەسکەر»، کە خۆشی کوشت نامەیەکی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو و نوسیبووی «هیچ نەبێت ئەم مردنە لەم ژیانە حیزە باشترە کە تامی نییە».

هەموومان پێکەنین، بەڵام مەنگوڕ بە توڕەییەوە پێکەنینەکەی پێبڕین و گووتی «دوائەوە گەر کوڕەکە نەڕوات... ها با وادابنێین کوڕەکە نایەوێت بڕوات. ئەوکات تادەمرێت، حەسرەتی خۆشەویستی یەکەم لە دڵیدا دەبێت. من دەزانم یەکێک ئێستا دەڵێت «هێی مەنگوڕ، مەیکە بە قیامەت... مەیکە بە قیامەت... خۆ کچ قاتی نییە، کوڕێکی وەک کامەرانی سەلما یەکێکی تر هەر دەدۆزێتەوە»، سوێند دەخۆم یەکێکتان ئێستا لە خەیاڵی خۆیدا وادەڵێت. بەڵام من واناڵێم، من دەڵێم کچ قاتییە... ئا... یوسف کەویار دەیگووت ژن و پیاوی ڕاستەقینە زۆر بەزەحمەت یەکتری دەدۆزنەوە... ئەوە ژن و پیاوی بودەڵەن کە مەسەلەی خۆشەویستیان هەروا بە گاڵتە گرتووە. گەر کامەرانی سەلما هەوڵ بۆ ئەم کچە نەدا... چی بکات؟ ها خۆ بە زۆر ناتوانێت کچەکە داگیربکات؟ قەسەم بە ناموسی دایکم، من قەت لەگەڵ ئەوەدا نیم پیاو بە زۆر ژنێک زەوتبکات... ها کەسێک برادەری مەنگوڕ بێت شتی وا ناکات... گەر کچەکە بیگووتبایە کامەرانی سەلما من شوو بە تۆ ناکەم. من لە کامەران زیاتر دڵم ژانیدەکرد و خوێن لە هەستم دەچۆڕا، بەڵام هیچ کات ناگاتە ئەوەی بڵێم بابڕۆین سەوسەن فیکرەت لە پێخەفی خۆی و لە کتێبخانەکەی خۆی دەربهێنین و بیفڕێنین... نا... قەسەم بە خودا... هەر کەسێک برادەری مەنگوڕ بێت شتی وا ناکات... سوێند دەخۆم بە شەرەفی ئەولیا کە من سڵاو لە کەسی واناکەم... چەند عەزیز بێت لام... ئا لێرەدا کەسی وەها ڕووبەڕوو ببینم، سەیریدەکەم و سڵاوی لێ ناکەم... من دەزانم سنووری ڕاستەقینەی پیاو لە کوێدایە. کامەرانی سەلماش دەزانێت... ها وانییە کامەرانی سەلما وانییە؟»،

کامەرانی سەلما سەیریکرد و گووتی «مەنگوڕ من زۆر شت لە تۆوە فێربووم... ئەو شتانەی لە تۆوە فێریان بووم، زۆر یارمەتیاندام، نازانم ئەم شتانە چەندە سوودیان دەبێت گەر لە شوێنی تر بژیم و

بەرگە بگرم... بەڵام لە هەرجێگایەک بم چاوەڕوانی نامەی تۆ و نامەی هەمووتان دەکەم. تۆ تۆزێک پێشتر باسی ئەو چۆلەکەیەت کرد کە بۆ هەر جێگایەک بفڕێت دەزوویەکی ئەم شارە بەقاچییەوە دەمێنێتەوە. من ئەو چۆلەکەیەم... کە دەڕۆم، تەنیا بیر لەوە دەکەمەوە کەی بگەڕێمەوە. بەجۆرێک دەگەڕێمەوە شانازیم پێوەبکەن... یەک شت زۆر بەلامەوە گرنگە، ئەوەیە ئێوە شانازیم پێوەبکەن...».

مەنگوڕ بە خۆشحاڵییەوە دەستی بەرزکردەوە و گووتی «مێی کوڕی گەنج... مێی برای شیرینمان... پێویست ناکات، قسەبکەیت، من دەزانم تۆ لە ناوەوە مەعدەنێکی باشیت. ئەوەی دەڕۆی و بەجێمان دەهێڵیت قەدەرێکی ناخۆشە، بەڵام ئەوەی دونیاش ببینیت بەختێکی لەوە باشترە. برای شیرینم من خۆم تاسەر سنوور لەگەڵتدا دێم، لە کوردستانی ئەودیو ناسیاومان هەیە، لەوێوە دەتوانیت لە هەر کوێی دونیا بیت کاغەزمان بۆ بنێریت، بەڵکو خودا تەمەنمان بداتێ و جارێکی تر یەکتر ببینینەوە... هەندێجار هەشتسەد ساڵ دەڕوات و هیچی گرنگ لە دونیادا ڕوونادات، هەندێجاریش لە هەشت مانگدا هەشت مەملەکەت دەڕوخێت... هیچ شتێک لە مێژوو بێبارتر نییە، کەس نازانێت قوونی خۆی چۆن دەجوڵێنێتەوە. بەڵام برای شیرینم، با هەمیشە چەقۆیەکت پێبێت، چووی بۆ هەر جێگایەکی دونیا با چەقۆیەکت پێبێت، کە ماندووبوویت سەیری چەقۆکە بکە و ئێمەت بیربکەوێتەوە. جارێکیان عونیلی سەبەی قەیماغ سوێندی خوارد کە ئەو برایەتییەی چەقۆ لە نێوان دوو کەسدا دروستیدەکات لە برایەتی خوێن بەهێزترە. عونیل خۆی هاوڕێی یاسینی شوکە بوو، کە عونیلیان کوشت دوای شەش مانگ یاسینی شوکە لە مەراقدا ڕۆحی دەرچوو؛ خۆی وەسێتی بۆ یاسین کردبوو گەر بە دەمانچە کوشتیان هەقی نەسێنێتەوە. یاسین کوڕێکی پیاو بوو، گەر ئەو وەسێتە نەبووایە هەموو ئەوانەی دەکوشتەوە کە عونیلیان بە ناهەق کوشت،

بەڵام وەسێتەکە دەست و قاچی بەستبوو... ها کامەرانی سەلما، خودا دەزانێت ئەم چیرۆکەی تۆش خەڵکی چەند ساڵ دەیگێڕنەوە، خودا دەزانێت. بەڵام برای باش، چوویت بۆ هەر مەملەکەتێک و هەستتکرد وەڕز و بێبرستیت سەیری چەقۆکەت بکە، من بۆ یادگار چەقۆکەی خۆمت دەدەمێ هەڵیگرە، ئەوە غەریبیت دەشکێنێت... چەقۆ زمانێک قسەدەکات هەموومان تێیدەگەین، لە بولبول باشترە کە بە زمانێک دەخوێنێت کەسمان تێیناگەین... ئا زۆر لە بولبول باشترە. من سوێندت بە گۆڕی یوسف کەویار بۆ دەخۆم کە هەرچییەکم لە دەست بێت دەیکەم، هەرچییەکیشم لە توانادا بێت بۆ ئەوەی تۆ بکەوێتە پێش نەیارەکانت هەر دەیکەم... هەرچییەک... لە بەر ئەوە بڕۆ و مەترسە».

## ٢٥

لەسەرەتای بەهاری ساڵی ١٩٨٧ دا، هەر سێ داواکارەکە دوای ئەوەی هەر یەکەیان بە ڕێگای خۆی پاسپۆرتێکی پەیداکرد و لای هەندێک لە شارەزاکان وێنەکەی گۆڕی، لە سێ خاڵی جیاوازی سەر سنوورەوە لە سێ ڕۆژی جیاوازدا بە قاچاغ نیشتیمانیان بەجێهێشت. پاسپۆرتەکان بەجۆرێک بێهەڵە گۆڕدرابوون، شارەزاترین پسپۆڕ و وردترینیان نەیاندەتوانی جیاوازییەکان ببینن. سێ نوێنەرەکەش لە سێ ئێوارەی جیاوازدا بە ڕێزێکی زۆرەوە چوون بۆ ماڵی گوڵدانچی و هەواڵی سەفەری سێ گەنجەکەیان بە سەوسەن ڕاگەیاند. هەر یەکەشیان دوا وێنەی کوڕەکانیان لەسەر سنووری نێوان وڵات و جیهاندا بە دیاری برد بۆ سەوسەن فیکرەت. ئەو بە بایەخێکی زۆرەوە وێنەکانی خستە ئەلبومێکی تایبەتییەوە. لەو سێ وێنەیەدا هەر سێ کوڕەکە بە جلی کوردییەوە بە خۆیان و جانتاکانیانەوە لەسەر مەرز وەستاون و زەردەخەنەیەکی گەورەیان گرتوو، پێدەچێت زەردەخەنەکەیان بۆئەوە بێت شتێک لە گەشبینی بخەنە دڵی سەوسەنەوە.

دوای ڕۆیشتنی هەر سێ گەنجەکە، شتێک لە بێدەنگی و هێمنی باڵی بەسەر ژیانی هەمووماندا کێشا، بەڵام ئێمە کوڕ و کاڵی ئەم شارە هەمیشە شێتی ئەوەبووین سەوسەن ببینین، شێتی ئەوەبووین دوای هەواڵی بکەوین، هەموو جوڵەیەکی بخەینە ژێر چاودێرییەوە. ئەو تەنیا

کچێکی شارەکەمان بوو هەموو چیرۆکەکەیمان دەزانی، لەبەرئەوە لامان گرنگ بوو تا کۆتایی لەگەڵ بەسەرهاتەکەیدا بڕۆین و هیچ شتێک لە دەست نەدەین. ماوەیەک سەوسەنمان تەنیا لە کاتی سەردانەکانی دکتۆر «ڕەفعەت ڕەمزی»دا دەبینی، کە دکتۆرێکی گەنج بوو، هۆی لاوازی و سەرئێشە و بێخەوی کچەکەی دەگێڕایەوە بۆ تەنهاییە قووڵەکەی، بۆ جۆرە هێمنی و بێدەنگییەک کە هەموو ژیانی تەنیوە.

دوای ڕۆیشتنی داواکارەکان، سەوسەن ماوەیەکی لەجاران درێژتری لەگەڵ کتێبدا دەبردەسەر، ئەو چەند ساڵە بەجۆرێکی بەرپلاو و قووڵ خەریکی زانستی باڵندەناسی بوو، بایەخێکی سەیر و گەورەی بە هەر شتێک دەدا پەیوەندی بە باڵندە و جۆرەکان و پۆلینەکانیەوە هەبێت، لەو بوارەدا ڕایسپارد چەند کتێبێکی گەورەی دیکەشی لەدەرەوەی وڵاتەوە بۆ هات، لە ڕێگای نامەگۆڕینەوە بووە ئەندام لە هەندێک کۆمەڵەی باڵندەناسی و باڵندەپارێزی دونیادا. لەو کاتەوە پەیوەندی لەگەڵ باڵندەکانیشدا گۆڕا، ئەوەی نابێت هیچ جۆرە باڵندەیەک لە بەردەمیدا سەر ببڕێت، نابێت لەسەر سفرەیەک دابنیشێت کە گۆشتی باڵندەی لەسەر دەخورێت، نابێت کەس لە هەیوان و حەوش و سەربانی ماڵی ئەو باڵندە دەربکات، وەک جۆرە سروتێکی سادەی ژیانی ماڵی گوڵدانچی لێهات. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا کەسمان هەستمان نەدەکرد کە هیچ شتێک لە ژیانی سەوسەندا هەیە بە عەشقێکی زۆر قووڵ و ئارەزوویەکی زۆر گراوییەوە بۆی بژی، هەمیشە هەستمان بە شتێک لە ساردی و خاوی دەکرد، کە بەڕاستی نەماندەزانی چەند پەیوەندی بە جیهانی ناوەوەی سەوسەنەوە هەیە. هەر لەو دەمانەدا پەیوەندی نێوان سەوسەن و پرۆشەی خوشکیشی تادەهات کەمتر و بەرتەسکتر دەبووەوە، هێندی هێدی دوو خوشکەکە هیچی ئەوتۆیان بۆ قسەکردن لەگەڵ یەکدا نەدەما. پرۆشە وەک بیوەژنێکی گەنج کاتێکی زۆرتری بۆ

شتە ڕۆژانەکان تەرخاندەکرد، پتر میوانی دەهات، پتر دەڕۆیشتە دەرێ، بەرامبەر بەو سەوسەن کیژێکی گەلێک بێدۆست و هاوڕێ بوو. دوای تێپەڕینی گەردەلوولی داواکاران و ئارامبوونەوەی دەروونە گرژەکان، فیکرەت گوڵدانچی پەیوەندی خۆی لەگەڵ گوڵدانچییەکانی تردا ئاساییکردەوە، ئەو پیاوێک نەبوو مرۆڤ بتوانێت ماوەیەکی درێژ لێیزویربێت. هەمووان وەک پیاوێکی بەڕێز دەیانبینی کە بە ویقاری فەرمانبەرێکی گەورەوە لە شارێکی بچوکدا دەژی. فیکرەت گرفتێکی ئەوتۆی لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ هاوتەمەنانی خۆیدا نەبوو؛ هەمیشە ڕای وابوو خەڵکانی پیر خێراتر و باشتر دەبن بەدۆستی یەک، چونکە ئەوان نیازێکی ئەوتۆیان بە دونیا نەماوە «مرۆڤ تەنیا بەر لە مردن توانای دروستکردنی هاوڕێتی ڕاستەقینەی تیا دەخولقێت» زۆرجار لە دانیشتن و گفتوگۆکاندا وایدەگووت. لەو ماوەیەدا فیکرەت دوای سەرنجی زۆر لە کچەکە و ڕەفتاری گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەم خانمە گەنج و سەرسەختە بە ڕاستی پێویستی بەوەیە لە ماڵ بچێتەدەرێ، بەڵام شارەکە جێگایەکی ئەوتۆی تێدا نەبوو ڕووی تێبکات... کچەکە نەیدەتوانی هاوڕێ دروستبکات، چەند جارێک بینیمان گوڵدانچی کچەکەی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ کتێبخانەی شار. لەگەڵ ئەوەی کتێبخانەکە کتێبی ئەوتۆ گرنگی لە خۆ نەگرتبوو، لەگەڵ ئەوەی هۆڵی کچان زۆربەی کات خاڵی بوو، بەڵام سەوسەن مانگی جارێک یان دووان لە بەیانییەوە دەچوو بۆ ئەوێ و لە هۆڵە سارد و چۆڵەکەیدا تاسەرەنگ دەمایەوە. کەس نەیبینی بۆ جارێکیش کتێب لەوێ وەربگرێت، هەمیشە کتێبی خۆی دەبرد، سەیری کەسی نەدەکرد، ئەو ڕێبوارانەی بەلایدا دەڕۆیشتن، ئەو کچانەی بەرامبەری دادەنیشتن ئەو هەستەیان هەبوو کە سەوسەن نایانبینێت. هەندێ جار فیکرەت گوڵدانچی بە تاکسی دەیهێنا و دەیبرد... هەندێ جاریش خۆی دەهات و دەڕۆیشت. وەک کچێک کە خاوەنی چیرۆکێکی سەیرە لە هەموو

جێگایەک سەرنجی خەڵک ڕادەکێشێت، بەڵام ئەوە هیچ لەو ساردی و بێئاگاییەی ئەو ناگۆڕێت، بەردەوام بەیەک دەموچاو و بەیەک نیگا و بەیەک جۆر سەیرکردنەوە لە شتەکان دەڕوانێت. چوونی بۆ کتێبخانە جگە لەوەی چێوەی تازە بۆ تەنهاییەکەی دەکێشێت و لە قاڵبی نوێدا دەریدەخات، کارێکی ئەوتۆ لە ژیانی ناکات. فەرمانبەرانی کتێبخانە پێکرا بەو سەردانانەی سەوسەن وەڕزدەبن، نە لە بەرئەوەی کیژەکە ئەرکێکی تایبەتی یان قورسی هەیە، بەپێچەوانەوە ئەو هیچ ئەرکێکی نییە، بەڵام هاتنی وەک هاتنی ئەمیرەیەک جۆرە بێدەنگی و هێمنییەک بەسەر هەمووانـدا دەسەپێنێت کە کەس حەزی پێ ناکات. ئەوەی کچێک لە کتێبخانەکەدایە و عاشقی زۆرە، فەرمانبەرە کچەکانی دیکەی تووشی پەشۆکان و تووڕەیی و نائاسوودەیی دەکات. سەوسەن خۆی لەوە هێمنترە کەس بتوانێت بێبەهانە بێزاری خۆی بە ڕوودا بتەقێنێتەوە، بەڵام هەموان لە کتێبخانەکە دەزانن کە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە بۆ هۆیەک و بەهانەیەک دەگەڕێت ڕووی شەڕانگێز و تووڕەی خۆی بەرامبەری دەربخات. سەوسەن دەچێتە هەر جێگایەک پەشۆکان و نائارامی لەگەڵ خۆیدا دەبات. هێدی هێدی وای لێدێت خۆی هەست بە پووچی و بێمانایی سەردانەکانی خۆی بۆ کتێبخانە دەکات و تەواو دەستبەرداری دەبێت.

لەو سەرەتایەوە سەوسەن تووشی ئەو خەوبینینە شەوانە غەمناکانەش دەبێت کە بەردەوام لەگەڵیدا دەمێنێتەوە، خەوبینین بە برا مردووەکەی و سێ داواکارەکەیەوە دەبێت بە بەشێکی هەمیشەیی ژیانی شەوانەی، هەمیشە هەر چواریان لە خەونەکانیدا پێکەوە دەردەکەون، هەر جارەی بەجۆرێک، هەر جارەی لە جێگایەک، هەر جارەی لەجۆرە ژینگەیەکدا... شەوێک تێناپەڕێت ئەو نەیانبینێت، جارێک لە شەمەندەفەرێکی تۆزاویدا بە ناو بیاباندا دەڕۆن، جارێک لە گالیسکەیەکی دێریندا لە بەرگی ئەفسەرە قەیسەرییە کۆنەکاندا دانیشتوون و سەیری یەکدی دەکەن،

جارێک لە جێبێکی ئەمریکیدا لە ناو کۆمەڵێک مەزرا و کێڵگەی گەورەی گوڵەبەڕۆژەدا... هەمیشە لە خەونەکانیدا وەها دیارە وەک ئەوەی هەر چواریان بە هێمنی و بێدەنگی سەیریبکەن، وەک ئەوەی هەر چواریان بە نیگاکانیان سەرزەنشتیبکەن... هەر چواریان شتێک لە ونبوون و نائومێدی بە دەموچاویانەوە دیاربوو... هەموو شەوێک بە هەمان نیگا و ڕوخسارەوە دەردەکەوتنەوە. کەسیان لە خەونەکانیدا قسەیان نەدەکرد، خەونەکانی دیکەی بەجۆرێک لە جۆرەکان هەموو قسەیان تێدابوو، بەڵام دڵنیابوو ئەم خەونەیان خەونێکی بێدەنگە، هەمیشە بێدەنگە... تێیدا هەر چوار پیاوەکە قووڵ تەماشای چاوی دەکەن و هیچ ناڵێن. هەمیشە لە دوای ئەو خەونە بە ئاگادەهات، هەموو ئەو هەشت ساڵە هیچ شەوێک تێناپەڕێت ئەو خەوەی تێدا نەبینێت و ڕانەچڵەکێت و بە ئاگا نەیەتەوە. بەردەوام بەیانیان لەسەر بەرچایی خەونەکەی دەگێڕایەوە، هەمووان بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگ دەبوون و ئەو خەونەکەی خۆی باسدەکرد. فیکرەت گوڵدانچی دەیزانی ئەو خەونە نیشانەی ناڕەحەتی و پەشۆکانێکی قووڵی دڵی کچەکەیە کە لە منداڵییەوە فێربووە هەمیشە خۆی بەهێز نیشانبدات. لە کۆتایی بەهاری ئەو ساڵەدا کە هێشتا داواکارەکان تەنیا سێ مانگ بوو بە ڕێگاوەبوون، سەوسەن بیری لەوەکردەوە لەسەر یەکێک لە دیوارەکانی کتێبخانەکەی خۆی، جارجار نیگارێکی گەورەی سروشتی بۆ گۆشەیەکی دونیا دروستبکات کە لە فەرهەنگ و کتێبە گەورە و گۆڤارە جوگرافییەکاندا دەیانبینێت، تا لەو ڕێگایەوە پتر لە داخوازەکانی خۆیەوە نزیک بێت، کە هەردەم لە خەونەکانیدا لە ئامێزی شوێنە عاجباتییەکانی سروشتدا دەیبینین. کە پرۆشەی خوشکی ناڕەزایی خۆی دەرخست، بەو بیانووەی کە ئەوجۆرە نزیکییە هیچ نییە جگە لە خۆ خەڵەتاندن، سەوسەن بە ئارامی پێیگووت «هیچ دوو مرۆڤێک لەم دونیایەدا بەڕاستی لە یەک نزیک نین... مرۆڤ تەنیا لە حاڵەتی

خۆخەڵەتاندن و خۆفریوداندا لە مرۆڤ نزیکە... ئێمە وەها دروست بووین نەتوانین لە هیچ نزیک بین، دەبێت بەختەوەربین گەر بتوانین تۆزێکیش لە خۆمان یان لە شتەکانی تر نزیک بین...». فیکرەت دەیزانی کە سەوسەن بەجۆرێک لە جۆرەکان دەتوانێت هۆیەک و مانایەکی فەلسەفی بۆ هەموو ئارەزووەکانی خۆی بدۆزێتەوە، هەندێ جار بەهانە و هۆکارەکانی قووڵ و هەندێ جاریش بەهانە و هۆکارەکانی لە خزمەت ویستە منداڵانەکانیدا بوو. فیکرەت دروستکردنی ئەو وێنانەی وەک جۆرە دەستکارییەک بۆ دونیای سەوسەن سەیردەکرد کە دەیویست بگۆڕێت و نەدەگۆڕا، ئەوە بیرۆکەیەکی باش بوو کچەکە کەمێک لە دەوری خۆی هەست بەگۆڕان بکات، لایەنیکەم دەکرا ئەوە شتێک لە کەم خوێنی و سەرئێشەکەی کەمبکاتەوە. هەڵبەت تێچوونی دروستکردنی ئەو نیگارانە ئاسان نەبوو، لە هەموو شاردا دوو سێ نیگارکێش هەبوون ئەو دیواربەندە گەورانەیان دروستدەکرد، دووانیان هونەرمەندی کارامە نەبوون و یەکێکیان نرخی زۆر بەرزی داوادەکرد کە بە بودجەی پیاوێکی وەک فیکرەت هەڵنەدەسوڕا. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دوای مەزاجی کیژەکە دەکەوت، وەک ئەوەی قەدەری بێت لەگەڵ هەوای ئەو کچەدا هەڵبسوڕێت. دواجار ڕێکەوت کۆمەکیکردن و کوڕێکی گەنجیان دۆزییەوە کە بە پارەیەکی گونجاو ڕازی بوو ناو بە ناو نیگارێک بۆ سەوسەن دروستبکات. کوڕەکە ناوی «ئاریان جەودەت» بوو، کاتێک یەکەمجار هات بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی، سەوسەن بە ئاسکی پێیگووت «بە یەک مەرج ڕێگات دەدەم بێیتە ئەم ماڵە. سوێندم بۆ بخۆیت کە حەزم لێ ناکەیت، بیر لەوە ناکەیتەوە خۆشت بوێم، جگە لە ڕاستیش هیچی دیکە لەسەر ئەم ماڵە لە دەرەوە ناگێڕیتەوە، بە هەموو کەس دەڵێیت تۆ لێرەیت تا دیوارەکانم بۆ ڕەسمبکەیت، تەنیا دیوارەکان... نەبا لە وەڕسیدا بمرم». کوڕەکە سوێندی بۆ خوارد کە حەزی لێ ناکات، هەموو شتێکیش دەکات بۆ

ئەوەی بیر لە خۆشەویستی نەکاتەوە، بە دەنگێکی غەمگینیش گوتی «خانم من چیرۆکی تۆ دەزانم، چیرۆکی تۆ و داواکارەکانتم بیستووە، ئیتر چۆن بتوانم حەزت لێبکەم. تا ئەو ڕۆژەی زیندەمێنم هەر نیگارێک تۆ بتەوێت دەیکێشم و هەر شتێکیش تۆ ئاسوودەبکات دەیکەم، بەڵام ڕۆژێک ژنم هێنا، ئەوکات ژنەکەم بڕیاردەدات ئاخۆ دەتوانم لەگەڵتدا بەردەوامبم یاخود نا...». سەوسەن فیکرەت بەوەوە وازی نەهێنا، بەڵکو کاغەزێکی بە خەتی خۆی پێپڕکردەوە کە تێیدا کوڕەکە سوێند دەخوات هەرگیز حەز لە سەوسەن فیکرەت ناکات. سەوسەن گوتی «پیاوی ئەم شارە تەنیا بەجۆرە پەیمانێکی وا دەبەسترێنەوە». کاغەزێکی چکۆلانە بوو کە سەوسەن ناوی نابوو «پەیمانی حەزنەکردن» شتێک بوو بە پێچەوانەی «پەیمانی خۆشەویستی»ـەوە کە کوڕ و کچانی شار پیرۆز سەیریاندەکرد و لەگەڵ یەکدا مۆریاندەکرد. سەوسەن فیکرەت ڕای وابوو هەموو ژنێکی ئەم شارە دەبێت کۆمەڵێک لەو پەیمانانەی پێبێت، و بە هەموو پیاوە زیادەکانی دەوروبەری خۆی مۆربکات، تا بتوانێت ئاسوودە بژی.

یەکەمین نیگارێک ئاریان جەودەت کێشای وێنەی پاییزێکی تووڕە بوو، تێیدا چەند درەختێک با دڵڕەقانە بەرەو چەپ وەریگێڕاون، ئاسمانێکی گرژ بەسەر دەریاچەیەکدا دەڕوانێت کە بە گەڵای زەرد داپۆشراوە. پێدەچوو ئەو وێنەیە وەک سەرەتا گەلێک دڵی کچەکە خۆشبکات، کە ئەو وەرزە ئارەزووی بۆ نیگاری غەمگین و پاییزیی لە تروپکدابوو، لە هەمان کاتدا وێنەکە پڕ بوو لە باڵندە، باڵندەی ناوازە و سەیر سەیر کە سەوسەن فیکرەت لە کتێبی جیاواز و لەسەرچاوەی جیاواز دەریدەهێنان و بە ئاریان جەودەتی دەگووت نیگاریان بکات.

تەماشاکردنی ئاریان جەودەت لە کاتی ئیشدا نەیتوانی ئەو بۆشاییە قووڵەی ژیانی سەوسەن پڕبکاتەوە. پرۆشە لە هەمووان زیاتر بەدەست

ئەو بێدەنگییەوە دەینالاند و پێیوابوو قوڵبوونەوە بەردەوامەکانی سەوسەن لە کتێب و فەرهەنگەکاندا ئەو بێدەنگییەی لە ماڵدا دروستکردوە. پرۆشە ئەو بێدەنگییەی وەک درێژکراوەی ڕۆح و جەستەی سەوسەن سەیردەکرد، وەک جۆرێک لە دەستەڵاتی ئەو بەسەر ماڵەکەدا، وەک بەشێک لە هێزی نهێنی ئەو بەسەر هەموو شتەکانی دەوروبەریدا. پرۆشە بۆ ئەوەی ئەو بێدەنگییە بشکێنێت دەبایە بەردەوام دەنگی تەلەفزیۆنەکە زیادبکات، کە ئەو زەمانە بێوچان سرودی تیپە بەعسییەکانی لێدەدا کە سەرتاسەری وڵاتیان بە مۆسیقای جەنگ پڕکردبوو. سەوسەن تەنیا شەوان سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد، خووی بە بینینی ئەو بەرنامە تایبەتیانەوە گرتبوو کە لەسەر جەنگە، هەموو شەوێک بەدیار تەماشاکردنی وێنەی لاشەی سەربازە ئێرانییەکانەوە دادەنیشت. ئەوە تاکە شتێکی تەلەفزیۆن بوو کە پرۆشە نەیدەتوانی سەیربکات. لاشە سووتاوەکان و دیمەنی ئەو گەنجانەی بەسەرو ڕوخساری تۆزاوییەوە لە سەنگەرەکاندا کەوتبوون، مردنی براکەی و مێردەکەی بە یادا دەهێنایەوە. پرۆشە زۆرجار دەپاڕایەوە لە کاتی دەرخستنی ئەو وێنانەدا تەلەفزیۆنەکە خامۆشبکەن، بەڵام سەوسەن دەیگووت «شەڕ تاکە شتێکی ڕاستەقینەیە کە لەم وڵاتەدا هەیە... دەبێت بەسەیرکردنی ڕابێین». پرۆشە نەیدەتوانی لەگەڵ ئەو نیگارانەدا بژی... سووک و سادە نەیدەتوانی، کە ئەو وێنانەی پیشاندەدا هەستیدەکرد بۆنی مردووەکان ماڵەکە پڕدەکەن... هەستیدەکرد تا دوای تەواوبوونی بەرنامەکانیش تەلەفزیۆنەکە هەر بۆنی مردنی لێدێت. ڕایدەکردە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی دادەخست و دەگریا، بەڵام ئەو بۆنە هەمیشە بەدوایەوە بوو. دەبێت بڵێم یەکێک لەو هۆ گەورانەی وای لە پرۆشە کرد بیر لە شووکردن بکاتەوە، ئەو بۆنە ترسناکە بوو. چیتر بەرگەی بۆنی ماڵەکەی نەدەگرت، هیچ شتێکیش لەوە خراپتر نییە مرۆڤ بەرگەی بۆنی ماڵی خۆی نەگرێت... ئەوە ژیانی لێدەکات

بە دۆزەخ. شەوێکیان پرۆشە تکای لە باوکی کرد چارەیەک بۆ بێدەنگی ماڵەکە و ئەو بۆنە ترسناکانە بدۆزێتەوە کە هەستیان پێدەکات. فیکرەت گوڵدانچی لە سەر قەنەفەی ساڵۆنەکە لە ناو پەیکەر و تۆپی کریستاڵ و باڵندە شوشەکاندا، نائومێدانە سەیریکرد و تێگەیشت کچە گەورەکەی تووشی دەردێک بووە لە دەردی خوشکە بچوکەکەی ترسناکترە. مرۆڤ گەر نەتوانێت بە بێدەنگی ڕابێت لە شێتییەوە نزیکە، ترس لە بێدەنگی و سەرهەڵدانی بۆنی خەیاڵی لە کەپووی مرۆڤدا سەرەتایەکی ترسناکن بۆ شێتبوون. فیکرەت دڵنیابوو هیچی ئەوتۆی بۆ ناکرێت، بەڵام ڕێنمایی کیژەکەی کرد گولاو بکرێت و بەیانیان بیپرژێنێت، بەڵکو ئەو بۆنە کەمێک لەو هەستانەی تێدا بڕەوێنێتەوە، ئامۆژگاریکرد ماوەیەک لە هاویندا لەگەڵ ماڵی پورەکانیدا لە شار دووربکەوێتەوە و بچێت بۆ هەر جێگایەک کە ئەوان دەچن، دەربارەی بێدەنگیش کیژەکەی بەرامبەر خۆی دانا و پێیگووت «پرۆشە، ڕاستییەکی قووڵ لە ژیاندا هەیە دەبێت بیزانیت، مرۆڤ گەر بیەوێت لەگەڵ دونیادا ڕاستگۆ بێت دەبێت بێدەنگی قەبووڵبکات، کێشەی هەرە گەورەی مرۆڤەکان ئەوەیە کە هیچی ئەوتۆیان لەگەڵ یەکدا نییە بیڵێن، من واتێدەگەم زۆربەی ئەو شتانەی مرۆڤ ئەنجامیان دەدا هەر بۆ ئەوەیە لە بێدەنگی ڕابکات، سیاسەت و جەنگ و خۆشەویستی هەموو پەیوەندیان بە پێویستی مرۆڤەوە هەیە بۆ هەڵهاتن لە بێدەنگی... بۆ تاقیکردنەوەی توانای خۆی لەسەر قسەکردن. کێشەی ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە دەمانەوێت زمان زۆر زیاتر لە ویستی خۆی و توانای خۆی بەکاربهێنین... کە شەوانە گوێ لە هەواڵەکان یان لەو سرودانە دەگرم کە بەعسییەکان بڵاویدەکەنەوە، هەست ناکەم ئەو سرودانە لە پێناوی ئەو جەنگە گەورەیەدان، بەپێچەوانەوە کچم، زۆرجار ئەو هەستە دامدەگرێت کە ئەم جەنگە لە پێناوی ئەم سرودانەدا دەکرێت. ئەوەی مرۆڤ گوێی لەدەنگی خۆی بێت کە دەنەڕێنێت، ئەوەی

خۆی تاقیبکاتەوە بە زمان، بە قسە، بە هاوار دەتوانێت ئەوانی تر تا کوێ بەدوای خۆیدا ڕابکێشێت، یەکێکە لە دەردە ترسناکەکانی مرۆڤ... لێم مەگرە، دوای ئەم عومرە زۆرجار بێدەنگی دەمگێڕێتەوە بۆ خۆم، وەک کەسێک کە ئەوانی تر بەقسە و دەنگەدەنگ ناتوانن کاری تێبکەن... مەبەستەکەم من و سەوسەن بەو بێدەنگییە دەژین... تۆ دەبێت بزانیت من زۆر بە غەمم بۆ تۆ... زۆر... ڕەنگە من و سەوسەن زۆر لە یەکتر بچین. من لە غەریبی تۆ لە نێوان من و سەوسەندا تێدەگەم، بەڵام جگە لەوەی کە تکات تیابکەم بەرگەبگریت و سەبرت هەبێت و خۆشتبوێین... هیچی ترم پێ ناکرێت، خۆشبەختیش دەبم گەر بتبینم شوو دەکەیتەوە و جێگایەکی تر و ماڵێکی تر بۆ بەختەوەری خۆت دەدۆزیتەوە».

ئەوە ئەو قسانەی گوڵدانچی بوو کە تا ئەندازەیەک پرۆشەی لە ماڵ هەڵکەند.

## ٢٦

دوای تێپەڕینی سێ مانگ بەسەر ڕۆیشتنی کامەرانی سەلمادا، کاریگەرییەکانی ئەو سەفەرە بەسەر مەنگوڕی بابەگەورەوە دەرکەوت.

ئەو ماوەیەی مەنگوڕ تێیدا هاوڕێی کامەرانی سەلما بوو قۆناغێکی تایبەتی ژیانی بوو، کەمتر لە هەر کاتێکی دیکە شەڕانگێزی و خراپەی تێدابوو. هەستکردنی بەوەی مرۆڤێک هەیە دەبێت ئەم بیپارێزێت و یارمەتی بدات، زۆر شتی تێدا گۆڕی بوو. ئەوەی هاوڕێ کۆنەکانی زۆربەیان باوکن و منداڵی گەورەیان هەیە و ئەم خاوەنی هیچ نییە، نائومێدی نەکرد، تا... پێشتر ئەو هەستەی نەبوو، بەرامبەر خەڵکانی خاوەن ژن و ماڵ ئیرەیی هەبێت. بەپێچەوانەوە خۆی بە بەختەوەرتر دەزانی کە بەوجۆرە دەژی. خۆی سروشتی هەستەکانی خۆی بەرامبەر کامەرانی سەلما نەدەزانی، ئایا هەستی باوکانە بوو، یان تەنیا دەیویست لەسەر نەریتی چەقۆکێشە گەورەکان، کەنجێکی هەبێت بیخاتە ژێرباڵی خۆی و بیپارێزێت و باوەدڵەی بێت؟. هۆکەی هەرچییەک بێت، ئێستا مەنگوڕ هەستی بە تەنیاییەک دەکرد بەر لە ڕۆیشتنی کامەرانی سەلما لە ژیانیدا نەبوو. ڕاستە مەنگوڕ لە چایخانەی پەپولەی ئازاددا بایە یان لە ژێرزەمینی ئوتێلەکەی باوەجاندا هەردەم کۆڕی گەرم و لە دەوری هەرا بوو، بەڵام هەموو هەستمانکرد کە شەڕانگێزی و نائارامی بە شێوەیەکی کتوپڕ لە ناویدا زیندووبوونەتەوە. دوای کامەران هاوڕێتی لەگەڵ مەریوانی مەمە و سامان کیسرادا زۆر

بەهێزبوو، هەردووکیان گەلێک شەڕکەر و تەشقەڵەکاربوون. ئەو ساڵانە دەوڵەت گوندەکانی دەوروبەری شاری وێراندەکرد، گوندەکییەکان بە کۆمەڵ دەهاتنە ناو شار، مەنگوڕ ڕای وابوو دونیای ئەو شارە ڕۆژ دوای ڕۆژ بچوک دەبێتەوە، ئەو پتر لە هەر کەسێکی تر، هەستی بە بچوکبوونەوەی سنورەکانی ئەم شارە دەکرد و ڕۆژ دوای ڕۆژ هەناسەتەنگییەکی گەورە بەر گەرووی دەگرت. ئەو دەیگووت «ئەم شارە ڕۆژ دوای ڕۆژ وەک کیسەڵ دەچێتەوە ناو خۆی... ئێستا شارەکە ئاگای لە چواردەوری خۆی نییە، هەر شارێک ئاگای لە چواردەوری خۆی نەما، باری ناتەواوە، شار وەک ئینسان وایە بە هەست و نەستدا حیسابی بۆدەکرێت، کە هەست و نەستی مرد، کە چواردەوەری خۆی نەبینی ئیتر حیسابی پاکە، هیچ شتێک ڕزگاری ناکات» . لەو ماوەیەدا ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕەفتاری خراپ دەبوو، هەندێک هەستیاندەکرد چیتر ناتوانن لەگەل مەنگوڕدا قسە و مامەڵەبکەن. شتێک لە شەڕانگێزی و ئارەزووی جەنگ لە ناویدا گینگڵی دەدا کە خۆشی بێزارکردبوو. لە ماوەیەکی کورتدا چەندین جار دەنگە دەنگی گەورەی تووشهات، دوای چەندین ساڵ بۆ یەکەمجار گەڕایەوە بۆ سەر خولیای چەقۆ هەڵگرتن، بۆ یەکەمجار لە ساتەکانی توڕەیی و قۆڵبادان و دەمار گرژیدا لێمانبیست کە لە هەمووومان بێزار و لە هەموو شتێکیش توڕەیە. ئەو هەستەی بە بچوکبوونەوەی شار وای لێدەکرد پتر بیر لە سەوسەن بکاتەوە، هەستیدەکرد ئەو کچە وردبینتر لە هەر کەسێکی دی بچوکی ئەم دونیایەی بینیوە. وەک نوێنەری کامەرانی سەلما ڕۆژێک چوو بۆ لای سەوسەن فیکرەت، ئەو کات نزیکی چوار مانگ بەسەر سەفەری سێ کوڕە عاشقەکەدا تێپەڕی بوو، هیچ هەواڵێکی تایبەتی لەلای کامەرانی سەلماوە نەبوو، بەڵام هەموو دەمانزانی ئەو بێهەواڵییە دەگەڕێتەوە بۆ خراپی باروذۆخ لەسەر سنوورەکان. مەنگوڕی بابەگەورە لە ڕێگای فیکرەت گوڵدانچییەوە داوایەکی پێشکەشکرد و تکایکرد بۆ سەعاتێک سەوسەن

گوڵدانچی ببینێت، لە ڕاستیدا ئەوکات کەس نەیدەزانی بۆ مەنگوڕ وا بە حەسرەتەوە دەیەوێت سەوسەن ببینێت، بەڵام دواتر زانیمان کە هەموو هەوڵی ئەو بۆئەوە بووە سەوسەن وا بسازێنێت گوناهی ئەو تێکەڵ بە هەڵسەنگاندنی کامەرانی سەلما نەکات. لە ڕۆژێکی کۆتایی تەموزدا، مەنگوڕ بە کراسێکی قۆڵ کورتی سوور و کڵاوێکی ئەستووری خڕەوە کە لەگەڵ گەرمای ئەو وەرزەدا نەدەگونجا، چوو بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی. خولیایەکی نەبوو ئەوە نەبێت سەبارەت بە باروودۆخی خراپی خۆی و «گەورەیی دونیا» قسە لەگەڵ کچەکەدا بکات، ماوەیەک بوو کە هەستی بە نالەباری ڕەفتارەکانی خۆی و بەدی ڕەوشتەکانی دەکرد، لەدڵەوە هەستیدەکرد هۆی ئەو گۆڕانەی دەگەڕێتەوە بۆ تێکچوونی پەیوەندی بەم شارەوە. بۆ ئەوەی لە بۆچوونەکانی خۆی دڵنیابێت پێویستی بە قسەکردنێکی دووروودرێژ لەگەڵ ئەم خانمەدا هەبوو کە مەنگوڕ بڕوای وابوو زۆر نهێنی گەورەی دونیا دەزانێت. کە گەیشتە ماڵی گوڵدانچی، پێشتر بیری لە هەموو وشەیەکی خۆی کردبووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕستەکانی بەوجۆرە نەهاتنەدەرێ کە خۆی دەیویست، سەرەتا قووڵ وەک خزمەتکارێک نوشتایەوە و گووتی «ها، خانمی سەوسەن، لە مێژە یەکترمان نەبینیوە، بەداخ و بەژارەوە دەبێت بڵێم، کە هەواڵێکم لە کامەرانی سەلماوە پێ نییە... لەو ڕۆژەوەی ڕۆیشتووە هیچ شتێکمان لێ نەبیستوە، نە من، نە کەسوکاری... بەڵام سەوسەن خان، مەترسە، هۆی ئەو بێدەنگییە، دەگەڕێتەوە بۆ خراپی سەر سنوور. لەو کاتەوەی ئەو ڕۆیشتووە، دونیا هەر خراپ و خراپتر دەبێت...». سەوسەن بەرەو ژووری کتێبخانەکە پێشیکەوت و لە جێگایەکی گونجاودا دایینیشاند و گووتی دەرهەق بە بێدەنگی داواکارەکان مەراقێکی نییە و گەرنێک دڵی نەگرتووە. مەنگوڕ کڵاوەکەی خستە سەر کۆشی و گووتی « خانم پێویست ناکات، من هیچ بڵێم، هەموو دەزانین شتەکان ڕۆژ دوای ڕۆژ خراپتر دەبن. یوسف

کەویار بە ڕەحمەت بێت دەیگووت «ژیان سێوێکە گەر لە کاتی خۆیدا نەیخۆیت دەڕزێت». ئا ژیان بەوجۆرەیە، خانم». سەوسەن هەمیشە ماندوێتییەکی قووڵی پێوەدیاربوو، گووتی «بەتەواوی تێناگەم مەبەستتان چییە... بەتەواوەتی تێناگەم». مەنگوڕ پاڵیدایەوە و گووتی « من لەو کەسانەم کە ژیانم لە کاتی خۆیدا نەخواردوە، هەموو واین، ئەوانەی لەم شارەدا دەژین زۆربەمان ئەو هەستەمان هەیە کە هیچمان لە ژیان نەخواردوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە هۆی سەردانەکەی من نییە، من دەمەوێت بزانم تۆش هەمان ئەو هەستەت هەیە کە ئەم شارە بچوکتر و بچوکتر دەبێتەوە. لەو ڕۆژەوەی کامەرانی سەلما ڕۆیشتووە، واهەستدەکەم ئەم شارە تا دێت بچوک دەبێتەوە، پێشتر ئەوەم نەدەبینی، بەڵام شتێکی سەیرە، ئێستا دەڵێیت ئەم شارە وەک کلکی کیسەڵ دەچێتەوە ناو خۆی... عەفوومکە خانم، من لە ناو خەڵکی سادە و چەقۆکێشدا گەورەبووم... بەڵام دەزانم تۆ تێمدەگەیت، ڕاستە من بە تەمەن لە تۆ گەورەترم، بەڵام تۆ لەم کتێبخانەیەوە عیلم و مەعریفەتی زۆرت وەرگرتووە، لە بەرئەوە هەرچییەک دەڵێم تۆ حاڵی دەبیت... زۆربەی ئەوانەی دەیانناسم قوونی خۆیان ناجوڵێنن، بۆ ئەوەی تێمبگەن... ئاە عەفوومکە خانم، داوای لێبوردن دەکەم، مەعزەرەت دەخوازم کە هاتم سوێندم خوارد قسەی خراپ نەکەم و ئەم وشانە بەکارنەهێنم... بەڵام باوەڕت بێت خانم، ئەوجۆرە وشانە خۆیان دێن، لە پڕێکدا بێئەوەی بزانیت دەپەڕنە سەر زارت... هەموو واین، خەڵکی ئەم شارە هەموو بەم وشانە دەژین... گەر ئەو وشانەمان لێبستێنن، گەر ئەو وشانە لە زمانەکە دەریهێنن و بیسووتێنن ئیتر لاڵ دەبین... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عەفوومکە، من هاتووم بۆ ئەوەی بپرسم بۆ لەو کاتەوەی کامەرانی سەلما ڕۆیشتووە من هەستدەکەم شارەکە تووشی بێهۆشی بووە و بە هیچ شتێک هۆشی نایەتەوە. من دەمەوێت بپرسم... خانم بەڕاستی وایە، ئەم شارە تادێت

بچوکتر دەبێتەوە، یان ئەوە تەنیا خولیایەکی خراپی ناو سەری منە؟».
سەوسەن وەک کچێک لەسەرە مەرگدا هەندێک ڕاسپاردەی ترسناک بدرکێنێت و گووتی«شار هەرگیز بچوک نابێتەوە، شار بەردەوام گەورە دەبێت، بەڵام دونیاش لەگەڵیدا گەورە دەبێت... شار چەند خێرا گەورە بێت، خێراییەکەی ناگاتە خێرایی گەورەبوونی دونیا... تا دونیا گەورەتر بێت، شار لە بەرچاومان بچوکتر دەبێتەوە». مەنگوڕ گووتی «سەوسەن خان، سەیرکە، خەڵکی ئەم شارە ئاگایان لە هیچ شتێک نەماوە، من دەزانم سەرباز و ئەمن و سیخوڕەکانی حکومەتی بەعس کە نزیکی بیست ساڵە لە سەر قوونمان دانیشتوون، کارێکیانکردوە مرۆڤ تەنیا بیر لە خۆی بکاتەوە... بەڵام جاران زیاتر ئاگامان لە دونیا بوو... شارەکە ئێستا کوێربووە.... لە قوونی خۆی زیاتر هیچی تر نابینێت. من لەو شەوانەدا لەگەڵ سامانی کیسرادا لە یاری دەهاتمەوە، پێمگووت: ئەو کچە شتێک دەزانێت ئێمە نایزانین، دەزانێت کارەساتێک بەڕێوەیە، بۆیە بە هەر بەهانەیەک بووە ویستی ئەو سێ کوڕە ڕزگاریکات... ئەوەتا ئێستا هەستدەکەم شارەکە تۆزەتۆزە لە شیاکەی خۆیدا نوقمدەبێت، دەمەوێت بزانم تۆ بەڕاستی شتێک دەزانیت کە کەسی تر نایزانێت، خانم بە ڕاستی ئەمە مەراقمە، گەر شتی زۆر ترسناک بەڕێوەیە، گەر بۆنی تۆ وەک ژنێک لە بۆنی ئێمە بەهێزترە شتێکم بۆ ئاشکرابکە؟».
سەوسەن لە نیگار و شێوەی مەنگوڕدا دیمەنی «خان»ـی تەتاری ناو یەکێک لە ئەفسانەکانی دەهاتەوە یاد. کەمێک گەرمتر و زیندووتر لە قسەکانی پێشووی گووتی « نازانم جەنابی کاک مەنگوڕ، تۆ بۆ وادەزانیت من شتێک دەزانم کە خەڵکانی تر نایزانن، لە ڕاستیدا من شتێکی زۆر تایبەتی نازانم کە بۆ خەڵکانی تر نهێنی بێت... بەڵام دەزانم مرۆڤ لە شوێنی بچوکەوە ناتوانێت بەڕوونی بیر لە جێگای تر بکاتەوە... مرۆڤ لەم شارە بچوکەی ئێمەدا، گەورەیی دونیای بیردەچێتەوە... من

لە منداڵییەوە ئەو ڕاستییە دەزانم، تۆ کوڕی ئەم شارەیت، بەڵام من کچی هیچ شارێک نیم. بەدوای پیاوێکیشدا دەگەڕێم خەڵکی هیچ شارێک نەبێت... دۆزینەوەی پیاوێک کە خەڵکی هیچ شوێنێک نەبێت ئاسان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا من هەوڵدەدەم. جەنابی کاک مەنگوڕ، هەوڵدەدەم... هەق بە تۆیە، ڕۆژ بەدوای ڕۆژ هەموو شتێک خراپ دەبێت، ڕاستت دەوێت من ئەوانەم نارد، بۆ ئەوەی نەکوژرێن. من شتێک دەزانم... ئا، من شتێک دەزانم، بەڵام شتێکی ئەوتۆ گرنگ نییە، ئەوەیە شەڕ لەم وڵاتەدا تەواو نابێت، قەت شەڕ تەواو نابێت... بەڵام جەنابی مەنگوڕ خان خۆت دەزانیت ئەوە زانیارییەکی وەها گرنگ نییە... وانییە... شتێکی ئەوتۆ نییە».

سەوسەن هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وەک یەکێک چاوەڕوانی وەڵامی تکایەک بکات، بەبێدەنگی سەیری مەنگوڕی کرد و بەردەوامبوو «کاک مەنگوڕ، کاتێک کامەرانی سەلما چەقۆی لە مەنسور ئەسرین دا هەموو وایان دەزانی من بێباکم، من هەست بە هیچ ناکەم، بەڵام وانییە، باشترین پیاو، ئەو پیاوەیە کە نازانێت شەڕبکات. من زۆر بیرم لێکردۆتەوە، سەفەر تەنیا شتێکە پیاوی ئەم وڵاتە لەو شتانە دووردەخاتەوە کە لە پێناویدا شەڕدەکەن، بێودیترین مرۆڤی دونیا، ئەوانەن کە سەفەردەکەن».

مەنگوڕ بێئەوەی لە قسەکەی سەوسەن تێگەیشتبێت گوتی « بەقەبری مردووم خانم، ژیانی ئێمە وەک شەرابی تاڵ وایە، گەرچی تاڵە، بەڵام لەبەرئەوەی لەشمان بە ژەهرەکەی ڕاهاتووە، ناتوانین دەستبەرداری بین. بەڵام خانم بە گۆڕی عەزیزم، مرۆڤ حەیوانێکی تەمەڵە، گەر بەدوای شتێکی گەورەدا نەگەڕێت، لە جێگایەکدا دەچەقێت و ناجوڵێت. منیش وام، منیش هەمیشە خۆم وەک حەیوانێکی تەوەزەل و تەپۆ سەیرکردوە. قەسەم گەر من لە جێگای داواکارەکانی تۆ بوومایە، نەمدەتوانی ئەم شارە بەجێبهێڵم، دەمگووت خانم عەفومکە، من کەتیرەیەکی نهێنی بەم شارەوەی

نوسـاندوم... نـا خانـم، ئـەوەم پـێ نەدەکـرا، شـتـەکە وەک نەخۆشـی وایـە. قاسمی عەنبەرخـان لـە شەسـتەکاندا چەقۆکێشـێکی گـەورەی شـار بـوو، کـە شـەڕیدەکرد دەسـتیت نەدەبینـی، خێراتریـن چەقۆکێشـی ئـەو سـەردەمەبوو. دایکـی قاسـم پـازدە هـەزار دینـاری ئـەو سـەردەمەی بۆ کـرد بە دۆلار تـا بڕوات و واز لـەم شـارە بهێنێت. مـن پێمگـووت «قاسـە پارەکـە لـە حاجـی عەنبـەر وەرگـرە و بـڕۆ» هەمـوو لـە دڵمـان چەسـپیبوو بەسـەلامەتی دەرناچێت. مـن گووتـم « ئـەم شـارە مەلعونـە دەتفەوتێنێـت، بـڕۆ و کەوڵـی خـۆت ڕزگاربکە». ڕۆژێـک پارەکـەی وەرگـرت و ڕۆیشـت، هەمـوو واماندەزانـی ئیتـر ناگەڕێتـەوە. دوو هەفتـەی پێنەچـوو، دیسـان لەبـەر سینەماکاندا دەسـوڕایەوە. بەڕەحمـەت بێت گووتـی « مەنگـوڕ، مـن لـە هیـچ شـوێنێکی تـر ناتوانـم سـەوزبم. ئـاوی هیـچ شـارێکی تـرم بـۆ ناخورێتـەوە، نانـی هیـچ شـارێکی تـرم بـۆ ناخورێـت». دوای دوو مانـگ لـەو ڕۆژە لەسـەر ئـەوەی جنێـوی بـە شـەرەفی سیاسـییەکی گـەورە دابـوو، لەبـەر قەیسـەرییەکەدا دایانـە بـەر چەقـۆ، پێنـج کـەس بـوون، دووانـی لـێ برینداركـردن، بـەڵام دەرەقـەت نەهـات، بەڕەحمـەت بێـت کوڕێکـی ئازابـوو، لەویـادا کوشـتیان. کـە چوومـە سـەر لاشـەکەی هـەژدە چەقـۆی پێوەبـوو، خـوای گـەورە تـا ئەوکاتـە کەسـم نەبینیبـوو هـەژدە چەقـۆی پێـوە بێـت. سەوسـەن خـان ئێسـتا واهەسـتدەکەم منیـش تووشـی ئـەو دەردە بـووم... ئـەو دەردەی قاسـمی عەنبەرخانـی کوشـت. تـۆ پێمبڵـێ خانـم، تـۆ بڵێـی خوابـکات مـن لـە هیـچ شـوێنێکی تـری دونیـادا سـەوز ببمـەوە... لـەو باوەڕەدایـت حەیوانێکـی تەمەڵـی وەک مـن، کـە بەزەحمـەت دەتوانـم قوونـی خـۆم بجوڵێنـم، بتوانـم سـەفەربکەم؟...».

سەوسـەن بـە غەمگینییـەوە سـەیریکرد و بەهێمنـی گووتـی «مەنگوڕ خان، مـرۆڤ گـەر بـەدوای شـتێکدا نەگەڕێـت ناتوانێـت سـەفەربکات. مـرۆڤ بـۆ شـتێکی تـر دەگەڕێـت و لـە ڕێـگادا بـە ڕێکـەوت چـاوی بـە دونیـا دەکەوێـت. گـەر تـۆ ئەمـڕۆ بڕۆیـت، بەیانـی بگەیتـە سـەر ترۆپـکی شـاخێکی بـەرز، بگەیتە

ناو بەفرێکی زۆر، بڕۆیتە سەر بەحرێکی گەورە، دوایی لە خۆت دەپرسیت من چیدەکەم لێرە، بۆ پشوونادەم، بۆ لە جێگایەکدا ناحەوێمەوە؟. گەر بتوانیت ئەو پرسیارە نەکەیت، دەتوانیت سەفەریکەیت... باشترین شت ئەوەیە مرۆڤ لەسەرەتاوە جێگایەکی نەبێت بۆی بچێت و جێگایەکی نەبێت بۆی بگەڕێتەوە، ئەوە لای من ڕێبواری ڕاستەقینەیە... بەڵام خۆت دەزانیت ئەوە قورسە... بۆ نمونە، من شارم نییە، بەڵام شتێکم هەیە لە شار ترسناکتر... ئەم کتێبخانەیەم هەیە...».

مەنگوڕ گوتی «خانم ڕاستییەکەی من دەمەوێت ڕوونتر قسەتان لەگەڵ بکەم. من دەڵێم شتەکە بەدەست مرۆڤ خۆی نییە، کە لە شارێکی کوێردا لەدایک بوویت تۆش هیچ نابینێت. خانم من لە ژیانمدا کەم شت پەستمدەکات، یەعنی هەموو شتێک لام ئاساییە. بەڵام تۆ منت نەخۆش خست، ئەوە ئەسڵی مەسەلەکەیە، نا خانم من لەگەڵ هەموو ڕێز و حورمەتێکدا وادەڵێم... هەر من نا. خانم... خەڵکانێکی زۆر تووشی ئەو موسیبەتە بوون... پێشتر ئەم شارە هەموو دونیای من بوو. ئا قەسەم بە گۆڕی مردوم هەموو دونیای من بوو. نەمدەزانی لەدەرەوەی ئەم شارە شتێک هەیە ناوی دونیایە، ناوی جیهانی بەرین و گەورەیە. بەڕێزتان بیری داماوێکی وەک منتان خستەوە شتێک هەیە ناوی جیهانە. لەو کاتەوە خانم نەخشەیەکی بچوکی دونیام کڕیوە و خستومەتە گیرفانم، بەردەوام لە گیرفانمدایە، بۆ هەر شوێنێک بچم لە گەڵمدایە، بەردەوام سەیریدەکەم. نا خانم مەترسە، من ناتوانم بچم بۆ هیچ جێگایەک، تا ئێستا هەمووی خەیاڵاتی نابەجێیە. بەڵام بەوەدا نەدەتوانم بڕۆم و نەدەشتوانم لێرە ئاسوودەبم، خەریکە دەبم بە بەشەرێکی تر. سوێنددەخۆم دوای مانگێک لە سەفەری کامەرانی سەلما ئەو گۆڕانەم تیا دروستبوو. لەسەرێکەوە خەریکە ئەم شارە دەمخنکێنێت و لەسەرێکی تریشەوە دەزانم ناتوانم لەم شارە بڕۆم. ئەوەش توڕەیی و

شێتییەکم تیا دروستدەکات خۆم لێیدەترسم. بۆ نمونە خانم دوێنێ وەک هەر مرۆڤێکی ئاسایی بەسەر جادەکاندا دەڕۆیشتم، لە ناکاو هەستمکرد لە قەفەزدام، هەستمکرد قەفەزەکە تەنیا لە دارودیوار و جادە دروست نەبووە، بەڵکو لەو خەڵکەش دروستبووە کە لەدەورم دێن و دەچن، ئەوە تووشی بوغزێکی وەهای کردم مەپرسە، وەخت بوو لە چایخانەی پەپولەی ئازاد دوای شەش ساڵ بۆ یەکەمجار «قارەمانی عوسەی کافوور» بدەمە بەر چەقۆ، ئەگەرچی بەقەبری مردووم چەقۆشم پێ نەبوو. لە ڕاستیدا خانم من ئەمڕۆ بۆ یەک شت هاتووم، بمبورە کە بەردەوام وا فێڵبازانە نیانی خۆم دەشارمەوە و هەوڵدەدەم وادەربکەوم کە بۆ شتێکی تر لێرەم، بەڵام ڕاستییەکەی من بۆ ئەوە هاتووم پێتبڵێم، من زۆر بەرەو خراپە دەگۆڕێم. شتێک لە خوێنمدا دەجوڵێت کە بۆم ناوەستێنرێت. بەڵێ خانم کورتەی حیکایەتەکە ئەوەیە من بەرەو خراپە دەچم. ڕەنگە بەڕێزتان بڵێن، یەعنی چی تۆ خۆت دەزانیت بەرەو خراپە دەچیت و کەچی هیچ ناکەیت بۆ ئەوەی بەرەو خراپە نەچیت. بەڵام خانم من وام، لە منداڵییەوە وام، دەزانم نیشێک خراپە کەچی دەیکەم، هەمیشە بەهانەیەک دەدۆزمەوە بۆ ئەوەی بیکەم. بەڵام هەموو گوناهەکە لە ملی مندا نییە، یوسف کەویار کە مامۆستای ڕاستەقینەی من بوو دەیگووت «مرۆڤی خراپ نییە، شوێنی خراپ هەیە». بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، من هاتووم تیاتاندا بپاڕێمەوە، هاتووم پێتانبڵێم لە داهاتوودا لەوانەیە زۆر شتی خراپ لە من بوەشێتەوە، ڕەنگە پاشەڕۆژ لەسەر من هەواڵی بەد ببیستن. زۆر سوپاستاندەکەم گەر هەڵەکانی من نەخەنە ملی کامەرانی سەلما... خراپەکانی من پەیوەندییان بە کامەرانی سەلماوە نییە، من هەر خراپەیەکم هەبێت ئەو لێی بێئاگایە».

کچەکە گوتی « مەنکوڕ خان گەرچی من تۆ باش ناناسم، بەڵام نامەوێت وابزێت وەک ئەوەی لە قەفەزدایت، ئەوەی نوێنەری کامەرانی

سەلمایت هەقی ئەوە نادات بە من داوای هیچ لە ئێوەبکەم، دڵنیابە خراپی مرۆڤێک تێکەڵ بە خراپی یەکێکی تر ناکەم». سەوسەن نەیدەزانی بەو قسانە چرا بۆ مەنگوڕ هەڵدەکات زیاتر شەڕانگێز بێت.

مەنگوڕ هەستایە سەر پێ و چەند جارێک نوشتایەوە و بەوپەڕی ڕێزەوە بچوکی خۆی نیشاندا و گووتی «خانم، من ئەوەم دەوێت، من دەمویست ئەو ڕستەیە لە زارتان ببیستم، ئەو قسەیەی تۆ بۆ من گەورەیە... ئومێدم ئەوەیە لە ویژدانی خۆتدا خراپی من تێکەڵ بە وێنەی کامەرانی سەلما نەکەیت... ئەوە تەنیا داوای منە، خانم... هیچ شتێکی ترم ناوێت».

تا ماوەیەکی زۆر تێنەگەیشتین بۆ مەنگوڕ پێویستی بەوەیە ڕەزامەندی سەوسەن گوڵدانچی لەسەر خراپەکانی خۆی بەدەست بهێنێت، بەڵام هەموو دەمانزانی مەنگوڕ بەبێ ئەو ڕەزامەندییە نەیدەتوانی زۆر لەو کارانەبکات کە دواتر کردی، ئەو ڕەزامەندییە بۆئەو زۆر گرنگ بوو، دەبایە سەردانێکی تایبەتیشی بۆ ئەنجام بدایە. سەوسەن ئەو ڕۆژە بێئەوەی بزانێت چی دەکات چەند جارێک دڵنیایکردەوە کە ئەو خراپەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکدا تێکەڵ ناکات. مەنگوڕی بابەگەورە کاتێک کڵاوەکەی هەڵگرت و لە ماڵی گوڵدانچی هاتەدەرەوە، گەلێک کامەران بوو. سەوسەن لەبەردەرگاش دووبارە سوێندی بۆ خوارد کە گوناهی ئەو ناخاتە ملی کامەرانی سەلما، ئەوە بۆ مەنگوڕ بەسبوو هەست بە ئاسوودەبییەکی گەورە بکات. بەڵام ساڵانێکی دواتر هەستمانکرد ئەو سەردانە و پەیمانە بۆ چەندەها ساڵ پەیوەندی مەنگوڕ و سەوسەن گوڵدانچیان تەواو تێکدا، بەجۆرێک دەبایە دونیا سوڕێکی گەورە بخوات و شتەکان هەموو بگۆڕێن تا دووبارە بتوانن پێکەوە بە ئاشتی و ئارامی دانیشن.

## ٢٧

لێدانەکەی قەلەندەر بۆ مستەفا هەژار هەروا ئاسان ڕانەبورد. مستەفا لە هەر شوێنێک دابنیشتایە چیرۆکی درندەیی ئامووننیەکانی دەگێڕایەوە، بە چەشنێک کۆڕ و دانیشتنێک نەما بەسەرهاتی ئەو شەوە غەمگینەی خۆی و قەلەندەری تیا نەگێڕێتەوە. ئامووننیەکان وایان هەستکرد کە سەرهەڵدانی ئەم گرفتە لە هەفتەی یەکەمەوە، نیشانەیەکی خراپە بۆ ئەوان، بەتایبەت لێدانی مستەفا هەژار، فیکرەت گوڵدانچی زۆر توڕە کرد و هەموو شاریش بینیان کە بە پاکەتێک پسکیتەوە چوو بۆ خەستەخانە بۆ لای. لە ڕاستیدا فیکرەت گوڵدانچی هەموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی ئاسوودەیی و هێمنی لە نێوان بەرە جیاوازەکاندا بەرقەرار بێت، چونکە نەیدەزانی گەر شتەکان لەدەست دەربچن، دواجار چارەنوسی خۆی و کچەکەشی بەرەو کوێ دەچێت. بەڵام شتەکان ڕوو لە هێمنی و بەرقەراری نەبوون. هەفتەیەک دوای سەردانەکەی مەنگوڕی بابەگەورە، ساقی مەحمود کاسێتێکی بڵاوکردەوە کە بوو بە پزیسکی یەکەمین ئاگری گەورە. هەموو زانیمان ساقی لە گۆرانییەکانیدا باسی مەنسور ئەسرین دەکات، «عاشقێک لە پێناوی خۆشەویستیدا جیهان دەگەڕێت و باڵندەی نەفین ڕاودەکات». ئەوەی گرفتەکەی گەورەکرد ئەوە بوو کە ساقی لە هەموو گۆرانییەکانیدا بە مەجاز پەلاماری عاشقانی درۆزن و چەقۆکێشە درندەکان و چەتە پارەدارەکان دەدات. گۆرانییەکان چ بە شیعر و چ بە ئاواز

نیشـی گۆرانیبێژێـک بـوون کـە بەهرەیەکـی ئەوتـۆی نییـە، بـەڵام بـەوەدا زۆریـەی خەڵـک ناتوانـن بەهـرەی ڕاسـتەقینە بناسـن، گۆرانییەکانـی سـاقی کـە بەسـەمبولی سیاسـی زەق موتوربەکرابـوون، گوێگرێکـی زۆریـان هەبـوو. سـەرانی ئاموونییـەکان پێکـەوە گوێیـان لـە کاسێتەکە گـرت، پەرچەکـرداری قەلەندەر ئاموون گەلێک هیسـتری و شـێتانە بوو، بەڵام بەهۆی پێشـنیارەکانی فـەوزی بەگـەوە کـە سـووربوو لەسـەر ئـەوەی نابێـت نـاوی ئاموونییـەکان لـەوە زیاتـر لکەداربکرێـت، بـە کۆمـەڵ فەرمانیـان بـە قەلەنـدەر دا تووڕەیـی خـۆی بخواتـەوە و لـە هەمـوو تۆڵەیـەک ببورێـت، گووشـاری ئامووونییـەکان و سـەرانی خێـڵ لەسـەر قەلەنـدەر بەجۆرێـک گەورەبـوو ناچاربـوو لەبـەردەم هەموویانـدا پەیمانێـک بنوسـێت و ئیمزاببـکات کـە بێگەڕانـەوە بـۆ سـەرانی خێـڵ هیـچ شـتێک نـەکات و هەرچییـەک ڕووبـدات ئـەو شـتەکان بـە پێکەنیـن و زەردەخەنـەوە وەربگرێـت.

لەبـەرەی مەنگـوڕەوە کاسـێتەکە هـەژان و هـەڵای گـەورەی نایـەوە، گۆرانییـەکان مەنگوڕیـان وەک جرجێکـی بێڕەحـم و ناحەزێکـی چڵکـن وەسـفدەکرد، پیاوێـک لـە پاشـەڕۆی گـورگ و نـاوی زێـراب. وەسـفەکان وەهـا لێدەربـوون، کەسـانێکی زۆر ئەوەیـان بـە دەرفـەت زانـی لاقرتـی بـە مەنگـوڕ بکـەن و بیدەنـە بـەر کلـکان، مەنگوڕ هەسـتیکرد دەسـتێک هەیـە دەیەوێـت لووتـی لـە زەوی بـدات و بیـکات بـە قەرەقـۆز، ئـەوە زۆر برینداریکـرد و توانـا شـەڕانییەکانی زیاتـر تیـا جوڵانـد. مەنگوڕ لەوانـە نەبـوو کـە گـوێ لـە ئـاواز و گۆرانـی دەگـرن، سـەلیقەیەکی زۆریشـی بـۆ مۆسـیقا نەبـوو. بـەڵام دوای ئەوەی مەنگـوڕ لاقرتـی و تانەکانـی بیسـت، دوای ئـەوەی زانـی توانجـەکان کاریـان لـە دەمـاری کـرد، بڕیاریـدا گـوێ لـە کاسـێتەکەی سـاقی بگرێـت. مەنگـوڕی بابەگـەورە و دەسـتەیەک لـە هـاوڕێ هـەرە نزیکەکانـی لـە ماڵـی «حەسـەن نەرمیـن» کـە پیاوێکـی بچکۆلـەی بێـوەی بـوو، لەوانـەی زۆر حەزیـان بـە کـۆڕ و کۆمەڵـی مەنگـوڕە، گوێیـان لـە کاسـێتەکە گـرت. مەنگـوڕ تـا ئەوکات سـاقی

وەک دوژمنێکی سەرسەخت سەیرنەکردبوو، تەنیا بەرەیەک بە ڕاستی لێیدەترسا بەرەی ئامووینییەکان بوو، بەڵام ئەو شەوە هەموو ئەوانەی لە ماڵی حەسەن نەرمین بوون، پێکڕا هەستیانکرد مەنگوڕ چەند بریندارە و چ گرێیەک لەدەروونی بەریووە. دوای ئەوەی کەمێک عارەقی خواردەوە، بە هەموو مەستەکانی دۆستی گووت «سوێند دەخۆم بە قوونی هەرچی فریشتەی ئاسمانە کە ئەم پیرە خەرەفاوە ساڵانی زووی بیرناچێتەوە، سەردەمێک ئەو شیوعی بوو و من ئیشم بۆ پارتی دەکرد... جنێوەکانی وەها ئاشکران دڵ هەلاهەلادەکەن. تا ئێستا کەس ئاوها بە ئاشکرا و لە بەرچاوی دونیا لاقرتی بە مەنگوڕ نەکردوە، من قوونی خۆم خستۆتە هەلاکەتەوە بۆ ئەوەی ناوێکی پاک بۆ خۆم دروستبکەم. بەڵام قەسەم بە قەبری نەنکم لەگەڵ کەوتنی خۆری سبەینێدا، شتێکدەکەم نەمدەویست دووبارەیبکەمەوە... شتێک نەمدەویست جارێکی تر بیری لێبکەمەوە».

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، بەیانی لەسەر هەواڵی چەند ئاگرێکی گەورە لە خەو هەستاین کە شەو ماڵی ساقی مەحمود و نیشتەجێی تیپی هەرزاڵ و سێ لە گەورەترین تۆمارگاکانی شاری سووتاندبوو. دەستێکی شارەزا ئاگرەکەی کردبوووەوە، شتەکان وەها ورد و زیرەکانە کرابوون، کەس ڕاستەوخۆ جێ پەنجەی مەنگوڕی لەئیشەکەدا نەدۆزییەوە، بەڵام هەموو دەمانزانی دەستی ئەوە. دەمانزانی لە کۆتایی شەستەکاندا مەنگوڕ لە ڕووداوێکی هاوشێوەدا ماڵی فریای بابەعەلی سووتاند کە ئەو سەردەمە بە یەکێک لە کۆشکە جوانەکانی شار حیسابدەکرا. فریا خۆی یەکێک بوو لەو کوڕە قۆزانەی کەم جوانی وەک ئەو بە کوچەو کۆڵانی شاردا تێپەڕیوون، بەڵام فریا نامەردییەکی وەهای کردبوو، کاتێک مەنگوڕ ماڵەکەی بۆ سووتاند دەستخۆشیمان لێکرد و بە ئیشی هاوڕێیەکی دڵسۆزمان زانی کە لە ساتی سەختیدا پشتی دۆستەکانی بەرنادا. ئەوکات فریا پەیوەندییەکی لەگەڵ نەشمیلی ژنی «بەهادینی بوکێ» دا هەبوو،

بەهادین هاوڕێیەکی نزیکی مەنگوڕ بوو، نەشمیل ئەسپەژنێکی کەم وێنەبوو، بەڵام وەها سەر بەدەرەوە بوو مەپرسن. بەهادینی بوکێن و حەپسەخانی دایکی نەبێت هەموو دەمانزانی نەشمیل لەگەڵ فریادا دەخەوێت. بەڵام فریا بەوەوە نەوەستا، بەڵکو بە کامێراکەی وێنەیەکی ڕووتی نەشمیلی گرت بۆ ئەوەی لای هاوڕێکانی شانازی بە گورزەکانی خۆیەوە لەگەڵ ئەو ژنە بێوێنەیەدا بکات. وێنەکە هیچ گومانێکی هەڵنەدەگرت، وێنەی نەشمیل بوو، ژنێکی سپی و باڵابەرز بە توکەبەرێکی ڕەشی چڕ و خاڵێکی گەورە لە ژێر مەمکی چەپیدا، لەسەر دۆشەکێکی گەورە پاڵکەوتبوو. ئەوە یەکەمجاریبوو لە مێژووی ئەم شارەدا یەکێک وێنەی ڕووتی ئافرەتێک بە ئاشکرا بگرێت، تا ئەوکات کامێرا لە شاری ئێمەدا بۆ مەبەستی لەو جۆرە بەکارنەهێنرابوو، ڕاستییەکەی ئەو وێنەیە سەرەتای زنجیرەیەک وێنە و فلیمی ئیرۆتیکی بچوک بوو کە دواتر ئەرشیفی پۆرنۆگرافی لەم شارەدا ئاوداندەکەنەوە. کە وێنەکەیان پیشانی بەهادین دا سەرەتا ویستی خۆی بکوژێت، دواتر ویستی نەشمیل پارچەپارچەبکات، بەڵام پورەکانی فریاکەوتن و نەشمیلیان شاردەوە و لە جلی پیاواندا گۆڕیان و ناردیان بۆ بەغداد و دواتر کەس هیچی دەربارەی نەبیست. بەڵام فریا باکی نەبوو، وەک هەمیشە بێباک لەگەڵ کوڕانی ڕەفیقی سەعاتچیدا دەسوڕایەوە. گەر مەنگوڕ نەبایە بەهادین دەیکوشت، بەڵام مەنگوڕ ڕای وابوو وێنەیەک ئەوە ناهێنێت خوێنی لەسەر بڕژێت و سوێندی شەرەفی بۆ بەهادین خوارد کە خۆی تۆڵەی بۆ دەکاتەوە. لە هاوینی ساڵی شەست و نۆدا شەوێک لە ناکاو ماڵی بابەعەلی گڕی گرت. کەس زیانی گیانی پێنەگەیشت، بەڵام ئاگرەکە بەجۆرێک گەورەبوو دوو ڕۆژ نەکوژایەوە. ماڵی بابەعەلی نەیانتوانی بیسەلمێنن کە مەنگوڕ ئاگرەکەی خستۆتەوە، دەشیانزانی سووتانی ماڵەکەیان شتێکە لە بری کوشتنی کوڕەکەیان، لەبەرئەوە کارەساتەکەیان بە بێدەنگی قەبووڵکرد. دواتر وێنە ڕووتەکەی نەشمیل وەها ڕەواجی

پەیداکرد، هەندێک پارەی خەیاڵیان دەدا بۆ ئەوەی دەستیانبکەوێت. لە کۆتایی حەفتاکاندا وێنەکە هێندەی لەبەرگیرایەوە سیحری بەتاڵ بووەوە و پەواجی نەما. کە ئێستا سەیری کۆپییەکانی ئەو سەردەمە دەکەین بە چەشنێک کاڵن، مرۆڤ بە گران دەموچاوی نەشمیلی تێدا دەناسێتەوە.

لەو کاتەوە دەزانین گەر مەنگوڕ ئیشێکی بە چەقۆ بۆ جێبەجێ نەکرێت، بە ئاگر جێبەجێیدەکات. ئەمجارەش ئیشەکە بە وێنەیەک بوو کەس زیانی پێنەکەوت، ئاگرێکی گەورەبوو، کە هیچ شتێک نەیکوژاندەوە... تەواوی ماڵەکە بوو بە خۆڵەمێشێکی ورد، هەتا شیش و دەرگا و پەنجەرەکانیش. ساقی دوو ڕۆژ لە ژێر ئازاری گورزەکەدا قسەی بۆ نەدەکرا. ئاشکرابوو وەڵامێکی بەوجۆرە توند لەبەرەی ساقییەوە نابیستین، ئاگرێکی گەورەی لەو چەشنە نابینینەوە، وەڵامی ساقی و هاوڕێکانی توند نەبوو، چەند ڕۆژێک دوای ئاگرەکە بەیانییەک لە خەو هەستاین و بینیمان دەستێکی نهێنی بەشەو هەموو چایخانە و دوکان و شوێنە گشتییەکانی پڕکردوە لە سێ نیگاری کاریکاتێر. لە یەکێکیاندا مەنگوڕی بابەگەورە و تاقمێک چەقۆکێشی لۆتی ڕەنگ وەستاون و ئاگر لە کەمانێکی گەورە بەردەدەن. لەوی دیکەیاندا ئاگرێکی گەورە لە قوونی مەنگوڕ هاتۆتە دەرەوە و ماڵێکی گەورەی سووتاندوە، بەڵام لە سێیەمیاندا قەڵەندەر ئاموون دەبینین بە زنجیرێکی گەورە ڕیزێک قەفەز ڕادەکێشێت، لە هەر قەفەزێکیشدا ژنێک لەسەر مێزێک دانیشتووە و پارە دەژمێرێت، لە خواری وێنەکەشدا نوسراوە «ئاموونییەکان بەمجۆرە ژن دەکڕن».

لە ڕۆژی یەکەمەوە سەوسەن ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانی شەڕەکە بوو، ئاریان جەودەت کە ئەوکات نیگارێکی نوێی بۆ سەوسەن لەسەر دیوارەکانی کتێبخانەکە دەکێشا، ڕۆژ دوای ڕۆژ بەدەم جگەرەکێشان و چاخوردنەوە و وێنەکێشانەوە ڕوداوەکانی بۆ دەگێڕایەوە، ئەوەی ئاریانی سەرسامکرد ئەوەبوو سەوسەن بە ساردی و کەمتەرخەمییەوە گوێی لە

هەموو شتێک دەگرت. هەتا کاتێک ساقی مەحموود بە دڵی پڕەوە هات، سەوسەن وادەرنەکەوت کە دیمەنی ئەو پیاوە بەستەزمانە هەژاندبێتی. ساقی مەحموود کە هات شوشەیەکی پڕ لە خۆڵەمێشی ماڵەکەی خۆی هێنا و لە بەردەم فیکرەت گوڵدانچیدا داینا و گووتی «ئەمە ئێشی ئەو نامەردەیە، ئێشی ئەو ناکەسبەچە تەرەسەیە، ئێشی مەنگوڕە... جەنابی گوڵدانچی، لە هەموو خانووەکەم ئەم خۆڵەمێشەم بۆ ماوەتەوە». ساقی بەوردی چیرۆکی سووتانی ماڵەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە. چیرۆکەکە فیکرەت گوڵدانچی زۆر غەمگینکرد، ساقی و خوشکەکەی تەنیا ئەو خانووەیان هەبوو تیادەژیان، ئیتر دەبایە بچنە خانوویەکی کرێ، بەڵام ساقی بەزەحمەت توانای بەسەر کرێدا دەشکا. گووتی «ئیتر لێرە بەدواوە دەبێت زۆر گۆرانی بڵێم... زۆر... بۆ ئەوەی بتوانم بژیم». کە بە چاوە شینە پیر و غەمگینەکانییەوە لە ماڵی گوڵدانچی چووە دەرێ دیمەنێکی وەها دڵتەزێنی هەبوو، پڕوشە دەستیکردە گریان بۆی، بەڵام سەوسەن شتێکی ئەوتۆی پێوە دیار نەبوو. هێند هەیە شوشەی خۆڵەمێشەکەی هەڵگرت و لەسەری نوسی «خۆڵەمێشی ماڵی ساقی مەحموود» و بە بێدەنگ خستییە ناو «دۆڵابی یادگارە تاڵەکان»ـەوە.

فیکرەت گوڵدانچی هەستیکرد ئەمجارەش هیچ چارێکی نییە، جگە لەوەی بکەوێتە نێوان بەرە ناکۆکەکانەوە. گەرچی چارەی فەوزی بەگی نەدەویست، بەڵام کەسێکی لەو عاقڵتریشی لە نێوان شەڕکەرەکاندا نەدەبینی پەنای بۆ بەرێت، خۆی و فەوزی بەگ مانگێک لە هاتوچۆدا بوون تا ناوبژی لە نێوان هەر سێ دەستەکەدا بکەن، دوای ماندووبوونێکی زۆر گەیشتنە ڕێکەوتنێک نزیکی شەش ساڵی خایاند... لەو شەش ساڵەدا شتەکان کەمێک هێوربوونەوە، بەڵام لەو ماوەیەدا گەلێک ڕووداوی گەورە بەسەر وڵاتدا تێپەڕین کە زۆریەی خەڵکی ئەم دەڤەرەی لە ڕەگ و ڕیشەوە گۆڕی.

## ٢٨

ساڵی ١٩٨٨ یەکێک بوو لە ساڵە سەختەکان. لەو ساڵەدا سەدام حوسەین بڕیاریدا تۆڵە لە هەموو ئەو کوردانە بکاتەوە کە لە جەنگی ئێراندا بەشدارییان نەکرد. لە نێوان کۆتایی زستان و سەرەتای پاییزی ئەو ساڵەدا دەوڵەت پتر لە دووسەد هەزار گوندەکی کوشت کە زۆربەیان دانیشتووی گوندەکانی نزیکی شاری ئێمەبوون. ئێمە لە ناو شار زۆر هەستمان بەشتەکان نەکرد، لەو بەحری خوێنەدا ژیانی شارنشینی خۆمان تا ئەندازەیەک ئاسوودە دەبردەسەر. گەر بهاتبایە و لە بەهاری ساڵی هەشتاوهەشتدا ڕێبوارێک ڕێی بکەوتبایەتە شاری ئێمە، ژیانمان بەجۆرێک ئاسایی و ڕۆژەکانمان بە چەشنێک هێمن بوون، هەستی نەدەکرد ڕێگای کەوتۆتە وڵاتێک و لە شارێکدا هەواری لاداوە چواردەوەری وێرانی و خاپوورییە. مەنگوڕ لەوەدا لەسەر هەق بوو کە شارەکە تەواو ئاگای لە چواردەوری خۆی نەمابوو.

ئامونییەکان لەو سەردەمەدا وەک زۆربەی خێڵەکانی تر، دڵسۆزیی و وەفای خۆیان بۆ دەوڵەت تازەکردەوە، شاندێکی گەورە لەوان چوو بۆ بەغداد و لەوێ دوازدە کیلۆ ئاڵتونی ژنە ئامونییەکانیان پێشکەش بە سندوقی هاریکاریی جەنگ کرد. «قەڵەندەر ئاموون» لە ڕیزی شاندەکەدا بوو، گەر چی قەڵەندەر یەکێک بوو لەوانەی بە دڵ خۆی بە سەربازێکی دێرینی بەرزانی دەزانی، ئومێدی ئەوە بوو سەردەمێک بگەڕێتەوە و ڕۆژە

زێرینەکانی خۆی وەک «بەرپرسی تۆپخانەکانی شۆڕش» زیندوویکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە بەغداد گەڕایەوە و لە کۆبونەوەیەکی گەورەی ئامووینییەکاندا بەشداریکرد، ئەوەی نەشاردەوە کە شەقامەکان و کۆشکەکان و ژنەکانی بەغدا سەرنجیان راکێشاوە، بە وشەگەلێک کە پڕبوون لە سەرسامی باسی ئەو کچە فیلیپینیانەی کرد کە بەتەنورەی کورتەوە لە ئوتێلە گران و بەرزەکاندا بیرە و شەراب و خواردنەوەی قورس پێشکەش بە میوانەکان دەکەن، ئەو کات ئەو فیلیپینیانە تاکە جۆری ئافرەت بوون، مرۆڤ لە عێراقدا لە شوێنە گشتییەکاندا بەوجۆرە جلانەوە بیانبینێت. هەڵەی گەورەی قەلەندەر ئاموون ئەوە بوو کە وێنەی سەردانەکەی لای یەکێک لە وێنەگرە دەم هەراشەکان شتەوە، لەوێدا چەندین دیمەنی قەلەندەر هەبوو لەتەک پاسەوانە تایبەتییەکانی وەزیری ناوخۆ، شان بە شان لەگەڵ بەرپرسی فەوجی پاراستنی کۆشکی کۆماری، لەگەڵ بەڕێوەبەری دیوانی کۆشک و سەگەکەیدا. وێنەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان گەیشتنە دەست مستەفا مەزڵری شاعیر و قەپۆز جرقڵی کە چەقۆکێشێکی پلە یەک و هاوڕێیەکی نزیکی مەنگوڕ بوو. لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا وێنەکانی قەلەندەر ئاموون بە هەموو شاردا بڵاوبوونەوە، هەتا دەستێکی نەناسیش هەندێک لەو وێنانەی خستبووە زەرفێکی نامەنوسین و لە بەیانییەکی زوودا خستبوویە ماڵی گوڵدانچییەوە. ئەوکات هەموو وامان هەستکرد هەڵوەشاندنەوەی ئاگربەستەکەی پێشوو گەلێک نزیکە و خەریکە دووبارە شەڕ دەست پێدەکاتەوە، بەڵام وانەبوو، ئامووینییەکان تەواوی توانج و پلارەکانیان بەزەردەخەنەیەکی ناسک و پێکەنینێکی نەرمەوە وەرگرت و وەڵامی کەسیان نەدایەوە. بەڵام دوای ئەوە ناوی قەلەندەر ئاموون زۆر لکەداربوو، ئامووینییەکانیش لە بەرچاوی هەموومان وەک خێڵێک دەرکەوتن کە پاکی سیاسی خۆیان دۆڕاندوە و ڕۆحی کوردانەیان داناوە و بوون بە دەسکەلای دوژمن.

لە هەمان ساڵدا ساقی مەحمودیش وەک گۆرانیبێژێک کەوتە بەر

گوشـاری پیاوانــی ئاسـایش و چەنـد جارێـک بەرپرســی هونەرمەنـدان لــە ڕێکخراوەکانـی حیزبـدا بانگیکـرد، ماوەیـەک هێندەیـان هێنـا و بـرد، هێندەیـان ترسـاند و هەڕەشـە لێکـرد، تـا ڕۆژێـک ناچاریانکـرد لەیەکێـک لـەو ئاهەنگانـەدا بەشداربێت کـە بەرپرسـانی دەوڵـەت بـۆ بۆنـە سیاسییەکان ڕێکیـان دەخسـت. گۆرانییەکانـی سـاقی گۆرانییـە فۆڵکلۆرییـە کۆنـەکان بـوون، شـتێکی تێدانەبـوو ستایشـی سـەرۆک و سـوپا و حیـزب بـکات، بـەڵام تەنیـا بەشـداریکردن لـەو ئاهەنگانــەدا بەسـبوو بـۆ ئــەوەی مـرۆڤ وەک خائیــن ســەیربکرێت. هەمــوو دەمانزانــی سـاقی لــە ژێـر بـاری هەڕەشــەدا چــوو بـۆ ئــەو ئاهەنگــە، بــەڵام هەندێـک هەرگیـز لـە ساقییان نەبووری و سـاقی خۆشـی لـە خـۆی نەبـووری...
دوای ئــەو ئاهەنگــە سـاقی تووشـی شـەرمێکی وەهـا بـوو، ئیتـر نەیتوانـی تـا مــردن گۆرانــی بڵێــت، هەرچییەکــی کــرد و هــەر دەرمانێکــی خـوارد و هــەر چارەیەکـی وەرگـرت سـوودێکیان نەبـوو، ڕاسـتەوخۆ دوای دابەزینـی لـە سـەر سـەحنەی ئاهەنگەکە قوڕگـی بەجۆرێـک نوسـا جارێکـی تـر گـەرووی نەکرایـەوە و دەنگــی نەچــووەوە جێــگای خــۆی، دوای ئــەوەش ماوەیەکـی درێـژ سـاقی خزایـە کونجـی مـاڵ و دەگمـەن دەردەکـەوت، لـە ژیانـی گشـتی پاشەکشـەیکرد و خەریـک بـوو لـە بیـر هەمـووان بچێتـەوە.

مەنگـوڕ لـە هەمـوو شـوێنێکدا بـە دەنگـی بـەرز دوو نەیارەکـەی خـۆی بـە خائیـن ناودەنـا، وەک دوو کـەس کـە کوردفرۆشـن و لەدەوڵەتـەوە نزیکـن، بـەڵام دواتـر ڕاسـتییەکان دەریانخسـت مەنگوڕیـش بەجۆرێـک لـە جۆرەکان لـە هەندێک شـتەوە ئـاڵاوە. ئـەوکات مەنگـوڕ زۆربـەی کاتەکانی لـە سـوڕاندنەوەیەکی بەتاڵدا لـە چایخانــەکان و بـاڕەکان و ژێرزەمینــی ئوتێلەکانـدا دەبردەســەر، کەسـمان نەماندەزانــی بەچــی دەژی، هــەر کــەس ئــەو پرسـیارەی لێبکردایـە دەیگـووت «مـن پیاوێکـی کـەم مەسـرەف و کـەم خـۆرم، بـەو پـارە کەمـە دەژیـم کـە خوشـکەزایەکم لـە ئیتالیـاوە بـۆم دەنێرێـت». بـەڵام کەسـمان باوەڕمـان پـێ نەکرد، چونکە مەنگوڕ مەسرەفی هەبوو، هەردەم خۆشـحاڵ و تێریش دەینواند.

هەندێک کەس دڵنیابوون مەنگوڕ لەو دەمەدا لە قاچاغچێتی مەشروبەوە بۆ ئێران ئاڵاوە، ئەو بازرگانییە پارەیەکی زۆری دەردەکرد و ڕاستەوخۆش لە ژێر چاوەدێری دەزگای هەواڵگری گشتییدا بەڕێوەدەچوو. هەندێک لەوانەی ئەو گومانەیان لای مەنگوڕ دروستکرد، نەڕەتکردنەوەیەکی ڕوون و نە پشت ڕاستکردنەوەیەکی ئاشکرایان لێبیست. لەوەش بترازێت دەنگۆیەکی گەورە هەبوو کە هەندێک لەوانەی لە دەوری مەنگوڕن لە پشت برینی هەندێک دوکان و کۆگای زەڕەنگەر و قاسەی ماڵانەوەن... پۆلیس ماوەیەک قەپۆز جوقڵی و لیچ قۆقز و سامانی کیسرا و هوشەجوویان بەتۆمەتی دزیکردن گرت، کە هەر چواریان لە پیاوە نزیکەکانی مەنگوڕبوون، پێنج ڕۆژ هەر چواریان لە ژێر فەلاقەیەکی قورسدا بوون، بەڵام کەسیان دانیان بە هیچ شتێکدا نەنا و دوای سێ هەفتە زیندان گەڕانەوە بۆ ناومان، بەڵام زۆر کەس باوەڕی تەواویان هەبوو کە مەنگوڕ دەستێکی لەو دزییە گەورانەدا هەیە کە دەکرێن.

هەموو لەو گوڕانە گەورەیەی مەنگوڕ زۆر دەترساین و لە مۆکەشی تێنەدەگەیشتین، ئەوە یەکەمجاربوو ببیستین مەنگوڕ لە کاری دزییەوە تێوەدەگلێت.

تا گەیشتینە کۆتایی ساڵی سێیەم، سێ گەڕیدەکە چەند جارێک لە چەند هەرێمێکی جیاوازی دونیاوە وێنەیان بۆ سەوسەن نارد، گەرچی بارودۆخی سیاسی وڵات زۆر دژوار بوو، گەرچی دەوڵەت هەموو ئەو کوردانەی گرتەوە بەسەربازکە لە کاتی جەنگی ئێراندا لە سوپا هەڵهاتبوون و وەک سزا ناردنی بۆ بیابانە گەرمەکانی باشوور، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەمان دوور و نزیک چارەنوسی ئەو سێ ڕێبوارەمان لە بیرنەچووەوە کە زەویان بە دوای ئومێدێکدا تەیدەکرد. تا ڕۆژەکان سەختتر بوونایە، تا ڕەفتاری دەوڵەت لەگەڵ خەڵکدا بەدتر بووایە، ستایشی سەوسەن فیکرەت و سەیرکردنی وەک ژنێکی لە خۆبوردە و دووربین زۆرتر دەبوو. ئەوانەی لە بەهاری ساڵی

هەشتاو حەوتدا قسەیان بەسەوسەن دەگووت و بە سۆزانییەکی بێڕەحم وەسفیاندەکرد، دوو ساڵ دوای ئەوە کە بەچاوی خۆیان بینیان گەڕیدەکان لە چ دەور و زەمانێکی ناخۆش ڕزگاریان بووە و چ خۆشبەختن کە ئەم سەردەمە تاریکەیان نەبینیوە، هەموو سەرزەنشتی خۆیان و ستایشی سەوسەنیان کرد. لە ماوەی دوو ساڵدا وێنەی سەوسەن لە وێنەی کچێکی بێڕەحمەوە وەرگەڕا و بوو بە وێنەی فریشتەیەک کە تەنیا چاکەی عاشقەکانی خۆی دەوێت. هەر ئەوکات هەندێک ئارەزووی خۆیان بە ئاشکرا ڕاگەیاند کە دەیانەوێت سەردانی سەوسەن بکەن و ڕوو بەڕوو ستایشی دانایی و لە خۆبوردوویی بکەن، بەڵام سەوسەن لە بەر هەر هۆیەک بێت هەموو ئەو داوایانەی ڕەتکردەوە و گووتی « شتێکی نائاسایی لەوەدا نییە، مرۆڤ هەوڵبدات کەسانێک لە دۆزەخ ڕزگاربکات».

لە کاتێکدا زۆربەمان لە سەربازگە و شوێنەکانی مەشقی سوپادا گیرۆدەبووبووین و دەوڵەت بۆ جەنگێکی گەورە ئامادەیدەکردین، سێ داواکارەکە بە سێ ئاڕاستەی جیا بە جیهاندا لە سەفەردا بوون.

کامەرانی سەلما بەرەو هیند و لەوێوە بەرەو باشووری ئاسیا دەڕۆیشت، خالید ئاموون بە ئاڕاستەی خۆرئاوا ڕووەو باکووری ئەفریقا و لەوێوە بە هەموو ڕۆخی دەریادا تا باشووری ئەو کیشوەرە بەرین و سیحراوییە بەڕێوەبوو، مەنسور ئەسرینیش لە تورکیاوە ڕووەو خۆرهەڵاتی ئەورووپا ڕێگای تەیدەکرد. ئەوەی سەرنجی سەوسەنی ڕاکێشا ئەوەبوو هەرسێ داواکارەکەی لە وێنەکاندا سێ ڕیشی درێژیان هەیە، مەنسور ئەسرین و خالید ئاموون لە زۆربەی وێنەکاندا کاسکێتێکیان لەسەردایە تا نیوە ناوچاوانی داپۆشیوون، بەڵام کامەرانی سەلما سەرمای زۆر و گەڕان بە چیا سەختەکانی ئاسیادا پێستی سووتاندووە. کامەران لە هەردوو عاشقەکەی دی وتتر و بێکەستر دەنوێنێت، لە هەندێ وێنەدا جلی پاکستانی و ئەفغانی لەبەردایە، بەڵام خالید ئاموون بە هێلەگی گەڕیدە ئەورووپی و ڕۆژنامەنوسە جیهانگەڕەکانەوە

دەبینرێت، مەنسور ئەسرینیش لە سێ وێنەدا تەپلەیەکی فەرووی لەسەردایە کە سەرۆکە کۆمۆنیستەکان لە سەریاندەکرد. لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا کامەران دوازدە وێنە و مەنسور بیستویەک وێنە و خالید ئامووین پتر لە پەنجا وێنەی ناردبوو. کەمێک لە وێنەکان لە ڕێگای پۆستی دەوڵەتییەوە نێردرابوون، ئەوانی دی پێکڕا بە ئەدرێسی جیاجیای ئێران و بە کۆمەکی قاچاغچییەکان گەیشتنە دەستمان. دەبێت بڵێم گەرچی ئێمە شارێک بووین لە عێراقدا، بەڵام ئێران تاکە وڵاتێکی دونیایە کە هەمیشە و بەدرێژایی مێژوو پەیوەندیمان پێوەی هەبووە. هەندێک لە وێنەکان بۆ ماوەی درێژ لە پۆستی ئێراندا مابوونەوە، دواتریش چەندەها دەستیان کردبوو، چەندەها قاچاغچی بە چەندەها شاردا هێنابوویان، کاتێکیش گەیشتنە دەستی ئێمە، زۆربەیان چرچ و کۆن و شکاوەبوون. وێنەکان لە ناو شاریشدا دەیەها دەستیان دەکرد و بەسەر چەندین خێزاندا دەگەڕان، ئینجا دەگەیشتنە دەست ماڵی گوڵدانچی. بەڵام ئیدی لە دوا وێستگەدا بە بایەخێکی بێوێنەوە هەڵدەگیران.

زۆربەی شەوان کاتێک هەمووان دەخەوتن، سەوسەن ئەلبومەکەی دەردەهێنا و بە نهێنی سەیری کوڕەکانی دەکرد. سەیرکردنی شەوانەی ئەلبومی سێ داخوازەکەی شیرینترین نهێنی ژیانی بوو، وەک چۆن لە منداڵیدا چاوی لێکدەنا و دەچووە ناو وێنەکانەوە، ئێستاش دەستی دەخستە سەر وێنەکە و چاوی لێکدەنا و دەچووە ناو ئەو دونیا دوورانەوە، دڵنیابوو ئەوانیش لەو ساتانەدا هەست بە نزیکی ئەو دەکەن، هەست بەوە دەکەن کە سەوسەن شەوان دەیانبینێت. مەنسور ئەسرین پێدەچوو لە دووانەکەی دی زیاتر لەزەت لە بینینی جیهان ببینێت، لە هەمووان سادەتر دەینواند، ئەو ڕیشە تەنکەشی ڕوخساری گەڕیدەیەکی بەختەوەری پێبەخشیبوو. بەڵام کامەرانی سەلما لە کەسێک دەچوو نەزانێت چی دەکات، سەوسەن لە هەموو وێنەکانی ئەودا ئەوەی دەخوێندەوە کە ئەم کوڕە زۆر خەیاڵی لای

گەڕانەوەیە، گومانی ئەوەی لێدەکرێت، بەر لە کۆتایی سەفەرەکەی بپچڕێت و بگەڕێتەوە. لە هەمووان سووریتر و ساردتر و بەئیرادەتر خالید ئاموون دیاربوو کە وێنەکانی لە بیابان و جەنگەڵەکانی ئەفریقادا وردەکار و قەشەنگ بوون. خالید وەک هەمیشە لە وێنەکاندا پێنەدەکەنی، سەوسەن ئەوەی بە دڵ بوو کە وێنەکانی خالید خەنداوی نین، ڕقی لەو خەندە ساختەیە بوو کە هەمووان لەبەردەم کامێراکاندا دەیخەنە سەر لێویان، ژیانی دووروودرێژی لەگەڵ فەرهەنگ و ئەنسکلۆپیدیاکاندا ئەو چاوەڕوانییەی تیا خولقاندبوو وێنەکان ڕاستی بۆ بگوازنەوە، بەڵام خەندەی بەر کامێراکان هەمیشە بۆ شاردنەوەی دەموچاوی ڕاستەقینە و ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤەکانە، ئەوەش سەوسەنی توڕەدەکرد. خالید لە وێنەکاندا وشک و بێڕەحم دەردەکەوت، نیگایەکی زۆر تیژی هەبوو کە تەولو پێچەوانەی نیگا نەرمەکانی مەنسور و سەیرکردنە بۆهیمییەکانی کامەرانەوە بوو. ئەوەی لە باکووری ئەفریقاوە دەستی بەسەفەرە ڕاستەقینەکەی کردوە مایەی ستایشی سەوسەن بوو. بە پاپۆڕ لە بەیروتەوە بەرەو تەنجە ڕۆیشتبوو. دیارە ئەفریقا کیشوەری باڵندە کێوییەکانە؛ سەوسەن دەیزانی هەڵبژاردنی ئەفریقا خێرایییەک و پێش دەستییەک بە خالید دەبەخشێت کە ئەوانی دی دواتر ئاسان نایگەنێ، مرۆڤ لە ئەفریقا دەتوانێت ئاسانتر باڵندەکان ڕاوبکات، ڕاوکەری هەرزانتر و جەنگەڵناسی لێزانی ئاسانتر دەستدەکەوێت، بە ئاسانی دەتوانێت فیزەی ساختە بکرێت و لەنێوان وڵاتەکاندا هاتوچۆبکات، لە شوێنەکانی تری دونیاش باشتر دەتوانێت جێگایەک بۆ هەڵگرتن و پاراستنی باڵندەکان بەکرێ بگرێت.

وێنەکان بۆ سەوسەن گەلێک بەنرخ بوون، بە شەوقێکی زۆرەوە چاوەڕوانیدەکردن، بە ڕۆژ هەرچییەکی بکردبایە خەیاڵی لای زەنگی دەرگاکە بوو، گەرچی نەیدەهێشت هیچ شتێکی پێوەدیاربێت، بەڵام هاتنی نوێنەرەکان و سەردانە لە ناکاو و بێوادەکانیان دڵی خۆشدەکرد.

قەلەندەر ئاموون پتر لە نوێنەرەکانی دی ڕێگای دەکەوتە ماڵی گوڵدانچی، لەیەکەم سەرنجدا پیاوێکی بێدەنگ و کەمدوو و شەرمن دەردەکەوت، کەمجار قسەی بکردبایە، بە شەرمێکەوە وێنەکانی لەسەر مێزی ژووری میوانەکە دادەنا و چایەکی لەگەڵ گوڵدانچیدا دەخواردەوە و کەمێک لەسەر سیاسەت و ئاوهەوا و گرانی قسەیاندەکرد و دواتر بە هێمنی و بێدەنگی وەک چۆن هاتووە دەڕۆیشت. سەوسەن هەمیشە دەیپرسی: بۆ کەسێکی واشەرمن ناوبانگێکی وەها خراپی هەیە؟. ئەو شتێکی خراپی لەقەلەندەردا نەدەبینی. جارێکیان قەلەندەر لەگەڵ گوڵدانچی باوکیدا لەقسەوە ئالا و زۆر کرایەوە، باسی ئەو ڕۆژانەی بۆکردن کە وەک بەرپرسی تۆپخانەکانی شۆڕش کاریدەکرد، باسی کەمی خۆراک و خراپی گوللە تۆپەکان و بۆردومانی بەردەوامی فڕۆکەکانی دوژمنی بۆ کردن. سەوسەن ئەوجارەی بە هەل زانی و لێیپرسی، ئاخۆ لە جەنگەکاندا مەیتی کوژراوانی زۆر بینیوە. قەلەندەر ئاموون گووتی «خانم زۆر زۆر... زۆر زۆر». سەوسەن پرسی: دەمەوێت یەک شت بزانم، یەک شت، جیاوازی نێوان بۆنی مردووەکان لەگەڵ ئێمەدا کە هێشتا دەژین، چییە؟. پرسیارەکەی بۆ قەلەندەر ئاموون سەیربوو. بێ بیرکردنەوە سەیرێکی چاوی کرد، نیگاکانی وەک نیگاکانی خالید ئاموون سارد و تیژ بوون و گووتی« خانم، ئەوە شتێکە مرۆڤ دەبێت خۆی ئاقیبکاتەوە... هەموو کەسێک دەبێت خۆی بەتەنها ئاقیبکاتەوە».

بەڵام سەوسەن چۆن دەیتوانی ئەزمونی وەها بژی... چۆن دەیتوانی بۆنی مردووەکان ئاقیبکاتەوە؟.

لە ساڵی ١٩٨٨ دا جەنگی عێراق و ئێران تەواوبوو، چیتر تەلەفزیۆن وێنەی مردووەکانی نیشان نەدەدا. نەمانی وێنەی سەربازە مردووەکان لە ژیانی سەوسەندا گۆڕانێکی گەورەبوو، هەشت ساڵ بوو هەموو شەوێک بێوچان سەیری وێنەی سەربازە سووتاو و پارچەپارچەکانی کردبوو... ونبوونی لە ناکاوی ئەو وێنانە لای سەوسەن گۆڕانێک بوو نەیدەتوانی

ئاسان لە گەڵیدا بژی، ئەو مردووانە بەشێکی گرنگی دونیای ئەو بوون، پێیوابوو نەبینینی ئەو مردووانە وەک ونبوونی دەموچاوی ڕاستەقینەی ژیانی ئەم وڵاتە وایە. بەڵام شتێک لە دڵیدا پێیدەگووت «دڵنیابە مردووەکان دەگەڕێنەوە... دڵنیابە».

سەردانەکانی مەنگوڕی بابەگەورە لە هەمووان زیاتر دڵی سەوسەنی خۆشدەکرد، مەنگوڕ بە شێوازی قسەکردن و دەست جوڵاندنی سەوسەنی دەهێنایە پێکەنین. هەمیشە وادەردەکەوت وەک ئەوەی مەنگوڕ زیاتر لەوانی دی هەواڵی نوێنەرەکەی خۆی بزانێت، ئاگادارییەکی وردی لەو ڕێگا و پلانانە هەبوو کە کامەران هەیەتی، کامەران بە ڕێگایەکی درێژ لە ئێرانەوە بۆ پاکستان و لەوێوە بە دەریادا ڕووەو هیند پەڕیبووەوە. لە شارێکی هیندوستاندا کە ناوی ئاورنگئاباد بوو شوێنێکی گرتبوو، کردبووی بە قەفەزگایەکی گەورە و چەند کەسێکی شارەزاشی بۆ سەرپەرشتی باڵندەکان دانابوو. بەقسەی مەنگوڕ گەشتەکەی کامەران بە هیندوستاندا گەلێک سەرکەوتووبووە، لە هەموو هەرێم و جەنگەڵ و ڕۆخی دەریایەک باڵندەی گرتبوو، لە هەر جێگایەک بایە باڵندە گیراوەکانی لەقەفەزی تایبەتیدا و بە پۆستی تایبەتی دەنارد بۆ بنکەی سەرەکی کۆکردنەوەی باڵندەکان لە «ئاورنگئاباد»، بە قسەی ئەو کامەران لەو ماوەیەدا فێری زمانی تووتییە بەنگالییەکان بووە، لە هەندێک دارستانی چڕدا بە فیکەو ئاماژەی تایبەتی توانیویەتی خۆی لە هەموو مەلە ڕام نەکراو و کێوییەکان نزیکبکاتەوە. ئەوەی کامەران دەیتوانی گەشتەکەی بە خێراییەکی گونجاو ببڕێت، مایەی ستایشی فیکرەت گوڵدانچیش بوو، کە لەسەر نەخشەکەی گیرفانی مەنگوڕ هێڵی سەفەرەکەی کامەرانی بە ڕۆشنی دەبینی. «کوڕەکە گەڕاڵێکی عەیارە بیست و چوارە، قوونی خۆی باش دەجوڵێنێت»، مەنگوڕ بە شانازییەوە وایدەگووت.

لەگەڵ ئەو خۆشییە کورت و کەمانەدا کە هاتنی وێنەکان لە دڵی

سەوسەندا دروستیاندەکرد، بەردەوام تەندروستی بەرەو خراپی دەڕۆیشت. ئێستا دوو مانگ جارێک دەبایە ئاریان جەودەت وێنەی سەر دیوارەکەی بۆ بگۆڕێت. سەوسەن هەمیشە دەگەڕا و لە گۆڤارە کۆنەکان و لە کتێبە سروشتی و مێژووییەکاندا سیحراویترین وێنەی هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی ئاریان بۆی نیگاربکات... وەک ڕۆژانی منداڵی بەرامبەر ڕێنەکان دەوەستا و دەیتوانی بچێتە ناویان، هیچ کەس بەوەی نەدەزانی کە ئەو هێند سانا دەچێتە ناو وێنەکان، بەڵام خۆی وەک هەمیشە مەراقی گەورەی ئەوەبوو لە دونیای وێنەکاندا بۆنی هیچی نەدەکرد و گوێی لە هیچ دەنگێک نەبوو.

سەرئێشەی بەردەوام و لەهۆش خۆچوون، لاوازی و کەمخوێنی، دابەزینی کتوپڕی فشاری خوێن و نەمانی ئارەزوو بۆ خواردن... بەشێکی گەورەی ژیانی سەوسەن بوون. دکتۆرەکان بەوردی هۆکاری ئەو دیاردە دووبارە و بێچارانەیان نەدەزانی، بەڵام سەردەمێک دۆخی بەچەشنێک ناجۆربوو دەبایە هەفتانە سەردانی دکتۆر «ڕەفعەت ڕەمزی» بکات و لە ژێر چاودێری بەردەوامدا بێت. زۆربەی کات پرۆشە لەگەڵیدا دەچوو بۆ پشکنین، ڕۆژێک هەستمانکرد دکتۆر دوای پشکنینە ڕۆتینییەکانی سەوسەن، ماوەیەکی درێژ لەگەڵ پرۆشەدا دەباتەسەر، بەڵام دانیشتنەکانی دکتۆر و پرۆشە، جار دوای جار درێژتر و درێژتر دەبوونەوە. سەوسەن گەلێک بێباک و کەمتەرخەم بەرامبەر هەموو شتەکان دەردەکەوت، پێدەچوو لەزەت لەو ماوەیە ببینێت کە لە ساڵۆنی چاوەڕوانییەکەدا دادەنیشێت و سەیری وێنەی سەر دیوارەکان و جلی فەڕاشەکە و ڕوخساری ئەو نەخۆشانە دەکات کە درێژی خەڵوەتەکانی دکتۆر لەگەڵ بێوەژنێکی وەک پرۆشەدا توڕەیدەکردن.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ دا لە زەماوەندێکی خێرا و گەورەدا پرۆشە شووی بە دکتۆر ڕەفعەت ڕەمزی کرد. ئەوە دووهەمین زەماوەندی گەورەی ژیانی پرۆشە بوو، کە ئەوکات دەیویست بە هەر نرخێک بووە لە بێدەنگی ماڵی گوڵدانچی ڕابکات.

## ٢٩

شووکردنی پڕوشە هەندێک شتی لە ژیانی سەوسەن و فیکرەت گوڵدانچیدا گۆڕی، ئیدی دەبایە خۆیان غەمی هەموو شتێک بخۆن، بەڵام سەوسەن ئەوکات لە کاروباری ماڵدا دەستەوەستانێکی تەواو و کەم سەلیقەیەکی بێوێنەبوو، بە ئەستەم دەیتوانی بەرچاییەکی بچوک ئامادەبکات. خەندە گوڵدانچی دەبایە هەفتانە بهاتبایە، یان کیژێکی بناردبایە تا ماڵی فیکرەتی برای لە هەرەس و ناڕێکییەکی گەورە بپارێزێت. لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگی کوێتدا، فیکرەت گوڵدانچی تووشی یەکەم گرفتی دارایی گەورەی ژیانی بوو، ئەودەم نرخی پارە هەرەسیهێنا و چیتر موچەی خانەنشینی بەشی ئەوەی نەدەکرد وەک جاران دەستبڵاو بژی. لە کۆتایی ساڵی ئەوەدا بۆ یەکەمجار، فیکرەت گوڵدانچیمان بینی مامەڵەی فرۆشتنی هەندێک کتێبی لەگەڵ یەکێک لە کتێبفرۆشەکانی سەرجادەدا دەکرد. ئەوە یەکەمجاربوو فیکرەت دەستبەرێت و لەکتێبخانەکەی خۆی شتێک بفرۆشێت. هەڵبەت فرۆشتنی کتێبەکان سەرسامی نەکردین، لەو وەرزەدا خەڵکانێکی زۆر کە ساڵەهای ساڵ موچەکەیان ژیانێکی بەحورمەتی بۆ دابینکردبوون، تووشی دەستکورتی و نەبوونی هاتبوون و بینینی ئەو جۆرە دیمەنانە ئاسایی بوو. ئەوەی سەرسامیکردین ئەوەبوو فیکرەت بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە کتێبەکانی فرۆشت، وەک یەکێک ڕقێکی قووڵ و ناوەکی و گەورەی بەرامبەر کتێب لە ناودا دروست بووبێت. هەموو

هەستمانکرد فیکرەت نەخۆشی کچەکەی دەگێڕێتەوە بۆ ونبوونی لە ناو کتێب و فەرهەنگ و ئەتڵەسەکاندا، بەلامانەوە سەیربوو کە بیستمان پاڕانەوەکانی سەوسەن سوودێکی ئەوتۆی نەبووە و نەیتوانی باوکی لەوە پەشیمانبکاتەوە دەست بۆ کتێبەکان بەرێت. دیارە دەستکورتی و نەبوونی پارە بەهانەی گەورەی گوڵدانچی بوون، ڕاستەوخۆ شتێکی بە کچەکە نەگووت ئەو هەستەی تیا ببزوێنێت، دەریبخات باوکی ساڵ دوای ساڵ و ڕوداو دوای ڕوداو ڕقێکی قووڵی بەرامبەر کتێب تێدا سەوزبووە. ئەو ڕۆژە کە گوڵدانچی کتێبەکانی فرۆشت، شەوەکەی سەوسەن تا بەیانی بە نهێنی لە جێگا خەوەکەیدا گریا، یەکەمجاربوو لە ژیانیدا بەو چەشنە بگری و سۆزی وەها توند و ڕاچەنینی ویژدانی وەها گەورە بژی. بەڵام وەک هەست بە دۆخی سەختی باوکی بکات، بۆ ئەوەی ئازارەکانی گوڵدانچی گەورەتر نەکات، نەیهێشت فیکرەت بەو گریانە قووڵەی بزانێت. بەیانی ڕۆژی دوایی هەستا و بۆ یەکەمجار بەرلەوەی گوڵدانچی لە خەو هەستێت سفرەی بەیانی ڕازاندەوە، بەڵام بە ئەندازەیەک ڕەنگ پەڕیوو و لاوازبوو، باوکی چەند جارێک لەسەر نانخواردن هەستا بۆ ئەوەی گەرمی بگرێت و فشاری خوێنی بپێوێت. سەوسەن لەوجۆرە مەخلوقانە بوو کە کاریگەرییە ڕۆحییەکان زۆر خێرا لە لەشی و لە تەندروستیدا دەردەکەوتن. لەو دەمەدا زۆر کەم سەوسەنمان لە بازاڕ و شەقامەکاندا دەبینی، دوای شووکردنی پرۆشە، گەشتی دەستەکچانی گوڵدانچی کە جاران ناو بە ناو سورێکی هاویەشیان بە بازاڕدا دەکرد، بەرەو کزی ڕۆیشت. ئەودەمە بەهۆی گەمارۆی سەر وڵاتەوە بازاڕ جوڵەیەکی ئەوتۆی تێدانەمابوو، زۆربەی کۆگاکانی شار داخرابوون، خاوەنەکانیان زۆربەیان لە کوێت و سنوورەکانی دەوروبەریدا سەربازبوون. تاکە خۆشییەکی ماڵی فیکرەت گوڵدانچی سەردانی بەردەوامی بووک و زاوا نوێکە بوو. پرۆشە و دکتۆر ڕەفعەت هەموو ئێوارەیەکی پێنجشەممە دەچوون بۆ ماڵی

گوڵدانچی و شەوی هەینی دەگەڕانەوە، دکتۆر پیاوێکی ڕووخۆشبوو کە بەبایەخێکی بێوێنەوە سەیری ژیانی نەخۆشەکانی خۆی دەکرد، پڕبوو لە چیرۆکی سالآنی موقیمی و ئیشکردنی دوور و درێژ لە گوندە دوورەکان و خەستەخانە بچوکەکانی شاردا، لەگەڵ پرۆشەدا ژن و مێردێکی گەلێک بەختەوەر دیاربوون، فیکرەت گەلێک بە ژیانی تازە و ئاسوودەی کچەکەی بەختەوەربوو. گەر پێویستی بکردبایە دکتۆر ڕەفعەت هەفتەی دووجار دەهات بۆ پشکنینی سەوسەن، بەڵام دکتۆر دڵنیابوو کچەکە نەخۆشی سەختی نییە و تاکە شتێک بە ڕاستی پێویستی پێیەتی گۆڕینی شوێن و شێوەی ژیانێتی. سەوسەن لە ناخی دڵەوە پێکەنینی بە دکتۆر ڕەفعەت دەهات، هەستیدەکرد کێشەیەکی لەگەڵ ژیانی تایبەتی خۆیدا نییە، ژیانی خۆی ناجۆر و خراپ نەبوو، بەڵام ئاسۆکان و ئارەزووەکانی لەوە گەورەتربوون بتوانێت خۆی تێریانبکات. سەوسەن پێویستی بە زیاد لە ژیانێک و زیاد لە جیهانێک هەبوو، ئەوە کێشەی هەرە گەورەی بوو.

لەو ماوەیەدا نوێنەرەکانیش بەدەگمەن دەچوون بۆ ماڵی گوڵدانچی، بەڵام ئێمە هەمیشە شەیدای هەواڵی تازە بووین، هەتا لە ڕۆژە زۆر ناخۆشەکانیشدا وازمان لە سۆراغی دەنگوباسی سەوسەن نەهێنا، چونکە لەو وەرزەشدا شتێکی ئەوتۆ گرنگ و نوێمان نەبوو باسیبکەین، گەر هەندێ جار سەوسەنمان بە ڕێکەوت لەدەرەوە بدیبایە، بۆ ئێمە دەبووە بابەتی قسەکردنێکی زۆر. تاکە شتێک لەو ماوەیەدا سەرنجی ڕاکێشاین دەرکەوتنە تەنها و بێوادەکانی بوو لە بازاڕدا، پێشتر زۆر کەم بە تەنها دەمانبینی، بەڵام لە مانگ و هەفتە غەمگینەکانی پێش جەنگی گەورەدا پیاسە تەنهاکانی ڕوو لە زیادبوون بوون. کاتەکانی هاتنەدەرەوەی گەلێک ناڕێک و بێبەرنامەبوون، هەر جارەی لەسەعاتێکدا دەردەکەوت کە بە کاتی دەرچوونی پێشووی نەدەچوو، زۆر بەوردی و لاوازی هەنگاوی هەڵدەهێنا، زۆربەی کات تەنوورەیەکی سپی و پاڵتۆیەکی ڕەشی درێژی لەبەردابوو کە

بە قایشێکی پان لە کەمەرەوە توند دەیبەست، گەر باران بایە چەترێکی نیلۆفەری کۆنی هەڵدەدا، گەر خۆش بایە دەستی دەخستە گیرفانی پاڵتۆکەیەوە و بەهێمنی بێئەوەی سەیری کەسمان بکات دەڕۆیشت. بە گشتی لە هیچ شوێنێکدا نەدەوەستا، هەندێ ڕۆژ گەر بهاتبایە و فیکرەت گوڵدانچی خۆی ڕۆژنامەکانی ئەو هەفتەیەی وەرنەگرتبایە، سەوسەن لە کتێبفرۆشی «شار» لایدەدا و ڕۆژنامەکانی باوکی وەردەگرت، لای ئەو کتێبفرۆشانەش کە لەسەر جادە کتێب دەفرۆشن کەمێک دەوەستا و سەیرێکی خێرای ناونیشانەکانی دەکرد، بێئەوەی دەست لە هیچ کتێبێک بدات، دواتر بە هەمان ڕێگا و بە هەمان ڕیتمی خاو و لاواز دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ. بەدەگمەن شتێکی دەکڕی و بە ڕێکەوت دەستی دەبرد بۆ شتێک، بەڵام سەرنجماندا بەر لەوەی هەر شتێک بکڕێت، سەرەتا دەیخاتە بەر هەناسەی خۆی و بۆنیدەکات.

لەسەرەتای ساڵی نەوەدویەکدا کۆمەڵێک وێنەی مەنسور ئەسرین بەجۆرێکی چاوەڕوان نەکراو گەیشتنە شار، وێنەکان لە سنووری تورکیاوە، لە ڕێگای یەکێک لە گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستانەوە درابووە دەست شۆفێرێکی خەڵکی خۆشناوەتی و لەویشەوە گەیشتە دەست ساقی مەحمود کە ئەودەم سەختترین ڕۆژەکانی ژیانی خۆی دەژیا. ساقی دوای ونبوونێکی دوور و درێژ ڕۆژێک وێنەکانی برد بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی. سەوسەن سەرنجیدا ساقی لەو چەند مانگەی دواییدا لە جاران گەلێک پیرتر و ماندووتر دەنوێنێت.

ساقی کە لەگەڵ هەردوو گوڵدانچییەکەدا دانیشت، هەستیکرد ئەرکی سەرشانێتی شتێک لەو هەواڵانەی دەربارەی گەشتەکەی مەنسور دەیزانێت بۆ «کیژە بەستەزمانەکە»ی بگێڕێتەوە. دوای ئەوەی جگەرەیەکی داگیرساند و مژێکی قووڵی لێکێشا گوتی «ئەم ماوەیە ژیان بەجۆرێک گۆڕاوە، مرۆڤ خۆی ناناسێتەوە، بمبورە کە بەمشێوەیە درەنگ درەنگ

دەردەکەوم. حەزدەکەم گەر پێویست نەکات و شتێکی گرنگ نەبێت، ئارامی ئێوە و ژیانی ئاسوودەتان نەشێوێنم. ئێوەش دەزانن کە لە بەهاری ڕابوردووەوە مەنسور دەنگی نییە، بەر لەم وێنانە، دوا نامەی ئەو بەدەستم گەیشتبێت دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ئایاری ڕابوردوو. گەر ئەم وێنە و نامانە نەبوونایە وەخت بوو دڵم لەو بێدەنگییە دەکەوتە مەراقەوە، بەڵام با ئێستا دڵنیابین، پێدەچێت لەو کاتەوە تا ئێستا سەفەرەکەی گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتبێت، ڕاستی بڵێم، من لەسەرەتاوە لەگەڵ ئەوەدا نەبووم ئەو لە ئەورووپاوە دەست بە گەشتەکەی بکات، دیارە ڕوخانی کۆمۆنیستەکان، سەفەرەکەی مەنسوری شتێک ئاسانتر و خێراتر کرد. خۆت دەزانیت لەسەردەمی پاشاگەردانی و نارێکیدا، ڕێبوارەکان ئاسانتر دەتوانن سنوور ببڕن و ئەمدیوە و دیو بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە گشتی وڵاتە ئەورووپاییەکان لە مەسەلەی ڕاوشکار و گرتنی باڵندەدا یاسای سەختیان هەیە... دیارە من شتەکەم بیستووە، چەندە ڕاستە نازانم... ئا بەڵی، بەڵام وادەزانم وەهایە و یاسای سەختیان هەیە... بۆیە من لەسەرەتاوە دژی ئەوەبووم لە ئەورووپاوە دەست پێبکات. دوای ساڵی یەکەم مەنسور بەرەو سەرەوە ڕۆیشت، بەرەو وڵاتە زۆر ساردەکانی باکوور، هەستدەکەم مەنسور پێویستی بەوە هەبووە لە ناو ئەو سەرما و بەستەڵەک و گۆشەگیرییە قووڵەدا تەواو بیر لە هەموو شتێک بکاتەوە. گەر وانەبێت، من تەفسیرێکی تەواوم لا نییە، بۆ ماوەیەکی هێند درێژ لەو هەرێمە ساردانە مایەوە. بەپێی دوا هەواڵ مەنسور لە نەرویژەوە بە کەشتییەک ڕووەو ئەمریکا ڕۆیشتووە، ڕاستەوخۆ بەرەو یەکێک لە بەندەرەکانی مەکسیک. ئەوەم پێچاکە... ئەوەم زۆر پێچاکە کە کاتێکی زۆری لە باکووری ئەمریکا نەکوشتووە، هەرچەند زانیارییەکی ئەوتۆم نییە، بەڵام وادەزانم مرۆڤ تا زیاتر بەرەو باشوور بڕوات، شانسی زۆرترە، وەک بیستوومە حەوزی ئەمەزۆن و ئەو

هەرێمانەی دەوروبەری بەهەشتی ڕاستەقینەی باڵندەن، لەوێ دەتوانێت ئەو کاتانە بگێڕێتەوە کە لەدەستی داوە. ئەوەی مایەی خۆشحاڵییە بۆ من ئەوەیە کە زانیم کاتێک لە ئەمریکا دابەزیوە، قەفەزی چەندەها باڵندەی پێبووە، لە هەموو شوێنێک خۆی بە پسپۆڕێکی بایۆلۆژی لە جیهانی باڵندەدا ناساندوە، کەسێک کە لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەفتاری هەندێک باڵندەی کۆچەر دەکات، وادەزانم لە زانکۆیەکی نەرویژەوە جۆرە ڕەزامەندییەکی وەهای بەدەست خستووە، ئەوە ئیشەکانی خێراتر و باشتر دەکەن. هیوادارم لە کاتی خۆیدا بکاتەوە ئێرە و هەموو باڵندەکانی پێبێت... هیوادارم».

لە دەنگی ساقیدا شتێک لە گومانی قووڵ هەبوو. گومانێک پەیوەندی بە مەنسورەوە نەبوو، هێندەی گرێدراوی ئەو ڕۆژگاری گومانە بوو کە هەموو تێیدا دەژیاین. بەڵام لەگەڵ هەموو شتێکیشدا وێنەکانی مەنسور لە بەفر و سەرمای باکووردا، لە بەندەرە گەورەکاندا، لە بەردەم دارستانەکانی سنەوبەر و ڕووبەرە بێکۆتاکانی بەفردا، دڵی سەوسەنی خۆشکرد.

لەو سەردەمەدا لە ناکاو دیاردەیەکی سەیر لە ناو ئێمەدا سەریهەڵدا. لەو دەمەدا ئەو خەونانەی سەوسەن هەموو شەوێک بە سێ گەڕیدە گەنجەکەوە دەیبینی، بوون بە خەونی هەموومان، زۆربەی خەڵکی شارەکە ماوەیەک هەمان خەونمان دەبینی، زۆربەمان سەرمان دەخستە سەر سەرین و چاومان لێکدەنا و ئەو سێ ڕێبوارەمان دەبینی بە شوێنی جیاواز جیاوازی ئەم جیهانە گەورەیەدا دەڕۆن. سەیربوو، هەتا کوڕەکانی ئەم شارەش لە سەنگەرە دوورەکانی بیاباندا، لەو جێگایانەدا کە سوپای عێراق بێهودە خۆی کۆدەکردەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ سی سوپای گەورەی دونیادا شەربکات، کاتێک شەوان لە ژێر ئاسمانی باشووردا دەخەوتن، هەر خەونیان بەو سێ گەڕیدەیەوە دەبینی کە ئازادانە بە کۆمەڵێک

باڵنـدەوە زەوی دەگـەڕان. لـە سـاڵی نـەوەددا دەوڵـەت جیهانـی دەرەوەی وڵاتـی وەک شـوێنێکی ترسـناک و تاریـک نیگاردەکـرد کـە پـڕە لـە دوژمـن، بـەڵام وێنـەی دونیـا لـەو خەونانـەدا شتێکی دی بـوو، جیـاواز لـەو وێنەیـەی دیکتاتـۆر دەیویسـت بـاوەڕی پێبهێنیـن، هەمـوو هەسـتمانکرد ئـەو سـێ گەنجـە جیهانمـان بـۆ دەدۆزنـەوە، جیهانێکـی تـر، جیهانێکـی بێسـنوور و قەشـەنگ کـە ئێمـە تەنیـا لـە خـەودا دەتوانیـن بیبینیـن.

دووبارەبوونـەوەی بەردەوامـی ئـەو خەونـە لە شـەوەکانی ئێمەدا سـەیربوو، هەندێـک کـەس چەنـد سـاڵێکی تـەواو ئـەو خەونەیـان دەبینـی، بـەڵام لای کەسـانێکی تـر خەونێکـی کاتـی بـوو کـە ماوەیـەک دەردەکـەوت و ونـدەبوو. سـەرەتا کـەس نەیدەوێـرا ئاشـکرا دانـی پێدابنێـت، مسـتەفا هـەژاری شـاعیر یەکەمیـن کـەس بـوو لـە ڕۆژنامـەدا ڕایگەیانـد خەونـی بـە سـێ گەڕیـدەوە بینیـوە کـە دەگەڕێـن و جیهانمـان بـۆ دەدۆزنـەوە، دوای ئـەو گەلێـک لـە شـاعیران و هونەرمەندانـی دیکـە هەمـان ڕاسـتییان دووبارەکـردەوە. هێـدی هێـدی شـەپۆلی دانپیانـان بـە جۆرێـک گەورەبـوو، هەتـا ئەوانـەش کـە خەونەکەیـان نەدەبینـی لەسـەر ڕۆشـنایی وەسـفی ئەوانـی دیکـەدا ڕایانگەیانـد کـە هەمـان خەونیـان بینیـوە. دەبێـت بڵێـم ئـەو خەونـەو لـەو وەرزەدا مایـەی خۆشـبەختی و هێمنییەکـی گـەورەی ئێمـە بـوو. سـاڵانێک دواتـر کـە دەیـان هـەزار کـورد کۆچیانکـرد و بـە دونیـادا بڵاوبوونـەوە، کـە دەگەیشـتنە هەندێـک وڵاتـی دوور، پێیـان دەخسـتە سـەر هەندێـک خاکـی نامـۆ و دەچوونـە سـەر هەندێـک سـەر زەمینـی نەناسـراو، هەندێکیـان ڕادەچڵەکیـن کە هەسـتیاندەکرد پێشـتر بـە جۆرێـک لـە جۆرەکان ئـەو شـوێنانەیان بینیـوە و لـە خەونـدا بـەو سـەرزەمینانەدا تێپەڕیـوون.

٣٠

بۆ ئەوەی زۆر لە قسەکانی پێشوو دوورنەکەوینەوە، دەمەوێت بڵێم لە وڵاتی ئێمەدا هەموو ڕۆژگارەکانی ترس، ڕۆژی گەورەی خەون و هەموو ڕۆژگارەکانی خەون، سەردەمی گەورەی ترسن. لە ساڵی ١٩٩١ دا کە جەنگی عێراق لەگەڵ سەرجەمی جیهاندا دەستی پێکرد، هەموو ترس و خەونمان بە چەشنێکی وەها بەرین تێکەڵاوکرد، دواتر بۆمان جیانەکرایەوە. بەڵام سەوسەن ئەو ڕۆژانە وەکو ئێمە نەژیا، ژیانی بەردەوامی لە منداڵییەوە لەگەڵ وێنەکانی جەنگدا، مایەی ئەوە بوو وەک ئێمە نەترسێت، کەمتەرخەمیشی بەرامبەر بە سیاسەت وایدەکرد نائومێدی بەو مانایەی ئێمە تێیدەگەین لای ئەو نامۆ بێت. سەوسەن لە ناخیدا چەند دەیویست مرۆڤەکان لە جەنگ دووربن، بە هەمان ئەندازە شتێک لە جەنگدا سەرسامیدەکرد، سیحرێک بەدروستی نەیدەزانی چییە و نەیدەتوانی دیاریبکات. دڵنیابوو لەگەڵ پیاوانی جەنگاوەردا ناتوانێت بژی، بەڵام جەنگ خۆی... جەنگ بە هەموو ئەو هەستە سەیرانەوە کە دەیوروژێنێت، بەو دەموچاوانەوە لەسەر وێنەکان جێیدەهێڵێت، بەو هەستە ناڵۆزانەی لە جەنگاوەراندا دروستیدەکات، بەو دوکەڵە سپییەی لەسەر زەوی بڵاویدەکاتەوە، بەو گۆڕانکارییە قووڵانەی لەسەر دیمەنی زەوی و ڕوخساری شارەکان و شێوازی ژیان جێیدەهێڵێت، پێکرا بۆ سەوسەن دونیایەکی تر بوو. گەرچی سەوسەن داواکارەکانی خۆی بە

جیهاندا ناردبوو تا لە جەنگ دووربکەونەوە، بەڵام خۆی لە منداڵییەوە باوەڕی وابوو لە بەرئەوەی جەنگ هەیە پێویستە ببیبنێت. خولیای سەوسەن بۆ جەنگ پەیوەندی بە هیچ خواستێکی شەڕانییەوە نەبوو، دەتوانین بڵێین کچەکە لە منداڵییەوە لە ڕێگای کتێبەکانەوە زۆر جەنگی گەورە گەورەی بینیبوو، بەڵام وێنەکان وەک هەمیشە دوو شتی گەورەیان کەمبوو، کەولیان دەکرد زۆر جێگای متمانەی سەوسەن نەبن، ئەویش دەنگ و بۆن بوون.

ساڵی ١٩٩١دوای هەرەسە ترسناکەکانی سوپای سەدام لە باشوور و باشەکشەیان لە کوێت، ڕاپەڕین هەموو وڵاتی گرتەوە. سەوسەن یەکێک بوو لەو کچانەی لە ڕاپەڕیندا بەشداریکرد. بەڵام سەوسەن بە پێچەوانەی ئێمەوە دوای خەون و ترس نەکەوتبوو، بەشدارییەکەشی بەچەک نەبوو، بەڵکو سووک و سادە بێنەوەی شتێکی دیاریکراو بکات لەگەڵماندا بوو. ئێمە جەنگاوەرانی ڕاپەڕین، ئەو ڕۆژانە چاومانکردەوە کچێکی جوانمان لەتەک خۆماندا بینی کە بەجۆرێکی سەیر سپی هەڵگەڕابوو، بەردەوام پانتۆڵێکی کاوبۆی کۆن و پاڵتۆیەکی ڕەشی درێژی لەبەردەکرد. هیچ شتێکی نەدەکرد، هیچ شتێک تەنیا سەیریدەکردین و گوێی لە فیشەکەکانمان دەگرت، بۆنی باروتی تفەنگەکانمانی هەڵدەمژی، بەڵام هیچ هەستێکی ترسی تێدا نەبوو، ئێستاش هەموو سەرسامی ئەوەین، چۆن لەو ڕۆژانەدا نەکوژرا، تاکە کەسێک بوو بێترس بە ناو گوللە و دەستڕێژەکاندا دەڕۆیشت، هەندێ جار هاوارمان لێدەکرد، تکاماندەکرد لە شوێنی خۆی نەجوڵێت، بەڵام وەک ئەوەی نەبیستێت، وەک ئەوەی دەنگەکان و بۆنەکان مەستیانکردبێت، لە هاوارەکانی ئێمە بێباک بوو. لە شەڕەکانی ڕۆژی یەکەمدا ئێمە زۆربەی بارەگا و بنکەکانی دەوڵەتمان گرت، هەر ئەو ڕۆژە هەموو پۆلیسخانەکان چەکەکانیان ڕادەستی شۆڕشگێڕان کرد، میلیشیا مەدەنییەکانی دەوڵەت ڕووی تفەنگەکانیان

وەرگێڕا و لەگەڵ ڕاپەڕیواندا کەوتنە پەلاماری هێزەکانی دەوڵەت، ڕۆژی دووەمیش زۆربەی سوپاکانی دەوروبەری شار چەکەکانیان فرێدا و هەموو ئەفسەر و سەربازەکانیان بەدیلی کەوتنە دەستمان. بەڵام بەعسییە گەورەکان و پیاوانی پۆلیسی نهێنی و کارگێڕانی ئاسایش و کارمەندانی دەزگاکانی هەواڵگری هەموو هەڵهاتنە ناو بنکە گەورەکەی ئاسایشەوە و لەوێدا سەنگەری خۆیان لێدا. ئەو جێگایە شوێنی خوێناویترین شەڕەکانی ڕاپەڕین بوو. مەنگوڕ شەوی پێش ڕاپەڕین دۆستانی خۆی کۆکردەوە و تکای لێکردن لە ڕاپەڕیندا لە چەقۆ زیاتر چەکێکی تر بەکارنەهێنن، قسەکانی ئەو ئێوارەیەی مەنگوڕ تا ساڵانێک دواتر لە خەیاڵماندا بوو، ئەو گووتی «خوێن زۆر دەڕژێت، من لە دژی ئەوە نیم کە هەموو بەشداری پەلامارەکان بین، خودا دەزانێت یوسف کەویاری گەورە لە چەند شەڕدا بەشداربووە، لە شەست و حەفتاکاندا کورد شەڕێکی گەورەی نەکردوە، کەویاری تێدا نەبوبێت. بەڵام ئامۆژگاری من ئەوەیە لە چەقۆ زیاتر چەکێکی تر بەکارمەهێنن، مەسەلەکە پەیوەندی بە نەریتی ئێمە و ئەخلاقی دێرینەی ئێمەوە هەیە لە شەڕدا، کەویاری ڕەحمەتی تا مرد هەر چەکی سپی پێبوو... دوژمن ئەوەندی بە چەقۆکەی کەویار سەغڵەت بوو، بە گوللە و باروتی تۆپخانەکانی شۆڕش سەغڵەت نەبوو... چونکە بە مێژووی هەموو شۆڕشی ئەیلول، پارچەی گوللە تۆپێکی ئێمە ڕاستەوخۆ نەگەیشتە قوونی دوژمن».

قسەکانی مەنگوڕ بۆ ژمارەیەک لە هاوڕێ نزیکەکانیشی قەبووڵ نەبوو، هەندێکیان ڕاستەوخۆ دەنگیان بەرز نەکردەوە، بەڵام قەپۆز جوقڵی و مچۆی ئەختەرخان و مەریوانی مەمە و هەندانێکی تر بە حورمەتەوە بە مەنگوڕیان گووت کە شەڕەکانی داهاتوو سەخت دەبێت و بەبێ چەکێکی ڕاستەقینە کەس ناتوانێت ژیانی بخاتە بەر مەترسی وەها گەورەوە. ڕۆژی داهاتوو مەنگوڕ خۆی نەبێت، هەموو تیپەکەی چواردەوری

بە چەکی قورسەوە هاتنە ناو ڕیزی ڕاپەڕینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا مەنگوڕ بە چەقۆکەی دەستییەوە ئازایەتییەکی بێوێنەی نیشاندا، لە زۆر شوێندا یەکەمین کەس بوو پێش تفەنگدارەکان دەکەوت و خۆی بە ناو ئاگر و دوکەڵەکاندا دەکرد. هەر لە ڕۆژی یەکەمیشەوە هاوڕێکانی مەنگوڕ بە جۆرێکی بەربڵاو لە تاڵانکارییە گەورەکانی شاردا بەشداربوون، گەلێک مەخزەنی گەورەیان تاڵانکرد، لە چەندین شوێنی تایبەتیدا کەلوپەلی فەرهودکراویان حەشاردا. تاڵانییەکان هەموو شتێکی گرتەوە، لە تاڵانکردنی کارگەکان و ماشێن و شتە گرانبەهاکانی ناو دەزگاکانی دەوڵەتەوە بیگرە تا تاڵانکردنی ئاڵتون و پارەی ماڵە بەعسییە کۆنەکان. ڕاستە کەسمان مەنگوڕمان لە جۆرە کارێکی وەهادا نەبینی، بەڵام کەسیشمان باوەڕمان نەکرد کە خۆی لە هەموو ئەو کارانە بێئاگابێت.

لە ڕۆژی دووەمدا، لە کاتی گرتنی یەکێک لە ڕێکخراوەکانی حیزبی دەسەڵاتداردا، مەنگوڕ بۆ یەکەمجار سەوسەن گوڵدانچی لەدەرەوە بینی، مەنگوڕ لە ناو دوکەڵ و تەم و بۆنی باروتدا کڵاوەکەی بۆ سەوسەن داگرت و گووتی «سەوسەن خان ڕێزی زۆرم قەبووڵ بکە، بەڵام خانم بەقەبری هەرچی ئەولیایە، ئێرە شوێنێکی باش نییە بۆ ئێوە، بزانە تەقەکەرەکان لە ترسدا ناتوانن نیشانە بگرنەوە، زۆربەیان لە ترسدا دەستیان لە قوونیان زیاتر دەلەرزێت، گەر شتێکت لێبێت حەسرەتێکی گەورە دەچێتە دڵمان. لەبەرئەوە ڕوخسەتم پێبدە و ئەو شەرەفە بە بچوکی خۆت ببەخشە تا ماڵی خۆتان بەڕێتانبکەم و تا دەتگەیێنمەوە دەست باوکی بەڕێزتان لەگەڵتاندا بم».

ئەوکاتەی مەنگوڕ وایدەگووت، دەنگی دەستڕێژەکان بەجۆرێ بەرزبوون هەستمانکرد سەوسەن گوێی لە دەنگی مەنگوڕ نییە. بەڵام گوێمان لێبوو سەوسەن بە دەنگێکی گەرم کە گەلێک لە دەنگی لاواز و بێتینی خۆی جودابوو، وەڵامیدایەوە و گووتی کە هەموو شتێک باشە و هیچ

مەترسییەکی نییە و نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و دەیەوێت تا کۆتایی دیمەنەکان ببینێت. دواتریش بینیمان بە خێرایی لە مەنگوڕ دوورکەوتەوە کە لە ناو هەوای شێداری ئەو بەیانییەدا تا لە چاو ونبوو کڵاوەکەی بۆ داگرتبوو و سەیریدەکرد.

مەنگوڕ ساڵەهای ساڵ ئەو دیمەنەی سەوسەنی لە بیرنەکرد، بەردەوام بە شێوەی جۆراوجۆر بۆ ئێمەی دەگێڕایەوە، شانازییەکی بێوێنەشی بەوەوە دەکرد کە ژنێکی وا ئازا لە نزیکەوە دەناسێت .

لە نیوەڕۆی ڕۆژی دووەمدا شەڕی ڕاستەقینە لە چواردەوری بینای گەورەی ئاسایش دەستی پێکرد، ئەو شوێنە وەک قەڵای گەورەی بەعسییەکان تەماشادەکرا. بیناکە خانوویەکی زەبەلاح و ناشیرین و ترسناک بوو، دەیان ڕاڕەو و ژێرزەمین و ژووری گەورەی ئەشکەنجەی تێدابوو، هەر کەس بە دیلی بچووبایەتە ئەو بینایەوە وەک خۆی نەدەهاتەوە دەرێ، یەکێک بوو لە جێگا هەرە ترسناکەکانی ئەشکەنجە کە جەلادی گەلێک لێزان و بێڕەحم، بە موچەی گەلێک زۆر ئیشیان تێدادەکرد. پاشەکشێی هەموو بەعسییەکان بۆ ناو ئەم بینایە هەڵەیەکی کوشندەبوو کە کاری گەمارۆدانیانی زۆر ئاسانکرد، سەرەتا شەڕەکان زۆر قورس نەبوون، ئەوانەی لە ناوەوە دەجەنگین هێشتا هیوایان بەوەبوو لەدەرەوەی شارەوە هێزیان بۆبێت، شۆڕشگێڕان و ڕاپەڕیوانیش چاوەڕوانی دابەزینی پارتیزانەکانی شاخیان دەکرد، بەڵام بەعسییەکان لە سەرتاسەری وڵاتدا وەها شکست و شپرزە بوون کەسیان نەیاندەتوانی فریای ئەوی دیکەیان بکەوێت. لەبەرئەوە ریتمی شەڕەکان سەعات دوای سەعات قورستر دەبوو. ئێمە بیناکەمان لە هەر چوارلاوە گەمارۆدا، سەوسەن لە سەعاتی یەکەمەوە لەگەڵماندا بوو، لەو شەڕانەدا بۆ یەکەمجار قەلەندەر ئاموون و کوڕگەلێکی دیکەی ئاموونیمان بینی لە تەنیشتمانەوە شەڕیاندەکرد. سەوسەن شەوان گەلێک درەنگ دەگەڕایەوە

بۆ ماڵێ، هاوارەکانی باوکی و پاڕانەوەکانی پرۆشە و ئامۆژگارییەکانی دکتۆر ڕەفعەت سوودێکیان نەبوو، کچەکە لەناو خوماری شەڕدا دەژیا. هەموو شەوێک کەدەگەڕایەوە بە ئاوێکی سارد خۆی دەشت و بێنەوەی قژی وشکبکاتەوە، بە تەڕی دەچووە ناو جێگاکەوە و بەدەم هەڵەرزینەوە سەیری ئەلبومی دەستگیرانە دوورەکانی دەکرد. دەبێت بڵێم ئەو چەند ڕۆژەی لەگەڵماندا بوو هەمیشە هێمن و بێدەنگ بوو، وەک یەکێک سەیری وێنەیەک بکات، سەیری هەموو شتەکانی دەکرد.

دوای چەند ڕۆژێک و دەیان سەعات شەڕی قورس، ئەو بەعسییانەی لە ناوەوە گەمارۆدرابوون، هەرەسیانهێنا، ئێمە جەنگاوەرانی ڕاپەڕین، هەموو دەروازەکانمان گرت، موشەک و نارنجۆکە دەستییەکانمان لە چەندین شوێنی ناو قەڵاکەدا ئاگری گەورەی دروستکردبوو، لە یەک کاتدا نوسینگەکانی سەرەوە و بەشێکی زۆری قاتەکانی خوارەوە دەسووتان، لە پەنجەرە بچوکەکانی سەر ژێرزەمینەکەوە دوکەڵێکی ڕەش دەهاتەدەرێ، ئاگرەکەی ناوەوە بەعسییەکانی ناچارکرد یان لە ژوورەوە بسووتێن یان بێنەدەرێ و خۆیان ڕادەستی ئێمە بکەن. وابوو لە بەردەم هەردوو دەرگا سەرەکییەکەی ئەو بینا ترسناکەدا گەورەترین قەسابخانەی مێژووی شارەکەمان ڕوویدا. دووسەد ساڵی ڕابوردووی مێژووی شارەکە شەو و ڕۆژی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو. هەموو بەعسییەکانمان لەوێدا کوشت، هێندەی لە ناو ئاگر و دوکەڵەکە ڕایاندەکرد و دەکەوتنە دەست ئێمە، بە چەقۆ یاخود گوللە یان بەرد دەمانکوشتن. کەس تا ئەمڕۆ ژمارەی کوژراوەکان نازانێت، بەوەدا لە یەککاتدا لە چەندین دەروازە و دەرگاوە کوشتار بەردەوام بوو، بەوەدا هەندێک لە لاشەکان دەم و دەست پەت دەخرایە دەست و قاچیان و بە جادەکاندا ڕادەکێشران، زانینی ژمارەی ڕاستەقینەی کوژراوەکان ئەستەم بوو. دەبێت بڵێم ژمارەیەکی زۆر لە کوڕانی شار بۆ یەکەمجار لەو کوشتارەوە فێری شەڕ

و پیاوکوشتن بوون. ئەو کوشتارە بۆ کوڕانی دەوروبەری مەنگوڕیش یەکەمین قوتابخانە بوو، تا ئەو کاتە زۆربەیان چەقۆوەشێنی ئاسایی بوون و ئەزموونێکی ڕاستەقینەیان لەگەڵ کوشتندا نەبوو، کەسیان پێشتر ڕۆژی واخوێناوی نەژیابوو. بەڵام قڕانی بەعسییەکان ڕووداوێکی گەورەبوو، بە ترس و خەونێکی زۆر بارکرابوو، هەتا هەندێک شاعیر و هونەرمەند و ئەکتەرانیش، وەک ئەوەی بەشداری لە شانۆگەرییەکی گەورەدا بکەن تێیدا بەشداربوون... تورەییەکە بە جۆرێک گەورەبوو، کەسی نەدەبوارد... ترس و خەون هەموومانی بەجۆرێکی سەیر بۆ پێشەوە ڕاودەنا. قەلەندەر ئاموون لەوانەبوو کە لەدەرگای پشتەوە خۆیان بە قەڵای بەعسییەکاندا کرد بۆ ئەوەی بیناکە ژووراو ژوور لە ناوەوە پاکبکەنەوە و خۆیان بگەێننە زیندانەکان و ئازادیانبکەن. مەنگوڕ کەسی نەکوشت، بە خۆی و چەقۆکەیەوە لەسەر دیواری دەرەوەی بنکەکە دانیشتبوو و بە هێمنی سەیری هەموو دیمەنەکەی دەکرد، سەرەتا هەوڵیدا منداڵان و ژنان لە سەیرکردنی کوشتارەکە دووربخاتەوە، بەڵام سوودی نەبوو. دەیان منداڵ و ژن لە حەوشی بنکەی ئاسایشدا کۆبووبوونەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە تەماشابکەن.

لەو ساتەدا مەنگوڕ دەیزانی سەردەمێک بەرەو کۆتایی دەڕوات و سەردەمێکی نوێ دەست پێدەکات، ئەوە دوا شەڕ بوو بتوانێت وەک چەقۆکێشێک لە نزیکەوە بیبینێت، ئەوە ساتی ئاودیوبوونی تەواوەتی خۆری چەقۆکێشان بوو کە لە مێژبوو بەرەو ئاوابوون دەڕۆیشت. مەنگوڕ تاکە کەسێک بوو لە گەرمەی ئەو تورەییە بێسنوورەدا هۆشی ئەوەی هەبوو بڵێت «ئەمجۆرە کوشتارە ڕاست نییە»، بەڵام لەوە زیاتر هیچی دی نەگووت. لەو ساتەدا لای ئێمە وەک پیاوێکی زۆر ئازا دەرکەوت، کە تەنیا دوای بڕوا نەگۆڕەکانی خۆی دەکەوێت. شێوەی دانیشتن و سەیرکردنەکەی ئەوەی تێدا بوو کە دەیەوێت جۆرە وێنەیەکی لەو

چەشنە بۆ مەتامەتایە لە خەیاڵی ئێمەدا جێبهێڵێت.

سەوسەن لە ڕیزی پێشەوەی تەماشاکەراندا بوو، لەگەڵ هاتنەدەرەوەی هەر بەعسییەک و لەگەڵ هەر کوشتنێکدا ئێمە سەیری دەموچاوی ئەومان دەکرد کە گەلێک سارد دەینواند، ئێمە هەموو چەپڵەمان لێدەدا، خۆشحاڵ بووین، لەسەر لاشەکان سەمامانده‌کرد، بەڵام کەسمان نەمانتوانی شتێکی تایبەت لەسەر ڕوخساری ئەودا بخوێنینەوە، هەندێ جار وامان هەستدەکرد شتێک لە ناوەوە توند بەری هەناسەی دەگرێت، بەڵام وانەبوو... هێدی هێدی سەرنجماندا و بینیمان، سەوسەن بۆنی هەموو دیمەنەکە دەکات... تەنیا گوێدەگرێت و بۆندەکات.

لە ئێوارەدا شتەکان گەلێک تاریک و ترسناک دەیاننواند، سەدەها لاشە بەتەباری گەورە گەورە لەسەر یەک کەڵەکەکرابوون، زۆربەی لاشەکان بە بەرد و لێدان و پیاکێشان بەجۆرێک شێوێنرابوون بەدەگمەن کەسێک بیتوانیبایە یەکێکیان بناسێتەوە، لە هەندێک پەنجەرەی بیناکەوە، هێشتا دوکەڵ و بۆنی بۆکرۆز و سووتانی گۆشتی مرۆڤ بەرزدەبووەوە. تیپێکی بچوک لە ئێمە چووینە ژوورەوە و یەکەیەکە هەموو ژوورەکان گەڕاین. لە ناوەوە سەدان لاشەی سووتاومان بینی، سەرنجماندا بەعسییەکان لە هەندێک ژووری تایبەتیدا کۆبوونەتەوە و دواتر ئاگر بواری نەداون بێنەدەرێ و دوکەڵ خنکاندونی و هێدی هێدی کڵپەکان گەیشتۆتە سەریان و بوونەتە ڕەژووی تەواو. چەندێک لە ناو لاشەکاندا گەڕاین یەک زیندوومان نەدۆزییەوە، بەڵام لە جێگایەکدا لاشەی بەڕێوەبەری ئاسایش و پارێزگاری شارمان ناسییەوە، هەردووکیان لە تەنیشت یەکەوە مردبوون. لە زیندانەکاندا هەندێک لە گیراوەکان، لەوانەی دەبایە ئازادیانبکەین سووتابوون، لەویادا تەرمی جەلادەکان و قوربانییەکان تێکەڵاوی یەکتربووبوون، پێست و گۆشتەکەیان لە ناویەکدا توابووەوە، ئەوە بۆ ئێمە دیمەنێکی زۆر غەمباربوو کە نەماندەتوانی ئاسان جەلادەکان و

قوربانییەکان لە یەکتر جیابکەینەوە. لە هەندێک شوێنی تردا سەرنجماندا ئەوانەی دەستیان چوویووە خۆیان و نەیانویستبوو بکەونە دەست شۆڕشگێڕەکان، خۆیان کوشتبوو، شێوەی گرتنیان بۆ دەمانچە و شوێنی گوللەکە لەسەریاندا نیشانەی ئاشکراو ڕوونی خۆکوژی بوو. لە ڕاستیدا تا ئێستا کەس بەدروستی نازانێت چی لە ناوەوە ڕوویداوە، چۆن شتەکان سەعات دوای سەعات چوونەتە پێشێ، ئەوانەی لە ناوەوە بوون چۆن بیریانکردۆتەوە، چیان کردوە، چ هەوڵێک لە خەیاڵیاندابووە، هەستیان بە چ ئازار و چ پەشیمانییەک کردوە، ئەوانە هەمووی تا هەتاهەتایە نادیار و نهێنی دەمێننەوە، چونکە ئێمە لەگەرمەی هەڵچوون و تووڕەییدا هەتا یەک کەسیشمان لە دانیشتووانی قەڵا تاریکەکە بە زیندوویی نەهێشتەوە تا چیرۆکەکانمان لەدیدی ئەوانەوە بۆ بگێڕێتەوە کە لە ناوەوە تیا ژیان.

هەموو ژوورەکان و ڕێگاکان و سەردابەکانمان پشکنی، نەبا هەندێک لە بەعسییەکان بە ئومێدی دەربازبوون لە کەلێنێک یان ژوورێکی نهێنیدا خۆیان حەشاردابێت، بەڵام هیچمان نەدۆزییەوە. کە شەو داهات تاریکییەکی سەنگین و ترسناک باڵی بەسەر دونیادا گرت، تەنیا بە کۆمەکی لایتە دەستییەکان لە ژێر زەمینی پێچاوپێچ و لە زوڵمەتی سەنگینی ناو ژوورە سووتاوەکان هاتینەدەرێ. لەدەرەوە شەوێکی قورس نیشتبووە سەر زەوی، جگە لە مەیتە بێدەنگەکانیش کەس لە گۆڕەپانەکەدا نەمابوو، بیناکە لە تاریکیدا دیمەنێکی وەها ترسناکی هەبوو، هاڵاوێکی وەها سەیری لێهەڵدەستا مرۆڤ سامی لەسەیرکردنی دەکرد. بێدەنگییەکی ترسناک هەموو شتێکی داگرتبوو... ئێمە لە ناو لاشەکاندا وەستاین و بیرمان لای ئەوە بوو: ئاخۆ لە چ ساڵێکی دی و لە چ ڕۆژگارێکی دیکەدا جۆرە شەوێکی دیکەی وەک ئەمشەوە دووبارەدەبێتەوە؟

## ٣١

شەو درەنگ زانیمان کە سەوسەن خان دیارنییە. لەدوای کەوتنی تاریکییەوە، فیکرەت گوڵدانچی و پرۆشە بەسەبرێکی زۆرەوە چاوەڕوانیانکرد، ئەو کات پرۆشە لەگەڵ دکتۆری مێردیدا پێکەوە لەماڵی گوڵدانچی بوون، هەموو چاوەڕوانی پێشهاتی ترسناکمان دەکرد، لە سامی ئەوەدا دەژیاین بەعسییەکان شارەکەمان بە گازی کوشندە و چەکی دیکە بۆردومانبکەن. ئەو شەوە کە سەوسەن تاسەعاتی هەشت نەهاتەوە، گوڵدانچی دڵی کەوتە مەترسییەوە. تا سەعات نۆش ئومێدی ئەوەیان هەبوو بگەڕێتەوە، هەموو لە ڕۆژانی ڕابوردوودا سەرنجی ئەو دۆخە نائاساییی و تازەیەی سەوسەنیان دابوو، وەک ئەوەبوو کوشتارەکانی ناو شار کچەکەی لە ڕابوردووییەکی بێدەنگ ئازادکردبێت، وەک ئەوەی یەکەمجاربێت جیهان لە ڕوخسارە ڕاستەقینەکەیدا ببینێت. فیکرەت گوڵدانچی گەرچی دڵی بێئەندازە دەترسا، گەرچی زۆر هاواری بێهودەی لەسەوسەن دەکرد، بەڵام دڵی بەوە خۆشبوو، کە سەوسەنی دەبینی لە کتێبخانەکەی دێتەدەرێ و ئەو بۆنە ڕاستەقینەیەی ژیان هەڵدەمژێت کە لەسەر شەقام و کوچەکانی وڵاتدا هەن، بەبڕوای ئەو کیژەکە لەو کتێبخانەیەدا هەستێکی بۆ حەقیقەت نەمابوو.

کاتژمێری نۆ فیکرەت گوڵدانچی و دکتۆر بە دوودڵی و بێئارامییەکی کەم وێنەوە کەوتنە خۆیان بۆ ئەوەی بە هەموو لایەکدا بڕۆن و بکەونە

سۆراغی سەوسەن. ماشێنەکەی دکتۆر بانزینێکی کەمی تێدابوو، دەبایە وریایانە بەکاریبهێنن، بەتایبەت لە هەموو شاردا بانزین بەرەو کەمی دەڕۆیشت و پەیداکردنی لەجۆرە شەوێکی وەهادا سەخت بوو. سەرەتا چەند ماڵە ناسیاوێکی نزیک چوون، لەو جێگایانە بیستیان سەوسەن تا ئەمەو عەسرێکی درەنگ لەگەڵ خەڵکێکی زۆری تردا لە سەیری کوشتارە گەورەکەی بنکەی سەرەکی ئاسایش بووە، هەمووش گوتیان کە سەوسەن لەگەڵ بینەرەکانی دیدا جێگاکەی چۆڵکردوە و ئێستاش ئەو ناوە لە تەباری لاشە بەولاوە هیچی دیکەی لێ نییە. دکتۆر و فیکرەت گوڵدانچی چەندین ماڵە ناسیاویان کرد، لە ڕێگای خۆیاندا سەریان لە هەندێ لە ئامووزنییەکان و ساقی مەحمودیش دا، بەڵکو لە گەڕاندا کۆمەکیانبکەن. هێند گەڕان کە ئیدی ماشێنەکەیان لە جێگایەکدا پەکیکەوت، دواتر بەیەکێک لە تاکسییە ڕاگوزەرەکانی شەو هەموو ناسیاوە نزیک و دوورەکانی دی و هەموو خەستەخانەکانیان بەسەرکردەوە، بەڵام سوودی نەبوو. لە ڕاستیدا کەس نەیدەزانی سەوسەن چی لێهاتووە .

لە نیوەشەودا ژمارەی ئەوانەی بەدوای سەوسەندا کۆڵانە و کۆڵان دەگەڕان، شەقامەکانی دەرەوەی شاریان بۆ دەپشکنی لەسەد کەس زیاتر بوون، لە مەیتخانەکان سەیری مەیتی هەموو کوژراوە مەدەنییەکانیان کرد، لە خەستەخانەکانیشدا سەیری بریندار و بێهۆش و مردوە بێناوەکانیان کرد، بەڵام لە سەوسەن خەبەرێک نەبوو.

قەلەندەر ئاموون پاڵەوانی ڕاستەقینەی ئەو شەوە بوو، لەسەعات یەکی شەودا دوای ئەوەی هەموو لە گەڕان ماندووبووبوون، قەلەندەر بەتەنیا گەڕایەوە بۆ بینا سووتاوەکەی ئاسایش، کە بۆنی خوێن و مردن لە هەموو گۆشە و کەلێنێکی دەهات. سەدان لاشە لە گۆرەپانەکەدا کەوتبوون، قەلەندەر سەیری لێهات کە مردووەکان بەو ئەندازەیە بێدەنگن، پێشتر بیری لە بێدەنگی مردووەکان نەکردبووەوە، سوڕێکی

گه‌وره‌ی به‌ده‌وری حه‌وشی بنكه‌كه‌دا خوارد، به‌ لایته‌كه‌ی ده‌ستی سه‌یری ده‌موچاوی هه‌ندێك له‌ لاشه‌كانی كرد، شێوه‌ی كرانه‌وه‌ی ده‌میان و ده‌رپه‌ڕینی چاویان و خواربوونه‌وه‌ی ملیان گه‌لێك سه‌یربوو، قه‌له‌نده‌ر پێشتر مردووی له‌و جۆره‌ی نه‌بینیبوو، شێوه‌ی خۆبه‌ده‌سته‌وه‌دانیان بۆ مردن ڕایچڵه‌كاند، هه‌ستیكرد له‌ مێژه‌ مردوون... هیچیان به‌وه‌ نه‌ده‌چوو كه‌ كه‌سانێك بن دوێنێ شه‌و یان پێش چه‌ند سه‌عاتێك له‌وه‌وبه‌ر زیندووبووبن. به‌ڵام قه‌له‌نده‌ر هه‌ستی به‌ ترسێكی تایبه‌تی نه‌كرد، ئه‌وه‌ی كه‌ ناترسێت له‌ دڵه‌وه‌ ترساندی... له‌ منداڵییه‌وه‌ ده‌زانێت كه‌ نیشانه‌یه‌كی باش نییه‌ مرۆڤ له‌ مردوو نه‌ترسێت، هه‌موو زیندوویه‌ك ده‌بێت له‌ مردووه‌كان بترسێت، ده‌بێت لێیان بترسێت تا له‌ زیندوێتی خۆی دڵنیابێت. ئه‌وه‌ی به‌ته‌نیا له‌م تاریكییه‌ كوشنده‌یه‌دا و له‌م حه‌وشه‌ ساردەدا و له‌ ناو ئه‌م هه‌موو لاشه‌یه‌دا وه‌ستاوه‌، هه‌ستێكی بێئه‌ندازه‌ ناخۆشی تیا دروستكرد، به‌ڵام هه‌ستیكرد شتێك به‌ره‌و ناو بیناكه‌ی ڕاده‌كێشێت، له‌وێ بۆنی سووتانی لاشه‌كان تیژتر و تاریكییه‌كه‌ چڕتر بوو، هه‌ندێك له‌ ژووره‌كان ته‌نیا لاشه‌یه‌ك یان دووانیان تێدابوو، له‌ هه‌ندێ ژووری تردا، مه‌یته‌كان له‌سه‌ر یه‌ك كه‌ڵه‌كه‌بووبوون. قاتی خواره‌وه‌ جگه‌ له‌ خۆڵه‌مێشێكی نه‌رم و پارچه‌ شووشه‌ی شكاو و مێز و كورسی و دۆڵابی سووتاو هیچی دیكه‌ی تێدا نه‌بوو، له‌ هه‌ندێ جێگادا هێشتا له‌ ژێر خۆڵه‌مێشه‌كه‌وه‌ گڕێكی كز ده‌سووتا. كه‌ چووه‌ قاتی سه‌ره‌وه‌ هه‌ستیكرد هێدی هێدی خه‌ریكه‌ باران ده‌بارێت... له‌ په‌نجه‌ره‌ گه‌وره‌كانه‌وه‌ سه‌یری ئه‌و دیمه‌نه‌ تاریكه‌ی شاری كرد، دڵنیابوو ڕۆژانی پێشوو به‌عسییه‌كان له‌وێوه‌ سه‌یری دونیایان كردوه‌. به‌ر له‌وه‌ی بنكه‌كه‌ به‌جێبهێڵێت له‌ پشته‌وه‌ دابه‌زی بۆ ژێر زه‌مینه‌كه‌. ژێر زه‌مینه‌كه‌ لاشه‌ی زۆرتری تێدابوو، ئاشكرا ئاگرێكی سامناك و دۆزه‌خێكی گه‌وره‌ له‌وێ به‌رپابووبوو، هه‌ندێك له‌ مردووه‌كان ته‌نیا ئێسكه‌ ڕه‌شه‌كانیان مابووه‌وه‌،

قەلەندەر هەستیکرد بۆنی مردن لەوێ لە هەر جێگایەکی دیکە چڕترە.
قەلەندەر بەهێمنی بە لایتەکەی دەستییەوە، تا ئەوسەری ڕاڕەوەکان ڕۆیشت، بێدەنگییەکی کوشندە سەروەر بوو. لەسەرەخۆ و ئارام بە هەنگاوی بچوک بچوک بەلای ژوورەکاندا دەڕۆیشت، یەکە یەکە سەیری هەموو کونج و کەلێنەکانی دەکرد. تادواجار لە یەکێک لە ژوورەکاندا لە ناوەڕاستی دەیان لاشەی سووتاودا سەوسەنی بە ڕاکشاوی بینییەوە، بە هێمنی و بێجوڵە وەک مردووەکان کەوتبوو، سەرەتا تەنیا گوێی لەدەنگی هەناسەی بوو، دەنگێکی بچوک و مشەیەکی لەسەرەخۆ. قەلەندەر بەترسێکەوە لایتەکەی وەرگێڕا و و بە دەنگێکی نوساو و نیمچە خنکاوەوە گووتی «خودای گەورە، سەوسەن خان... هەموو شار بەدوای تۆدا دەگەڕێت... هەموو شار... تۆ چی دەکەیت لێرەدا... چی دەکەیت».
ئەو بەبێئەوەی هەستێت بە هەمان دەنگی لاوازی خۆی، بەو دەنگەی لە ساتە هەرە سادە و ئاساییەکانی ژیانیدا قسەی پێدەکرد گووتی «گوێ لە مردووەکان دەگرم... گوێ لە مردووەکان دەگرم، بۆنی مردووەکان دەکەم، قەلەندەر ئاغا بۆنیاندەکەم». قەلەندەر بەدەنگێکی شپرزەوە گووتی «دڵنیابووم لێرەدا دەتدۆزمەوە... دڵنیابووم دەتەوێت بۆنی مردووەکان بکەیت. سەوسەن خان وەختێکی زۆر خراپت هەڵبژاردوە، هەموو شار بە دوای تۆدا دەگەڕێت... ئاه خوایە، بەڵام سەوسەن خان... سەوسەن خان هەست بەچی دەکەیت؟». سەوسەن خۆی ڕاستکردەوە و بە هێمنی گووتی «بەهیچ قەلەندەر ئاغا... هیچ. هەستم بە هیچ نەکرد، بۆنیان وەک بۆنی خەڵکی ئەم شارە وایە، وەک بۆنی من و تۆ وایە». قەلەندەر بێئەوەی بزانێت بۆ ئەو پرسیارەی کردوە، گووتی «بەڵام سەوسەن خان دەستتم بدەرێ، دەستتم بدەرێ، بیناکە لە هەموو لایەکەوە سووتاوە، تێدەگەیت مەترسی ئەوەی هەیە بڕوخێت... بەڕاستی بڕوخێت، باش نییە لێرەدا بمێنیتەوە». سەوسەن دەستی خۆی دایە دەست قەلەندەر

ئامـوون و گووتـی «مـن هەمـوو شـتێکم بینـی، قەڵەنـدەر ئاغـا هەمـوو شتێکم بینـی». قەڵەندەر بەسەرسامییەوە گووتـی «خانم چیت بینـی؟». سەوسـەن بـە هێمنـی بەرزبـووەوە و بێنـەوەی وەڵامیبداتـەوە، دەستی گرت بەچاوییـەوە تـا تیشـکی لایتەکـە کوێـری نـەکات و گووتـی «قەڵەنـدەر ئاغا درەنگـە... وانییـە، زۆر درەنگـە، ئێسـتا گوڵدانچـی مـەراق دەخـوات، لـە مـن زیاتـر کەسـی نییـە، دەڵێـم بابڕۆینـەوە بـۆ ماڵـێ». قەڵەنـدەر گووتـی « گوڵدانچـی لـە ئێـوارەوە بەدواتـا دەگەڕێـت... لـە ئێـوارەوە مـاڵ بـە مـاڵ بەدواتـا دەگەڕێـت». ئامـوون دەسـتی گـرت و بەرزیکـردەوە، هەسـتیکرد سەوسـەن گوڵدانچـی بۆنـی مردووەکانـی لێدێـت، سەوسـەنیش تەماشـایەکی سێبەرە گەورەکـەی قەڵەنـدەری کـرد و هەسـتیکرد ئەویـش بۆنـی مردووەکانی لێدێـت.

## ٣٢

کەس فریا نەکەوت سەرزەنشتی سەوسەن بکات، ئەو شەوە بە نەخۆشی گەڕایەوە ماڵێ، کە گوڵدانچی و پڕوشە بینیان بە جۆرێک بێهێز و کەم تین بوو، وایان هەستکرد ئاگای لە خۆی نییە و گوێی لە هیچ تێبینی و ئامۆژگارییەکیش نابێت. تا کەوتنی خۆر چەند جارێک لەسەر یەک ڕشایەوە، تایەکی بەهێز دایگرت و عارەقی دەردەدا، لە بێهۆشی نزیک دەبووەوە و نەگەڕایەوە، لەرزێکی توند دەیگرت و بەدوایدا خاودەبووەوە. ئەو دۆخە ماوەیەکی زۆر درێژی خایەند، چەند مانگێکی دووردودرێژ، لەو چەند مانگەدا هەندێ جار ناچاربوون بەشێوەی دەستکرد خواردنی لە ڕێگای دەمارەوە بدەنێ. دیارە لەو ماوەیەدا بۆ ماوەی کورت ئارامی تێدەگەڕا، بەڵام هەموو هێوربوونەوەیەک داکەوتنێکی کتوپڕ و توندی بەدوادا دەهات. ناچار بۆ ئەوەی لە دونیای گەورەی خۆی دانەبڕێت، قەرەوێڵە و جێگای خەوەکەیان بۆ بردە قاتی سەرەوە بۆ ناو کتێبخانەکە. ماوەی نەخۆشییەکەی سەوسەن سەردەمی گۆڕانکاری سیاسی گەورەبوون، لە دوای هاتنەدەرەوەی لەو سەردابە تاریکەی پڕبوو لە مەیتەکانی ڕاپەڕین، ئارەزوویەکی نەمابوو وەک جاران گوێ لە هەواڵەکان بگرێت. فیکرەت گوڵدانچی نەخۆشی کچەکەی وەک جۆرە مانگرتنێک دژ بە دونیا وەرگرت، بۆنی ژیان، بۆنی جەنگ، بۆنی مردن، پێکڕا ئارەزوویەکی ئەوتۆیان تیادروست نەکرد لەسەر ناسینی دونیای

ڕاستەقینە بەردەوام بێت. لەو دەمەدا تاکە دڵنیایی و نەوازشی ئەو ڕۆژانێک بوو کە ئاریان جەوەدەت بۆیەی پەیدادەکرد و دەهات لەسەر دیوارەکانی کتێبخانەکە وێنەی نوێ و گەورەی بۆ نیگاردەکرد، ئەو لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆی دادەنیشت و ئاریان بە هێمنی نیگاری دەکێشا، ئەوەی بە بێدەنگی سەیری جوڵە و فڵچەدانان و ڕەنگگرتنەوەکانی ئاریانی دەکرد، ئارامییەکی دەروونی قووڵی پێدەبەخشی. لەنێوان ئەو و ئاریاندا بێدەنگییەکی گەورە بەرقەرار بوو، ئەو هێدی هێدی وەک نیگارکێش وازی لەکردنەوەی پێشانگا و دروستکردنی تابلۆی دیکە دەهێنا بۆ ئەوەی تەواو خۆی بۆ ئەم نیگارانە تەرخانبکات. سەوسەن تاکە بینەری ڕاستەقینەی ئەوبوو، بەڵام هەستیدەکرد لە هەر بینەرێکی دیکەی جیهان قووڵتر و وردتر دەچێتە ناو تابلۆکانەوە، پتر لە ناویاندا وندەبێت، زیاتر دەتوانێت بەناویاندا بڕوات، زیاتر لەزەتیان لێدەبینێت... زۆر کەم قسەیان لەگەڵ یەکدا دەگۆڕییەوە، هەندێ جار بە هێمنی چایەکیان پێکەوە دەخواردەوە، هەندێ جاریش لەسەر ڕەنگ و پلەی تۆنەکان قسەیان دەکرد، گەر سەوسەن زۆر ئارەزووی هەبایە و کراوەبایە، کەمێک لەسەر ژیانی شار و هەندێک کتێب و نەخۆشییەکەی خۆشی قسەیاندەکرد.

بەهار و هاوینی ساڵی ١٩٩١ گرنگترین سەردەمی ژیانی ئێمەبوون، لەوسەردەمەدا گۆڕانکاری گەورە ڕوویاندا، لە کۆتایی هاوینی ئەو ساڵەدا هێزەکانی سەدام حوسەین دوای چەند شەڕێکی گەورەی سەر جادە و کۆڵان، بۆ هەتاهەتایە شارەکەمانیان بەجێهێشت و سەردەمێکی تر لە مێژووی ئێمەدا دەستی پێکرد، حیزبە کوردییەکان کە تائەوکات چەکیان بەدەستەوە بوو، لە چیاکان دابەزین و ئەو حوکمڕانییەیان دامەزراند کە ئەمڕۆ بەرقەرارە. ئەوە گەورەترین سەرکەوتنێک بوو کورد لەدوای ڕوخانی ئیمارەتی بابانەوە بەدەستی بهێنێت. ئەو کات کە دوو حیزبە گەورەکەی وڵات یەکێتی نیشتیمانی و پارتی دیموکرات دابەزینە ناو

شارەکانەوە وەک چەژنێکی گەورە وەهابوو، بەڵام خودی دوو حیزبەکە بە مێژووییەکی تاریک و پڕ ناکۆکییەوە هاتنە ناو ژیانمانەوە، لە سەردەمی جیادا لەسەر دابەشکردنی ناوچەکانی دەسەڵات و کۆنترۆلکردنی خاڵە سنوورییەکان و خۆسەپاندن و ڕابەرایەتیکردن زۆریان لە یەکدی کوشتبوو، بەڵام کە هاتنەخوارێ و بوون بە دەسەڵاتی مەدەنی پەیمانی ئەوەیاندا شتەکان بە ئاشتی و بێکوشتار چارەدەکەن. ئامۆنییەکان لە بنەڕەتدا پارتی بوون، بەجۆرێکی بەربڵاو لە شۆڕشی ئەیلولدا بەشداربوون، بۆیە لەگەڵ دابەزینی پارتییەکاندا، سەی کەرەمی ئاموونی و لە تەکیشیدا هەموو پیاوانی دیکەی سەر بە عەشرەت بێدوودڵی ڕاستەوڕاست چوونە ناو حیزبەوە، قەڵەندەر ئاموون وەک جەنگاوەرێکی کۆن و بەناوبانگ پتر لەوانی دی پێشوازیی لێکرا و لەلایەن ئەندامە باڵاکانی حیزبەوە بۆ خوانی تایبەت داوەتکرا. بەوەدا لەو چەند ساڵەدا پارتییەکان پێگەیان لە شاری ئێمەدا زۆر لاوازبووبوو، پەیوەندیکردنی ئاموونییەکان بەوانەوە هێز و تینێکی گەورەی پێبەخشین. دیارە ناوبانگی ئاموونییەکان وەک عەشرەتێک کە لە دە ساڵی ڕابوردوودا لە دەوڵەتەوە زۆر نزیکبوون، بە گرنگ وەرنەگیرا، گرنگ ئەوە بوو ئاموونییەکان هێزێکن دەتوانن شکۆی دێرینی حیزب لێرەدا زیندووبکەنەوە.

تێکەڵبوونی ئاموونییەکان بە هێزەکانی پارتی دیموکرات، زۆر شتی لە چیرۆکەکەی ئێمە گۆڕی. ئەو ڕۆژەی کە هەواڵ بڵاوبووەوە کە ئاموونییەکان چوونەتەوە ناو حیزب، هەموو دڵنیابووین کە بەشێکی ئەو بڕیارە پەیوەندی بە شەڕی ئاموونییەکانەوە لەسەر سەوسەن فیکرەت هەیە، دەشمانزانی ئەو بڕیارەیان کاریگەریی گەورە لەسەر هەموو ئەوانی دی جێدەهێڵێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەنگوڕ تا کۆتایی هاوین بڕیاری نەدا بچێتە ناو هیچ هێزێکی سیاسییەوە، بەردەوام بیریدەکردەوە و بەردەوامیش ڕاکانی خۆی دەگۆڕی، بەڵام لە کۆتایی هاویندا ئیدی تەواو

دڵنیابوو کە ناتوانێت وەک تاکە مەخلوقێکی بێ حیزب لە شارەکەدا بژی، خەڵکی شارەکە پێکڕا تووشی ئەو دەردەبووبوون کە یان دەبێت ببنە ئەندامی حیزبێک یاخود هەواداری حیزبێک، بەوەدا هەوادارەکان هەمیشە لە ئەندامەکان سەرسەختتر و کەللە بەجۆشترن، دۆخی شار تا دەهات خراپتر و خراپتر دەبوو. لە پاییزی ئەو ساڵەدا تاک و تەرا خەڵکانێکی بێلایەن مابوونەوە. فیکرەت گوڵدانچی یەکێک بوو لەو تاک و تەرایە. فیکرەت ڕۆژێکیان لەگەرمەی ئەو پەتای حیزبچێتییەدا لەسەر چا خواردنەوە و لە هەیوانی گەورەی ماڵەکەدا بە دکتۆر ڕەفعەتی زاوای گووت «ترسناکترین بەڵایەک ڕوویکاتە شارێک ئەوەیە خەڵکی بێلایەنی تێدا نەمێنێت، چونکە سیاسەتی ڕاستەقینە هەمیشە بێلایەنەکان دەیکەن». ئەوکات دکتۆر ڕەفعەت بێئەوەی پێشتر کەس هەست و نەستی ناسیونالیستی بەجۆشی لێدیبێت، بێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا بۆ ماوەیەکی کورت بوو بە ئەندامی حیزبێکی بچوک کە دروشمی یەکگرتنەوەی هەموو کوردستانی هەڵگرتبوو. لە کۆتایی هاویندا مەنگوڕ دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر، بڕیاریدا بچێتە ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانییەوە. هۆی هەڵبژاردنی بۆ یەکێتی نیشتیمانی هەر ئەوە نەبوو کە دژایەتی ئامووزییەکان لە سەنگەرێکی بەرامبەرەوە بکات، بەڵکو ئەوەبوو زۆربەی کوڕانی دەوروبەری بە ئاشکرا و نهێنی چووبوونە ناو یەکێتییەوە. ئێوارەیەکیان قەپۆز جوقڵی پێیگووت «مەنگوڕ بیر لە چی دەکەیتەوە، بچیتە هەر حیزبێکی دیکەوە دەبیت بە دوژمنی ئێمە، خۆت دەزانی دڵسۆزی بۆ حیزب لەسەروو هەموو وەفا و دڵسۆزییەکەوەیە». ئەو ڕستەیەی قەپۆز جوقڵی مەنگوڕی هەژاند. دڵنیابوو ئێستا وەفا و لایەنگری ئەو کوڕانە بۆ حیزبە نەوەک بۆ ئەو، وەک ئەوەی بەدوای جێگایەکی وندا بگەڕێت، وەک بیەوێت دەست بەو شتانەوە بگرێت کە ژیان خەریکە لەدەستی دەفڕێنێت، بڕیاریدا بچێتە حیزبەوە. قەپۆز جوقڵی ئامۆژگاریکرد «مەنگوڕ تۆ پیربوویت، حیزب

گەنجینەیەکی گەورەیە، بەڵام کەم کەم خۆی دەردەخات، تا زیاتر تیا قووڵ بیتەوە زێڕی زۆرتری تێدایە، تاکە جێگایەک لەم وڵاتەدا ئینسان بتوانێت ئاڵتونی لێدەربهێنێت ناو حیزبە... لەبەرئەوە دوودڵ مەبە».

لەو ماوەیەدا هەموو دەمانزانی کە مەنگوڕ لە ڕێگای دۆستە قاچاغچییە ئێرانییەکانییەوە، خەریکی ساغکردنەوەی کەلوپەلە تاڵانکراوەکانی دوای ڕاپەڕینە، بەڵام هێزی گەورەی مەنگوڕ لەوەدابوو کە خۆی ڕاستەوخۆ لە وێنەکەدا دەرنەدەکەوت، کەس لە کاتی ئەوجۆرە کارانەدا نەیدەبینی بوو، کەسیش نەیدەزانی ئەو پارە زۆرەی مەنگوڕ لەو چەند ساڵەدا پەیدایکردوە لە کوێیە و بۆ کوێ دەچێت.

ڕۆژێک لە ناکاو هەموو مەنگوڕمان بینی وەک یەکێتییەکی سەرسەخت قسەیدەکرد، چیتر ئەو دوودڵی و بێدەنگییەی نەمابوو کە جاران هەیبوو، لە زمان و قسەکانیدا گاڵتەکردن و لاقرتێیەکی شاردراوە دەرهەق بە هەموو حیزبەکانی دیکە و سیاسییەکانی دیکە هەست پێدەکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سنوورێک هەبوو مەنگوڕ نەیدەبەزاند، بەڵکو بە ئاشکرا دەیگووت «لە سیاسەتدا مرۆڤ دەبێت بزانێت قوونی خۆی لە کوێدایە».

ڕووداوەکان دواتر زۆر بە نارێکی ڕۆیشتن، مەنگوڕ لە حیزبدا گەلێک خێرا چووە پێشێ، کوڕەکانی دەورووبەری زۆربەیان بوونە چەکدار و هێزی پاراستنی ئەو، ئیدی ڕۆژگارێک هاتە پێشێ مەنگوڕ چیتر نەدەهات بۆ چایخانەی پەپولەی ئازاد، بەڵکو زیاتر لە بنکەو بارەگاکانی حیزبدا دەردەکەوت و دەبینرا، وای لێهات ئێمە زۆر کەم دەمانبینی، شەوانێکیش گەر بهاتبایە بۆ ئوتێلەکەی باوەجان، وەها خەڵکی تفەنگ لە شان گەمارۆیان دەدا، ئاسان گوێمان لە قسەکانی نەدەبوو، بەڵام هەموو دەمانزانی کە خۆی هیچ کات لە چەقۆیەک زیاتر هیچی دیکەی پێ نییە... هیچ کات.

لە کۆتایی هاوینیشدا هێدی هێدی سەوسەن بەرەو باشبوون ڕۆیشت، لە

ئەیلولی هەمان ساڵدا بۆ یەکەمجار لەسەر شەقامەکان لەگەڵ دەستەیەک لە کچانی گوڵدانچییدا بینیمانەوە، وەک هەمیشە لاوازییەکەی سیحراوی و ڕەنگی نەخۆشی لە سیمایدا دڵڕفێن بوو. لەو وەرزەدا بۆ یەکەمجار لە هەندێک کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەدەبیدا ئامادەبوو، وەک هەمیشە بێدەنگ و بەویقار لە جێگایەکدا تا کۆتایی دادەنیشت و دواتر بە بێدەنگی هەڵدەستا و دەڕۆیشت، دەیزانی لە هەموو لایەکەوە سەیردەکرێت، دەیزانی هەموو چاوەکان لەسەر ئەون، دەیزانی بۆ هەر کوێ بڕوات بەدوایەوەین... دەشیزانی کە تەنهایە، زۆر تەنهایە، وە ناشتوانێت تەنها نەبێت.

هەر لەو وەرزەدا پڕوشە گوڵدانچی کوڕێکی بوو و ناویان نا «هوزار»، کوڕێکی شیرین کە تادوا ڕۆژی ژیان دەبێتە هاوڕێیەکی نزیکی سەوسەن.

## ٣٣

بەعسییەکان هەرگیز ئەو کوشتارەی ناو بنکەی سەرەکی ئاسایشیان لە بیرنەچووەوە، هێندەی هێزەکانی خۆیان کشانەوە گەمارۆیەکی ئابووری گەورەیان خستە سەر ناوچەکانی ئێمە، لە هاوینی ساڵی نەوەدویەکدا دۆخی ئابووری خەڵک زۆر بەرەو خراپی ڕۆیشت، موچەی زۆربەی کارنشینان لە ناکاو بڕا، چیتر دەوڵەت لە بەغداوە پارەی هیچ کەسێکی نەدەدا کە شوێنی ژیانی بکەوتایەتە ناو هەرێمی ئێمەوە. فیکرەت گوڵدانچیش لەو دەمەدا وەک سەدان هەزار خەڵکی پیر و خاوەن خانەوادە بێ هیچ سەرچاوەیەکی ژیان مایەوە و هەژارییەکی گەورە ڕوویکردە ماڵەکەیان. لەو ماوەیەدا فیکرەت جارجار بۆ یەکێک لە ڕێکخراوە بیانییەکان کە کاری گەیاندنی کۆمەک و ئاوەدانیان ئەنجامدەدا، هەندێک بەڵگەنامە و نوسراوی تایبەتی لە ئینگلیزییەوە دەکردە عەرەبی، بەڵام دەستکەوتی لەو ئیشانە شتێک نەبوو هەموو ژیانی دابینبکات. لەبەرئەوە جارێکی تر دەستی بردەوە بۆ فرۆشتنی کتێب لە کتێبخانەکە. گوڵدانچی دەبایە هەمووجارێک گفتوگۆیەکی درێژ لەگەڵ سەوسەندا ئەنجامبدات، دەبایە بە زەحمەت بیخاتە سەر ئەو قەناعەتەی گەر کتێبەکان نەفرۆشن ناتوانن بژین... بۆ ئەوەی دەست لە خەڵک پان نەکەنەوە، فرۆشتنی کتێب و پەیکەر و توحەفیاتەکان تاکە سامان و تەنها دەروازەیان بوو. گوڵدانچی لەو پیاوانە نەبوو یارمەتی خۆڕایی لە کەس وەربگرێت. بەڵام جگە لە

هـەژاری، هۆیەکـی گـەورەی تـر پێشـنیارە بەردەوامەکانـی دکتـۆر رەفعـەت بـوو کـە پێیوابـوو تـا ئـەو کتێبخانەیـە بمێنێت، سەوسـەن جێگایەکـی ئەمینی هەیـە، جێگایـەک وای لێدەکات پێویستی بـە دونیا نەبێت و لـە ماڵـدا دیل بێـت و تـا کۆتایـیَ بـە خەڵکـی ئـەم شـارە نامۆبێـت. هەتـا جارێکیـان دکتـۆر رەفعـەت کـە دەنگێکـی گـڕ و سـەرێکی چکۆلانـە و قژێکـی زەردی زۆر تەنکی هەبـوو، دوای قرغەیـەک بـە گوڵدانچـی گـووت «کاک فیکرەت... لـە ڕوانگـەی دەروونییـەوە بڕوانیـت، سەوسـەن کتێبخانەکـە وەک دونیایەکـی سـەربەخۆ سـەیردەکات، وەک شـوێنێکی تایبەتـی کـە هێـزی ئـەوەی دەداتـێ سـەنگەر لـە ئێمـە وەربگرێـت. گـەر لـە مـن دەپرسیت، وادەبینـم بەشـداری سەوسـەن لـە ڕاپەڕینـدا، لـە ڕووی دەروونییـەوە، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کیژەکـە جـار دوای جـار دەیەوێـت ئـەو وێنـە ناشـیرینەی ئـەم شـارە و ئـەم دەورووبـەرەی ئێمـە تێیـدا دەژیـن لای خـۆی تۆخبکاتـەوە... بەرلـەوەی ڕاستەوخۆ خانمـی کچتـان بناسـم، کـە چیرۆکەکەیـم بیسـت، بەڵـێ دەمێـک کـە لـە خەسـتەخانەی گشـتی بـووم، حیکایەتەکـەم لـە دەمـی دکتـۆر و سسـتەرەکان بیسـت، لـە دەمـی نەخۆشـەکان، لـە دەمـی فەڕاشـەکان و باجییـەکان و میوانـی نەخۆشـەکان... بەڵـێ جەنابـی گوڵدانچـی لـە دەمـی ئەوانـم بیسـت، یەکجـار نـا... بەڵکـو دەجـار... یـان سـەد جـار. ئەوکاتیش ڕام وابـوو کچەکـە بـەو بڕیـارە سـەیرەی بـۆ یەکێـک دەگەڕێـت لـە تـۆزی ئـەم شـارە و لـە هەراوبەزمـی ئـەم مێـژووە بـەدوور بێـت. بەڵـێ ئاغـام، یەکێـک بەدونیـادا بگەڕێـت و سـەفەر کەسـێکی تـری لێبسـازێنێت... ها ئەمـە مانـای چـی... گـەورەم مانـای چـی... لـە ڕووی دەروونییـەوە سـەیربیکەیت، ئەمـە مانـای ئـەوەی ئـەم کیـژە ناتوانێـت لـەم شـارەدا بـژی، کەیفـی بـە کەسـمان نایـەت و کەسـمانی خـۆش ناوێـت و شارەکەشـی خـۆش ناوێـت... بـۆ؟ چونکـە کتێبخانەکـەی هەیـە... تـا ئـەو کتێبخانەیـەی هەبێـت، واهەستدەکات قەڵایەکـی گـەورەی هەیـە، شـوێنێکی هەیـە لـە شـوێنی کەسـی تـر ناچێـت.

لە ڕووی دەروونییەوە سەیریبکەیت ئەمە نەخۆشییە، بەڵێ نەخۆشییەوە... ئەم کچە بەڵێ، بەڵێ نەخۆشە... بەڵێ قوربان نەخۆشە... هەتا ئەگەر دەزگیرانەکانیشی بگەڕێنەوە ناتوانێت شوویان پێبکات. هەڵبەت مەبەستم شووی ڕاستەقینەیە، مەبەستم ئەوەیە ببێت بە کچێک وەک کچەکانی تری ئەم شارە، وەک پرۆشەخانی خوشکی، وەک ئامۆزا و پورزاکانی. نا باوەڕم پێبکە بەم چەشنە نابێت بە ژنێکی ڕاستەقینە و ساغ، وەک هەموو ژنە ڕاستەقینە و ساغەکانی ئەم شارە، وەک خوشکەکانی من و خوشکەکانی تۆ... تا ئەم کتێبخانەیە بمێنێت، لەگەڵ هەموو تێکچوون و زویربوونێکی بچوکدا ڕادەکاتەوە بۆ پشت کتێبەکان، خۆی لەو دیوارانی کتێبەکانەوە دەشارێتەوە. هەمیشە گووتوومە کە کتێبی زۆر لە ماڵدا ترسناکە. مرۆڤی نەخۆش دروستدەکات... هەڵبەت من لە ڕووی دەروونییەوە قسەدەکەم. چاکترین شت ئەوەیە ئەو ساتەی شوودەکات نەتوانێت خۆی لە ناو کتێبەکاندا بشارێتەوە، ئەوە باشترین شتە... من دەزانم کە تۆ لەبەر دەستکورتی کتێبەکان دەفرۆشیت، بەڵام باشدەکەیت... باشدەکەیت... دەبێت هیچ ئاسەوارێکی ئەم کتێبخانەیە لەم ماڵەدا نەمێنێت، دەبێت تەفروتونایبکەیت، بەڵکو سەوسەن بتوانێت وەک کەسێکی ئاسایی بژی».

فیکرەت گوڵدانچی کە بە ڕاستی بەرەو پیری دەچوو، زۆر لە ڕابوردووی خۆی لەگەڵ کتێب و زانستدا نائومێدبوو، بۆ بەهانەیەک دەگەڕا تورەیی خۆی بەرامبەر هەموو ئەو ڕابوردووە خاڵیبکاتەوە، بەڵام کتێبخانەکە بەشێکی گرنگی ژیانی سەوسەن بوو، ئەو جێگایە بوو کە تێیدا گەورەبووبوو. فیکرەت گوڵدانچیش دڵنیابوو تا ئەم کتێبخانەیە بمێنێتەوە سەوسەن ناتوانێت لە دونیای ئەم کتێبخانەیەوە بگوازێتەوە بۆ ژیانی ڕاستەقینە. ڕۆژانی ڕاپەڕین و ئەو شەوە تاریکەی لە ناو لاشەکاندا بردیە سەر، نیشانەی ئەوەبوون کە سەوسەن ناتوانێت بەرگەی

دەنگی ڕاستەقینەی ژیان بگرێت، ئەو نەخۆشییە گەورەیەی بەڵگەبوو کە ڕێگرێکی ڕۆحی گەورە لەبەردەم کچەکەدا وەستاوە و نامێڵێت دونیا قەبووڵبکات. ئەوەی تادێت تەنهاتر دەبێت، ئەوەی لە ناو دونیای وێنە بێدەنگەکاندا نەبێت ناژی، ئەوەی گەیشتۆتە ئەو تەمەنە و هاوڕێیەکی ڕاستەقینەی نییە، فیکرەتیان تووشی غەمێکی قووڵ دەکرد... دەبووایە پێش ئەوەی بمرێت شتێک بکات، توانای ژیان لەم کچەدا گەورەتر بکات... چی دەبێت گەر سبەینێ ئەم بمرێت... چی دەبێت و چۆن دەتوانێت بژی؟.

ڕۆژێک کە «فەیسەڵ نەجیب سەحاف» هات بۆ سەیری کتێبخانەکەی گوڵدانچی زۆر سەرسامبوو، ئەو هەموو ژیانی لە کڕین و فرۆشتنی کتێبخانە شەخسی و تایبەتییەکاندا بردبووە سەر، پیاوێکی باڵابەرزی باریک و ڕەقەڵە بوو، چەناگەیەکی درێژ و دەنگێکی منگن و قەوامێکی ڕێکی هەبوو. لە سەرەتای حەفتاکانەوە ئیشی کڕینی کتێبی کۆن و دەستنوسی کۆن و کتێبخانەی ئەو پیاوانەبوو کە لە ناکاو هەرەسیاندەهێنا و دەبایە دەستبەرداری هەموو ئەو شتانەبن کە لە ژیانیاندا کۆیانکردۆتەوە. فەیسەڵ سەحاف کە کتێبخانە گەورەکەی گوڵدانچی بینی زمانی گیرا و بۆ چەند ساتێک لەسەرسامیدا قسەی بۆ نەدەکرا، هەڵبەت پێشوەخت زۆر ناوبانگی ئەم کتێبخانەیەی بیستبوو، بەڵام کتێبخانەکە لەسەروو هەموو ئەو وەسفانەوە بوو کە بیستبووی، گەنجینەیەکی گەورەی بێوێنە بوو، کە پێشتر خەونی پێوە نەبینی بوو. دەبێت بڵێم فەیسەڵ سەحاف ئیشەکەی خۆی بە ئیشی مردووشۆرەکان و گۆڕهەڵکەنەکان دەشوبهاند، هەمیشە دەیگووت «کڕینەوەی کتێبخانەیەک، وەک دزینی هەموو یادەوەری و یادگاری مرۆڤێک وایە، وەک دزینی گەنجێتی وایە. کە کتێبخانەیەک دەکڕیتەوە، وەک ئەوەیە هەموو ئەو ڕۆژ و ساڵانە بکڕیتەوە

کە مرۆڤێک لە پەروەردەکردنی خۆیدا بردوێتییە سەر، ئەو سەعاتانە بدزێت کە تێیدا لەگەڵ پاڵەوانەکان و جیهانەکان و کێشەکانی دونیادا ژیاوە». لەگەڵ ئەو قسانەشدا فەیسەڵ سەحاف کتێب کڕێکی دڵڕەق بوو، گەرچی دەیزانی برسێتی هۆی سەرەکی ئەو کەسانەیە کە کتێب دەفرۆشن، بەڵام نرخەکانی تا دوا ئاست دادەبەزاند و کتێبەکانی وەها کەم بەها دەنرخاند، مرۆڤ بەزەیی بە زانست و عەقڵ و نوسیندا دەهاتەوە. لە دوای ڕاپەڕینەوە بازاڕی ئەو بەجۆرێکی بێوێنە هاتبووە گەرمی، لەسەرێکەوە سەدان ڕۆشنبیری بێ پول و برسی لە شاردا ڕۆژ دوای ڕۆژ دۆخیان دژوارتر و دژوارتر دەبوو، بەسەرێکی دیش خەڵکانێکی پارەداری نوێ هاتبوونە مەیدان کە دەیانویست ماڵ و نوسینگەکانیان بە کتێبخانەی گەورە و کتێبی ناوازە بڕازێننەوە. لەو سەردەمەدا دەستخستنی کتێبێکی ناوازە لەوانەبوو ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت، پەیوەندی تازەی بۆ دروستبکات، بە کەسانێکی خاوەن دەسەڵاتی بناسێنێت کە دەیانویست خۆیان وەک ئەهلی کتێب دەربخەن و وابنوێنن کە پلەی سیاسیان ئاوێنەی خولیایەکی فیکرییە. ئەو ڕۆژە کە فەیسەڵ سەحاف هات بۆ ماڵی گوڵدانچی لە چێوەی جۆرە کارێکی وەهادا بوو، هەندێک لەو پیاوانەی لە شاخ هاتبوونە خوارێ و بەڕاستی دەیانویست ڕوخسارێکی مەدەنی نیشانبدەن و وەک عاشقی کتێب و ڕۆشنبیریی دەربکەون، چاویان خستبووە سەر کتێبخانەکەی گوڵدانچی... ئەو کتێبخانەیەی دەیانزانی یەکێک لە جوانترین و سیحراویترین کچەکانی شار وەک ماسییەکی زێڕ لە حەوزێکی شیندا مەلەی لە ناودا دەکات.

فەیسەڵ پیاوێکی ڕاستگۆ و یەکسەرە و بێپێچ و پەنا بوو، دوای ئەوەی چایەکی لەگەڵ فیکرەت گوڵدانچیدا خواردەوە کە لە ڕاستیدا لە چا زیاتر شتێکی دیکەی نەبوو پێشکەش بە میوانەکانی بکات گووتی «لێتی ناشارمەوە کە کتێبخانەکەی ئێوە، تەنیا کتێبخانەیەکی

ڕاستەقینەیە لە ژیانمدا بینیبێتم، من کتێبخانە گەورەکانی بەغداد و تاران و ئەستەمبوڵم هەموو بینیوە، بەڵێ هەر سێ وڵاتەکە چووم بۆ ئەوەی سەیری کتێبخانەکانیان بکەم، من تەنیا کتێب کڕ نیم، من عاشقی کتێبخانەم. لێتی ناشارمەوە کە من زۆر کەم کتێب دەخوێنمەوە، من عاشقی خوێندنەوە نیم، بەڵکو عاشقی کتێبم، کتێبناسم نەوەک ڕۆشنبیر. ئەوە دوو شتی جیاوازن. ئا کاک گوڵدانچی مرۆڤ نابێت ئەوانە تێکەڵبکات. بەڕێز بەڕاستی لە شارە هەرە گەورەکانی خۆرهەڵات و لای خەڵکی هەرە زانا و داناى ئێران و تورکیا کتێبخانەی وەها دەوڵەمەندم نەبینیوە، بەڵێ قوربان هەموو شتێک ئاشکرایە، کتێبەکان بە خۆشەویستییەوە کڕدراون، بەخۆشەویستییەوە خوێنراونەتەوە، بە خۆشەویستییەوە هەڵگیراون... من کتێبەکان بۆ خۆم ناکڕم، گەر بۆ دوکانەکەی خۆم بیانکڕم بەو جۆرە سەر ڕاست نابم و بەو چەشنە ڕاستیت پێناڵێم. پێشتر ناوبانگی ئەم کتێبخانەیەم بیستوە، زۆر ناوبانگیم بیستوە، بەڵام ئەمڕۆ، بۆ شتێکی تر لێرەم، یەکێ لەسەرکردە سیاسییە ڕۆشنبیرەکانمان ڕایسپاردوم کتێبخانەکەی ئێوەی بۆ بکڕم، جەنابیان ئەندامی باڵای حیزبێکی ناسراون، ئەویش عاشقی کتێبخانەیە، بۆئەوەش پارەیەکی زۆر دەدات... پارەیەک چەند ساڵێک خۆت و خانمی کچتان بێکێشە پێیدەژین... بێکێشە». فیکرەت گوڵدانچی گوتی «ئا، کاک فەیسەڵ، بە هیچ جۆرێک ناتوانم هەموو کتێبخانەکە بەیەکەوە بفرۆشم، بەڵێ من بڕیارمداوە تەواوی کتێبخانەکە، هەتا دوا پەڕەی لە کۆڵ خۆم بکەمەوە، لە ڕاستیدا بڕیارمداوە لە پیریدا لە ماڵێکدا بژیم کتێبی تێدا نەبێت، ئەوە بڕیاری منە، ئاسان نییە مرۆڤ بکاتە بڕیاری لەوجۆرە، مەسەلەکە هەر تەنیا پەیوەندی بە بێسوودی کتێبەوە نییە لەم شارەدا، پەیوەندی بە درۆ و دەلەسەی نوسەران و ڕۆشنبیرانی شارەکەوە نییە کە هیچ نین جگە لە کۆمەڵێک زۆربلێی گەورە، بەڵکو پەیوەندی بەو

هەستەی خۆمەوە هەیە کە کتێبخانە جیاوازییەکی نییە لەگەڵ قەفەزدا، ئا بەڵێ... جیاوازی نییە لەگەڵ قەفەزێکی گەورەدا کە مرۆڤ لە ناویدا دیل بێت... بەڵام خانمی کچمان ناتوانێت بەوجۆرە دەستبەرداری کتێبەکان بێت، ناتوانم لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا هەموو کتێبخانەکەتان بۆ باریکەم، هەر نرخێکی دونیام بدەیتێ ناتوانم کاری وات بۆ بکەم، چونکە کاری وەها لەوانەیە سەوسەنی کچم بکوژێت... من پێشتر لەگەڵ دکتۆری زاواشمدا بیروبۆچوونم گۆڕیوەتەوە، بەڵێ دکتۆر رەفعەت ڕەمزی ئەگەر بیناسیت، ئەوە مێردی کچە گەورەکەمە، ئەویش ڕایوایە خۆمان لە کتێبخانەکە ڕزگاربکەین، بەڵام هەڵبەت شتەکان بەوجۆرە نابن... گەر هاوڕێ بەڕێزەکەتان کتێبخانەکەی دەوێت، دەبێت بەش بەش و لە کاتی جیاواز و بە خشتەیەک کە دوو ساڵ زیاتر بخایەنێت کتێبەکان بکڕێت... هەر بەو شێوەیەش بەش بەش ئەو پارەیەمان بداتێ کە بەڕێزتان باسیدەکەن... هەر بەوشێوەیە».

فەیسەل هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەبەر باخەڵی سەعاتێکی دەستی دەرهێنا و تەماشایەکیکرد و گووتی «گەر لەسەر ئەو بڕوایەبن کتێبخانەکە بفرۆشن، شتەکانی دیکە گرنگ نیین... وادەزانم هاوڕێکەم، گەر تەواوی چیرۆکەکە ببیستێت لە دۆخی ئێوەش تێدەگات، ئەمە جگە لەوەی لەو باوەڕەدام خۆشی خۆشحاڵ دەبێت، خۆشی دەتوانێت هەرجارە و بە جۆرە کتێبێک میوانەکانی سەرسامبکات، کتێبخانەکەی تۆ شتگەلێکی زۆری تێدایە کە مرۆڤ سەرسامدەکات، ئێستا گەر ئێوە ڕێگام بدەن چەند وێنەیەکی کتێبخانەکە دەگرم، وێنەی بەرگی چەند کتێبێک دەگرم، دەتوانم دواتر هەندێک لە وێنەکان بۆ خۆشتان بشۆمەوە... بۆ یادگار، وەک شاهید لەسەر ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان کتێبخانەیەک لە ماڵەکەتاندا هەبووە».

گوڵدانچی جارێکی دی سەری لەقاند و سەرلەنوێ فەرمووی لە

میوانەکە کردەوە، لەوێدا کابرا بە هێمنی کامێرایەکی دەرهێنا و کەوتە گرتنی وێنە.

فەیسەڵ کامێرایەکی زیناتی روسی گەورەی پێبوو، سەرەتا وێنەی هەموو پەیکەر و دەمامک و سندوقە نەخشدارە بچوکەکانی گرت کە هەندێکیان دەستکردی هونەرمەندە بودییەکان و هەندێکیشیان کاری دەستە و پەنجەی پەیکەرتاشە ئەفریقییەکان بوون. دواتر کەوتە ڕەسمگرتنی تاقی کتێبەکان لە کتێبە مێژووییە دێرینەکانەوە دەستی پێکرد و لە ڕەفی تایبەت بە هەژدە بەرگە گەورەکەی کتێبی «شیفا بە گوڵ» کۆتایی بەوێنەگرتن هێنا. تاک تاکیش هەندێک کتێبی وەک نمونە جیادەکردەوە و وێنەی دەگرتن، لەسەرەتاوە کتێبی «ڕۆڵی شەیتان لەسەرهەڵدانی بورکانندا» و دواجاریش بە وێنەگرتنی دەستنوسی «توانای مێخەک لەسەر زیندووکردنەوەی مردوان» کۆتایی بە هەمووشتێک هێنا.

سەوسەن لە جێگاکەی خۆیەوە بەساردی سەیریدەکرد، بەڵام دڵنیابوو ناتوانێت هیچ بکات. دەیزانی ماڵەکە خۆراکی تێدا نییە، دەرمانەکانی ئەو لە بازاڕی ڕەشدا بە پارەی گران نەبێت دەست ناکەون، حەبەکانی باوکی کە دەمێ ساڵە بۆ ڕاگرتنی فشاری خوێن دەیخوات پارەی زۆریان دەوێت. بۆ ئەوەی ئازارەکانی باوکیشی زۆرتر نەکات، هیچی نەگووت. لە مێژبوو دەیزانی باوکی بە پێچەوانەی جارانەوە ڕقی لەم کتێبخانەیە.

٣٤

لەدوای راپەڕینەوە مەسەلەی گەیشتنی وێنە و نامەی سێ ڕێبوارەکە ئاسانتر و خێراتربوو، لەودەمەدا ژمارەی ئەو کوردانەی لە خۆرئاواوە دەگەڕانەوە تا دەهات لە گەورەبووندا بوو، ئەوان پردێکی خێرای پەیوەندیان لە نێوان سێ پیاوە ئاوارەکە و ئێمەدا دروستکرد، بە جۆرێک بەردەوام دەمانزانی عاشقە غەریبەکانمان ئێستا لە کوێی جیهاندان. لە سەرەتای ساڵی نەوەدودوودا لە ناکاو خولیا و ئارەزوویەکی کۆیی لە شاردا سەریهەڵداو هەموو دەمانویست هەفتە دوای هەفتە هەواڵی سێ ڕاوکەرەکە بزانین. هەندێک کەس نەخشەی تایبەتیان کڕی و لەسەر ئەو نەخشەیە هێڵی سەفەری ڕێبوارەکانیان دروستدەکرد، بەڵام زۆربەی ئەو هێڵانە هێڵی خەیاڵیبوون کە پەیوەندییەکیان بە ڕاستییەوە نەبوو، هەندێ جار دەمانبینی کەسانێک لە چایخانەکاندا لەدەوری نەخشەیەک کۆبوونەتەوە و لەسەر چارەنوس و ئاڕاستە و ئەگەرەکانی پێشدەم سێ عاشقەکە قسەدەکەن، بەڵام زۆربەی قسەکان ڕاوبۆچوونی بێمانا و بێسەروبەرە بوون. لە شوباتی نەوەدودوودا دوو وێنە لە بازاڕدا دەرکەوتن یەکێکیان وێنەی کامەران سەلما بوو، لە گوندێکی ناو چیا بەرزەکانی سنووری پیرۆ و ئەکوادۆر، ئەوی دیشیان وێنەیەکی مەنسور ئەسرین بوو لەگەڵ تووتییەکی گەورە... ئێجگار گەورەدا، لە شوێنێکی نادیاردا. ئێستا ئەلبومی وێنەکانی سەوسەن تادەهات گەورەتر و گەورەتر دەبوو،

شـەوان دەسـتی دەخسـتە سـەر وێنـەکان و چـاوی لێکدەنـا و خـۆی لـە جیهانێکـی دیکـەدا دەبینییـەوە، لـەدوای شـەوی نـاو لاشـەکان و نەخۆشـییە سـەختەکەی خۆیـەوە ئارەزوویەکـی نەمابـوو بۆن و دەنگـی دەرەوە زۆر بچن بەسـەریدا، ئێسـتا ئاسانتر دەچووە نـاو وێنـەکان و ڕوونتـر دەیتوانـی ببینێت عاشـقەکانی لـە کوێـن و بەکوێـادا دەڕۆن، بـەردەوام ئەتڵەسـێکی گـەورە بـە کراوەیـی لەسـەر مێزەکـەی دانرابـوو. ئـەوکات نـە پڕوشـەی خوشـکی، نـە فیکرەتـی باوکـی و نـە هیـچ کەسـێکی تـر لـە بنەماڵـەی گوڵدانچـی ڕاسـتەوخۆ دەربـارەی ڕێبـوارەکان قسـەیان لەگەڵـدا نەدەکـرد، بـەڵام بـەو ئەتڵەسـە گەورەیـەدا هەمـوو دەیانزانـی کـە بـەردەوام خەیاڵـی لای ئـەو سێ ڕێبوارەیـە. هەنـدێ جـار لـە بۆنـە و کۆبوونـەوە گەورەکانـدا، کاتێـک هەمـوو ژنـان و بـوکان و کچانـی گوڵدانچی کۆدەبوونـەوە، دەیبیسـت یەکێـک لـە ژێـر لێویـەوە پێیدەڵێـت «بەملـی شـکاویان، ئینشـەڵا قـەت ناگەڕێنـەوە... توخودا ئـەوە زەوقـە بەوانـەوە، سـەیریکە خـۆی دەڵێیـت مریشـکی نەخۆشـە، توخـودا حەزیـان لـە چـی کـردوە»، دەیبیسـت یەکێکـی دی دەڵێـت «چۆن وادەڵێیت، سەوسـەن زۆر زۆر جوانـە... زۆر زۆر»، دەیبیسـت یەکێکـی دی دەڵێـت «جوانـە... بـەوە دەڵێیـت جـوان... سـەیریکە دەڵێیـت کرمـە و کراسـی لەبەر کـردوە». بـەڵام سەوسـەن هەرگیـز دەسـتی لـە ویقـاری خـۆی بەرنـەدەدا، ویقـاری ئەمیرەیەکـی ڕەنـگ پەڕیـو و بیمـار، کـە هەمیشـە کـەم قسـەدەکات، کـە قسەشـدەکات شـتێک دەڵێـت جیـاواز لەوانـی دی.

هـەر لـەو دەمـەدا بـوو سـاقی مەحمود دوای کۆمەڵێک پشـکنینی پزیشـکی دڵنیابـوو کـە چیتـر تامـردن ناتوانێـت گۆرانـی بڵێـت، لـە ڕاسـتیدا هیـچ هۆیەکـی فیزیکـی بـۆ ئـەو دەردە لەبەردەسـتدا نەبـوو، بـەڵام پشـکنینەکان دەریانخسـت سـاقی لـە ڕووی دەروونییـەوە ئێجـگار بیمـارە و هـەر زۆر لـە خۆکردنێکـی دەسـتکرد بـۆ تێپەڕاندنـی ئـەو دۆخـە دەشـێت دەرەنجامـی خراپـی هەبێـت. یەکێـک لـە دکتـۆرەکان پێیگـووت گـرێ دەروونییـەکان بـە

کەللە ڕەقی چارەسەر ناکرێن، مرۆڤ دەبێت لێگەڕێت زەمان و گۆڕانی هەلومەرجەکان ئەو کارە لە ئەستۆبگرن. ساقی دەنگی خۆی وەک شەهیدی دیکتاتۆرییەت و خۆشی وەک یەکێک لە قوربانییەکانی بەعس تەماشادەکرد. لەدوای ڕاپەڕینەوە ساقی وەک نوێنەری مەنسور ئەسرین ڕۆڵێکی گەورەی لە ناو هونەرمەند و شاعیرەکانی شارە بچکۆلەکەماندا بینی تا یادەوەری مەنسور هەر زیندوو و بەرز ڕابگرن، لەو دەمەدا جارێکی تر لە هەندێک گۆڤاری ئەدەبیدا هەندێک قەسیدە و شیعری بچوک دەرکەوتنەوە کە پێشکەش بە «ڕێبوارەکەی ڕێگای عەشق، مەنسور ئەسرین» کرابوون. هەتا لە یەکێک لە گۆڤارە ئەدەبییەکاندا شیعرێکی درێژمان بە ناونیشانی «یاداشتی سەفەرە ئەفسوناوییەکەی مەنسور» خوێندەوە، کە شاعیرێکی ناسراو و ناوداری ئەو سەردەمە نوسیبووی، جگە لەوە تابلۆیەکی سەرنجڕاکێش و بێناونیشانیش دەرکەوت کە ئەودەم ڕەواجێکی زۆری پەیداکرد، تابلۆکە گەڕیدەیەکی گەنجی کوردپۆش نیشاندەدات بە خۆی و گۆچان و تورەکەیەکەوە بە ڕێگایەکی درێژدا دەڕوات و لەبەردەمیدا دیمەنی ئەفسوناوی کۆمەڵێک جەنگەڵ و شاری دوور کراوەتەوە، تابلۆکە ناوی «گەشتەکەی مەنسور»ی لێنرابوو، تابلۆکە بەشێوازی شێوەکارانی شەست و حەفتای کورد ڕەسمکرابوو، ڕیالیست بەڵام جەنجاڵ بە سێ ڕەنگە سەرەکییەکەی ئێمە، ڕەنگە نەتەوایەتییەکانمان سەوز و سوور و ڕەش، سەوز وەک سەمبولی هەستانەوەی ئەبەدی و نەمریمان، سوور ڕەنگی خوێنی شەهیدانمان، ڕەش ڕەنگی ئازاری هەمیشەیی و پرسەی ناکۆتامان. تابلۆکە هەر زوو بەشێوەی کارتی بچوک چاپکرا و لە هەندێ جێگادا بۆ فرۆشتن خرایە پێشی جامخانەکانەوە. لە یەکێک لە ئێوارە کۆڕەکاندا کە سەوسەن فیکرەت خۆشی لەوێ بوو، شاعیرێکی لاو شیعرێکی لەسەر «باڵندە موبارەکەکان» خوێندەوە و ڕاشکاوانە مەنسوری وەک «ڕاوکەرێکی موقەدەس» وێناکرد... شاعیرە

شـەوان دەسـتی دەخسـتە سـەر وێنـەکان و چـاوی لێکدەنـا و خـۆی لـە جیهانێکـی دیکـەدا دەبینییـەوە، لـەدوای شـەوی نـاو لاشـەکان و نەخۆشـییە سـەختەکەی خۆیـەوە ئارەزووییەکـی نەمابـوو بـۆن و دەنگـی دەرەوە زۆر بچـن بەسـەریدا، ئێسـتا ئاسـانتر دەچـووە نـاو وێنـەکان و ڕوونتـر دەیتوانـی ببینێت عاشـقەکانی لـە کوێـن و بەکویـادا دەڕۆن، بـەردەوام ئەتڵەسـێکی گـەورە بـە کراوەیـی لەسـەر مێزەکـەی دانرابـوو. ئـەوکات نـە پرۆشـەی خوشـکی، نـە فیکرەتـی باوکـی و نـە هیـچ کەسـێکی تـر لـە بنەماڵـەی گوڵدانچـی ڕاسـتەوخۆ دەربـارەی ڕێبـوارەکان قسـەیان لەگەڵـدا نەدەکـرد، بـەڵام بـەو ئەتڵەسـە گەورەیـەدا هەمـوو دەیانزانـی کـە بـەردەوام خەیاڵـی لای ئـەو سـێ ڕێبوارەیـە. هەنـدێ جـار لـە بۆنـە و کۆبوونـەوە گەورەکانـدا، کاتێـک هەمـوو ژنـان و بـوکان و کچانـی گوڵدانچی کۆدەبوونـەوە، دەیبیسـت یەکێـک لـە ژێـر لێویـەوە پێیدەڵێـت «بەملـی شـکاویان، ئێنشـەڵا قـەت ناگەڕێنـەوە... توخودا ئـەوە زەوقـە بەوانـەوە، سـەیریکە خـۆی دەڵێیـت مریشـکی نەخۆشـە، توخـودا حەزیـان لـە چـی کـردوە»، دەیبیسـت یەکێکـی دی دەڵێـت «چـۆن وادەڵێیت، سەوسـەن زۆر زۆر جوانـە... زۆر زۆر»، دەیبیسـت یەکێکـی دی دەڵێـت «جوانـە... بـەوە دەڵێیـت جـوان... سـەیریکە دەڵێیـت کرمـە و کراسـی لەبەر کـردوە». بـەڵام سەوسـەن هەرگیـز دەسـتی لـە ویقـاری خـۆی بەرنـەدەدا، ویقـاری ئەمیرەیەکـی ڕەنـگ پەڕیـو و بیمـار، کـە هەمیشـە کـەم قسـەدەکات، کـە قسەشـدەکات شـتێک دەڵێـت جیـاواز لەوانـی دی.

هـەر لـەو دەمـەدا بـوو سـاقی مەحمود دوای کۆمەڵێک پشـکنینی پزیشـکی دڵنیابـوو کـە چیتـر تامـردن ناتوانێـت گۆرانـی بڵێـت، لـە ڕاسـتیدا هیـچ هۆیەکـی فیزیکـی بـۆ ئـەو دەردە لەبەردەسـتدا نەبـوو، بـەڵام پشـکنینەکان دەریانخسـت سـاقی لـە ڕووی دەروونییـەوە ئێجـگار بیمـارە و هـەر زۆر لـە خۆکردنێکـی دەسـتکرد بـۆ تێپەڕاندنـی ئـەو دۆخـە دەشـێت دەرەنجامـی خراپـی هەبێـت. یەکێـک لـە دکتـۆرەکان پێیگـووت گـرێ دەروونییـەکان بـە

کەللە ڕەقی چارەسەر ناکرێن، مرۆڤ دەبێت لێگەڕێت زەمان و گۆڕانی هەلومەرجەکان ئەو کارە لە ئەستۆبگرن. ساقی دەنگی خۆی وەک شەهیدی دیکتاتۆرییەت و خۆشی وەک یەکێک لە قوربانییەکانی بەعس تەماشادەکرد. لەدوای ڕاپەڕینەوە ساقی وەک نوێنەری مەنسور ئەسرین ڕۆڵێکی گەورەی لە ناو هونەرمەند و شاعیرەکانی شارە بچکۆلەکەماندا بینی تا یادەوەری مەنسور هەر زیندوو و بەرز ڕابگرن، لەو دەمەدا جارێکی تر لە هەندێک گۆڤاری ئەدەبیدا هەندێک قەسیدە و شیعری بچوک دەرکەوتنەوە کە پێشکەش بە «ڕێبوارەکەی ڕێگای عەشق، مەنسور ئەسرین» کرابوون. هەتا لە یەکێک لە گۆڤارە ئەدەبییەکاندا شیعرێکی درێژمان بە ناونیشانی «یاداشتی سەفەرە ئەفسوناوییەکەی مەنسور» خوێندەوە، کە شاعیرێکی ناسراو و ناوداری ئەو سەردەمە نوسیبووی، جگە لەوە تابلۆیەکی سەرنجڕاکێش و بێناونیشانیش دەرکەوت کە ئەودەم ڕەواجێکی زۆری پەیداکرد، تابلۆکە گەڕیدەیەکی گەنجی کوردپۆش نیشاندەدات بە خۆی و گۆچان و تورەکەیەکەوە بە ڕێگایەکی درێژدا دەڕوات و لەبەردەمیدا دیمەنی ئەفسوناوی کۆمەڵێک جەنگەڵ و شاری دوور کراوەتەوە، تابلۆکە ناوی «گەشتەکەی مەنسور»ی لێنرابوو، تابلۆکە بەشێوازی شێوەکارانی شەست و حەفتای کورد ڕەسمکرابوو، ڕیالیست بەڵام جەنجاڵ بە سێ ڕەنگە سەرەکییەکەی ئێمە، ڕەنگە نەتەوایەتییەکانمان سەوز و سوور و ڕەش، سەوز وەک سەمبولی هەستانەوەی ئەبەدی و نەمریمان، سوور ڕەنگی خوێنی شەهیدانمان، ڕەش ڕەنگی ئازاری هەمیشەیی و پرسەی ناکۆتامان. تابلۆکە هەر زوو بەشێوەی کارتی بچوک چاپکرا و لە هەندێ جێگادا بۆ فرۆشتن خرایە پێشی جامخانەکانەوە. لە یەکێک لە ئێوارە کۆڕەکاندا کە سەوسەن فیکرەت خۆشی لەوێ بوو، شاعیرێکی لاو شیعرێکی لەسەر «باڵندە موبارەکەکان» خوێندەوە و ڕاشکاوانە مەنسوری وەک «ڕاوکەرێکی موقەدەس» وێناکرد... شاعیرە

لاوەکە کاتێک لە خوێندنەوەی شیعرەکە بووەوە، بێئەوەی شەرمبکات یان بترسێت، دەستنوسی قەسیدەکەی خۆی بە قەدکراوی دایە دەست خانمی سەوسەن گوڵدانچی کە ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت لە ڕیزی پێشەوە دانیشتبوو و گووتی «خانمی بەڕێز فەرموو... ئەم قەسیدەیە لە بنەڕەتدا بۆ ئێوە نوسراوە، موڵکی ئێوەیە، وەک چۆن باڵندە موقەدەسەکانیش هەر موڵکی ئێوەن.. باڵندە غەمگینە موقەدەسەکان». ئەوە یەکەمجار بوو، ناوی «باڵندە غەمگینە موقەدەسەکان» ببیستین، پێشتر کەس ناوێکی لەوجۆرەی لە باڵندەکان نەنابوو. هەموو بینیمان سەوسەن بە هێمنی خەندەیەکی بۆ گەنجەکە گرت و بەدەنگێکی ناسک و نرم گووتی «سوپاس، زۆر سوپاس» و هیچی دیکەی نەگووت.

لە زستان و بەهاری ساڵی ئەوەدوودودا نوێنەرەکان چەندین جار چوون بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی و بەستە وێنەی تازەیان بۆ سەوسەن برد، هەندێک لەو وێنانە کەوتنە دەستی ئێمە و هەندێکی دیشیان بۆ سەوسەن فیکرەت گیرابوون و تەنیا ئەو بۆی هەبوو زەرفە تایبەتییەکانیان بکاتەوە. ئەوکات قەلەندەر ئاموون ئازادانە چەکی هەڵدەگرت و هەمیشەش بە هاوڕێتی کۆمەڵێک چەکدار بە ڕێگاوەبوو، بەردەوام وا خۆی بەستبوو وەک ئەوەی بچێت بۆ شەڕێکی قورس. زۆربەی کات لە نێوان بنکەکانی حیزبدا لە هاتوچۆدا بوو، خۆی وەک بەرپرسێکی عەسکەری گەورە نیشاندەدا کە کاروباری زۆر گرنگ و ترسناکی لە ئەستۆیە، بەڵام سەرقاڵییەکانی هەرگیز ئەوەیان لە بیرنەبردەوە لە کاتی پێویستدا سەردانی گوڵدانچییەکان بکات، غەریزەیەکی زیرەکانە پێیگووتبوو کە هەمیشە بەر لەوەی پێبخاتە ماڵی ئەوانەوە، چەکەکەی دانێت و وەک پیاوە سادەکەی جاران خۆی دەربخات، هەتا هەندێ جار ئامۆژگاری چەکدارەکانیشی دەکرد لەبەردەرگای ماڵەکە دووربکەونەوە و خۆیان دەرنەخەن... قەلەندەر لە دڵەوە دڵنیابوو، نە فیکرەت گوڵدانچی و نە

کچەکەی لەو جۆرە کەسانە نین حەزیان لە بینینی پیاوی چەکدار بێت. ئەو هەمیشە بە دەنگی یەکێک کە دەیەوێت شتی گرنگ بە جۆرێکی ئاسایی بگێڕێتەوە، باسی لە شوێنی خالید ئاموون لەسەر نەخشەکان دەکرد، هەرگیز درۆی نەدەکرد، هەرگیز شتێکی زیادی نەدەخستە سەر ئەو چیرۆکانەی دەیانزانێت، بە هێمنی و بەئەندازەی ئەو زانیارییە کەم و وشکانەی لە ناو نامەکانی خالیددا هاتبوون هەموو شتێکی دەگێڕایەوە، بە پێچەوانەی مەنگوڕەوە کە فەنتازیاکانی خۆی دەخستە سەر هەموو چیرۆکێکی بچوک تا سەوسەن زۆرتر و زۆرتر سەرسامبکات. مەنگوڕ دەیگووت کەشتییەکەی کامەران بیست ڕۆژ لە دەریادا ونبووە و دواتر بەکۆمەکی کۆمەڵێک دولفین ڕێگای وشکانیان دۆزیوەتەوە، دەیگووت کامەران لە باشووری ئەفریقا فێری سەمای خێڵەکانی زوڵوز بووە، لە ئەمریکای باشوور باڵندەیەکی سێ سەری گرتووە کە ئێستا بووە بە یەکێک لە شتە عاجباتییەکانی دونیا، لە جێگایەکی دیش مەیمونێکی بینیوە هەموو ددانەکانی ئاڵتون بوون.

توانای مەنگوڕ لەسەر دروستکردنی چیرۆک دڵی سەوسەنی زۆر خۆشدەکرد... وەک منداڵێک بەقسەکانی پێدەکەنی، فیکرەت لە ژیانیدا کچەکەی بەوجۆرە نەبینی بوو، پێشتر کەس نەیتوانی بوو بەوشێوەیە سەوسەن بخاتە پێکەنین. دیارە سەوسەن دڵنیابوو کە مەنگوڕ درۆدەکات، بەڵام شێوەی دانیشتن و جۆری داڕشتنی بۆ ڕستەکان دڵیان خۆشدەکرد، شتێکیان پێدەبەخشی نە لە ژیان و نە لە کتێبەکاندا نەیبینی بوو... مەنگوڕ هەر جارێک سەرنجی دڵخۆشی و بەختەوەری سەوسەنی بدایە، پتر درۆیدەکرد، تا جارێکیان گووتی کامەرانی سەلما لە ئەفریقا توتییەکی لە دارستانێکدا گرتووە کە هەموو مەم و زینی ئەحمەدی خانی لەبەربووە، سەوسەن بەو درۆیە هێندە پێکەنی خەریک بوو ببورێتەوە...

فیکرەت هەمووجار کیژەکەی ئاگاداردەکردەوە کە توانای مەنگوڕ لەسەر

قسـەی خـۆش و خەیـاڵ بەشـێکە لـە کولتـووری چەقۆکێشـانی شـارەکە، بەشێکە لـە ژیانـی ڕۆژانەیـان، بـەڵام ئەمـە بـە مانـای ئـەوە نییـە کـە خەڵکـی پـاک و بێزیانـن، بەڵکـو لەپـاڵ ئـەو قسەخۆشـی و زمـان شیرینییەشـدا دەتوانـن گەلێـک شـەڕانی بـن... ئـەوەی سەوسـەن بێئەنـدازە بەقسـەکانی مەنگوڕ مەست دەبێت، ئـەوەی ئـەم پیاوە نیمچە خوێنـدەوار و بازاڕییـە کـە ناوبانگێکـی خراپـی هەیـە، کیژەکـە بەوجـۆرە دەجوڵێنێـت سەرسامیدەکرد. فیکرەت لـە دڵـەوە خۆشـحاڵ بـوو کـە سەوسـەنی دەبینـی وەهـا پێدەکەنێت، خۆشـحاڵ بـوو کـە هاتنـی مەنگـوڕ دەیگەشـاندەوە، خۆشـحاڵ بـوو بەئاشـکرا و بێشـەرم پرسـیاری دەربـارەی شـوێن و ئاڕاسـتەی کامـەران لێدەکات، بـەڵام نەیدەویسـت تێبکەوێـت و نەزانێـت مەنگـوڕ چ جـۆرە ئادەمیزادێکـە... چ توخمێکـی ئاڵـۆز و سـەیری مرۆڤـە کـە سەوسـەن ئاسـان ناتوانێـت تێیبگات. هەمـوو ئـەو حیکایەتانـەی بـۆ سەوسـەن گێڕایـەوە کـە لـە بـازاڕدا لەسـەر مەنگـوڕ لەسـەر زاران بـوون، دزییەکانـی، ڕۆڵـی لـە تاڵانییەکانـی دوای ڕاپەڕینـدا، ئـەو غەریـزە سـەرەتاییەی بـۆ سـووتاندنی شـوێنەکان، پەیوەنـدی بەقاچاغچییـە گەورەکانـەوە، دەسـتی لـە فرۆشـتنی زۆر ئامێـر و کاڵای گرنگـی وڵاتـدا بـە ئێرانییـەکان. سەوسـەن جارێـک بـە باوکـی گـووت «گوڵدانچـی، تـۆ دەزانیـت، مـن ڕۆژێـک بـە مەنگـوڕم گـووت، هـەر هەڵەیـەک یـان هـەر شـتێک بـکات، لای مـن گرنـگ نییـە... گرنـگ ئەوەیـە چیرۆکەکانـی سـەر بـە دنیایەکـی تـرن... هەسـت ناکەیـت، کـە چیرۆکەکانـی سـەر بەدنیایەکـی تـرن... ئـەوەت بـەلاوە گرنـگ نییـە؟». فیکـرەت گوڵدانچـی نیگایەکـی کچەکـەی کـرد و بێئـەوەی بتوانێـت وەڵامیداتـەوە، پێکەنـی، دڵنیابـوو هـەر شـتێک سـەر بـە دونیایەکـی دی بێـت کیژەکـەی سەرسامدەکات.

لەسـەرەتای سـاڵی نـەوەدودوو دا هەڵمەتـە گەورەکانـی پڕوپاگەنـدە بـۆ یەکـەم هەڵبژاردنـی دیموکراتـی لـە شـارەکەماندا دەسـتی پێکـرد، یەکێتـی نیشـتیمانی و پارتـی دیموکـرات دوو گەورەتریـن هێـزی نـاو ئـەو هەڵبژاردنـە

بوون، ئەو ڕۆژانە هەموو لە جۆش و خرۆشدا دەکولاین، لەو هەلمەتە گەورانەدا هەمووان وەک مندالی لاسار و بێمێشکمان لێهاتبوو. قەلەندەر ئاموون لە ڕۆژانی بەر لە هەلبژاردندا ڕەفتەیەکی زەردی دەکردە ملی و جامانەیەکی سووری دەکردە سەری و پێکڕای کچ و کوڕی خێزانەکەی لە جلی زەرد هەلدەکێشا و لە پیکابێکی سەر بەتالدا دەیگێڕان، لەدوای پیکابەکەی خۆیەوە چەندەها پیکابی تر هەبوون کە ئەوانیش پڕبوون لە کچان و کوڕانی زەردپۆش و هەمووش بەیەک دەنگ هاواریاندەکرد «کاکە... کاکە». هەموو سەرنجماندا کە کەژاوەی ئامونییەکان ئێواران چەند جارێک بە پێشدەم بارەگاکەی مەنگوڕی بابەگەورەدا دەڕوات، کە سەرتاپای دیوار و ستارە و پەنجەرەی بە بۆیەیەکی سەوز ڕەنگکرابوون، هەر کات زنجیرە پیکابەکان دەگەیشتنە ئاستی بارەگاکە، کەمێک خاویاندەکردەوە و پێکڕا دەنگیان بەرزدەکردەوە و هەموو بە یەک گەروو هاواریاندەکرد «بژی بارزانی... بژی بارزانی موستەفا... بژی... بژی». بە چەشنێک هاواریاندەکرد پەنجەرەی بارەگاکەی مەنگوڕ دەلەرییەوە. مەنگوڕ و کوڕەکانی دەوروبەری تا سێ ڕۆژ بە هێمنی خۆیان گرت و شتێکی ئەوتۆیان پیشان نەدا، لە ڕۆژی چوارەمدا پێش ئەوەی ئامونییەکان لە مال بێنەدەرێ، چەندین پیکابی پڕ لە کچ و کوڕی سەوزپۆش، کە یەکی پەڕۆیەکی سەوزیان بەستبوو بە ناوچاوانیانەوە، چوونە بەردەمی مالی قەلەندەر ئاموون و بۆ نیوسەعات زیاتر پڕ بە هەموو گەرویان دەیانقیژاند «مامە... مامە». دەنگەکان وەها گەرم و بەرز و توڕەبوون لە کۆلانە دوورەکانیشەوە دەبیستران. ئامونییەکان ئەو ئێوارەیە نەیانتوانی کەژاوە ڕۆژانەکەی خۆیان ڕێکبخەن. هەر هەمان شەو دەستێکی نەناس مالی «فەوزی بەگی ئاموون» و «لەتیف ئاموون» و «عەبدولا بەگی ئاموون»ی سووتان. وەک هەمیشە ئاگرەکان هیچ زیانێکی گیانی لێنەکەوتەوە، بەلام هەر سێ خانووەکە بوون بە

خۆڵەمێشی تەواو... هەتا ئاسن و پەنجەرە و شێلمانەکانیشی توانەوە و بوون بە خۆڵێکی نەرم. هەر لەو شەوەوە ژیانی ئامووزنییەکان کەوتە دوودڵی و مەترسییەوە، دەستێکی نەناس، شەو دوای شەو عەلاگەی پڕ پیسایی و شیاکە و تەرسی دەخستە ماڵەکانیان، زەرفی پڕ زیڵی دەگرتە پەنجەرەکانیان، دەفتەری دەهاویشتە حەوشەکەیان کە لەسەر بۆ ئەوسەر بە وێنەی کەر پڕکرابووەوە، تورەکەی بچکۆلانە کە پڕبوون لە قاوغی فیشەک، بوتڵی پلاستیک کە پڕبوو لە میز، شوشە کە بە قژی سووتاو ئاخنرابوو، چەقۆی خوێناوی، سوژنی ڕەش، دوپشکی تۆپیو و سەرە ماری پانکراوە و شتی سەیری دیکەش. پەیوەندیکردنی ئامووزنییەکان بەسەرانی حیزبەوە بۆ داوای کۆمەک و هاریکاری شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکردن، دۆخی ئامووزنییەکان تا ماوەیەکی دوورو درێژ بەو چەشنە مایەوە. هەتا تکای فەوزی بەگ لە فیکرەت گوڵدانچی کە دەسەڵات و قسەی خۆی لای مەنگوڕ بخاتە کار، سوودێکی نەبوو. چونکە مەنگوڕ وەک هەمیشە تەواو خۆی لە دیمەنەکە دوورخستەوە و وابڵاوبووەوە کە بەسەفەرێکی تایبەت چووە بۆ ئێران تا لە تارانەوە بەتەلەفون قسە لەگەڵ کامەرانی سەلمادا بکات... مەنگوڕ تا دوای تەواوبوونی هەڵبژاردنەکان خۆی دەرنەخستەوە.

## ٣٥

کە لە ساڵی نەوەدوچواردا شەڕی ناوخۆ دەستی پێکرد، شتێکی ئەوتۆ لە کتێبخانە و دیکۆرە گرانبەهاکانی ماڵی فیکرەت گوڵدانچی نەمابوون، لە نێوان ئەو دوو ساڵەدا فەیسەڵ نەجیب بەچەند تەکانێکی جیاواز، هەموو کتێبخانەکەی لە گوڵدانچی کڕییەوە، بەڵام بەوەوە نەوەستا، بەڵکو تەواوی پەیکەرەکان و تەواوی کەرەستە ڕەنگینەکانی دیکۆر و تابلۆ گرانەکان و فەرشە ئاوریشمییەکانیشی لە چنگی دەرهێنا. وەک لە ڕێکەوتنی یەکەمدا پێکهاتن، فەیسەڵ دەبایە جار دوای جار و بە مەودای وەرزێک لە نێوان هەموو نۆبەتێکدا کتێبەکان بگوازێتەوە. سەوسەن دەبایە لەسەرەخۆ و هێمن ئاوابوونی دونیای جارانی خۆی ببینێت، زۆر لەسەرخۆ، بەجۆرێک بتوانێت ئازارەکەی بەسەر مەودایەکی زەمەنی دووروودرێژدا بەشبکات. دەبایە بە هێمنی وای لێبکرێت لەو زیندانە ئەبەدییەی ناو کتێبەکان بێتەدەرێ و وەک کچێکی ئاسایی بژی، دەبایە بزانێت ڕۆژێک دێت کە خۆی و قەرەوێڵەکەی بەتەنیا لەو ژوورە بەرین و گەورەیەدا دەمێننەوە. فەیسەڵ هەموو جارێک دەهات و بێئەوەی سەیری چاوی سەوسەن بکات، بێئەوەی بوێرێت ئاوڕی لێبداتەوە، ڕیزێکی گەورەی لە کتێبخانەکە دەبرد، شەوان کۆڵهەڵگرەکان دەهاتن و سەفتەسەفتە کتێبەکانیان دەخستە ناو کارتۆنی تایبەتییەوە و بە سرێشی تایبەتی لاکانیان دەگرتن و بەتیپی پان دەمی کارتۆنەکانیان

دەبەست و پەتی تایبەتیان تێهەڵدەکێشان و بەیانی ڕۆژی دوایی بە ماشێنی تایبەتی بۆ جێگایەکی نادیار باریاندەکردن. فیکرەت بەرابەر هەر بارێک بڕێک پارەی وەردەگرت کە بشێت بۆ ماوەیەک لە دابینکردنی ژیانێکی گونجاوداً بەکاریبهێنێت. بەڕوویەک بەختەوەریوو کە لەم ڕۆژە سەختانەدا شتێکی هەیە پێیدەژی و بەڕوویەکیش غەمگین بوو کە لەسەرەخۆ شورا و کۆڵەکە و پایەکانی ژیانێکی دووروودرێژی دەڕوخاند کە خۆی لە منداڵییەوە بۆ کچەکەی دروستکردبوو. ئەو شەوانەی فەیسەڵ سەحاف کتێبەکانی دەپێچایەوە، بێدەنگییەکی زۆر قووڵ و کوشندە باڵی بەسەر ماڵی گوڵدانچیدا دەگرت، بێدەنگییەک لەوانەی تاریکی لە ناویدا چڕتر و چڕتر دەبێتەوە، بێدەنگییەک هەستدەکەیت لە بێزمانییەکی گەورەی ڕۆحەوە هاتووە، لەوەوە هاتووە کە چیتر دەنگ و هاوار سوودی نییە... لە گەیشتنی قریشکەی ناو ڕۆحی مرۆڤەوە بە بونبەست سەری هەڵداوە. ئەو شەوانە هیچیان خەویان لێ نەدەکەوت، فیکرەت گوڵدانچی لە قاتی خوارەوە گوێی دەگرت و ئاگاداربوو کە سەوسەن ناتوانێت بخەوێت، بەهێمنی سەردەکەوت بۆ سەرەوە و لە تاریکیدا دەوەستا و گوێی دەنا بەدەرگاکەوە و دەیزانی سەوسەن دەگری. دەهاتە خوارێ و دەرگاکەی لە خۆی دادەخست و ئەویش لەجێگاکەدا دەستیدەکرد بە گریان، بەڵام دەیزانی کە سەوسەن دێت و بەهێمنی دادەبەزێت و گوێ دەنێت بە دەرگای ژوورەکەی باوکییەوە و دەبیستێت کە گوڵدانچی دەگری. هەردووکیان ئاگایان لە گریانی یەک بوو، هەردووکیان هەستیان بەو تاریکییە گەورەیە دەکرد کە قووتیان دەدا... سەوسەن دەیزانی باوکی دەیەوێت بە لەناوبردنی کتێبخانەکە لەو بێدەنگییە دەربهێنێت، ئەو بێدەنگییەی کە گوڵدانچی خۆی بەدرێژایی ژیانی تێیدا ژیابوو؛ ئەو بێدەنگییەی کتێبەکان و ئەتڵەسەکان و وێنەکان وەک دیوارێک لە چواردەوەری بەرزیانکردبووەوە، بێدەنگییەک هەژاری

و تەنهایی قوولتریانکردبووەوە، جەنگ قوولتریکردبووەوە، چاوەڕوانی قوولتریکردبووەوە... ونبوونی هەر بەشێک لە کتێبخانەکە ئەو هەستەی لای سەوسەن جێدەهێشت کە دیوارێک لە ژیانی دەڕوخێت، ئەو هەستەی جار دوای جار زیاتر و زیاتر ڕووتدەبێتەوە، زیاتر و زیاتر لاوازدەبێت، زیاتر و زیاتر بێپەرێز و بێقەڵغان بەرابەر دونیا دەوەستێت، هەستێکی تیژ و چەقۆئاسابوو تیژ لە ناوەوە دەیبڕی. ئێستا شەوان دۆعایدەکرد سێ ڕێبوارەکە زووتر بێنەوە، ژیانی پێویستی بە شتێکی گەورە بوو، دەبایە شتێک هەبێت جێگای کتێبەکان بگرێتەوە، شتێک وەک دیوار خۆی لە پشتییەوە بشارێتەوە و بژی... تادەهات شارەکە لەبەرچاوی ناخۆشتر و ترسناکتر دەبوو... بەڵام جیهان... جیهان کە ئەو گەڕیدانە تێیدا وێڵن، جوانتر و ئارامتر و هێمنتر لەبەرچاوی دەردەکەوت... کە بیری لەم شارە دەکردەوە بۆنی مردووەکانی بەیادا دەهاتەوە، دەموچاوی شێوێنراوی جەلادە کوژراوەکانی بەیادا دەهاتەوە، دەنگی گوللەکانی ڕاپەڕینی بەیادا دەهاتەوە، بۆنی باروتی بەیادا دەهاتەوە... شەوان دەخەوت و خەونی بە شەڕی دیکەوە دەبینی، دەترسا ئەو ساتەی کە ڕێبوارەکان دێنەوە شەڕ تەواو نەبووبێت... دڵنیابوو ئەو کاتەی ئەوان دەگەڕێنەوە شەڕ تەواو نەبووە... ئاخۆ دەتوانێت چییان بۆ بکات. هیچ... هیچ جگە لەوەی شوو بە یەکێکیان بکات و ئاواتی هێمنی و بەختیاری بۆ ئەوانی دی بخوازێت. لەگەڵ ڕۆیشتنی هەر بەشێک لە کتێبخانەکەدا زیاتر و زیاتر بیری لە باڵندەکان دەکردەوە، فەرهەنگی گەورەی باڵندەکان تاکە کتێبێک بوو کە سوێندی لە باوکی وەرگرت هەرگیز نەیفرۆشێت... هەرگیز... هەتا ئەگەر لە برسدا مردوون... بۆ ئەوەی غەمی کتێبەکان نەیکوژێت، بەردەوام چاوی لێکدەنا و بیری لە باڵندەکان دەکردەوە. شەو و ڕۆژ ئەو ساتەی دەهێنایە پێشچاوی خۆی کە تێیدا باڵندەکان دەبینێت، ئەو باڵندانەی بۆنی جیهانی بۆ دەهێنن، بۆنی شارە دوورەکان و گۆمە دوورەکان و لوتکە

سەختەكانی سەر زەمین. بۆنی ڕاستەقینەی جیهان، بۆنێك كە كتێبەكان پێی نابەخشن، تاكە بۆنێك كە دەتوانێت بۆنی مردنی لەبیربەرێتەوە، بۆنی لاشەی ئاسایشە سووتاوەكان لە یادەوەریدا بسڕێتەوە... بۆنی جیهان و ڕەنگی جیهانە كە لە پەڕ و بۆن و هاواری باڵندەكاندا چڕدەبێتەوە... ئیتر دەیتوانی چاو بنوقێنێت و لە نێوان قەفەزەكانیاندا بخەوێت و گوێی لە دەنگی هاوارەكانیان بێت، ئەو هاوارانەی هەوای جەنگەڵە دوورەكانی بۆ دەهێنن، هاواری دارستانە دوورەكان و سەرزەمینە دوورەكان.

مانگێك بەر لە دەست پێكردنی شەڕی ناوخۆ ژووری كتێبخانەكە تەواو چۆڵ بوو، جگە لە قەرەوێڵەكەی سەوسەن و مێزەكەی، جگە لە ئەتڵەسە گەورەكەی دونیا و ئەنسكلۆپیدیای باڵندەكان هیچ كتێبێك لە ماڵەكەدا نەما، هیچ پەیكەرێك، هیچ نیگارێك، هیچ دەمامكێك... ماڵی گوڵدانچی بووە شوێنێكی خاڵی، جگە لە چەند كورسییەكی كۆن و دوو قەنەفە بۆ میوان و مێزێكی نانخواردن و دوو قەرەوێڵە و دوو دۆڵاب لەگەڵ ئینجانەی گەڵا چاكاندا، هیچی تێدا نەما، هەڵبەت ئەمە گەر بێت و لە كەرەستە گرنگ و پێویستەكانی مەتبەخ بگوزەرێین.

فەیسەڵ سەحاف كە لە دوا ڕۆژدا دوا كۆمەڵە كتێبی برد، بەبێدەنگ زەرفێكی لەسەر مێزی نانخواردنەكە بەجێهێشت، هەموو ئەو وێنانەی تێدابوو كە ڕۆژی یەكەم گرتبوونی، دەیان وێنە كە لە هەموو لایەكەوە جوانی و گەورەیی كتێبخانەكەی لەو پەڕی ڕێكی و ڕەونەقیدا نیشاندەدەن. بەرگی كتێبە ناوازەكان و نیگاری ئەنسكلۆپیدیا بێهاوتاكان، خەریك بوو سەوسەن بخەنەوە گریان، بەڵام نا یەكجار بەوردی سەیری هەموو وێنەكانی كرد و بێئەوەی هیچ بڵێت، هەڵیگرتن و خستنیە ناو «دۆڵابی یادگارە تاڵەكان»ەوە.

سەوسەن ئیدی هیچ كتێبێكی كتێبخانەكەی خۆی نەبینییەوە. چەند ساڵێك دواتر كاتێك سەیری یەكێك لە كەناڵە تەلەفزیۆنییە لۆكاڵەكانی

دەکرد، لە ناکاو لە بەرنامەیەکی تایبەتیدا کە کتێبخانەی ڕۆشنبیران و سیاسییەکانی وڵاتی بەسەر دەکردەوە، کامێرا چووە ماڵی سیاسەتمەدارێکی گەورە، پیاوێکی خیپش کە ورگی بەجۆرێکی ناتاسایی بەسەر قایشەکەیدا شۆڕبووبووەوە، لەویادا... لەویادا هەموو کتێبەکانی خۆی بینییەوە، ئەو کتێبانەی خەونی پێوەدەبینین، ئەو کتێبانەی لە ناویاندا گەورەبووبوو، هەموویان ئێستا لە پشت ئەو پیاوەوە ڕیزکرابوون، ئێستا ئەو هەموو کتێبەکانی وەک گەنجینەی تایبەتی خۆی، وەک بەری ڕەنجی هەڵبژاردن و کۆکردنەوەی خۆی باسدەکرد... هەموویان لەوێبوون... هەموو کتێبە نازیزەکانی... لە پشت ئەو پیاوە قەڵەوەوە کە بە شانازییەوە لەبەردەم ڕەفەکان و پەیکەرەکاندا وەستابوو، بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە... زۆر گەورەوە بۆ کامێراکان پێدەکەنی.

٣٦

دوای چۆڵبوونی کتێبخانەکە، زۆری نەبرد شەڕی ناوخۆ دەستی پێکرد. لە بەهاری ساڵی نەوەدوچواردا هەردوو حیزبە گەورەکەی وڵات گەیشتنە ئەو بڕوایەی ناتوانن پێکەوە حوکمبکەن، پێشتر هەموو ئەو هەستەمان هەبوو کە ناکۆکی دوو حیزبەکە لەسەر دابەشکردنی سامانی گومرگ، بە خۆشی تەواو نابێت. بەڵام کەس لەو باوەڕەدا نەبوو بگاتە جەنگێکی وا سەرتاسەر و درێژ و خوێناوی. نا... ئەوکات مەنگوڕ لە ڕیزەکانی یەکێتی و قەڵەندەر ئاموون لە ڕیزەکانی پارتیدا چووبوونە سەرێ. لە حیزبدا کەس مەنگوڕی بابەگەورەی بە ناوی خۆیەوە بانگ نەدەکرد، بەڵکو ناویان نابوو «مەنگۆی گەورە». ناوبانگی مەنگۆ و تیپەکەی خراپ نەبوو، لەگەڵ ئەو وردە شەڕ و کێشە گەورانەی ڕوویان لە وڵات کردبوو. کوڕانی مەنگوڕ فەرمانێکی ڕوونیان هەبوو، لە کاتی بەرگریکردندا نەبێت ئازاری کەس نەدەن. ئەو دەمانە مەنگوڕ خۆی وەک فانەتیکێکی ئاشتیخواز نیشاندەدا، بەردەوام لە هەموو کۆبوونەوەکاندا دەیگووت «وڵاتەکە قوونی شەڕی پێوە نییە». بەڵام لەو سێ ساڵەدا کینەی نێوان قەڵەندەر ئاموون و مەنگوڕ لە ژێرەوە تادەهات زیادیدەکرد، قەڵەندەر لە کۆبوونەوە و دانیشتەکانی خۆیدا مەنگوڕی وەک سەرسەرییەکی دەم ڕووت و چەقۆکێشێکی سەرجادە ناودەنا، مەنگوڕیش ئەوی وەک ئاغازادە و کۆنەخۆفرۆش باسدەکرد، لەو ماوەیەدا دووبارە وێنە کۆنەکانی

قەلەندەر لەگەڵ پاسەوانە تایبەتییەکانی وەزیری ناوخۆ، لەگەڵ بەرپرسی فەوجی پاراستنی کۆشکی کۆماری، لەگەڵ بەڕێوەبەری دیوانی کۆشک و سەگەکەیدا، چاپکرانەوە و گەورەکران و لە هەندێ جێگاشدا هەڵواسران، وەک بەڵگەیەک بۆ خیانەت و خۆفرۆشی قەلەندەر. ئێمە ئەو سەردەمە مەنگوڕمان نەدەبینی، بەردەوام لە بارەگاکەی خۆی یان لە ئۆتومبیلی جام ڕەش و تایبەتیدا هاتوچۆیدەکرد، هەموو بیری قسەکانیمان دەکرد، بیری ئەو ڕۆژانەمان دەکرد کە لە چایخانەی پەپولەی ئازاد یان لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەدا قسەی بۆ دەکردین... حەزماندەکرد ئەم ڕۆژانە زوو بڕوات و شتەکان ئاسایی ببنەوە و مرۆڤەکان ببنەوە بە کەسی سادە و خۆیان لەو چەک و چەکدارییە دووربخەنەوە. بەڵام لە بەهاری ساڵی نەوەدوچواردا بارودۆخی وڵات تەواو تێکچوو... سەرەتا کەسمان باوەڕمان نەدەکرد ئەو تێکچوونە کاریگەرییەکی وەها گەورەی لەسەر تەواوی چیرۆکەکە دەبێت، بەڵام ڕووداوەکان واوەگەڕان، لەگەڵیاندا ژیانی هەموومان بەجۆرێکی چاوەڕوان نەکراو ئاوەژوو بووەوە. شەوی پێش هەڵگیرسانی شەڕ، قەلەندەر ئاموون لەگەڵ بەرپرسێکی سەربازی دیکەدا هێزەکانی خۆیان لە سەریان و کۆڵانەکانی دەوری بارەگای سەرەکی پارتی دابەشکرد، لە ئێوارەوە هەواڵ هاتبوو کە لە سەرتاسەری کوردستاندا بارودۆخ ناجۆرە و دوو حیزبەکە لە هەموو شوێنێک سەنگەریان بەرابەر یەک گرتووە. ئەو شەوە تا درەنگ شتێکی ئەوتۆ ڕوونەدا، شار کش و مات بوو. نزیکی نیوەشەو قەلەندەر زۆر خەوی دەهات، بۆ چەند سەعاتێک لەسەر قەنەفەیەکی درێژ لە ژوورەکەی خۆیدا لە بارەگا سەرخەوێکی شکاند، سەیری لێهات کە هەر چاوی دەچێتە خەو و بەئاگا دێتەوە خەون بە خالید ئاموونەوە دەبینێت. کە دەوروبەری سەعات پێنج هەستا، چاوی گڵۆفی و خەونەکانی بۆ چایچییەکە گێڕایەوە و گوتی «واهەستدەکەم دەبوایە منیش لەگەڵ خالید ئاموونـدا بڕۆیشتمایە».

چایچییەکە بینەوەی لە مەبەستی تێبگات، سەرنجیدا چۆن دەمانچەکەی تاقیدەکاتەوە و دەسکەکەی بەدەستەسرێکی زەرد دەپێچێت و دەچێتەدەرێ. گەرچی بەهاربوو بەڵام کزەی پێش سپێدە زۆر ساردبوو. قەلەندەر بەسەر ئەو خاڵانەدا گەڕا کە شەوی ڕابوردوو چەکدارەکانی تیا قایمکردبوو، نائومێدانە تێگەیشت برێکی زۆری پێشمەرگەکانی حیزب لە شەوێوە، چەکەکانیان جێهێشتووە و شوێنەکانیان چۆڵکردوە و گەڕاونەتەوە ماڵێ. قەلەندەر ئامورن بێئەوەی سەرسام بێت گەڕایەوە بۆ ناو بارەگاکە و بە چایچییەکەی گووت «سەیر نییە... حیزب زۆر لە مێژە شەڕی گەورەی نەکردوە». چایچییەکە چایەکی نوێی بۆ هێنا و لێیپرسی «قەلەندەر ئاغا... دڵنیان شەڕ دەبێت؟». قەلەندەر بە هێمنی سەری لەقاند و گووتی «دڵنیام». وەک دەستووری هەمیشەیی خۆی بەڕێزەوە داوای لە چایچییەکە کرد ماوەیەک بەجێیبهێڵێت و دەرگاکەی لەسەر دابخات چونکە دەیەوێت کاغەزێکی زۆر گرنگ بنوسێت. دوای سەعاتێک بە ماندوویی، بە جووتێک چاوەوە کە ئاسەواری گریانی پێوە دیاربوو لە ژوورەکە هاتەدەرێ و نامەیەکی پێچراوەی دایە چایچییەکە و گووتی «ئەم نامەیە بۆ خالید ئامورنە، تۆ هێندەت لەسەرە بیپارێزیت و هەرچییەک بووە نەهێڵیت نامەکە بفەوتێت، گەر من شتێکم لێهات ئەوا ئەم نامەیە بگەێنە دەستی سەی کەرەمی ئامورنی یان فەوزی بەگ... هەر کامێکیان بێت گرنگ نییە، تێدەگەیت... گەر من شتێکم لێهات دەبێت ئەم نامەیە بگاتە دەست خالید ئامورن... بەسەلامەتی... ئەوە لە هەموو شتێک گرنگترە... ئێستا لە من و پێنج پێشمەرگە زیاتر کەس لێرە نەماوین، بۆ شەرەفی حیزب جوان نییە کاتێک پەلاماری بارەگاکەی دەدەن کەسی تێدا نەبێت... بۆ مێژوو جوان نییە کەس نەبێت بەرگری لە پارتی بکات. کەس». چایچییەکە بە هێمنی کاغەزەکەی خستە گیرفانییەوە و گووتی «بە ئومێدی خودا هیچ نابێت... بە ئومێدی خودا».

ئەو هێزەی کە دەوری بارەگاکەی دابوو، بەشێکی زۆریان تاقمی مەنگوڕ بوون. بەدرێژایی شەو چاوەڕوانبوون، بەڵام فەرمانێکی ڕاستەوخۆیان بۆ گرتنی بارەگاکە بۆ دەرنەچوو. لە بەیانیدا دەیانزانی ناو بارەگاکە تەنیا قەلەندەر ئامۆون و دوو پێشمەرگەی دیکەی تێدا ماوە. نزیکی سەعات دەی بەیانی فەرمانی گرتنی بنکەکەیان پێگەیشت، دەبایە قەپۆز جوقڵی سەرکردایەتی ئەو هێزە بکات کە دەچێتە ناو بنکەکەوە. مەنگوڕ دواتر سوێندی خوارد کە ئەو نامەی نوسیوە و فەرمانی داوە بە هیچ جۆرێک ئازاری کەس نەدەن، تەقە لە کەس نەکەن، لە دۆخێکدا تەقەیان لێکرا بە چەشنێک وەڵامبدەنەوە کەس بریندار نەبێت. ساڵانی دوایی مەنگوڕ چەند جارێک و لە چەند بۆنەیەکدا ئەو نامەیەی دەرخست کە داوا لە قەپۆز جوقڵی دەکات، دەست بۆ ژیانی کەس نەبات. بەڵام قەپۆز تا مردنی حاشای لەوە کرد نامەی وای پێگەیشتبێت و گووتی «تەنیا لە ڕێگای لاسلکییەوە پێیگووتراوە کە بارەگاکە بگرێت و هیچی تر».

هەموو دەمانزانی قەلەندەر ئامۆون لەو کەسانە نییە ئاسان و بێتەقە خۆی بدات بەدەستەوە، خۆزگەمان دەخواست لە بری قەلەندەر کەسێکی دی لە بارەگاکەدا بووایە، چونکە کەس نەبوو سەرسەختی و لە خۆبایی ئەوی نەبیستبێت. دەمانزانی ئەستەمە بە زیندوویی بیگرن. لەگەڵ جوڵەی پێشمەرگەکانی تردا، قەلەندەر و دوو پێشمەرگەکەی دی لەسەربانی بارەگاکەوە یەکەم دەستپێژیان کرد. کەسانێک دەڵێن ئەمیر جوقڵی برا بچوکەکەی قەپۆز جوقڵی لەو یەکەم دەستپێژەدا پێوە بووە، کەسانێکی تریش دەڵێن نا ئەمیر لە کاتی تەکاندا بۆ ناو بنکەکە کوژراوە. بە هەر حاڵ گرتنی بنکەکە کارێکی ئاسان نەبوو، دوای زیاد لە سەعاتێک شەڕ یەکێک لە پێشمەرگەکانی قەلەندەر بریندار دەبێت و ئەوی دیکەیان دەگیرێت و قەلەندەر ئامۆون بە شێوەیەکی سەیر، بە بازی سەربانە و سەربان بۆی دەردەچێت. کوشتنی ئەمیر جوقڵی، قەپۆز و هاوڕێکانی

شـێتدەکات. دەڵێـن قەپـۆز و سـامانی کیسـرا و هوشـەجوجە ئـەو سـێ کەسـەن کـە دوای قەلەنـدەر ئامـوون کەوتـوون. قەلەنـدەر دەزانێـت لـەم شارەدا یـەک جێگا هەیـە بتوانێـت بیپارێزێـت، ئەویش ماڵـی گوڵدانچییـە، ئـەوە تاکـە جێگایەکـە دەشـێت مەنگـوڕ و کوڕەکانـی حورمەتـی بگـرن... تاکـە جێگایەکـە دەتوانێـت خـۆی تێـدا حەشـاربدات. بـە هەمـوو توانـای هەوڵـدەدات بگاتــە ئـەوێ، هەڵبـەت قەپـۆز جوقلێـش دڵنیایـە هێنـدەی گەیشـتە ماڵـی فیکـرەت گوڵدانچی، ئەسـتەمە مەنگوڕ بهێڵێت هیـچ کـەس نزیکـی ببێتـەوە. قەپـۆز جوقڵـی و هاوڕێکانـی تەنیـا دوو سـەد مەتـر دوور لـە ماڵـی گوڵدانچییـەوە قەلەنـدەر ئامـوون دەگرنـەوە و هـاواری لێدەکـەن چەکەکـەی دانێت و ڕادەست بێت، ئەو لـە شوێنی خۆیـەوە تەقـە لـە هـەر سـێکیان دەکات. ئەوانـەی دیمەنەکەیـان بینیـوە، بـاس لـەوە دەکـەن، کـە قەپـۆز و دوو هاوڕێکـەی بـە سـێ کلاشـینکۆف لـە سـێ لاوە و بەمەبەسـتی کوشـتنی دەم و دەسـت تەقـە لـە قەلەنـدەر دەکەنـەوە، سـێ کلاشـینکۆفی تـوڕە و تینـوو. دواتـر کـە قەلەندەرمـان هەڵگرتـەوە سـەرو سـنگی زیاتـر لـە چل فیشـەکی پێوەبـوو، کـە زۆربەیـان لـە نزیکـەوە پێـوەی نرابـوون. بـەڵام ئـەوەی لـە چیرۆکەکـەدا زۆر دژوارە، ئەوەیـە بـە هـەر سـێکیان پشـتێنەکەی قەلەنـدەر دادەماڵــن و دەیبەسـتن بـە دەسـتییەوە و تـا ماوەیـەک بەسـەر شـەقامە گشـتییەکەدا ڕایدەکێشـن، دواجاریش نیـوەڕووت و تۆزاوی لاشـەکەی لـە سـەر یەکێـک لـە شۆسـتەکان فڕێدەدەن.

ئـەو سـاتەی قەلەنـدەر کـوژرا، سەوسـەن هـوزاری کـوڕی پڕوشـە و دکتـۆر ڕەفعەتـی لـە ئامێزبـوو. لـە منداڵییەکـی زووەوە منداڵەکـە مەیلێکـی نائاسـایی بـۆ پـورە غەمگینەکـەی هەبـوو، لـە منداڵییـەوە لەگـەڵ ئـەودا لـە کتێبخانەکـەدا گەورەبووبـوو، ئـەو سـاتەی کـە تەقـەکان بـوون، دەنگـی گوللـەکان وەهـا نزیـک و بێوچـان و لەسـەریەک و گـەورە بـوون، سەوسـەن وایدەزانـی یەکێـک فیشـەکەکان لـە هـەوای خاڵـی و سـارد و بەرینـی کتێبخانـە

چۆڵەکەی ئەودا دەتەقێنێت، منداڵەکە ترسا و توند خۆی نوساند بە پورییەوە و گریا. سەوسەن منداڵەکەی توند بەخۆیەوە نوساند و گووتی «هیچ نییە مەترسە... مەترسە، یەک دەکوژن... یەک دەکوژن، وەک جاران... وەک هەمیشە». گەر یەکێک لە ژوورەکەدا بایە بە دڵنیاییەوە نەیدەزانی ئاخۆ سەوسەن لەگەڵ خۆیدا قسەدەکات یان لەگەڵ منداڵەکەدا. دوای نیوسەعات هەواڵیان بۆ هات کە کوژراوەکە قەلەندەر ئاموونە، ئەو پیاوەی سێ ساڵ لەوەوبەر لە شەوێکی تاریکدا دەستی سەوسەنی گرت و لە ناو لاشەکان دەریهێنا.

سەوسەن دڵنیابوو کوشتنی قەلەندەر شتێکی ترسناکە... زۆر زۆر ترسناکە... بەڵام نەیدەزانی بۆ.

تەفسیرکردنی کوشتنی قەلەندەر ئاموون ئاسان نەبوو. ئاخۆ تاوانێکی سیاسی بوو، پەیوەندی بەو دۆخە گشتییەوە هەبوو کە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دروستیکرد، یاخود پەیوەندی بەو کێشانەوە هەبوو کە دوای داواکردنی سەوسەن فیکرەت لە نێوان ئاموونییەکان و کەسانی دەوروبەری مەنگوڕدا سەریان هەڵدا؟. لە شاری ئێمەدا هەرگیز شەڕەکانی سیاسەت و خۆشەویستی لە یەکدی جیانابنەوە، هیچ مێژێک نییە بتوانێت سنوورێک لە نێوان ئەو شەڕانەدا دابنێت، هەموو شەڕێک لەسەر خۆشەویستی و ئیرەیی و شەرەف هەر زوو دەبێت بە شەڕی سیاسی و هەموو شەڕێکی سیاسیش هەر زوو دەبێت بە شەڕی خۆشەویستی و شەرەف. کە لایەنە ناکۆکەکان لە ساڵی هەشتاو هەشتدا و بە کۆمەکی فیکرەت گوڵدانچی ئەو ڕێکەوتنەیان قەبووڵکرد، کە چیدی لەسەر سەوسەن شەڕنەکەن، کەسمان لەو باوەڕەدا نەبووین ئەو ڕێکەوتنە بەوجۆرە خوێناوییە کۆتایی بێت. کوشتنی قەلەندەر بەوجۆرە بێڕەحمانەیە هەمووانی هەژاند، تاوانەکە ئاموونییەکانی بە شێوەیەکی بێوێنە سەرشێتکرد. دوو شەو دوای ناشتنی تەرمەکە پتر لە سێ سەد پیاوی ئاموونی بە نهێنی و لە ژێر باڵی تاریکیدا شاریان

بەجێهێشت و خۆیان گەیاندە ئەو ناوچانەی هێزەکانی پارتی دیموکرات بەسەریدا باڵادەستن. دوای کۆچی پیاوانی ئاموون، یەکێتییەکان هەموو خێزانەکانیان گرتن و بە ماشێنی تایبەتی گوازتنیانەوە بۆ دەرەوەی شار و لەوێ بەرەڵایانکردن و پێیانگووتن تا شەڕ کۆتایی نەیەت ڕێگا نادرێت بگەڕێنەوە، ئەوە سەرەتای ئاوارەبوونێکی دووردرێژی ئاموونییەکان بوو. ئیدی تا ماوەیەکی درێژ ماڵ و کۆشک و باغی خۆیانیان نەبینییەوە و ماڵەکانیان بوو بە نیشتەجێی ئەو خێزانانەی پارتی لە شوێنی خۆیان دەریانکردبوون، بەڵام ئەوەیان چیرۆکێکی ترە... بەڵێ ئەوە چیرۆکێکی غەمگینی ترە کە لێرەدا جێگای نابێتەوە. ئەوەی لەو ماوەیەدا سەیر بوو پەرچەکرداری مەنگوڕ بوو، کە دوای چوار ڕۆژ لە کوشتنی قەلەندەر بە تەواوەتی وازی لە حیزب هێنا و بۆ هەتاهەتایە پەیوەندی خۆی لەگەڵ قەپۆز جوقڵی و هەموو ئەوانەدا پچڕی کە لە کوشتنی قەلەندەر ئاموونەدا بەشداربوون. قەپۆز جوقڵی لە ڕۆژی یەکەمەوە ئەوەی ڕاگەیاند کە فەرمانی گرتنی بارەگاکە لە مەنگوڕی بابەگەورەوە دەرچووە. مەنگوڕیش لە سەعاتی یەکەمەوە ئەو نامەیەی دەرخست کە گوایە گووتوویەتی دەبێت بارەگاکە بێخوێن بگیرێت. بەڵام ئەو قسانە لای ئاموونییەکان نرخێکیان نەبوو، دوای کوشتنی قەلەندەر بەهانەیەک نەما بۆ ئەوەی مەنگوڕ و ئەوانی تر لەسەری سەرەوەی ئەو لیستەیەدا نەوەستن کە ئاموونییەکان بۆ تۆڵە دروستیانکرد. لە دوای کوشتنی قەلەندەر پەیوەندی نێوان خالید ئاموون و سەوسەن پچڕا... بەڵام ئەوکات ماوەیەکی زۆر لە بەردەم ڕێبوارەکاندا نەمابوو بۆ گەڕانەوە، نزیکی شەش مانگ دوای ئەوە خالید ئاموون بە خۆی و کاروانێکی گەورەی باڵندەوە گەڕایەوە بۆ شار، بەڵام لەبەرئەوەی یەک ماڵی ئاموونیش چییە لە شاردا نەمابوو، یەک دۆست و هاوڕێی دڵسۆز و دێرینیشی نەبوو بوێرێت ئامێزی بۆ بکاتەوە، دەبایە یەکەمجار کە پێدەخاتە سەر خاکی شار، بچێتە ئوتێلەکەی باوەجان و لەوێ بخەوێت.

## ٣٧

بەپێچەوانەی چاوەڕوانی هەموومانەوە، کامەرانی سەلما یەکەمین کەس بوو کە لە سەرەتای پاییزی ساڵی نەوەدوچواردا گەیشتەوە نیشتیمان، بەیانییەک هەستاین و لە ناوەڕاستی شاردا کاروانێکی دووردرێژی باڵندەمان بینی، چەندەها قەفەزی گەورە و چەندەها چەشنی سەیر سەیری باڵندە کە تا ئەوکاتە چاوی ئێمە لە خەونیشدا شێوە بوونەوەری وەهای نەبینیبوو. دەیان قەفەز کە زۆربەیان پڕبوون لە گەڵای سەرەتای خەزان، وەک ئەوەی کاروانەکە بەرلەوەی بگاتە شار بە ناو گێژاوێکی گەورەی پاییز و جەنگەڵێکی پڕ گەڵاڕێزاندا ڕۆیشتبێت. کاروانەکە بە مەبەست لە ناوەڕاستی شاردا وەستێنرابوو، بۆ ئەوەی بەیانی کە هەستاین هەموومان بیبینین... باڵندەکان لە ئێمە زیاتر خرۆشابوون و هاواریاندەکرد، دەیانجیکاند و دەیانخوێند. وەک ئەوەی بزانن کە دوای سەفەرێکی درێژ... زۆر درێژ بە بەشی هەرە زۆری جیهاندا گەیشتوونەتە شاری ئێمە، وەک ئەوەی باوەڕنەکەن شارێکی واسەیر و جەنجاڵ و نارێک و غەمگین لەسەر ئەم ئەستێرەیەش هەیە، وەک ئەوەی باوەڕنەکەن گەیشتوونەتە شارێک خەڵکەکەی لە پاساری و کۆتر و کەو زیاتر زۆر کەم چەشنە باڵندەی دیکەیان بینیوە. ژمارەی باڵندەکان گەلێک لە سەد باڵندە زیاتر بوون. قەفەزەکان زۆربەیان کۆن و ژەنگاوی دیاربوون، بەڵام زۆربەیان بە جانفازی تایبەتی و هەندێکیان

بە شوشە و هەندێکیان بە دیواری پلاستیکی ئەستوور و هەندێکیشیان لە ناوەوە بە تەپەدۆری سپی یان پارچە تەپەدۆری ئاسایی گیرابوون. دواتر کە دوو ڕێبوارەکەی دیش گەیشتنەوە شار، سەیرمان لێهات کە تەکنیکەکانی پاراستن و گەرم ڕاگرتنی قەفەزەکان لە نێوان هەر سێ ڕێبوارەکەدا زۆر لە یەکدی دەچوون. لە هەموو قەفەزەکاندا هەندێک دەروازە و پەنجەرە جێهێڵرابوون، ئێمە لەو دەلاقانەوە سەرمان دەکێشا و تەماشای ویقاری ئەو باڵندانەمان دەکرد کە هەندێکیان بە بێدەنگییەکی حەکیمانە و هەندێکیان بە هاوارێکی شێتانە و هەندێکیان بە جریوەی ناسک وەڵامی نیگاکانیان دەدایەوە. لەو کەژاوەیەدا باڵندەمان بینی کە دەنوکی ئاسن و چاوی پڕ تیشک و باڵی زێڕینیان هەبوو. هەر قەفەزێک لە قەفەزەکان بۆنی شوێنێکی دونیا و هەوای جەنگەڵێک و کزەی گوێ دەریایەکیان پێبوو. هەر باڵندەیە و شێوە خواردنێک و جۆرە گیایەکی نەناس و جۆرە ڕازاندنەوەیەکی سروشتی تایبەتی ویستبوو. هەموو هەستمانکرد کامەرانی سەلما گەلێک بە ناسکی و گەلێک بە خۆشەویستییەوە باڵندەکانی گرتووە و بەخێویکردون، قەفەزی گونجاوی بۆ سازاندون و کەشی پێویستی بۆ خولقاندون، هەندێک لە باڵندەکان جووت و هەندێکیان تاک بوون، بەڵام هەموو قەفەزەکان بە قفڵی تایبەتی قفڵکرابوون. لە دوای دوای کاروانەکەدا کەرەڤانێکی گەورە هەبوو، کە دینەمۆیەکی کارەبای تایبەتی پێوە بەسترابوو، تا لە ڕۆژانی سەفەردا و لە کاتی پەڕینەوەدا بە شوێنە ساردەکاندا، لە کاتی لادانیدا لەسەر شەقامە بەفراوییەکانی جیهان گەرمی تایبەتی ببەخشێتە باڵندەکان. گەرچی لەو ساڵانەی دواییدا لە ڕێگای سەتەلایتەکانەوە، لە ڕێگای ئەو سەریازە کڵاوشینانەی بوئێنەوە، لە ڕێگای ئەو کوردانەوە کە لە خۆرئاوا دەگەڕانەوە، لە ڕێگای ئەو ڕێکخراوە بیانییانەی لە شارەکەماندا دەستگیرۆیی خەڵکانی هەژاریان دەکرد، شتێکمان لە هەوای دونیا و لە

سێبەری بەرینی جیهان بەرکەوتبوو، بەڵام تا ئەو ساتە، تا ئەو ڕۆژەی پاییزی ساڵی نەوەدوچوار کە باڵندەکانمان بینی هەستمان نەکرد کە جیهان بە ڕاستی گەیشتۆتە شارەکەمان، کە زەمین سیحری خۆی بۆ ناردوین، کە شتێکمان لە سروشتی ئەم دونیایە بینیوە. لەبەر هۆیەکی نادیار باڵندەکان لەو ساتەدا نوێنەری تەواوی ئەو شتانەبوون کە ئێمە لەم شارە بچوک و غەمگینەی خۆماندا ونمانکردبوو.

سەرەتا کامەرانی سەلمامان نەبینی، دواتر زانیمان لەسەر کورسییەکی چایخانەی پەپولەی ئازاد خەوتووە. ئەو بەیانییەکی زۆر زوو لەگەڵ دوو کۆمەککاری ئێرانیدا گەیشتبووە ناو شار. قەفەزەکانی لەسەر شەقامەکە ڕاگرتبوو، ئەو ساتەی ئەو گەیشتبوو، تازە چایخانەکە دەرگاکانی بۆ ڕێبواران و کرێکارانی دەمەوبەیان دەکردەوە، دەم و دەست هەموو ناسیانەوە، بەڵام بێئەوەی لەگەڵ کەسدا هیچ بڵێت، بە هێمنی بە خاوەن چایخانەکەی گووت «من و هاوڕێکانم زۆر ماندووین... زۆر... دەتوانین لێرەدا پشوویەک بدەین و بخەوین». خاوەن چایخانەکە ڕاستە و ڕاست ناسییەوە، دڵنیابوو ئەمە کامەرانی سەلمایە، ئەو پیاوەی یەکێک بوو لە ئەفسانە گەورەکانی شار. بێهیچ دوودڵییەک ڕێگای بە هەر سێ ڕێبوارەکە دا لەسەر کورسییەکان بخەون. کە ئێمە بەیانی بینیمان یەک تەختە و لەسەر پشت لەسەر کورسییەکی درێژ خەوتبوو، پیاوێکی بەقەد و قامەت بوو بە ڕیشێکی زۆر گەورە و درێژ و ڕەشەوە. لەچاو ئەو کاتەی کە ڕۆیشت و بەجێیهێشتین باڵابەرزتر و پیاوانەتر دەینواند، قژی کەمێک لەو کاتە کورتتر بوو، ئەسمەرتر و پتەوتریش دیاربوو، ئاشکرا خۆر و سەرما یارییەکی گەورەیان لەسەر ڕوخساری کردبوو. بوونی لەویادا، خەوتنی بەوچەشنە سام و هەیبەتێکی گەورەی لە هەمووماندا بەجێهێشت، گەڕانەوەکەی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو بوو، پێشتر هیچ کەسی ئاگادار نەکردبووەوە، ویستبووی بەبێدەنگی باڵندەکان تا ناو جەرگەی شار

بهێنێت و لە سەر کورسییەک لە کورسییە درێژ و تەختەکانی پەپولەی ئازاد بخەوێت. کە بەیانی زوو هەواڵیان بۆ مەنگوڕ برد، سەرەتا باوەڕی نەکرد. بەڵام کە خۆی گۆڕی و بەر لە کەوتنی تەواوی خۆر گەیشتە لای قەفەزەکان سەری لەو هەموو باڵندە قەشەنگە سوڕما. ماوەیەکی درێژ بە بێدەنگی و حەپەساوی یەک یەک سەیری قەفەزەکانی کرد و گوتی «وای خوای گەورە... وای ئەولیا... هەموو تەیری دونیای لەگەڵ خۆی هێناوە... هەموو تەیری دونیا». بەخێرایی کەسانێکی لە ئێمە وەک پاسەوان بە دیار قەفەزەکانەوە دانا و ڕۆیشت بۆ ناو چایخانەکە، هەموو بینیمان کە ماوەیەکی درێژ، زۆر درێژ لەسەر سەری کامەرانی سەلما و دوو هاوڕێکەی وەستا... وەستا و هیچی نەگووت... وەک ئەوەی باوەڕ بە چاوی خۆی نەکات، وەک کەسێک بروسکە لێیدابێت سەیری کامەرانی دەکرد. دواتر بە هێمنی لەسەر کورسییەک دانیشت و دەستی گرت بە دەموچاوییەوە و دەستیکرد بە گریان... ئەوە یەکەمجار بوو مەنگوڕ ببینین دەگری.

لەدوای کوشتنی قەلەندەرەوە، مەنگوڕ بوو بە کەسێکی تر، بوو بە پیاوێکی غەمگین. زۆر ڕۆژ دەهات بۆ چایخانەی پەپولەی ئازاد و لەوێ لەسەر کورسییەک دادەنیشت و قسەی لەگەڵ کەسماندا نەدەکرد، بوویوو بە پیاوێکی زۆر تێکشکاو. گەرچی زۆر لەوە دەترساین ڕۆژێک ئامووزنییەکان زەفەری پێبەرن و بیکوژن، بەڵام ئەو بێباک بوو، جگە لە چەقۆ کۆنەکەی جاران هیچی تری پێ نەبوو. چیدی وەک سەردەمی زوو دڵی بۆ کەس نەدەکردەوە، گەر قسەی بکردبایە، دەیگووت «کوشتنی قەلەندەر هەموو شتێکی تێکدا... هەموو شتێک... هەرچییەک من لەو چەند ساڵەدا کردوومە بە زایە ڕۆی... هەمووی بە زایە ڕۆی».

کە مەنگوڕی بابەگەورە و کامەرانی سەلما باوەشیان بە یەکدا کرد، بۆ ماوەیەکی کورت هەموو دڵمان پڕبوو، هەندێکمان بە ڕاستی گریاین،

هەندێکمان دەستمان بە دەممانەوە گرت و هەندێکمان ڕوومان وەرگێڕا و خۆمان بەشتێکی دییەوە سەرقاڵکرد نەبا بگرین. مەنگوڕ ئێستا هێدی هێدی پیری پێوە دیاربوو، لەدوای کوشتنی قەلەندەر ئێوارەیەک چوو بۆ لای سەوسەن فیکرەت و دوای ئەوە بەپیری هاتەدەرێ. مەنگوڕ هەرگیز باسی ئەو دانیشتنەی خۆی لەگەڵ کچەکەی گوڵدانچییدا نەکرد، بەڵام دەنگۆکان باس لەوە دەکەن کە سەوسەن خان بێوێنە سەرزەنشتیکردوە و گووتوویەتی کەوتنەوەی خوێن لە نێوان بەرەکاندا ئاسان تێناپەڕێت، سەوسەن ڕاستەوخۆ مەنگوڕی بە کوشتنی قەلەندەر تاوانبارکردوە و پێیگووتووە کە گوایە بڕوا و متمانەی ئەوی خراپ بەکارهێناوە و پلەی شەڕانێتی خۆی تا جێگایەکی ترسناک بەرزکردۆتەوە کە ئیدی جێگای بێدەنگی و لێبوردنی تیانەماوە... دەشڵێن کچەکە گووتوویەتی گەرچی ناتوانێت تا هەتاهەتایە لە مەنگوڕ ببورێت و ڕێگای بدات پێ بخاتە ماڵییەوە، بەڵام سوێندی بۆ خواردوە، وەک چۆن چەند ساڵێک پێشتریش سوێندی بۆ خوارد، کە هەڵسەنگاندنی کامەرانی سەلما و دوا بڕیاری گەورەی لەم حیکایەتەدا ملکەچی هیچ جۆرە گرێدانەوەیەکی نابەجێ لە نێوان خراپییەکانی مەنگوڕ و کامەراندا نابێت، بەڵکو هێندە هەیە کە مەنگوڕ وەک نوێنەرێک، وەک کەسێک کە لەدڵەوە زۆر دڵخۆشیکردوە، وەک مرۆڤێک کە بە چیرۆکە سەیرەکانی سەرسامیکردوە، ئیتر بۆی نییە، هەرگیز بۆی نییە پێ بنێتە ئەم ماڵەوە و چاکترە کامەرانی سەلما ڕاسپێرێت کە نوێنەرێکی تر، پەیامهێنێکی تر لە نێوان ئەو و خۆیدا دیاریبکات. دەڵێن کیژەکە سوێندی خواردوە گەر شوو بە کامەرانیش بکات تەنیا مەرجی ئەوە دەبێت ئەو و هاویارەکانی لەو زەماوەندەدا نەبن و دواتریش تا هەتاهەتایە تا ئەوان ژن و مێردن مەنگوڕ نابێت بچێتە حەوشی ماڵی ئەوەوە.

ئەوانەی چیرۆکەکەیان بۆ گێڕاینەوە دەڵێن مەنگوڕ بە پێچەوانەی

عادەتی خۆیەوە، بەپێچەوانەی ئەو غرور و سەرسەختییە زۆرەیەوە کە بەدرێژایی ژیانی لە سیما و ڕەفتاریدا بووە، گریاوە و پاڕاوەتەوە کە هەرچییەک دەکات شتی وای بەرابەر نەکات، نامەکەی خۆی دەردەهێنێت و نیشانی سەوسەنیَ دەدات، سوێندەخوات کە تەنیا لە بەرخاتری کامەران و لەبەرئەو و بۆ پاراستنی شکۆی ئەو چۆتە حیزبەوە، سوێندەخوات کە ئەویش وەک هەمووان نیگەرانە و رامەستدەکات تاوانەکە ڕاستەوخۆ ناڕاستەی ئەو و کامەرانی سەلما کراوە، بەڵام کیژەکە سەرسەختانە ئەوەی بەبیردەهێنێتەوە کە کوشتنی قەلەندەر بەجۆرێک دڕندانە و ناشایستە و دوور لە عورفی جەنگە، هەتا لە ئیشی پیاوانی دەوڵەت بێڕەحمانەتر دەنوێنێت، لەبەرئەوە هیچ دڵێک لە دڵ نادات و بڕیاری خۆی ناگۆڕێت و لەو بڕیارانە پەشیمان نابێتەوە. هەموو دەڵێن کەس لەوەوبەر هەڵوێستی بەوجۆرە ڕەقی لە خانمی سەوسەن نەبینیوە، هەموو دەڵێن فیکرەت گوڵدانچی و دکتور ڕەفعەت و پرۆشە کە لە ژوورێکی دیکەوە گوێیان لە قسەکانیان گرتووە، بە دڵڕەقی و پێداگرتنی سەوسەن سەرسامبوون. هەرچۆنێک بێت، مەنگوڕ دڵشکاو و دەرکراو لە ماڵی گوڵدانچی دێتەدەرێ، دوای ئەوە دەبێتە ڕۆحێکی شکست و غەمگین و بێدەنگ. ئیدی وەک جاران بەیانیان و ئێواران دەهاتە چایخانەکە، هەروەک جاران گیانی فەرمان و ڕۆحی بێباکی لە هەموو شتێکیدا بوو، هەموو ئامادەبووین هەموو داوایەکی جێبەجێبکەین، ئامادەبووین بێمەرج لایەنی بگرین و هەر شتێک بڵێت بۆی بسەلمێنین، زۆربەمان باوەڕمان بە بێگوناهی مەنگوڕ هەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاونەترسی و بێباکی مەنگوڕ شوێنی پرسیاری هەموومان بوو، هەموو دەمانپرسی: چۆن دوای کوشتنی قەلەندەر ئاموون، ئاوها بێخەم دەسوڕێتەوە؟ ناترسێت بیکوژن، ناترسێت تۆڵەی لێبکەنەوە. بەڵام لە نێو بازاڕدا هەندێ کەس باسی نامەیەکی نهێنیان دەکرد، کە ئاموونییەکان بۆ مەنگوڕیان نوسیوە، نامەیەک تا

ماوەیەکی درێژ کەسمان نەماندەزانی چی تێدا نوسراوە، هەندێکمان وەک دەنگۆ باسماندەکرد و هەندێکی دیمان ڕاست دەمانقەبڵاند، بەڵام دوای زیاتر لە دوو ساڵ لە ڕۆژێکی زۆر گەرمی سەرەتای ئەیلولدا مەنگوڕ ئەو نامەیەی پیشانی کامەرانی سەلمادا و دواجاریش نامەکە کەوتە دەست سەوسەن گوڵدانچی و تاکۆتایی لای ئەو مایەوە.

ئەو ڕۆژە دوای ئامێزانە گەرم و پڕ سۆزەکان، دوای ئەوەی کامەرانی سەلما بەدەنگی بەرز گووتی «چ خۆشحاڵم کە لێرەم، چ خۆشحاڵم... من لەسەر کورسی و شۆستە و لاڕێکاکانی زۆر شارانی دونیا خەوتم، سوێندم خوارد ئەو ڕۆژەی دەگەڕێمەوە یەکەم پشووم لەسەر کورسییەکانی ئەم چایخانەیە بێت و یەکەم چای نیشتیمانم لێرەدا بخۆمەوە و یەکەم سەرخەوم لەسەر ئەم کورسیانە بشکێنم، سوێندم خوارد قەتاری باڵندەکانم لە ناوەڕاستی شار و لەو جێگایەدا بوەستێنم کە دواجار تێیدا ماڵاواییم لە ئێوە کرد، سوێندم خوارد بەرلەوەی باوەشبکەم بە خوشک و پور و کەسەکانی خۆمدا، باوەشبکەم بە ئێوەدا... سوپاستانبکەم... سوپاسی وەفا و کۆمەکتانبکەم... ئێستا ئێوە نازانن من چەند دڵخۆشم کە دەگەڕێمەوە... کە باڵندەکانم بە سەلامەتی هێنایەوە ئەم شارە... سەفەرێکی ئاسان نەبوو... بەڵام ئێستا هەستدەکەم کاتی هاتووە بە هێمنی ماندوێتی ئەو هەموو ساڵە لە گیانم دەربچێت... هەستدەکەم هێندەی هەناسەی ئەم شارە هەڵدەمژم و بای ئەم شارە بەر ڕوخسارم دەکەوێت... هەموو شتێک لام دەبێتە ڕابوردوو... من لێرەدا... ئا لێرەدا سوێندتان بۆ دەخۆم کە هەرگیز تا هەتاهەتایە جارێکی تر ئەم شارە بەجێناهێڵم، خۆشحاڵم کە بەعسییەکان لێرە نەماون، خۆشحاڵم دەگەڕێمەوە بۆ شارێکی ئازاد، من سوێندتان بۆ دەخۆم جارێکی تر ئەم شارە بەجێناهێڵم... سوێندتان بۆ دەخۆم، هەتا ئەگەر ئەم شارە تاعوون لە ناویدا بڵاوببێتەوە، دڕمی ترسناک کۆڵانەکانی پڕکەن لە مەیت،

کوچەکانی چۆڵ ناکەم... ئێوە هەمووتان دۆعام بۆ بکەن کە سەوسەن فیکرەت، ئەو کچەی بۆ خۆشەویستی ئەو دونیام تەیکردوە بە هاوسەری خۆی هەڵمبژێرێت... دەست بخەنە سەر دڵتان و دۆعام بۆ بکەن کە شتێک بچێتە دڵی خانمی سەوسەنەوە و من لە هەموو عاشقانی تر باشتر ببینێت و باڵندەکانی من زیاتر سەرنجی ڕابکێشن، دۆعام بۆ بکەن و هیچ کات لە دۆعاکردن مەوەستن... بەڵام ئێستا مەستدەکەم، ڕۆژی ئاهەنگمانە... هیوادارم ئەمە سەرەتای ئاهەنگی هەرە گەورەمان بێت... ئاهەنگی هەرە گەورە».

سالآنێک دواتر کە بیری قسەکانی ئەو ڕۆژەمان دەکەوتەوە، خوێن لە دڵمان دەهات. بەڵام ئەو ساتە ساتی شادی بوو. مەنگوڕ بەبینینی وەها گەشابووەوە خۆشحاڵی و کەیفی جارانیمان بەیادا دەهاتەوە. کامەرانی سەلما پێدەچوو چیتر ئەو گەنجە سەرەڕۆ و توڕەیە نەبێت کە زیاد لە هەشت ساڵ لەوەوبەر نیشتیمانی بەجێهێشت. گەلێک جوانتر و دونیادیدەتر و پڕ حیکمەتتر دەینواند، دەنگی وەک جاران توڕەیی و لەرەی ناکامڵی تێدا نەبوو، وشەکانی پڕبوون لە دڵنیایی و بڕوا بەخۆبوون. مەنگوڕ جار دوای جار باوەشی پیادەکرد و دەیگووت «ئای کوڕی خۆم... ئای کوڕی خۆم». دواجار مەنگوڕ لە ناوەڕاستی چایخانەکەدا وەستا و دەستی بەرزکردەوە و گووتی «خۆشبەخت ئێمەین، شادومان ئێمەین کە دووبارە تۆ دەبینین، بەخێربێیتەوە بۆ ناومان. ئەمڕۆ هەموو ئاهەنگدەکەین، بەڵام تا... ئێستا خوشکانت و پورانت و خێزانی گەورەت چاوەڕوانتدەکەن... بەرلەوەی هیچ بڵێیت... بەرلەوەی باسی هیچ شتێک بۆ هیچ کەس بکەیت، دەبێت بگەڕێیتەوە ماڵێ، لەوێ بخەویت و خۆت بشۆیت و پشوویدەیت... من لێرەدا پاسەوانی باڵندەکان دەکەم... تا ئێوارێ... تا ئێوارێ، ئەوسا بە هەموو ویقاری خۆتانەوە وەرن و دەچین بۆ ماڵی گوڵدانچی و تۆ لەوێ دەچیتە ژوورێ و هاتنەوەی

خۆت بۆ سەوسەن خان و باوکی ڕادەگەێنیت... وادەکەین... ئاه بەخێربێیتەوە کوڕم... دووبارە بەخێربێیتەوە».

کامەران هەر ئەو بەیانییە هاوڕێ ئێرانییەکانی خۆی بە ئێمە ناساند، یەکێکیان هەر لە سەرەتای سەفەرەکەیەوە ماوەی جیاجیا لەگەڵیدا بووبوو، زۆر وڵات لەگەڵیدا گەڕابوو، لە زۆر جێگای سەخت و لە زۆر قورتمی گەورە دەربازیکردبوو، ئەوی دیشیان وەک چاوساغ لە پەڕاندنەوەی قەفەزەکان و باڵندەکان لە سنوورەوە کۆمەکیکردبوون... بەڵام ئێمە بەشێوەیەک بەبینینی کامەران و باڵندەکان سەرسامبووین بایەخێکی زۆرمان بەوان نەدا.

بەیانییەکی سەیربوو، باڵندەکان بە جۆرێکی شێتانە دەیانقیڕاند و دەیانخوێند، دەنگیان بەجۆرێکی نائاسایی بەرز و خرۆشیان بێوێنە بوو. قیژە و چریکەی هەندێکیان بەجۆرێک بڵند بوو مرۆڤ لە شەقامەکانی شاردا وای هەستکرد لە دارستانە چڕەکاندا ونبووە. ئەو ڕۆژە پێدەچوو دەنگی ئەو باڵندانە زووتر لەوادەی خۆی شاری لە خەو هەستاندبێت. لە مێژووی شاری ئێمەدا ڕووی نەدابوو باڵندە بەوجۆرە سەرنجی خەڵک ڕابکێشێت. هەواڵی گەیشتنی باڵندەکان کە هەشت ساڵ بوو چاوەڕێماندەکرد بە خێراییەکی بێوێنە بەسەر هەواڵە تاڵەکانی شەڕی ناوخۆدا زاڵ بوو، هەر لە بەیانی زووەوە خەڵکانێکی زۆر هاتن بۆ سەیری قەفەزەکان. پێدەچوو مەنگوڕ پێشبینی هەموو شتێکی کردبێت، خۆی و چەندانێک لە ئێمە لە بەردەم قەفەزەکاندا بۆ پاسەوانی وەستاین، منداڵانی هارمان لە باڵندەکان دوورخستەوە، دیوارێکمان لە نێوان باڵندەکان و ئەو چاوە فزوڵانەدا دروستکرد کە هەندێکیان نیازی پاکیان نەبوو، دەمودەست قەدەغەمانکرد کەس خواردن بە باڵندەکان بدات. بەڵام ئەوەی سەیربوو خرۆشی نەسرەوتی خودی مەلەکان بوو، هەموو هەستمانکرد زۆر دڵخۆشن، گەلێک بەختەوەر دیاربوون، هەندێکیان زۆر

سەرسامانە لە دەلاقەی قەفەزەکانەوە سەیریاندەکردین، پێدەچوو ئەوانیش هێندەی ئێمە بەبینینی ئێمە سەرسامبن، وەک ئەوەی هەستبکەن فڕیون بۆ ئەستێرەیەکی تر و لەسەر پلانێتێکی تر نیشتوونەتەوە... زۆرکات هەستماندەکرد هێندەی ئێمە بۆ ئەوان غەریب و نائاساییین، ئەوان بۆ ئێمە وەها نین، هێندەی ئەوان فزوڵیان هەیە ئێمە ببینن و تێمانبگەن ئێمە نیمانە... مەنگوڕ بۆ ئەوەی جەنجاڵی و کۆبوونەوەکان لەدەوری قەفەزەکان کەمبکاتەوە، لە مبەرەو بەری شەقامەکەدا چوار پێنج خاڵی بەشینەوەی پاقلاوە و شیرینی و شەربەتی دانا. ڕێبوارەکان دەیانتوانی لەوێدا شەربەت و شیرینی بخۆن و پیرۆزبایی هاتنەوەی کامەران بکەن. ئەوەی سەیربوو ئەو ڕۆژە هیچ یەک لە شاعیران و شێوەکاران و مۆسیقارەکانی شار نەهاتنەدەرێ و نەهاتن بۆ سەیری باڵندەکان، کەس لەوان لەدەوری قەفەزەکان دەرنەکەوتن... هیچ کەسیش لە ئێمە، هەواڵێکی لە سات و وادەی گەڕانەوەی دوو داواکارەکەی دی نەدەزانی.

٣٨

لـه ئێـوارەدا کامەرانـی سـەلما و مەنگـوڕی بابەگـەورە و مەریوانـی مەمـە و لـچ قۆقـز لـە ماشـێنێکی سـپیدا کـە ئامۆزایەکـی کامـەران لێیدەخـوڕی بـەرەو ماڵـی سەوسـەن فیکـرەت بەڕێکەوتـن، کاروانـی باڵنـدەکان پـازدە قەفـەزی گـەورە بـوو کـە دوو ماشـێن ڕایاندەکێشـا، هەندێکیـان لـە نـاوەوە بوویـوون بـە دەیان وردە قەفـەزی دیکە، زۆریـەی قەفـەزەکان لەسـەر تایـەی تایبەتـی ڕاگیرابـوون کـە ئاسـان لەسـەر هەمـوو شـێوە ڕێگایـەک دەیانتوانـی بجوڵێـن، تایـەکان وەهـا کرابـوون بتوانـن بـە شـەقامی دژوار و ڕێـگای درێـژ و سەختیشـدا تێپـەڕن. کاتێـک کاروانەکـە لـە نزیکـی چایخانـەی پەپولـەی ئازادەوە بەڕێکـەوت، جوڵەیەکـی نائاسـایی کەوتـە شـەقامەکان. خەڵکانێکـی زۆر لەمبەرەوبـەرەوە بەسەرسـامی سـەیری کاروانەکەیـان دەکـرد، هەندانێـک توانجـی ناشـیرین و کەمێکیـش لـە پیـاوە هەمیشـە بێزارەکانـی شـار جنێویان بـە ئێمـە و باڵنـدەکان دەدا، هەندێـک بـە ناشایسـتەیان دەزانی لە سـەردەمێکی واسـەختدا، لـە ڕۆژانێکدا شـەڕ لـە زۆر شـار و شـارۆچکەی مەملەکەتـدا ئاگـری سـەندوە، ئێمـە سـەرقاڵی «کۆمەڵێـک تەیـری نەخـۆش» بیـن. بـەڵام ئێمـە بە بێدەنگـی لـە تەنیشـت کاروانەکـەوە دەڕۆیشـتین و باکمـان بـەو جـۆرە قسـانە نەبـوو.

لـچ قۆقـز یەکەمیـن کـەس بـوو کـە هەواڵـی هاتنـەوەی کامەرانـی بـۆ سەوسـەن فیکـرەت بـرد. کـە لای نیـوەڕۆ هاتـەوە بـۆ چایخانەکـە وەهـا

خرۆشـابوو، واماندەزانـی خەریکـە شـێت دەبێـت، بەدەنگـی بـەرز هەمـوو شتێکی بۆ گێڕاینـەوە، لەگـەڵ قسـە و هاوارەکانـی خۆیـدا سـوورتر و سـوورتر و لچی قۆقزتـر و قۆقزتـر دەبـوو، گووتـی «ئەوکاتـەی لەدەرگامـدا و چوومـە ژووریٚ باجـی سەوسـەن لەگـەڵ منداڵـی خوشـکەکەیدا پێکـەوە لـە ئاسـماندا سـەیری بەعـزیٚ باڵندەیـان دەکـرد، تـا ماوەیەکیـش ئاگایـان لـەوە نەبـوو کـە مـن لـە بەردەمیانـدا وەسـتاوم. کـە سـەرنجی منیانـدا وەک لاڵ وەهابـووم، بیلاهـی بـە نەوعێـک لەبەردەمیـدا پەشـۆکام هەناسـەم بـۆ نـەدەدرا، خەریـک بـوو بگریـم... بـەڵام پێـش ئـەوەی بگریـم، پێـش ئـەوەی فرمێسـکەکان لـە چـاوم بێنەخـواریٚ هاوارمکـرد، باجـی، باجـی گیـان، لێرەیـە... هاتـەوە... ئـەم بەیانییـە هاتـەوە. یەکەمجـار هـەر سـەیریکردم و هیـچ تێنەگەیشـت، مـن فرمێسـک لـە چـاوم هاتەخـواریٚ، بـە شـەرەفی دایکـم فرمێسـک وەک بـاران لـە چـاوم دایکـرد و گووتـم کامەرانـی سـەلما گەڕایـەوە، وەعدەکـەی خـۆی بەجێهێنـا و گەڕایـەوە، هەمـوو باڵـندەی دونیـای هێنـاوە... هەمـوو باڵـندەی دونیـا... هەمـوو باڵـندەی دونیـا. بێئـەوەی ئـاگام لـە خـۆم بێـت، لـە هەڵچوون و شپرزەییدا دەمقیژانـد، دەسـتم بەرزدەکـردەوە و دەمگـووت هەمـوو باڵـندەی دونیـا. باجـی سەوسـەن هـەر سـەیریدەکردم و هیچـی نەدەگـووت، ئینجـا منداڵەکـەی دانـا و گووتـی بەڕاسـتی لێرەیـە... بەڕاسـتی. مـن گووتـم بەقەبـری هەرچـی ئەسـحابەیە، بـە گـۆڕی باوکـم، مـن خـۆم ئێسـتا لای قەفەزەکانـەوە هاتـووم. مـن مەنگـوڕ ڕایسـپاردم بێـم، حەزیدەکـرد خـۆی ئـەم مژدە خۆشـە بـۆ تـۆ بهێنێـت، خـۆی ئـەو شـەرەفەی پێببڕێـت، بـەڵام هەمـوو دەزانیـن تـۆ حەرامتکـردوە پـیٚ بخاتـە حەوشـەکەتانەوە، بـەس خـودا خـۆی دەزانێـت کـە چەنـدە خـەوی بـەوەوە دەبینـی خـۆی ئـەم هەواڵەتـان بـۆ بهێنێـت، باجـی بـە قەبـری بـرای جوانەمەرگـم، هەشـت سـاڵە خـەو بـەوەوە دەبینێـت ڕۆژێـک بێـت خـۆی ئـەم مژدەیەتـان پێبـدات، بـەڵام دڵـی ئێـوەی لـە هەمـوو شـتێکی تـری دونیـا لا عەزیزتـرە، ئیتـر ناچـار، بەوەڵاهـی ناچـار منـی ڕاسـپارد... مـن...

کە پێتان بڵێم کە ئێواریَ، خۆمان و هەموو قەفەزەکان دێین بۆ ئێرە... هەموو دێین... خوابکات ئێوە ئامادەبن... خوابکات ئامادەبن».

لیچ قۆقز هەمیشە و هەمیشە بە شانازییەوە باسی ئەو ساتەی دەکرد، خۆشحاڵ بوو شەرەفێکی وەهای پێبڕاوە یەکەمین کەس بێت هەواڵەکە بۆ ماڵی گوڵدانچی بەرێت. ئێمە لە نیوەڕۆدا بیستمان کە گوڵدانچییەکان زۆریان لە ماڵی فیکرەت کۆبوونەتەوە تا لەو ساتە تایبەتی و سیحراوییەی مێژووی خێزانەکەیان بێبەش نەبن. لەو هەشت ساڵ و نیوەدا کەسیان لەو باوەڕەدا نەبوون چیرۆکەکەی سەوسەن ترۆپکێکی وا ئەفسانەیی تێدابێت. ئەوەی خەڵکانێکی زۆر بە شادییەوە دوای کاروانەکە کەوتوون، ئەوەی هەندێک بە ئاڵای کوردستانەوە لەگەڵ باڵندەکاندا دەڕۆیشتن مایەی سەرسامی خودی فیکرەت گوڵدانچی بوو، کاروانەکە نزیکی سەعات شەش و نیوی ئێوارە گەیشتە کۆڵانی ماڵی سەوسەن، سەدان کەس لەگەڵ کەژاوەی باڵندەکاندا دەڕۆیشتن، نا... نا، وەک گوتم پێشتر لە مێژووی شارەکەدا ئاوها باڵندە خەڵکی بەخۆیەوە سەرقاڵ نەکردوە. جەنجاڵییەک بوو مەپرسن. لەو ڕۆژەوە ئەو کۆڵانەمان ناونا «کوچەی باڵندەکان»، ماڵی سەوسەنیشمان ناونا «ماڵی باڵندەکان». کە کاروانەکە گەیشتە پێشدەمی ماڵی گوڵدانچی، سەوسەن بە هاوڕێتی هەریەک لە فیکرەت و عیزەت گوڵدانچی بۆ پێشوازی گەڕیدە دوور وڵاتەکە هاتەدەریَ، جگە لە مەنگوڕ کە بەتەنیا لە ماشێنەکەدا مایەوە، هەموو سەرنشینانی ماشێنەکە دابەزین. کامەران جلێکی کوردی قەشەنگی پۆشیبوو، گەلێک لە بەیانی بۆشناختر و جوانتر و پیاوانەتر دەینواند، بێئەوەی بشڵەژێت، بێئەوەی وەک جاران قەرەباڵغی زمانی ببەستێت، یەکەمجار بە حورمەتێکی مەردانەوە تەوقەی لەگەڵ دوو پیاوەکەدا کرد و ڕوویکردە سەوسەن فیکرەت و گوتی «خانم ڕێز و حورمەتی زۆرم... خۆشحاڵم دوای ئەم هەموو ساڵە تەندروست و سەلامەت دەتبینمەوە، من ئەمڕۆ بەیانی گەیشتمەوە شار، پتر لە هەشت

ساڵە بۆ تۆ بەم دونیایەدا وێڵم، خۆم بە بەختەوەرترین مرۆڤی ئەم زەوییە دەزانم کە توانیم باڵندەکان بەسەلامەتی بگەێنمەوە ئەم شارە و تا بەر دەرگای ئێوە بیانهێنم، ئەوە کلیلی هەموو قەفەزەکانە خانم، ئەوە کلیلی هەموو قەفەزەکانە، حەزدەکەم لە بەرچاوی خەڵکی بەڕێزی ئەم شارە بیدەمە دەستتان. خۆت دەتوانیت یەک بە یەک سەیریانبکەیت... لەم ساتە بەدواوە سەوسەن خان هەموو ئەم باڵندانە موڵکی تۆن».

هەموو بینیمان کە بەندێک کلیلی گەورەی دەرهێنا و بە ڕێزێکی زۆرەوە نوشتایەوە و کلیلەکانی دایە دەست سەوسەن فیکرەت، کە گەلێک پەشۆکاو و نامۆ دەردەکەوت، لە کاتێکدا هەمووان بەخێرهاتنەوەی کوڕەکەیان دەکرد، ئەو هیچی نەگووت، بەڵام بەجۆرێکی سەرسامانە سەیری کامەرانی سەلمای دەکرد، هەموو دڵنیابووین ئەو جۆرە سەیرکردن و نیگایە هێندەی تر ئاگر لە کامەران بەردەدات. لە ناکاو کامەران سەیری هەموومانی کرد، ئاوڕێکی خێراشی لە قەفەزەکان دایەوە، وەک ئەوەی شتێکی بیرچووبێت ڕوویکردە یەکێک لە قەفەزەکان و کلیلێکی جیای دەرهێنا و دەرگاکەی کردەوە و چووە ناوەوە و لەوێ لەگەڵ باڵندەیەکدا هاتەدەرێ. مەلێکی شێوە کۆتر، بە سەرپشت و سەرێکی خۆڵەمێشی کاڵەوە، تەیرێک باڵەکانی سپی بوون، کۆمەڵێک کەوانەی قاوەییان لەسەر بوو، سنگیشی سپی سپی بوو، بەڵام لە ناوەڕاستیدا ئەو سپێتییەدا پەڵەیەکی سوور هەبوو، وەک ئەوەی خوێن لە سینەی هاتبێت و دایدابێتە سەر پەڕەکانی. کامەران باڵندەکەی بەرزکردەوە و پیشانی هەمووماندا و گووتی «ئەمە ناوی کۆتری سینەزامدارە، کە لە ئەزەلەوە بەم پەڵە سوورەوە دێتە دونیاوە... لە باڵندەکانی ترم خۆشتردەوێت، خانم ئەمەیان دیاری تایبەتی منە... دیاری تایبەتی منە... گەر شووت بە من کرد یاخود نا، ئومێدم ئەوەیە ئەم باڵندەیە لە ژووری خۆتدا هەڵگریت و هەرکاتێک ئەوت بینی بیر لە من بکەیتەوە». هەموو گوێمان لێبوو کە سەوسەن باڵندەکە

دەگرێت و سەیریدەکات و بۆنیدەکات و دەڵێت «گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا... گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا». سەرەتا هیچ تێنەگەیشتین... هیچ، وامانەدەزانی کیژەکە خەریکە دەکەوێتە ورێنە و دۆخێکی نائاسایی تووشبووە، بەڵام سەری بەرزکردەوە و سەیری کامەرانی سەلمای کرد و بە ئەسپایی گووتی «کۆتری سینەزامدار، گەلێک جوانە... بەڵام ناوە لاتینییەکەی گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکایە... گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا، تەنیا لەسەر یەک دوو دوورگەی بچوک لە دوورگەکانی ئەندەنوسیا دەژی، لەوە بترازێت لە هیچ شوێنێکی تری جیهاندا نییە...». وشەکان بەجۆرێک لە زاری خۆشبوون، هەندێک لەوانەی لە دەوری کەژاوەی باڵندەکان وەستابوون، لەو کەسانەی هەر بە فیترەت لەبەر سیحری ئافرەتدا لاوازن خەریکبوو ببورێنەوە. سەوسەن سادە خۆی گۆڕیبوو، مەکیاجێکی کاڵ و تەنکی کردبوو، کراسێکی سپی بێملوان و پانتۆڵێکی ڕەشی لەبەردابوو، بەڵام یەک ڕەفتەی مۆری لە گەردنی ئاڵاندبوو، ئەو ڕەفتەیە جوانییەکی وەهای پێبەخشیبوو، نەماندەتوانی چاوی لەسەر بگوازینەوە و سەیری شتێکی دیکە بکەین. دڵنیام هەموو ئەوانەی گومانیان لە جوانی سەوسەن فیکرەت هەبوو، گەر ئەو ئێوارەیە بیاندیبایە، دەیانزانی چ هەڵەیەکی گەورەیان کردوە. سەوسەن ئەو ئێوارەیە «کۆتری سینەزامدار» ی لە دەست کامەران وەرگرت و گووتی «کامەرانی سەلما، شووت پێبکەم یاخود نا، ببیت بە هاوسەرم یاخود نا ئەم باڵندەیە تا مردن لەگەڵمدا دەمێنێتەوە... تا مردن».

سەوسەن لەگەڵ باوکی و مامی «دواتریش دکتۆر ڕەفعەت چووە ڕیزیانەوە» بەسەر باڵندەکاندا گەڕان. تا ئەو ئێوارەیە نەماندەزانی سەوسەن چ کچێکی زیرەکە، چ شارەزایەکی گەورەی دونیای باڵندەکانە. دەچووە بەردەم هەر قەفەزێک، سەیرێکی باڵندەکەی دەکرد و وەک زانایەکی گەورەی باڵندە ناوە لاتینییەکەی دەگووت، ئەو ناوە درێژ و ئاڵۆز و دووبەشانەی لە گوێی ئێمەدا تابلێی قورس دەزرینگانەوە، لە بەردەم

یەکێک لە قەفەزەکاندا هاواریکرد «ئارتیکۆرنێس کلامۆسۆس... خوای گەورە یەکێکە لە باڵندە دەگمەنەکان کە بەرەو نەمان دەچێت، یەکێکە لە هەرە باڵندە شەرمن و دەگمەنەکانی دونیا، کە لە سەر ڕووبەرێکی زۆر بچوک لە باشووری خۆرئاوای ئوسترالیا و هەندێ ژمارەی کەمیشی لە خۆرهەڵاتی ئەو وڵاتەدا دەژین... دەنگێکی بەرز و پڕنەغمەی هەیە... خوای گەورە چی دەبینم، ئارتیکۆرنێس کلامۆسۆس».

چەند قەفەز ئەولاتر، پێکەنی و باڵندەیەکی بڵند و باڵابەرزی نیشانداین کە بەلەش و باڵ لە داڵ دەچوو، قاچی وەک لەقلەق درێژبوو، بەڵام بنڕانەکانی ئەستوور و کڵاوپەڕێکی قەشەنگیشی لە پشتی سەرییەوە هەبوو. گووتی «ئەمە سکرتێرە، لە زۆربەی زمانەکاندا بە سکرتێر ناویدەنێن، چونکە کڵاوەکەی سەری لەو پەڕەموچە دەچێت کە نوسەرانی کۆن دەیانخستە پشت گوێیانەوە، لە توخمی داڵە، لەو گیاوگۆڵانەدا دەژی کە لە خوار بیابانەکانی ئەفریقاوە سەوزبوون، چنگێکی زۆر بەهێزی هەیە، باڵندەیەکی مارکوژ و مارخۆرە، بەو قاچە بەهێزانەی دەکێشێت بە مارەکاندا تا ڕۆحیان دەکێشێت، پیاکێشانێکی ترسناکی هەیە، گەر بەر مرۆڤیش بکەوێت برینداریدەکات... ناوە لاتینییەکەی سەکیتاریۆس سێرپەنتاریۆسە... تەیرێکی جوان، بەڵام ترسناکە... وانییە کامەران؟؟».

کامەران بە حورمەتەوە سەیریکرد و گووتی «هەموو زانیارییەکانت تەواون خانم... باڵندەیەکی ئەمین نییە، مرۆڤ دەبێت خۆی لە چنگە تیژ و قاچە درێژەکانی بپارێزێت... زۆر ڕاستە خانم، باڵندەیەکی پیادەڕەوە، شەق هاوێژێکی بێڕەحمە، وەکو تریش بەسەعاتی دووردرێژ بەپێ بە ناو گژوگیادا دەڕوات، ڕاودەکات و پیاسەدەکات، ها خانم... ڕاودەکات و پیاسەدەکات. لەم قەفەزەدا دڵی زۆر خۆش نییە، بەڵام چاری نییە، خۆی دەزانێت کە چاری نییە».

یەکە یەکە سەیری هەموو باڵندەکانیان کرد، سەوسەن باسی زۆر لە

باڵندەکانی بۆ کردین؛ ئەوە یەکەمجار بوو ببینین کە بەوجۆرە دەکرێتەوە و بەوشێوە گەش و دەنگە ساف و ڕوخسارە بێگەردە سەیرماندەکات و بۆمان دەدوێت، هەموو هەستمان بە بەختەوەریی کرد... بەختەوەرییەک لەو چەشنەی مرۆڤ لەگەڵیدا بیری دەچێتەوە بۆ بەختەوەرە. فیکرەت گوڵدانچی و عیزەتی براشی لە دیمەنی ئەو هەموو باڵندە سەیر و ناوازەیە سەرسامبوون. دکتۆر ڕەفعەت بە نیگایەکی تیژەوە، بەچاوی پزیشکێکەوە کە بەوردی تەماشای نەخۆشێک دەکات، سەیری باڵندەکانی دەکرد، دکتۆر گەرچی کوڕێکی گەنج بوو، بەڵام کەمەکەمە خەریک بوو ورگی دادەنا و چاویشی بەخێرایی کزدەبوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ شێوە سەیرکردنی پزیشکە پیرەکان بە نیگایەوە دەردەکەوت. هەموو هەستمانکرد بە گومانەوە سەیری باڵندەکان دەکات، بەشتێک لە نیرەییەوە سەیری سەوسەن دەکات، پێوەی دیاربوو دەیەوێت لە هەرجێگایەک بێت، هەر خۆی پیاوە زیرەکەکە بێت کە هەموو زانیارییەک لای ئەو دەست پێدەکات و لای ئەو دوایی دێت. دوای بێدەنگییەکی دووردرێژ دکتۆر بە دەنگێکی گوماناوی و بەنیگایەکی زێرەوانکێ لە بن چاویلکەکەیەوە گووتی «وامەستدەکەم ئێستا کێشەیەکی زۆر گەورەمان هەیە... کێشەیەکی زۆر گەورە». فیکرەت گوڵدانچی سەیریکرد و گووتی «کێشەی چی، جەنابی دکتۆر؟». دکتۆر گووتی «کێشەی شوێن... جەنابی گوڵدانچی... کێشەی شوێن، ئەم هەموو باڵندەیە لە کوێ دادەنێیت؟».

هەموو سەیری یەکدیمان کرد و گوێمان لێبوو گوڵدانچی دەڵێت «بەڵێ دکتۆر ڕەفعەت هەق بەتۆیە کێشەی شوێن، کێشەیەکی گەورەیە... زۆر گەورەیە. بەڵام دەبێت بەهێمنی بیری لێبکەینەوە، بۆ ئەمشەو دەشێت باڵندەکان لە حەوشی ماڵی ئێمەدا بمێننەوە... بۆ ئەمشەو و چەند شەوێکی دیش دەتوانین لە حەوشی ماڵی خۆماندا جێگایان بکەینەوە، بەڵام بۆ دواتر شوێنی گەورەترمان دەوێت».

## ٣٩

ئاهەنگەکانی ئەو شەوە تایبەتیانی بەردەوام بوون. لەو سەردەمەدا هێشتا غەریبی و کۆچکردن لە شاری ئێمەدا نەبووبوو بە شتێکی ئاسایی، هێشتا هاتنەوەی غەریبان هۆیەک و بەهانەیەکی باش بوو بۆ ئاهەنگ، ئەمڕۆ پازدە ساڵ دوای ئەو شەوە، دوای ئەوەی دەیان هەزار خێزان و کوڕ و گەنجی ئێمە بەسەر زەویدا ئاوارەبوون و نیشتیمانیان بەجێهێشت، چیتر هاتنەوەی غەریبان بۆنەیەکی سەیر نییە و شتێک نییە شایستەی ئاهەنگ بێت. کە لە هاوینی ساڵی نەوەدوچواردا کامەرانی سەلما گەڕایەوە، جیهان لە خەیاڵی ئێمەدا هێشتا شوێنێکی سیحراوی بوو، جێگایەک بوو پڕ لە ئەفسانە، پڕبوو لە شتی نەبینراو و نەبیستراو... هەر کەسێک لە دونیاوە بەرەو ئەم شارەی ئێمە بهاتبایە، چیرۆکی سەیر و پڕ نهێنی و نەبیستراوی بۆ دەهێنایینەوە. ئەو ڕۆژەی کە کامەرانی سەلما هاتەوە ئێمە لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئەو پەتایەدا بووین کە دونیا بناسین. ئەو شەوە لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەی باوەجاندا، شێتانەترین ئاهەنگمان گێڕا. مەنگوڕ شێتانە مەسرەفیکرد، تا نیوەشەو دوو کەبابخانە کەبابیان بۆ دەبرژاندین، لای هەموو مەشروب فرۆشەکان چی خواردنەوەمان دەستکەوت کڕیمان، سەدان قوتو بیبسی و کۆلای ئێرانیمان هێنا، لە بەیانیشەوە پاقلاوەخانەکانمان ڕاسپاردبوو پاقلاوەمان بۆ دروستبکەن. شەوێکی سەیربوو، ژێر زەمینی ئوتێلەکەی باوەجان کەسێکی تری نەدەگرت، مەنگوڕ باندێکی مۆسیقیشی

گرتبوو مۆسیقامان بۆ بژەنن و گۆرانیمان بۆ بڵێن. کامەرانی سەلما و مەنگوڕ هەردووکیان لەسەر مێزە گەورەکەی ئێمە دانیشتبوون. مەنگوڕ گووتی «کوڕینا، ئەمشەو خۆشترین شەوی ژیانمە... لەو کاتەوەی لە دایکبووم دونیا قوونی تێکردوم و بەدبەختی لەدوای بەدبەختی دێتە سەر ڕێگام، بەڵام هەموو ناخۆشی ئەم چەند ساڵەم ئێستا تێپەڕی... بە سەری عەزیزی هەمووان ئەمشەو شەوی ئەوەیە ئێمە قوون بکەینە دونیا... شەوی ئەوەیە هەموو مەست بین و کەس تا بەیانی ڕێگای ماڵی خۆی نەدۆزێتەوە». مەنگوڕ زۆر بە کەیف بوو، ئەو شەوە بۆ یەکەمجار گوێمان لێبوو گۆرانی بۆ گووتین، پێشتر نەمانبیستبوو مەنگوڕ دەنگی خۆش بێت، بەڵام سەرەتا «لەبەر نازی چاو بازان» و دواتر «بابچینە سەر وەیس»ی گووت. بە دەستە توکنەکانی پەرداخی عارەقەکەی گرتبوو و بازووە خڕ و ئەستوورەکانی لەسەر مێزەکە دانابوو و گۆرانی دەگووت، چاوی لێکنابوو و بەدەنگێکی پڕ سۆز وشەکان لە دەمی دەهاتنەدەرێ. مەنگوڕ لەوانە نەبوو کە زۆر بخواتەوە، کەمجار لە دوو پێک زیاتری هەڵدەدا، کەسێک بوو دەیویست هەمیشە ئاگای لە خۆی بێت، هەتا لەو شەوەشدا تەواو ئاگای لە خۆی بوو، کامەرانی سەلما و دوو ئێرانییەکە لە ملاو لایەوە دانیشتبوون. ئەو شەوە هەستمان بەو هەموو گۆڕانە قووڵانەکرد کە سەفەر لەسەر شێوەی قسەکردن و سەیرکردن و جوڵاندنەوەی کامەران جێیهێشتبوو. هەر ئەو شەوەش ئاشکرابوو کە بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە، مەنگوڕ مەسرەفی سەفەری ئەم کوڕەی بە نهێنی کردوە، هەرچییەکی کردوە بۆئەوەبووە تین و تاوێک بدات بەم پیاوە تا لە سەر ڕێگاکانی جیهاندا ون نەبێت، ئەوەی وەک پەیامی سەرەکی و گەورەی ژیانی خۆی تەماشاکردوە. ئەو شەوە هەموو تێگەیشتین کە مەنگوڕ بۆ پەیداکردنی پارەی ئەم سەفەرە درێژە لە قاچاغچێتی عارەقەوە بۆ ئێران ئاڵاوە، لە دزییەکانی پێش ڕاپەڕینەوە ئاڵاوە، لە تاڵانییەکانی دوای ڕاپەڕیندا بەشداربووە، دەستی لە ئاودیوکردنی

ماشێن و کەلوپەلە گرنگەکانی وڵاتدا هەبووە بۆ ئەودیو سنوور، چۆتە حیزبەوە بۆ ئەوەی ئاسان پارەی دەستبکەوێت. نەوەک هەر ئەوە بەڵکو وەک دواتر زانیمان کۆشکێکی زۆر زۆر گەورەشی کڕیوە و دایناوە کامەران دوای ژنهێنان بچێتە ناوی. ئەو شەوە مەنگوڕ خۆی هیچی نەگووت، بەڵام لە ڕێگای قسەکانی کامەرانی سەلماوە بۆمان دەرکەوت ئەو تەنیا بەو کۆمەکانە توانیوێتی بە ڕێگادا بڕوات و بە پارەی ئێمە لەنێوان شارەکان و وڵاتەکاندا سەفەریکردوە. بەڵام ئێمە کێ بووین... ئێمە لە مەنگوڕ بەولاوە کەسیتر نەبووین کە بە ناوی هەموومانەوە کۆمەکی ئەم کوڕەی کردوە، بە ناوی هەموومانەوە نامەی بۆ نوسیوە، بە ناوی هەموومانەوە تین و هێزی سەفەری پێبەخشیوە. ئەوشەوە کامەرانی سەلما لە نێوان گورانییەکاندا جار جار باسی جیهانی بۆدەکردین، جیهانی گەورە... کە ئەو هەمووی بینیبوو، ڕوبار بە ڕوبار، شار بە شار، جەنگەڵ بە جەنگەڵ. بۆ ئێمە ئەوە گرنگ بوو، کە باسی ژنە جوانەکانی سەر زەویمان بۆ بکات، باسی ئەوەمان بۆ بکات لە کوێ شۆخترین خانمی بینیوە و ئەم چەند ساڵە چۆن ژیاوە و چی سەرکێشییەکی کردوە. کامەران گووتی کە لە هەموو شارەکانی دونیادا ژن هەبووە ئامادەبوون لەگەڵیدا بخەون، ژن لە هەرە جوانترین ژنەکانی سەر زەوی، بەڵام ئەو جگە لە سەوسەن گوڵدانچی ئارەزووی نەچۆتە سەر هیچ ژنێکی تر. کامەران دەستی دەخستە سەر شانی هاوکارە ئێرانییەکەی و پێدەکەنی و دەیگووت گەر حەزتان لە باسی ژنە، هاوکارەکەم، ئەو دەتوانێت باسی ژنتان بۆ بکات، ئەو ئینگلیزییەکی بێگەرد و فەرەنسییەکی باش قسەدەکات، ئەو لەگەڵ هەموو ژنەکانی دونیادا خەوتووە نەک من، من دەتوانم تەنیا باسی باڵندەکانتان بۆ بکەم. ئا لەویادا ئێمە دەبووین بە دوو بەشەوە، ئەوانەی حەزمان لە چیرۆکی کەیف و ڕاموسانە ڕوومانکردە لای یاوەرە ئێرانییەکە و ئەوانەشی دەمانویست شتێکی نوێ دەربارەی جیهان فێرببین دەچووینە لای کامەران. ئەو شارەزاییەکی گەورەی لە

باڵندەکاندا پەیداکرابوو، باسی توخمێکی بولبولی بۆ کردین کە بە پۆلێکی گەورە نێر یەک مێیان هەیە، مێیەکی جوان و نازادار کە هەر شەوە و دەچێتە هێلانەی یەکێکیانەوە و ساڵی دوازدە هێلکە دەکات و نێرەکان لە بری مێیەکە لەسەر هێلکەکان کڕدەکەون. باسی جەنگەڵێکی کرد تەنیا جۆرێکی تایبەت لە قەلەڕەش لە نێویدا دەژین و ڕێگا بە هیچ باڵندەیەکی دیکە نادەن ڕووی تێبکات، باسی شارێکی بۆ کردین هەموو باڵندەکانی سپین، سپی سادە، بێئەوەی یەک خاڵی ڕەش لەسەر پەڕیان بێت. باسی جۆرە شاهێنێکی بۆ کردین لە ناو خۆڵەمێشی گەرمدا نەبێت هێلکە ناکات، باسی لەقلەقێکی بۆ کردین دەنوکی ئاڵتونە و بە هیچ ڕاوکەرێکی سەر زەوی ناگیرێت، چونکە هێندەی دەستی مرۆڤی بەرکەوت دەبێتە پارچەیەک لە پەڕی سپی و وەک با بیبات پەرشدەبێتەوە، جۆرە بولبولێک کە ئەگەر مرۆڤ زیاد لە دە دەقیقە گوێ لە خوێندنی بێت، هێدی هێدی لەشی خاودەبێتەوە و خەوێکی وەها قووڵی لێدەکەوێت چەند ڕۆژێک لە خەو هەڵناستێت. کامەران ئەو شەوە باسی ئەو قەلەڕەشانەی بۆ کردین کە لەگەڵ مردووەکاندا قسەدەکەن و سوێندی بۆ خواردین کە خۆی یەکێک لەوانەی بینیوە و هەموو شتێکی دەربارەی ژیانی باوکی لەدوای مەرگ پێگووتووە، باسی ئەو کۆترانەی بۆ کردین کە وەک مرۆڤ پرسە دادەنێن و گۆڕستانیان هەیە، باسی ئەو کونەپەپوانەی گەر هەتاویان بەرکەوێت یەکسەر دەبن بە خۆڵەمێش. یەکێکمان لێیپرسی «هێی کامەران، هێی کوڕەکەی سەلما نۆڵانی پێمبڵێ لەم سەفەردا زیاتر لە هەر شتێک لەچی ترساویت، لە چ جانەوەرێک، لە چ درندەیەک، لەچ ئازارێک؟». کامەران دوای کەمێک بیریکردنەوە گووتی «تاکە شتێک لێیترساوم ئەوەبووە ڕۆحم لە جێگایەک و لەشم لە جێگایەکی دیکە بمرێت، ئەوە ترسی هەرە گەورەی هەموو ژیانم بووە». ئەو شەوە هەموومان هێند سەرخۆشبووین بەو قسەیە دامانە قاقای پێکەنین، چونکە ئەوکات لە مەستیدا وا بیرماندەکردەوە،

هیچ مرۆڤێک نییە لەشی لە جێگایەک و ڕۆحی لە جێگایەکی دیکە بمرێت، لەو جەنجاڵییەدا قسەکەی کامەران بە هێمنی بەسەر هەمووماندا تێپەڕی و هەموو وەک نوکتەیەکی ناجۆر وەرمانگرت. بێئەوەی بیریکەینەوە دەمانخواردەوە و بە نۆبەت گوێمان لە چیرۆکی ئەو دوو پیاوە دەگرت، دەمانخواردەوە و گۆرانیمان دەگووت، لەگەڵ مۆسیقاکەدا خۆمان بادەدا و لەگەڵ گۆرانیبێژەکاندا گۆرانیمان دەگووتەوە، لە کۆتایی شەودا هەموو شەکەت و مەست و سەرسام نەماندەتوانی لە شوێنی خۆمان بجوڵێین. لەگەڵ ئەوەی زۆر زۆرمان خوارد و زۆر زۆرمان خواردەوە، چەندەها نەفەر کەباب هێشتا لەسەر سینییەکان بێدەستکاری مابوونەوە، هەموومان تا ئەندازەی کوێری مەست بووین، بەڵام دەیەها بوتڵە عارەق و شەرابی دەست لێنەدراو هێشتا هەر لەسەر مێزەکان بوون.

کەسمان نازانین کەی ئاهەنگەکە تەواو بوو، کەی گەیشتووینەتە ماڵەوە و کێ ئێمەی بردۆتە ناو جێگاکەوە؟... بەڵام کە بەیانی هەستاین دڵنیابووین لە جاران زیاتر شت دەربارەی دونیا دەزانین، لە جاران زیاتر ئارەزووی ئەوەمان تێدایە کە بڕۆین و شار و جەنگەڵ و تاڤگە دوورەکان ببینین... لە جاران زیاتر دەنگێک لەدەرەوەی دیوار و شەقام و کۆڵانەکانی ئەم شارە بانگیدەکردین... هەموو بەجۆرێکی سەیر گوێمان بۆ دەنگی باڵندەکان تیژبووبوو، ئێواران بە کۆڵانی باڵندەکاندا پیاسەماندەکرد بۆ ئەوەی گوێمان لە خوێندنی بولبولەکانی خانم بێت، گوێمان لە قیڕەی تووتییەکانی ئەو بێت، هەستماندەکرد دەنگی ئەو باڵندانە هاواری دونیایەکی پڕ تەلیسمە و بەرەو خۆی بانگماندەکات، دەنگی سیحراوی کچانی وڵاتانی دوورە و بانگماندەکەن... دوای بینین و بیستنی ئەو باڵندانە دەبووایە بە ڕاستی بڕۆین و جیهان بدۆزینەوە... ئێمە دوا میللەتی سەر زەوی بووین کە دەبووایە لە ماڵی خۆمان بێینەدەرێ و دووبارە کیشوەرە دۆزراوەکان بدۆزینەوە، دووبارە جەنگەڵە دۆزراوەکان و شارە دۆزراوەکان بدۆزینەوە.

## ٤٠

بۆ ڕۆژی دوایی سەوسەن لەگەڵ پرۆشە و مریەمی پورزایدا هات بۆ بازاڕ و لای دارتاشێک و دوو ئاسنگەر کۆمەڵێک قەفەزی تایبەتیان دا بەکردن، پتر لە سی و پێنج قەفەز لە هەموو جۆرە قەوارەیەک و لە هەموو شێوە چەشنێک، کە دەبایە لە ماوەی دە ڕۆژدا هەموویان بگوازرێنەوە بۆ ماڵی گوڵدانچی. هەر لەو ڕۆژەدا بوو پیاوانی ناو بازاڕ سەوسەنیان ناونا خانم یان کچی باڵندەکان. هەر لەو بەیانییەشدا سەوسەن لە بازاڕدا منداڵێکی زەرففرۆشی بینی ڕایدەکرد و دەیگووت «کچی باڵندەکان هات... کچی باڵندەکان هات».

سەوسەن سووربوو لەسەر ئەوەی باڵندە بچوکەکان، ئەوانەی شوێنی زۆر گەورەیان ناوێت، ئەوانەی دەتوانن پێکەوە بژین، ئەوانەی ئازاری مرۆڤ نادەن و ناشێت هوزاری خوشکەزای بریندارکەن، لە ماڵی خۆیدا و لەبەرچاوی خۆی بمێننەوە، تەنیا باڵندە گەورەکان دەبایە دەربچن و لەدەرەوەی ماڵ شوێنێکی تایبەتیان بۆ بکرێت. عیزەت گوڵدانچییش مەخزەنێکی گەورە و فەرامۆشکراوی لە دەرەوەی شار هەبوو، بە جۆرێکی کاتی خستییە بەر دەستی فیکرەتی برای تا بیکەنە نیشتەجێی باڵندەکان.

ڕۆژی دوایی کامەرانی سەلما دەبایە ئێوارەیەکی درەنگ بچێت بۆ ماڵی گوڵدانچی و گفتوگۆیەکی دوور قووڵی لەگەڵ سەوسەن خاندا ئەنجام بدات. کاتێک پێی خستە ماڵی گوڵدانچییەوە، هەستێکی بەهێز دایگرت

کە دەشێت ڕەشەبایەکی قایم پێش ئەو هاتبێت و هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا بردبێت، دیمەنی ماڵەکە هیچی لەو ماڵە قەشەنگە ڕازاوەیەی جاران نەدەچوو کە بەدرێژایی ساڵانی سەفەر، وێنەکەی لە خەیاڵی خۆیدا پاراستبوو. ئەو دەمەی پڕبوو لە کورسی و مێزی گران و پەیکەری کۆن و شتی بەسامانبار و خشڵبەها، کە چووە قاتی سەرەوە و پێی خستە ژووری کتێبخانە گەورەکەش، لە خاڵیتی و بێدەنگی هۆڵەکە سەرسامبوو، هەتا یەک کتێبیش چییە لەوێ نەمابوو، کورسی و مێزێکی کۆن و قەنەفەیەکی پیر و ماندوو و قەرەوێڵەیەکی خەو لەو سەری ژوورەکەدا دانرابوون. لە شوێنی خۆی وەستا و سەیری سەوسەنی کرد کە بە ئارامی لەسەر مێزەکەی خۆیەوە سەیریدەکرد. کامەران سەرسامانە هاواریکرد: «سڵاو خانم... سڵاو... بەڵام عەقوومکە... ڕەنگە کەم ئەدەبی بێت، بەڵام... بەڵام تێناگەم... بۆ وایە، خانم... بۆ وایە... بمبورە، ڕەنگە پرسیارێکی جوان نەبێت، بەڵام ناتوانم نەپرسم، ناتوانم نەپرسم. کوا ماڵە قەشەنگەکەی جارانتان... کوا کتێبخانە گەورەکەتان... کوا پەیکەرە جوانەکانتان؟». سەوسەن دڵنیابوو هەر سێ داخوازەکە ئەو پرسیارەی لێدەکەن. بە هێمنییەوە پێشوازی لێکرد و تکایکرد لە سەر قەنەفە کۆنەکەی دانیشێت، هەمان ئەو قەنەفەیەی زیاد لە هەشت ساڵ لەوەوبەر شەوێک لەسەری دانیشتبوو... بەڵام ئێستا ماندوو و بێڕەونەق دەینواند. سەوسەن ئەمجارە بەدەستی خۆی چای لە قۆرییەکی ڕەش بۆ تێکرد و بەدەنگە لاواز و کزەکەی خۆی گوتی «کامەرانی سەلما، تۆ زیاد لە هەشت ساڵە ڕۆیشتویت، لەو ماوەیەدا چەندین شەڕی گەورە ڕوویانداوە... من خۆشحاڵم کە تۆ لێرە نەبوویت، کە جەنگی عێراق و هاوپەیمانەکان ڕوویدا، بەخۆم گووت سوپاس بۆ خودا کە کەسیان لێرە نین... کەسیان ناچارنین لەو شەڕە پیسەدا بەشداربن. کە ڕاپەڕین ڕوویدا و هێزەکانی سەدام تێکشکان، دۆعامدەکرد کە بەس نییە تۆ لێرە نیت، دەمزانی تۆ لێرەبوویتایە شێتانە

خۆت دەخستە ناو هەموو ئاگرەکانەوە... هەموو شەقامەکانی شار، هەموو جێگاکانی شەڕ دەگەڕام و دەستم لەسەر دڵم بوو و دەمگووت بەس نییە کامەرانی سەلما لێرە نییە. دەمگووت بەو خوایە لێرەبایە، بە دڵنیاییەوە ئێستا لەگەڵ جەنگاوەرەکاندا شەڕیدەکرد. هەموو کاتێک کامەرانی سەلما، هەموو کاتێک... گەر هەر شتێک بووبێت، دەستم گرتووە بە دڵمەوە و گووتوومە بەس نییە کامەران لێرە نییە. بەس نییە ئەو لێرە نییە خۆی بخاتە ناو ئاگرەوە. ئیتر ئێمە لەو نێوەندەدا زۆر هەژاربووین، باوکم چیتر موچەی وەرنەدەگرت، ئەوەی هەمان بوو خەرجمانکرد، خۆت دەزانی گوڵدانچی خەریکە تەواو پیرەبێت... ناتوانێت کاربکات، کە گەڕاینەوە بۆ کوردستان بۆئەوە بوو پشوویدەین، بۆ ئەوەی هەموو ڕۆژانی ناخۆشی بەغدامان لە بیربچێتەوە، گوڵدانچی توانای کاری نییە و منیش توانای کارم نییە. لە شارێکی وەک ئێرەدا کە لەدەرەوەی دونیایە بۆ کچێکی وەک من چی هەیە بیکەم... هیچ... جگە لەوە من بەردەوام نەخۆشم. لەبەرئەوە دەبوو هەموو شتێک بفرۆشین... هەموو شتێک، بەڵام دەمەوێت گوێم لە تۆ بێت، ئەم شارە جگە لە حیکایەتی ناخۆش هیچی تری تێدا نییە، تۆ باسی جیهانم بۆ بکە... حەزدەکەم بزانم تۆ دونیات چۆن بینی؟... ها.. دەبینیت، منیش چیتر ئەو کچە نیم کە هەشت ساڵ و نیو لەوەوبەر هەبووم... پێمبڵێ پەشیمان نیت لەوەی بەو چەشنە و ئەو هەموو ماوەیە بەسەر زەویدا ئاوارەبوویت... پێمبڵێ هەندێ جار لە من تووڕە نەبوویت و رقت لێم نەبووە کە تووشی سەفەرێکی وا درێژم کردیت... ها پێمبڵێ، من هەشت ساڵە هیچ شەوێک نییە خەوم بە هەر سێکتانەوە نەبینیبێت، زۆربەی وەخت تۆم لە بەلەمێکدا دەبینی، بەلەمێکی سەوز... ئاه، بەڵام کاتی خەون نییە، وانییە، ئێستا ئەوەتا لە بەردەممدایت و دەتبینم... وانییە».

کامەران هەر وەک جاران بە خەندەکانی سەوسەن، بە نیگا سافەکەی

و سەیركردنە نەرمەكانی، بەو دەنگە تێچگار هێمنەی كە پێدەچوو دەنگی مەخلوقێكی سەر ئەم زەمینە نەبێت سەرسامبوو. ئاسان هەمان تەزووی خۆشەویستی جارانی لە دڵی خۆیدا دۆزییەوە، هەستیكرد هەڵەی نەكردوە لەوسەری زەمینەوە بۆلای ئەم ژنە هاتۆتەوە. هەڵەنەبووە درێژترین سەفەری بە دونیادا لە پێناوی ئەم ژنەدا كردوە. ئێستاش كە بەرامبەری وەستابوو هەمان ئەو هەستەی هەشت ساڵ لە مەویەری هەبوو كاتێك لە بەردەمیدا سوژدەی برد و گووتی «شووم پێبكە». ئێستاش دەیتوانی هەمان شت بكات، بەڵام ئەمڕۆ زیاتر لە هەر شتێك ویقاری پێویست بوو، هەردووكیان بەشی خۆیان كامڵ بووبوون. كامەران لەو ماوەیەدا گۆڕابوو، دەیتوانی هێمنتربێت و جوانتر قسەبكات، بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە یاوەرە ئێرانییەكەی و هاوڕێكانی لەمسەرە و سەری زەمیندا باشتر فێری نوسین و خوێندنەوە و قسەكردنیان كردبوو. كە بەرامبەر سەوسەن وەستا دەیزانی لە ساتێكی وادا، تەنیا وشە فریای دەكەوێت، تەنیا وشە. ئەو ساڵە دوورودرێژانەی سەفەر فێریانكردبوو كە وشە تەنیا پاسپۆرتی ڕاستەقینەی مرۆڤە. بە سەوسەنی گووت «ئا سەوسەن خان، بیرمنایەت لە تۆ توڕە بووبێتم. پێویست ناكات باسی ڕاوەكانت بۆ بكەم چەندە ناخۆشبوون، جارێكیان جووتیارێكی هیندی پێیگووتم گرتنی هەندێك باڵندە لە گرتنی تیشك ئەستەمترە، من قەت قسەی ئەو ڕاوكەرە هیندییەم بیر ناچێتەوە. تەنیا دوای سەفەرێكی وادووردرێژ دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم كە مرۆڤ و باڵندە لە دوو دونیای جیاوازدا دەژین... زەوی خانم، جێگایەكی جوانە، هەموو جێگایەكی جوانە... هەموو مەخلوقێكی جوانە، بەڵام حەزم نەدەكرد زۆر بیر لەو هەموو جوانییە بكەمەوە، عەقڵی ئەوەم هەبوو، زۆر بیر لەو هەموو جوانییە نەكەمەوە. گەر زۆر بیرم لە جوانی بكردایەتەوە ونەبووم... بەڵام دەمزانی تۆ بۆیە منت ناردوە تا دونیا ببینم. من دەمزانی، دڵنیام دووانەكەی تریش ئەوە دەزانن كە تۆ باڵندەكانت ناوێت،

تۆ دەتەوێت دونیا ببینین، یادگارییەکی گەورەمان هەبێت... کە پیربووین، شتێکی گەورەمان هەبێت بیگێڕینەوە. کە منداڵمان بوو، باسی دونیایان بۆ بکەین، هەموو دونیا. من وام بیر لێدەکردەوە، زۆر شەو کە لە ئوتێلی شارێکدا سەرم دەنایە سەر سەرین، دەمگووت گەر مرۆڤ باوکێکی هەبێت، باسی هەموو دونیای بۆ بکات، باشترە لە باوکێک کە تەنیا باسی شارێک یان گوندێکی بچکۆلەی بۆ بکات، گەر باوکێکی هەبێت هەموو شوێنەکانی بینیبێت باشترە لە باوکێک هیچی نەدیبێت... من لەو سەفەرە پەشیمان نیم... بەڵام ڕەنگە نەتوانم جارێکی تر سەفەرێکی تری وەها بکەمەوە».

سەوسەن بە نیگایەکی غەمگینەوە سەیریکرد و گووتی « بەڵام پێمبڵێ ئەی چیرۆکی زۆرت پێیە بۆ من... چیرۆکی زۆر؟».

کامەران بە پێکەنینەوە گووتی «سەوسەن خان، ئەگەر شووم پێبکەیت، بەشی هەموو شەوەکانی ژیان چیرۆکم پێیە... بەشی هەموو شەوەکان»

سەوسەن گووتی «کامەران پێمبڵێ بیرت لەوە کردەوە نەگەڕێیتەوە، بە خەیاڵتدا هات، بڕۆیت و پشت لە هەموو شتێک بکەیت و واز لە باڵندەکان بهێنیت و نەگەڕێیتەوە؟»).

کامەران گووتی «نا خانم... گەر سەر ڕاست بم لەگەڵتدا بیرم لە شتی وانەکردۆتەوە، بەڵام دەمویست سەفەرەکەم تەواویکەم، بەڕاستی دەمویست تەواوبیکەم. هەستمکرد تۆ باڵندەکانت بە جۆرێکی وا دابەشکردوە، مرۆڤ ناچارییێت زۆرترین شار و زۆرترین دارستان ببینێت. منیش گووتم مادام خانم وای دەوێت با بەوجۆرە بێت. نا نەمدەتوانی نەگەڕێمەوە، گەر باڵندەکانیشم نەگرتایە هەر دەگەڕامەوە، چونکە زۆر بیری هاوڕێکانم دەکرد، بیری منداڵی خۆمم دەکرد، دەمزانی گەر بە دەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە بەوە تووشی ئابڕووچوونێکی گەورە دەبم بەڵام هەر دەهاتمەوە، نا خانم گەر هیچیشم ڕاونەکردایە هەر دەهاتمەوە. بەڵام گەر وابووایە، ڕووم نەدەهات خۆم لە بەردەمی تۆدا ئاشکرابکەم، ئەو کات خەمی خۆم هەڵدەگرت

و وەک چەقۆکێشـەکەی جـاران دەژیـام... نـا خانـم، شـوێنم بـەلاوە گرنـگ نەبـوو. نـا سەوسـەن خـان، ئـەوەم بـەلاوە گرنـگ نەبـوو کـە لـە شـەڕ دوورم، ئـەوەم بـەلاوە گرنـگ بـوو کـە لـە تـۆ دوورم. مـن کوڕێکـی زۆر خوێنـدەوار نیـم، تـۆ ئـەوە دەزانیـت... زۆر جـار لـە خـۆم دەپرسـم چـی لـەم سـەفەرە فێربـووم... خانـم ڕۆژێکیـان هەستمکرد قـووڵ لـە نیـازی تـۆ تێگەیشـتووم، بـە هەمـوو نەخوێنـدەواری خۆمـەوە لـە نیـازی تـۆ تێگەیشـتووم. ڕۆژێـک لـە دارسـتانێک لـە ئوسـترالیا، بـۆ باڵندەیـەک دەگـەڕام نـاوم نابـوو مەلـە قاقـا، چونکـە دەنگـی خوێندنەکـەی لـە دەنگـی قاقـای مـرۆڤ دەچێـت، تەنیـا لـە دارسـتانەکانی ئوسترالیاشـدا دەژی، مـن لـە هیـچ جێگایەکـی تـری زەویـدا نەمبینیـوە، باڵندەیەکی مارخـۆرە خانـم، تەیرێکـی زۆر گـەورە نییـە، تۆزێک لە کۆتـر گەورەتـرە، ترسـنۆکیش نییـە خـۆی زۆر دەردەخـات و ئاسـان دەگیرێـت. مـن جووتێـک لـەو تەیرانـەم گـرت، ماوەیەکـی درێـژم بڕیبـوو بـۆ ئـەوەی بیانگەمـێ و بیانگـرم، بـەڵام دەنگـی قاقاکانیـان خەڵکـی زۆر سـەغڵەتدەکرد، کـە لـە کەشـتییەکی کۆنـدا لـە ئوسـترالیاوە بـەرەو هیندوسـتان گەڕامـەوە، بـە شـەو هێنـدە قاقایـان لێـدەدا، سەرنشـینانی کەشـتییەکەیان وەڕزکردبـوو، ئیدی یەکێـک ئـاوی ژەهـراوی دانـێ و دەم و دەسـت مەلـە قاقاکانـم مـردن. ئـەو شـەوە تێگەیشـتم ژیانـی باڵندەیـەک چەنـد نرخـی هەیـە، چەند گرنـگ و مانادار و گەورەیـە. تێگەیشـتم تـۆ بۆچـی منـت بـۆ ئـەم سـەفەرە نـاردوە... ئەو شـەوە کـە مردنـی ئـەو دوو باڵندەیـەم بینـی لـەوە تێگەیشـتم تـۆ دەتەوێـت نرخـی ژیـان بزانـم... لـە پاراسـتنی ژیانـی تەیرەکانمـدا ماندووبیـم... ئـەوکات زانیـم کـە چ هەڵەیەکـی گـەورەم کـردوە کاتێـک چەقـۆم لـە مەنسـور ئەسـرین داوە، لەوانەیـە گـەر مـن ئـەو چەقۆیـەم لـە مەنسـور نەدایـە کەسـمان پێویسـتیمان بـەم سـەفەرە درێـژە نەبووایـە... لەوانەیـە خانـم... لەوانەیـە تـۆ ئێمـەت ناردبێـت بـۆ ئـەوەی فێـری ڕێـزی ژیانبیـن... چوزانـم سەوسـەن خـان، لەوانەیـە بەوجـۆرە بێـت. مـن کـە ئـەو چەقۆیـەم وەهـا شـێتانە لـە مەنسـوردا، تـۆ

تێگەیشتی ئێمە چەند بێحورمەت سەیری ژیانی یەکتر دەکەین، ها ئەوە سزایەکی گەورە بوو کە بڕۆین و هەشت ساڵ شەو و ڕۆژ باڵندەکانمان لە مردن بپارێزین. ئێستا من کە ڕێزی ژیانی باڵندەیەکی بچوک دەگرم، ئیدی چۆن ڕێزی ژیانی مرۆڤ نەگرم... سەفەری ئەو هەشت ساڵەم خانم بۆخۆی بیرکردنەوەیەکی دووروودرێژ بوو لە باڵندەکان، خەمێکی ڕۆژانە بوو بۆ پاراستنی ئەوان... دەبوو ڕێزی ژیانیان بگرم. لە هەر شوێنێک بوومبێتم خەمی ژیانیانم خواردوە، دیارە لەو هەشت ساڵەدا زۆر لە تەیرەکانم مردن، بەڵام هەمیشە وامدەکرد نێر و مێیەکم هەبێت، جووتێک هێلکەم بۆ بکەن و بەچکەم بۆ دروستبکەن. ئا بەوجۆرە بوو، ئا بەوجۆرە زۆر توخمم دەپاراست».

سەوسەن چایەکی بۆ خۆی تێکرد و بەهێمنی خواردییەوە و بەردەوامیش سەیری کامەرانی سەلمای دەکرد، دوای ئێستێکی کورت گوتی «کامەران، ئێستا دەتوانێت کەس لە پێناوی مندا بکوژیت؟»

کامەران گوتی «نا خانم، مرۆڤ کە بە جیهاندا گەڕا، کە بەڕاستی بە جیهاندا گەڕا، مەبەستم ئەوەیە کە لە ڕۆحلەبەرەکانی تر نزیک بووەوە، ناتوانێت کەس بکوژێت. کە وات لێهات مردنی باڵندەیەک ئازارت بدات، ئیتر حورمەتی ژیانی تریش دەگریت. تۆ لەیەکەمجارەوە دەتزانی من تۆم خۆشدەوێت، لەو باوەڕەدا نیم تۆ منت خستبێتە بەر سەفەرێکی وادرێژ تا ئەو خۆشەویستییە تاقیبکەیتەوە. تۆ هەر لە یەکەم جارەوە دەتزانی من تۆم خۆشدەوێت... هەموو کەسیش ئەوەی دەزانی. تۆ بۆیە منت نارد، تا بژیم و نەکوژرێم و ژیان ببینم... من کابرایەکی شارەزا نیم... شەوێکیان دانیشتم و زۆر سەیری تەیرەکانم کرد، زۆر زۆر سەیرمکردن... دوای دەیان سەعات سەیرکردنی ئەو باڵندانە تێگەیشتم کە تۆ دەتەوێت من ژیان ببینم نەوەک دونیا... دەزانی خانم چ هەستێکی سەیرە کە باڵندەیەک دەگریت، چ هەستێکە کە پەنجە دەخەیتە سەر دڵی و لێدەدات، کە تەماشای چاوە

ترساوەکانی دەکەیت، کە دەبینیت لە ترسا پەڕەکانی دەوەرێت... ئا لەو کاتانەدا بە ڕوونی تێدەگەیشتم بۆ بەم ڕێگا گەورانەی دونیادا وێڵم، دەمزانی تۆ دەتەوێت ڕۆحلەبەرەکان ڕوو بە ڕوو ببینم. هەر ئەوەی کە دەبوولیە شەو و ڕۆژ لەگەڵ باڵندەکان بم، ئەوەی دەبووایە بەو هەموو دارستانانەدا بڕۆم، ئەو هەموو زیندەوەرانە ببینم... ئەوە شتێکی تازە بوو بۆ من... لە ڕاستیدا من ژیان سەرسامدەکات نەوەک دونیا... گەر بڵێیت دونیات بینیوە دەڵێم نا، لەبەرئەوەی لەسەفەرەکەمدا زۆربەی کات خەریکی سەیرکردنی زیندەوەران و باڵندەکان بووم... ئێستا ناتوانم باڵندەیەکیش بکوژم... بەڕاستی ناتوانم، گەر تۆش داوام لێبکەیت ناتوانم...».

سەوسەن هەستا و چووە پێشدەمی کامەرانی سەلما و گوتی «ئەی ئێستا من چۆن دەبینی، کامەرانی سەلما دوای ئەوەی کە هەموو ژنی دونیات بینی، دوای ئەوەی کە بە زەویدا سەفەرتکرد، ئێستاش من هەر وەک جاران دەبینیت... هەر وەک جاران؟»

کامەران خۆی ڕاستکردەوە و سەیرێکی سەوسەنی کرد و گوتی «چوومێتم بۆ هەر وڵاتێک بەوردی سەیری هەموو ژنەکانم کردوە، بەوردی لە جوانییان ڕاماوم، بەڵام سەوسەن خان، من دڵنیاتدەکەمەوە، لەسەر ئەم ئەستێرەیە تۆ لای من لە هەر کەس پڕ ئەفسوون تریت، ڕەنگە جوانترین ژنی دونیا نەبیت... ئا خانم لە ڕاستیدا حەزم لەو قسانە نییە، بڵێم جوانترین باڵندەی دونیا، دەنگ خۆشترین بولبولی دونیا، جوانترین ژنی دونیا، باشترین پیاوی دونیا... ئا خانم... کە مرۆڤ دونیای بینی، مەبەستم لەوەیە کاتێک بە ڕاستی دونیای بینی، واز لەو قسانە دەهێنێت. من بەردەوام وێنەکەی تۆ لە بەرچاوم بوو، ئەوە بەسە کە هیچ ژنێکی دونیا نەیتوانی ئەو وێنەیەم لە بەرچاو بسڕێتەوە... هەتا هیچ باڵندەیەک... هیچ دیمەنێکی جوان، ئەوە لای من لە هەر شتێک گرنگتر بوو، بەسەرزەویدا دەڕۆیشتم و تۆ لەگەڵمدا بوویت. شەو و ڕۆژ تۆ

لەگەڵمدا بوویت... کە سەیری باڵندەیەکی جوانم دەکرد حەزمدەکرد تۆم لەگەڵدا بیت، کە خواردنێکی تایبەتی و خۆشم دەخوارد دەمویست تۆ لەگەڵمدا بیت، هەتا کە ژنێکی جوانم دەبینی دەمویست تۆ لەگەڵمدا بیت تابزانم تۆش بەوجۆرە جوان دەیبینیت».

سەوسەن لە بەردەم کامەرانی سەلمادا وەستا و گووتی «کامەران دەستتم بەرێ... تکایە دەستتم بەرێ»

کامەران بە سەرسامی سەیریکرد و گووتی «فەرموو خانم، فەرموو».

سەوسەن بەهێمنی دەموچاوی لە دەستی کامەران نزیککردەوە، کامەران بۆ ئێستێک وایدەزانی دەستی ماچدەکات، بەڵام بینی لەسەرەخۆ، زۆر لەسەرەخۆ چاوی لێکدەنێت و بۆنی دەستی دەکات، بۆنکردنێکی زۆر قووڵ و دەڵێت «وای خوایە... وای خوایە». بە هێمنی ڕوخساری لە هەموو لەشی نزیککردەوە و بۆنیکرد، بۆنی بە سینەیەوە کرد، بۆنی بە گەردنییەوە کرد، بۆنی بە دەموچاوییەوە کرد، بۆنی بە قژییەوە کرد و زۆر زۆر بە ئەسپایی گووتی «وای خوایە... وای خوایە... ئەوە خۆیەتی... بۆنی دونیا... بۆنی ڕاستەقینەی دونیا...». جار دوای جار وەک بۆنی گوڵێک بکات، چاوی لێکدەنا و بۆنی کامەرانی دەکرد و بە ئەسپایی وەک چرپەیەکی ناسک و ئەفسوناوی دەیگووت «وای خوایە... وای خوایە». ئینجا هەڵدەستا وەک ئەوەی زۆر ماندووبێت بە هێمنی لە ژوورەکە دەچووەدەرێ، کامەران گوێی لە دەنگی پێڵاوەکانی بوو لەسەر کاشی ژوورەکە، گوێی لێبوو بەپلەکاندا چووە خوارێ. سەوسەن ڕۆیشت و وەک ئەوەی گێژییەکی گەورە لە خۆی دەربکات دەموچاوی شت، دەبایە شتێک فێنکیبکاتەوە، بەردەوام لە ژێر لێوی خۆیەوە دەیگووت «وای خوایە... ئەوە بۆنی دونیایە... بۆنی ڕاستەقینەی دونیا لەسەر لەشی پیاوێک... وای خوایە...».

ماوەیەکی ویست تا ئارام بووەوە. بۆ ئێستێک لە چێشتخانەکەدا خۆی بە دروستکردنی چایەکی دیکەوە سەرقاڵکرد، چووەوە ژوورەکەی جارانی

خۆی و لە بەر ئاوێنەکەدا سەیری خۆی کرد، هیچ کات لە ژیانیدا بەوجۆرە ڕەنگی نەپەڕیبوو، هیچ کات. پرۆشەی خوشکی لێیپرسی «سەوسەن چییە، شتێک هەیە؟». بە بێئارامییەوە سەری بادا و گووتی «نا هیچ نییە... هیچ نییە». کە کاتێک دڵنیابوو کەمێک هێمن بۆتەوە گەڕایەوە سەرێ... کامەرانی سەلما سەرنجی ڕەنگ پەڕین و تێکچوونە ناکاوەکەی دا، بەڵام بێئەوەی تێبگات چییەتی سەیریکرد و بۆی پێکەنی.

دوای ئەوە شتەکان ئارام ڕابووردن و ڕیفاری سروشتی خۆیان وەرگرتەوە. ئەو ڕۆژە بۆ هەردووکیان ڕۆژێکی خۆشبوو، قسەکردن لە نێوانیاندا لە قسەکردنی دوو کەس دەچوو هەموو ژیان بەشیان نەکات شتەکانی خۆیان بگێڕنەوە. سەوسەن فیکرەت و کامەرانی سەلما چەندین سەعات لەگەڵ یەکدا مانەوە، لەسەر جەنگ قسەیانکرد، لەسەر خۆشەویستی، لەسەر باڵندەکان، لەسەر شەڕی ناوخۆ، لەسەر چۆنێتی دروستکردنی قەفەزی باش و چەندان شتی دیکەش... بەڵام سەوسەن فیکرەت کە تەواو ئارام بووەوە پێیگووت دوا بڕیاری لە مەسەلەی شووکردندا کاتێک ئاشکرادەبێت کە هەردوو داواکارەکەی تر گەڕانەوە، پەیمانی دایە کە باش ئاگای لە باڵندەکان دەبێت و هەر کاتێک شوێنێکی گونجاویشیان هەبوو، کامەران دەتوانێت دووبارە بیانبینێت. کە کامەرانی سەلما هاتەدەرەوە دڵنیابوو کە سەرنجێکی باشی لای سەوسەن جێهێشتووە... سەوسەنیش هێندەی ئەو ڕۆیشت وەک شێت ڕایکردە خوارەوە و باوەشی بە پرۆشەی خوشکیدا کرد و گووتی «وای چ کوڕێکی جوانە خوایە... وای چ کوڕێکی جوانە... لە هەموو تەیرەکانی دونیا جوانترە». پرۆشە بەسەرسامی و خۆشییەوە سەیریکرد و باوەشی پیاکرد و گووتی «ڕاستدەکەیت سەوسەن، کوڕێکی زۆر جوانە... لە هەموو تەیرەکانی دونیا جوانترە».

پرۆشە لە ژیانیدا سەوسەنی بەوجۆرە کراوە و گەش نەبینیبوو... هیچ کات... هیچ کات.

## ٤١

هەمـوو قەفەزەكانـی یـەك یـەك بەدەسـتی خـۆی بـردە سـەرەوە، بـۆ شـوێنی كتێبخانەكـەی جـاران. پتـر لـە بیسـت باڵنـدەی ورد و دەنگخۆشـی جیاكـردەوە و لـەو قەفـەزە تازانـەدا ماڵـی بـۆ دروسـتكردن. گـەر هەنـدێ ڕۆژ پـەردەی ژوورەكـەی لاببردایـە، بـۆ ئـەوەی ڕوناكـی لـە باڵنـدەكان بـدات و پەنجەرەكانـی بكردایەتـەوە بـۆ ئـەوەی هـەوای نـوێ وەرگـرن، ئێمـە لەسـەر شـەقامەكەی خـوارەوە و لـە ڕێـگای دەلاقـەی پەنجەرەكـەوە هەندێـك لـە باڵندەكانمـان دەبینـی. ئێمـە تـا ماڵـی سەوسـەن لەوێـدا بـوو ئێـواران بەبەردەم ئـەو پەنجەرەیـەدا پیاسـەماندەكرد بـۆ ئـەوەی گوێمـان لـە دەنگـی سیحراوییان بێـت كـە هەمیشـە و هەمیشـە دەیانخوێنـد... شـەوانە هەندێكیـان دەیانخوێنـد و بەیانیـان هەندێكیـان و نیـوەڕوان چەندانێكـی تـر و ئێوارانیـش كۆمەڵێكـی دیكەیـان. هەنـدێ جـار ماوەیەكـی درێـژ تەنیـا باڵندەیـەك دەیخوێنـد و هەمـوو ئەوانـی دی گوێیـان دەگـرت. هەنـدێ جـاری دیكـەش چەنـد باڵندەیـەك پێكـەوە یـەك میلۆدیـان دەخوێنـد و كـەم كەمیـش هەمـووان پێكـەوە كۆراڵێكـی گەردونیـان دەگـووت. سەوسـەن هەسـتیدەكرد باڵنـدەكان بـە ئـاوازە جیاوازەكانیـان دەیبـەن بـۆ جەنگەڵـە جیاوازەكانـی دونیـا، لـە شـوێنەكەی خۆیـدا چـاوی لێكدەنـا و نەغمـەی خوێندنـی باڵنـدەكان لەگـەڵ خۆیانـدا بـە دونیـادا دەیانگێـڕا، یـەك بـە یـەك باڵندەكانـی دەناسـی و دەیزانـی لـە چ دارسـتان و زۆنـگاو و گـوێ ئاوێكـی سـەر زەمینـەوە هاتوون. دەنگـی باڵندەكان

بەسەر زەمینـدا دەیانبـرد و دەیانهێنـا، دەیانبـردە نـاو تاریکی دارسـتان و سـەر لقـی درەختـە هـەرە بڵنـدەکان، بـە دەنگـی باڵندەکانـدا دەیزانـی ئێسـتا ئـەو جەنگـەڵ و گـویَ ئاوانـە پـڕ خـۆرن یـا بـاران، بـە دەنگـی ئـەوان گەرمـا و سـەرمای لەشـی خۆشـی دەگـۆڕا. لـە ڕۆژی یەکەمـەوە بـە نـۆرە باڵندەکانـی بـەردەدا و دەیگرتنـەوە. سەوسـەن بـۆ یەکەمجـار لـە ژیانیـدا هەسـتیدەکرد لـە جیهانـدا دەژی... بـە ڕاسـتی لـە جیهانـدا دەژی.

سـێ ڕۆژ دوای گەڕانـەوەی کامـەران، باڵنـدە گەورەکانیـان بـرد بـۆ مەخزەنە گەورەکـەی عیـزەت گوڵدانچـی لـەدەرەوەی شـار، ئەو کات جێگایەکی باشـتریان بـۆ پارسـتنی باڵنـدەکان دەسـت نەکـەوت. دوو ڕۆژ چەنـد کرێکارێـک کـە دکتـۆر ڕەفعـەت ڕەمـزی گرتبوونـی شـوێنەکەیان چاککـرد، ژووری تایبەتیـان بەتەختـە تیـا دروسـتکرد و کارەبایـان بـۆ ڕاکێشـا، تـا ماوەیەکـی زۆر درێـژ دواتریـش هـەر دکتـۆر ڕەفعـەت پـارەی پاسـەوانەکانی دابیندەکرد کە دەبایە چاودێـری باڵنـدەکان بکـەن. هەڵـۆکان، شـاهێنە شـاخ نشـینەکان، داڵـە گـەورەکان، کونەپەپـوە جۆراوجـۆر و گـەورەکان، قەلەباچکـە دەنـگ زلـەکان و دەیـان چەشـنە باڵنـدەی نەبینـراوی دی کـە هیچیـان لـە زمانـی ئێمـەدا ناویـان نەبـوو و تەنیـا سەوسـەن نـاوی دەزانیـن، لـەوێ کۆببووبوونـەوە. لـەو ماوەیـەدا سەوسـەن و کامـەران چەنـد جارێـک لـە نـاو نیشـتەجێی باڵندەکانـدا یەکتریـان بینـی و هەندێـک قسـەی گرنگیـان دەربـارەی شـێوەی گونجـاو بـۆ پاراسـتنیان گۆڕییـەوە، بێئـەوەی لـە هیـچ جارێکـدا قسـەکان لە سـنووری بابەتـی باڵندەکان دەربچـن، یاخـود هیـچ کـەس لەوانـەی لـەو دیدارانـەدا ئامادەبـوون هەسـتیان بـە جـۆرە نزیکبوونەوەیەکـی تایبەتـی کردبێـت. کیژەکـە ئاشـکرا لـە چاوەڕوانی داخوازەکانـی دیکـەدا دەیویسـت لـە نێـوان خـۆی و کامەرانـدا سـنوورێک دابنێـت و بیپارێزێـت.

ئـەوەی زۆر سـەرنجی ئێمـەی ڕاکێشـا، ئـەوە بـوو کـە هەسـتماندەکرد باڵنـدەکان هەمیشـە دڵخۆشـیوون. دەنـگ و خوێنـدن و فڕیـن و هاواریـان

نەغمەیەکی تێدابوو پڕبوو لە لەرەی بەختەوەری. باڵندەکان بەختەوەر بوون... زۆر بەختەوەربوون.

دوو مانگ دوای ئەوە ئێوارەیەکی درەنگ بیستمان خالید ئامۆون بە خۆی و کاروانەکەی خۆیەوە گەیشتۆتە قەراغ شار. خالید ئامۆون نۆ قەفەزی گەورەی باڵندەی پێبوو و خۆشی بە تەنیا ئەو پیکابەی لێدەخوڕی کە باڵندەکانی ڕادەکێشا. ئەو بە زەحمەتێکی زۆر لە سنووری تورکیاوە گەڕابووەوە، چەند ڕۆژێک ژاندارمە تورکەکان نەیانهێشتبوو بپەڕێتەوە، دواجار لە سلۆپییەوە بەڕێگای ئەو تەلەفۆنە ساتەلایتە نوێیانەوە کە لەسەر سنوور دانرابوون چەندین جار پەیوەندی بە زاخۆوە کردبوو تا یەکێک لە ئامۆونییە ئاوارەکانی دەستبکەوێت، کە یەکێک لە ئامۆونییەکانی گرتبوو ئیدی ئیشەکەی هاتبووە ئاسانی. دەبوو تا چەند ڕۆژی دیکەش چاوەڕوانبکات تا ئەوان لە ڕێگای پەیوەندییەکانی خۆیانەوە پەڕینەوەی بۆ زامندەکەن. ئەو ڕۆژەی کە خالید ئامۆون لە خاڵی سنووری ئیبراهیم خەلیل هات بەمدیوا، دەیان ئامۆونی لەمبەری سنوورەوە چاوەڕوانیاندەکرد. هەموو ئەو ماوەیە ئامۆونییەکان کوشتنی قەلەندەر ئامۆونیان لێشاردبووەوە، چونکە لەو بڕوایەدابوون غەمێکی وا گەورە کاریگەرییەکی دەروونی خراپی لەسەر خالید دەبێت کە دوا مانگ و دوا هەفتەکانی سەفەرێکی دووردرێژی هەشت ساڵە دەژیا. بەڵام بەهۆی چەند نامەیەکی تایبەتییەوە تێیانگەیاند کە ئامۆونییەکان بەهۆی شەڕی ناوخۆوە ئاوارەبوون و شاری خۆیان چۆڵکردوە و هەتا یەک خێزانی ئامۆونیش چییە لەوێ نەماوە و پێکڕا لە شارو شارۆچکەکانی دەڤەری بادینانەدا کە پارتییەکان کۆنترۆڵیدەکەن ژیانێکی تازە دەژین. هەواڵی کوشتنی قەلەندەر ئامۆون بەدەستی هاوڕێکانی مەنگوڕی بابەگەورە و بە فەرمانی ئەو «وەک ئامۆونییەکان باسیانکرد»، خالید ئامۆونی هەژاند، ئەو دڵخۆشییە کاتییەی لەکاتی پەڕینەوەدا لە سنوور هەستی پێکرد هەرزوو تێپەڕی و ڕەوییەوە. ئەو ڕۆژە ئامۆونییەکان

پێشـوازییەکی گەورەیـان بـۆ ڕێکخسـت، ویسـتیان ئاهەنگی بـۆ بکـەن، بـەڵام هەواڵـی کوشـتنی قەلەنـدەر بەجۆرێـک غەمگینـی کردبـوو، تکایکـرد واز لـە هەمـوو بەزمێک بهێنـن و لێگەڕێـن غەمگینـی خـۆی بـژی. نامەکـەی قەلەنـدەر ئامـوون کە لـە بەیانـی گەمـارۆی بارەگاکـەدا نوسـیبووی، دەیـان جـار خالیـدی گریانـد، قەلەنـدەر لـە نامەکەیـدا داوای لێبوردنـی کردبـوو کـە ناتوانێـت تـا کۆتایـی لای سەوسـەن فیکـرەت نوێنـەری ئەوبێـت، باسـی ئـەوەی بـۆ کردبـوو کە پێـی شـەرمە بارەگاکـە چۆڵبـکات و تامـردن نـاوی وەک ترسـنۆکێک بچێتـە مێـژووی شارەکەوە، بـۆی باسـکردبوو کـە ئەوانـەی گەمـارۆی بنکەکەیـان داوە ئـەو یەکێتیانـەن کـە مەنگـوڕی بابەگـەورە بەرپرسـیانە، بـۆی نوسـیبوو کـە دڵنیایـە لـەم گەمارۆیـە دەرناچێـت. لە نامەکـەدا باسـی هەمـوو ئـەو شـتانەی بـۆ کردبـوو کـە ئـەو چەنـد سـاڵە پەنهـان هەڵیگرتبـوون، باسـی ئـەوەی بـۆ کردبـوو چـۆن لـە کوشـتنی ئاسایشـەکاندا بەشـداریبووە، چـۆن سەوسـەنی لـە نـاو مەیتەکانـدا دەرهێناوەتـەوە، چـۆن چۆتـە نـاو پارتـی دیموکراتـەوە، چـۆن مەنگـوڕ دەسـتی لـە سـووتانی ماڵـی ئاموونییەکانـدا هەبـووە، چـۆن زەرفـە شـیاکەیان تێکرتـوون، چـۆن سووکایەتیان پێکـردوون. نامـەی پیاوێـک بـوو کـە دەزانێـت چەنـد سـەعاتێکی دیکـە دەمرێـت، پـڕ لـە دڵتەنگـی و گومانـی گـەورە دەرهـەق بـە کـۆی دونیـا... بـەڵام نامەکـە ئاگادارکردنەوەیەکـی قووڵـی بـۆ خالیـد تێدابـوو کـە مەنگـوڕی بابەگـەورە و هاوڕێکانـی، لـە داهاتـوودا ناهێڵن بە ئاسانی بـە سەوسـەن فیکـرەت بـگات. تـەواوی مەبەسـتی نامەکـەی بـۆ ئەوەیە خالیـد ئامـوون لـە داهاتـوو ئاگاداریکاتـەوە، بـۆ ئەوەیـە کـە بزانێـت کوردسـتان چیتـر ئـەو کوردسـتانەی جـاران نییـە، بەڵکـو شـەڕ و کینـە پڕیکـردوە لـە خوێـن و بێبڕوایـی. پڕیکـردوە لـە تەقینـەوەی کتوپـڕی توندوتیـژی، لـە ترسـی هەمیشـەیی لـە یەکتـر.

خالیـد بەدرێژایـی ئـەو هەمـوو سـاڵە بـاوەڕی نەکردبـوو کـە دەشـێت قەلەنـدەر، ئـەو پیـاوە سـەر زل و چەتـەوڵ و کەچەڵەیـە، نامـەی لـەو چەشـنە

بنوسێت، بەڵام ڕووبەڕووبوونەوەی مردن هەستەکانی قەلەندەری بەجۆرێک تیژکردبووەوە، توانیبووی ئاسان شتەکان بڵێت و بە ڕوونی ترسەکانی خۆی ئاشکرابکات. ئەو چەند ڕۆژەی خالید لەگەڵ خزمە ئامونییەکانی و دایک و خوشکەکانیدا مایەوە، زۆربەی ئامونییەکان ڕایان وابوو کە خالید ئامون نابێت بگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، بەڵام هەندانێکی دی مەترسییەکی تایبەتیان لە گەڕانەوەیدا نەدەبینی، دواجار خالید هەموو زەوی تەیکردبوو بۆ ئەوەی ئەو باڵندانە بباتەوە بۆ سەوسەن، ئێستا نەدەکرا لێرەدا بوەستێت و قسە لە ترس بکات. هەندێک لەسەرانی خێڵەکە هەوڵێکی زۆریاندا کە لایەنی کەم لە کاتی گەڕانەوەدا بۆ شار کەسێک بکەنە یاوەری خالید، بەڵام خۆی پێیباش بوو تەنیا بڕوات، چونکە بوونی دوو یاخود سێ ئامونی لەگەڵ یەکدا دەشیا دەرەنجامی خراپتری هەبێت.

ئەو ڕۆژەی خالید لە دەڤەری بادینانەوە بەرەو خۆرهەڵات بەڕێکەوت، ڕۆژێکی ناخۆشبوو، دەیتوانی لەسەر شەقامە گشتییەکەوە ئاگری خومپارەکان ببینێت کە لە بەرزاییە نزیکەکانی ئەمبەرەوبەری شەقامەکەدا ناڵەیان لە زەوی هەڵدەستان. لە زۆربەی خاڵەکانی پشکنیندا، پاسەوانەکان سەرسەخت و بێزۆقرە و نائارام دیاربوون، برسێتی و بێخەویان پێوەدیاربوو. زۆربەی ئەو شارۆچکە بچوکانەی دەبایە بە ناویاندا تێبپەڕێت، بێدەنگ و نیمچە خاڵی و کش و مات دەیاننواند، بەشی هەرە زۆری ئەوانەی دەهاتنە سەر ڕێگای خەڵکانی چەکداربوون کە هەندێ جار بە هێمنی سڵاویان لێدەکرد و هەندێ جار دەیانوەستاند بۆ ئەوەی پرسیاری ڕێگای لێبکەن. خالید ئێوارەیەکی زۆر درەنگ گەیشتەوە شار، ئەوکات شەقامەکان چۆڵ بوبوون و قەرەباڵغییەکی زۆر بە ڕێگاکانەوە نەمابوو، سەرەتا ویستی ڕاستەوخۆ باڵندەکان لە جێگایەک ڕابگرێت و خۆی بە تەنیا بچێت بۆ ماڵی سەوسەن تا هاتنەوەی خۆی ڕابگەیێنێت، بەڵام هەستیکرد بە عارەقی ڕێگاوە، بەو ریشەوە کە چەند ڕۆژ بوو لە غەمی قەلەندەردا

نەیتاشی بوو، دیمەنێکی گەلێک ناشایستە و نالایەقی دەبێت کە دوور نییە هەموو ئەو نیگارە تێکبشکێنێت کە چەند وەختە دەیەوێت لای سەوسەن دروستیبکات. هەر گەیشتەوە شار، بروسکەیەکی گەورەی زیندووبوونەوەی ئیرەیی عەشق لێیدا، بیریکەوتەوە ئەم خۆشەویستییە چەند ئازاری داوە و چەند ئازاری دەدا. کە شەقامە پیس و تاریکەکانی شاری بینی، کە زانی زۆربەی کۆڵانەکان ڕوناکیان نییە خۆشحاڵ بوو، لەسەرێکەوە دڵنیابوو گەیشتۆتەوە شارەکەی خۆی و لەسەرێکی دییەوە پێویستی بە تاریکی بوو، زۆر پێویستی بە تاریکی بوو تا لە ناویدا هەست بە دڵنیایی بکات... هەستیدەکرد ڕابوردوویەکی زۆر سەختی لە پشت خۆیەوە جێهێشتووە، بەڵام داهاتوویەکی زۆر نادیاریش چاوەڕوانیدەکات. لە ناو شاریشدا هەستی بە نائارامی و بێئۆقرەیی و گرژییەکی گەورە کرد، لێرەش چەکدارەکان لە زۆربەی شوێنەکاندا وەستابوون. خالید ئاموون هەستیکرد دڵی بەجۆرێکی ترسناک لێدەدا، نەیدەزانی بچێت بۆ کوێ، هەتا یەک ئاموونیش لە شارەکەدا نەبوو بۆ پشویەکی کورت ڕووی تێبکات. کەمێک بیریکردەوە و بڕیاریدا لە ناو ماشێنەکەدا بمێنێتەوە، باڵندەکان لە جێگایەکدا بوەستێنێت و تابەیانی بخەوێت، بەڵام زانی کە دەبێت خۆی بشوات و ڕیشی بتاشێت و خۆی بگۆڕێت، ئەوانەش لە ماشێنەکەدا ناکرێن، لەوە زیاتریش دەبێت لە شوێنێکی بینراودا بێت، لە جێگایەکدا بێت کە خەڵکی باڵندەکان ببینن، بزانن کە باڵندەکان لێرەن و گەڕاونەتەوە. بە خۆی و ماشێن و قەفەزەکانییەوە، چووە بەردەم دوو ئوتێل، بەڵام هەردووکیان داخرابوون. لە مێژبوو شارەکە پێویستی بە ئوتێل نەمابوو، لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕدا، بەهۆی چەپەکی و دوورییەوە بە دەگمەن ڕێبوارێک ڕووی بکردایەتە ئەم جێگا پەرێز و لەبیرکراوەی دونیا. دوا جێگا بەدەستییەوە مابوو، ئوتێلی باوەجان بوو، کە لای خالید ناوبانگێکی خراپی هەبوو، بەڵام ناچار قەفەزی باڵندەکانی لە بەردەمدا وەستان و چووە ژوورێ و داوای ژوورێکی

بەتاڵی کرد. لە ڕاستیدا هەموو ئوتێلەکە بەتاڵ بوو... هەموو ئوتێلەکە. خالید ژوورێکی گرت کە بەسەر شەقامەکەدا دەیڕوانی و دەیتوانی لەوێوە ئاگای لە قەفەزەکان بێت، کە لە پەنجەرەکەوە سەیریکرد شەقامەکە زۆر تاریک و باڵندەکانیش زۆر بێدەنگ بوون، لەبەرەوە بە هێمنی خۆی گۆڕی و بڕیاریدا دوشێکی بچوک بکات تا کەمێک عارەق و ماندوێتی ڕێگا لە لەشیبکاتەوە. لە هەموو شارەکانی دونیادا هەر وایکردبوو، لە هەر جێگایەک بایە گەر دەستی بە ئوتێلی باش و فورسەتی خۆشتندا بگەیشتایە لە دەستی نەدەدا. بەڵام کە چووە ناو گەرماوەکەوە هەستێکی سەیر دایگرت، هەستێکی قووڵ بە ترس و نەبوونی دڵنیایی، بۆ لە هەموو شارە نامۆکانی دونیادا هەستی بە دڵنیایی کردبوو، بەڵام لێرەدا نا... نەیدەزانی. کە لە ئاوێنەکەدا سەیری خۆی کرد، سەیری چاوەکانی خۆی کرد، نەیتوانی تێبگات لەم هەموو ساڵەدا چی لە نیگاکانیدا گۆڕاون، ویستی زەردەخەنە بگرێت، بەڵام نەیتوانی. نا... دەموچاوی لەو دەموچاوانە نەبوو کە زەردەخەنە ئاسان لەسەری جێگای ببێتەوە. لە ژێر دوشەکەدا زۆر بیری لە سەوسەن فیکرەت کردەوە و پێیوابوو بەو زەینە زیرەک و پڕنهێنییەی خۆی لەوانەیە ئێستا هەست بە هاتنەوەی ئەم بکات. وەکو تر جگە لە ڕقێکی قووڵ و سارد بەرابەر بە نەیارەکانی هەستی بە هیچی تر نەدەکرد، هەمان ڕقی سارد کە پێش سەفەر هەیبوو، بەڵام ئێستا قووڵتر و بێڕەحمتر، بە تایبەت بەرامبەر کامەرانی سەلما کە دەبێت لە ژێرەوە بێڕەحمانە هاوکارەکانی گەرمکردبێت تا سووکایەتی وا گەورە بەسەر ئەو و ئامووتییەکاندا بهێنن. ڕقێکی هێند نهێنی و بەهێزبوو خۆی لێیدەترسا... نەیدەزانی چی لەو ڕقە بکات، هەموو سەر زەمین گەڕابوو بۆ ئەوەی ونیبکات و خۆی لێپاکبکاتەوە، بەڵام سوودی نەبوو... هەمیشە قووڵ لە دڵیدا بوو. ئێستا کە دەگەیشتەوە ئەم شارە، کە چیرۆکی ئەو کارەساتانەی دەبیست کە بەسەر خۆی و خێڵەکەیدا هاتووە،

دڵنیابوو ئەوەی ئەم هەموو ساڵە ئەوی بە زەریدا گێڕاوە ڕق بووە نەوەک خۆشەویستی. ئێستاش لە هەر کات زیاتر هەستی بەو کینەیە دەکرد، هەستیدەکرد گەر نەتوانێت بۆ هەتاهەتایە ئەم نەیارانەی تێکبشکێنێت، گەر نەتوانێت سەوسەن بباتەوە ژیانی هیچ مانایەکی نامێنێت.

بەدروستی کەس نازانێت کێ هەواڵی هاتنەوەی خالید ئامورنی لەو شەوە تاریکەدا بڵاوکردەوە. بەڵام لە سەعات دەی شەودا زۆربەمان هەواڵی گەڕانەوەی خالید ئامورنمان پێگەیشتبوو. نزیکی سەعات دەونیو هەندێکمان لە دەوری قەفەزەکان کۆبووینەوە، هەموو سەیرمان لە بێدەنگی باڵندەکان دەهات، تا بە لایت و چرای دەستی سەیری ناو قەفەزەکانمان نەکرد دڵنیانەبووین کە باڵندەی تێدایە، باڵندەکانی خالید بێنەندازە بێدەنگ بوون، چرکەیان لێوە نەدەهات. ئێمە سەری چەرداخی هەندێک قەفەزەکانمان لادا و دڵنیابووین کە هەموو قەفەزەکان پڕن لە باڵندە، بەڵام بەهۆی تاریکییەوە نەماندەتوانی بە ڕونی بیانبینین. سەرمان بۆ قاتی دووەمی ئوتێلەکە بەرزکردەوە و لە پەنجەرەیەکی بچوکدا تارماییەکی باریک و ڕەشمان بینی سەیرماندەکات، هەموو دڵنیابووین کە ئەوە خالید ئامورن خۆیەتی، چونکە جگە لەو کەسی دیکە لە ئوتێلەکەدا نەبوو. تا نزیکی سەعات دوازدە و نیوی شەو ئێمە لەدەوری باڵندەکان بووین، لە شەقامە تاریکەکەدا قسەماندەکرد و بەدەنگی بەرز پێدەکەنین، تا ئەو کاتە خالید ئامورن نەخەوتبوو، بەردەوام سەیری ئێمە و قەفەزەکانی دەکرد، بەڵام ئێمە سەعات دوازدە و نیوی شەو، بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە بە ئومێدی ئەوەی بەیانی زوو هەستین و بگەینە بەر ئوتێلەکە تا لەبەر ڕۆشنایی خۆردا سەیری باڵندەکان بکەین.

شەو درەنگ لەسەر دەنگی هەندێ فیشەک ڕاچڵەکین و خەوتینەوە... ڕاچڵەکین و خەوتینەوە. بەڵام سەعات شەشی بەیانی هەواڵێکی سەیر هەموومانی هەژاند، هەواڵێک سەرەتا کەسمان باوەڕمان پێ نەکرد، شەو

دەستێکی نەناس بە دوو تاپڕ تەقەی لە قەفەزەکان کردبوو و ژمارەیەکی زۆری لە باڵندەکان کوشتبوو... تا سەرەتا کەسمان باوەڕمان نەکرد، تا گەیشتینە بەردەمی ئوتێلەکەی باوەجان و خالید ئاموونمان بینی لە ناو خوێنی باڵندەکانی خۆیدا وەستاوە، وامانزانی ئەو دەنگۆیە درۆیە. پێدەچێت سەعات دوو و نیوی شەو، کەسێکی نەناس یاخود زیاتر لە کەسێک بە خێراییەکی بێوێنە یەک لەسەر یەک چەندین فیشەکی تاپڕیان نابێت بە ناو قەفەزەکانەوە و دواتر تاپڕەکانیان جێهێشتبێت و هەڵهاتبێتن. کە ناو قەفەزەکانمان بینی ترسێکی گەورە دایگرتین، خودایە ئەو هەموو باڵندە قەشەنگ و کوژراوە چی بوو لەوێدا بینیمان، زیاتر لە نیوەی باڵندەکان کوژراو و زامداربوون. باڵندەی سەیرتر و قەشەنگتر لە باڵندەکانی کامەرانی سەلما... هەندێ بولبولی بچوک کە لە ملیۆنێک ڕەنگ دروستبووبوون، هەندێک کۆتر کە ملی درێژیان لە ملی قاز دەچوو، هەڵۆ کە گەردنیان وەک ماسی پڕبوو لە پولەکەی سوور، کونەپەپو کە وەک ژنی حیجابدار وەهابوون، هەموو بە کوژراوی لە قەفەزەکاندا کەوتبوون. خالید ئاموون ماندوو و نائومێد و تێکشکاو لە تەنیشت قەفەزەکانەوە وەستابوو، قەمسەڵەیەکی ڕەش و کراسێکی ڕەش و پانتۆڵێکی ڕەشی لەبەردا بوو. نیگاکانی وەک خۆی نەگۆڕ و سەیرکردنەکانی سارد و تیژ بوون، زیاتر لە غەم، تووڕەیی و کینەمان تێدا بینییەوە. هێمنییەکی کوشندە دایگرتبوو، دیاربوو لەو چەند سەعاتەی ڕابوردوودا هەوڵیداوە هەستەکانی خۆی کۆنترۆڵبکات، ئەو پاسەوانەی شەو لە ئوتێلەکەدا مابووەوە باسی ئەوەی دەکرد کە لە دەنگی هاواری ئەو نەوەک لە دەنگی گوللەکان ڕاچڵەکیوە و هاتۆتەدەرێ. دەیگووت یەکەم کەس خالید ئاموونی بە جلی خەوەوە لە بەر دەرگای ئوتێلەکەدا بە چاوی پڕ فرمێسکەوە بینیوە، دەیگووت شارەکە و شەقامەکە هەمووی چۆڵ و هۆڵ بووە، دەیگووت بۆنی ساچمە و باروت و خوێنی کردوە. بە وردی باسی ئەوەی بۆ کردین کە چۆن چووە چرای

هێناوە، چۆن یەک بە یەک سەیری قەفەزەکانیان کردوە، چۆن لە ترسی ئەوەی باڵندە ترساوەکانی تر نەفڕن نەیانوێراوە قەفەزەکان بکەنەوە، چۆن هەندێک لە باڵندە زامدارەکان مردون، چۆن تەلەفونیانکردوە پزیشکێکی باڵندە بدۆزنەوە و هیچ کەسیان دەست نەکەوتووە چونکە شارەکە زۆر کەم بەیتاڵی تێدایە. چۆن خالید ئاموون کەوتووە و تێکشکاوە، چۆن سەری ناوە بە قەفەزەکانەوە و گریاوە.

ئوتێلی باوەجان دەکەوتە ناوەڕاستی شارەوە، لە جێگایەکدا نزیک لە بازاڕی سەوزە و گوزەری ماسیفرۆش و کوچەی قەیماغ فرۆشەکان، لە سەر یەکێ لە چوارڕێ سەرەکییەکانی شار. ئەوێ بەیانیان زووتر لە هەر جێگایەکی دی جوڵەی تێدەکەوت، ماستفرۆش و جگەرچییەکان لە بەیانییەکی زووەوە دەهاتن و دوکانەکانیان دەکردەوە. ئەو بەیانییە زۆر لە فرۆشیارەکان سەرسامانە هاتن و وەک ئێمە بەدیار ئەو باڵندە قەشەنگ و کوژراوانەوە وەستان، هەندێک لە باڵندە بریندارەکان هێشتا لە گیانەڵادا بوون، هەموو قەفەزەکان خوێنیان لێدەهاتە خوار، سەری هەندێک لە باڵندە کوژراوەکان لە دەلاقەی نێوان شیشەکانەوە شۆڕبووبووەوە، هەندێک لە باڵدارە زامدارەکان وەک کەڵەشێری سەربڕاو لەقەفرتێیان دەکرد، خامۆش و بێسرەوت دەبوون و لە ناکاو وەک مردن ڕاویان بنێت لە جێگای خۆیان بەرزدەبوونەوە و بەرەو سەرەوە دەفڕین و دەکەوتنەوەخوارێ، باڵندە ساغەکانیش بەجۆرێک خوێناوی بووبوون مرۆڤ بە چاو نەیدەتوانی بزانێت زامدارن یاخود نا؛ هەندێکیان مات و بێدەنگ لەسەر لاشەی هاوڕێکانیان وەستابوون و هەندێکی دیکەیان وەک مرۆڤی بریندار هاواریاندەکرد، قریشکەی هەندێک لە باڵندەکان وەها غەمگین و دڵبڕ بوو هەموومانی غەمبارکرد. لە سەعات هەشت و نیوی بەیانیدا سەوسەن و فیکرەت گوڵدانچی باوکی و دکتۆر ڕەفعەت ڕەمزی گەیشتنە بەر ئوتێلەکە، کە ئەوان هاتن هێشتا دیمەنی گەورەی تاوانەکە وەک خۆی وابوو. هێشتا خوێنی باڵندەکان

لەسەر شەقامەکە و لەدەوری قەفەزەکان تەڕبوو. سەوسەن بە ڕەنگێکی سپی و ترساوەوە سەیری قەفەزەکانی کرد و بۆ ئەوەی هاوارنەکات و نەگری دەستی گرت بە دەمییەوە. دەچووە بەر هەر قەفەزێک کورتە هاوارێکی خنکاوی لێدەهات. ئەو لە هەمووماں زیاتر باڵندەکانی دەناسی، لە هەمووماں زیاتر زانیاری لەسەر سروشت و گرنگی و تایبەتمەندی ئەو باڵندە کوژراوانە هەبوو.

بە بینینی سەوسەن فیکرەت، بینیمان خالید چاوی لێکنا، ئێستێکیکرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و بەرەو پیری چوو. نیگا و وەستان و سەیرکردنی لە نیگا و وەستان و سەیرکردنی عاشقێک نەدەچوو، بەڵکو لە شەڕکەرێکی تێکشکاو دەچوو، لە پیاوێک لە جەنگێکی گەورە هاتبێتەوە و پەشیمان بێت لەوەی زیندوە.

سەوسەن بە دەنگە ترساو و نیگا پەشۆکاوەکەیەوە سڵاوی لێکرد، دیمەنەکە وەها سەیر و غەمگین بوو، کەسمان نیشانەیەکی خۆشی ڕاستەقینەمان لە سەر ڕوخساری کەسیان نەبینی. فیکرەت گوڵدانچی باوەشێکی کورتی پیاکرد و گووتی «پێم ناخۆشە کوڕم، بەمجۆرە دەتبینم، پێم ناخۆشە». خالید بە دەنگێکی کز گووتی «منیش حەزمدەکرد هەموو باڵندەکان بە سەلامەتی ببینن... حەزمدەکرد، من بە ساغی بە هەموو دونیادا هێنامن... بەڵام ئەمشەو... ئەمشەو». فیکرەت گوڵدانچی گووتی «ئا... ئا عەزیزم، هەموو شتێک دەبینم... هەموو شتێک دەبینم... پێویست ناکات هیچ بڵێیت. بەڵام دەبێت کێ بێت، دەبێت کێ بێت؟».

خالید بە هێمنی سەری بادا و هیچی نەگووت. سەوسەن بە هێمنی و بەدەنگە لاوازەکەی خۆی گووتی «بەڵام ڕەنگە بتوانین هەندێک لە باڵندە بریندارەکان ڕزگاربکەین، ڕەنگە بتوانین. بابە... ئەگەر دکتۆرێکی باڵندە بدۆزینەوە». دکتۆر ڕەفعەت ڕەمزی لە تەلەفونی ئوتێلەکەی باوەجانەوە چەند تەلەفونێکی کرد و گووتی «دکتۆر دڵشاد شوکر هەیە، ئەوە تاکە

دكتــۆری تایبەتــی حەیواناتــە لــە شــارەكەدا... تۆزێكــی دی دەگات...».
فیكــرەت گوڵدانچــی ســەری بــادا و گووتــی « هــا... لــە ڕاســتیدا ســەیرم پێدێــت كــە دكتــۆری حەیوانــات لــەم شــارەدا كەمــن... زۆر ســەیرم پێدێــت، وادەزانــم لــە هــەر شارێكی تــری دونیــا ئێمــە زیاتــر پێویســتیمان بــە دكتــۆری حەیواناتــە». هەمــوو بــە قســەكەی گوڵدانچــی پێكەنیــن. پێشتر گوڵدانچیمــان بەوجــۆرە لــە نــاو ســەوزەفرۆش و ماســیفرۆش و جگەرچییەكانــی بەیانیــدا نەبینیبــوو، ئێســتا هێــدی هێــدی تــەواو پیــری پێــوە دیاربــوو. بەسەرســامی ســەیری چــواردەوری خــۆی كــرد و گووتــی «باشــترین شــت ئەوەیــە هەمــوو باڵنــدەكان بگوازینــەوە بــۆ مەخزەنەكــەی عیزەتــی بــرام... لایەنــی كــەم لــەوێ ســەلامەتن... پاســەوانیان هەیــە، وانییــە... لــەوێ دەتوانیــن باڵندە مــردووەكان دەربهێنیــن و زامــدارەكان تیماربكەیــن و غەمــی ئەوانــی تریــش بخۆیــن... هــا نازانــم كــەس هەواڵــی بــە پۆلیــس داوە... دەبێــت شــتی وابكەیــن... دەبێــت شــتی وابكەیــن؟». ئێمــە لــە مــلاولای شــەقامەكەوە گوێمــان دەگــرت، یەكێــك گووتــی « كاتــی خۆتــان بــۆ بــە پۆلیســەوە دەكــوژن. زەلامیــش بكوژرێــت پۆلیس غەمــی ناخــوات... هــا ئێســتا هیــچ ناكــەن، غەمــی كۆمەڵێــك تەیرونیور دەخــۆن». گوڵدانچــی گووتــی «نازانــم... نازانــم... ئــەم پیــاوە هەشــت ســاڵ بەدونیــادا گــەڕاوە ئــەو باڵندانــەی كۆكردۆتــەوە، ئێســتا نامەردێــك دێــت و لــە یەكــەم شــەودا كۆمەڵێــك تاپڕیــان پیادەتەقێنێــت... ئــەوەش كــەم نییــە... هــا كــەم نییــە».

تاكــە شــتێك كــە كردمــان ئەوەبــوو بچیــن و یەكێــك لــە وێنەگرانــی شــارەزا خەبەربكەینــەوە و بــە دەمەچــاوی خەواڵــووەوە كێشــیبكەین و داوای لێبكەین لە هەمــوو لایەكــەوە وێنــەی قەفــەزە خوێناوییەكانمــان بــۆ بگرێــت. بــرای وێنەچــی هــەر هێنــدەی خوێنــی ئــەو هەمــوو باڵندەیــەی بینی، كــە چاوی بەو قەسابخانە گەورەیــە كــەوت كــە بــۆ كۆمەڵێــك تەیــری قەشــەنگ ســازكراوە، بەئاگاهاتەوە و بــە حەســرەتێكی زۆرەوە فۆتۆكانــی بــە جوانتریــن شــێوە بــۆ گرتیــن. زۆر كــەس

لە ئێمە کە نەماندەویست یادگاری ئەو ڕۆژانە لە یادمان دەربچێت، ئەو وێنانەمان هەموو کڕی... هەندێک لەو وێنە خوێناویانە تا ئەمڕۆش لە ئەلبومی تایبەتی هەندێک کەسدا ماونەتەوە، لە دۆلابی یادگارە تاڵەکانی سەوسەندا هەڵگیراون، لەلای خالید ئاموونیش گەورەکراون و لە دۆسییەی تایبەتیدا پارێزراون.

بەڵام ئەو باڵندە زامدار و خوێناوی و کوژراوانەی خالیدیش بە هەمان شێوەی باڵندە ئازاد و خۆشحاڵ و سەرمەستەکانی کامەران، ئارەزووی ناسینی دونیا و بینینی سەر زەمینیان لە ئێمەدا جوڵاند. خوێن و برین و هاوارەکانیان لە سەرسامی ئێمەی کەم نەکردەوە، ئەوەی باڵندەکان نیشانەی هەبوونی سەرزەمینێکن بە ئێمە نامۆیە، نیشانەی دونیایەکی دوورن کە بانگماندەکات... هەر وەکو خۆی وەهابوو.

حاڵی خالید ئاموون گەلێک دژوار دەردەکەوت، بەڵام نیگاکانی لە پاڵ ماندوێتیدا سێبەرێکی نهێنی و ئاڵۆز و نەخوێنراوەی لەسەربوو. کەسمان لەوانەی لەو بەیانییەدا لە نزیک قەفەزەکانەوە وەستابووین نەمانتوانی تێبگەین، تابلێی تاریک و تەلیسماوی بوو، وەک ئەوەی جیهان، وەک ئەوەی ئەو سەفەرە درێژە ڕۆحی تاریکتر کردبێت. دواتر کەسانێکی تاک و تەرا دەرکەوتن کە لەوەرپێش خالیدیان لە بازاڕدا ناسیبوو، بە ئارامی تەوقەیان لەگەڵدا کرد و بە دەنگێکی لەسەرەخۆ بەخێرهاتنەوەیان کرد، بێئەوەی گەرمییەکی ئەوتۆ یان خۆشانێکی تایبەت پیشانبدەن. هەموو هەستمانکرد خالید ئاموون لە ناو ئێمەدا هەست بە تەنهاییەکی گەورە دەکات، گەڕانەوەکەی لە هیچ شتێکدا بە گەڕانەوەی کامەرانی سەلما نەدەچوو کە کۆمەڵێک ئاهەنگی زۆری خستەوە و بەجۆرێک لە جۆرەکان زۆربەمانی خۆشحاڵکرد. کاتێک ویستیان قەفەزی باڵدارە بیمارەکان لەو جەنجاڵییەی ناو بازاڕ دووربخەنەوە، هەستمانکرد دۆخی خالید لەوە دژوارترە بتوانێت ماشێن لێبخوڕێت، لەبەرئەوە کوڕێکی گەنج لەبری ئەو

چووە پشت سوکانەکە و ئەوانی دی لە تاکسییەکی کۆندا بۆ جێگای کۆبوونەوەی باڵندەکان پێشیکەوتن. نزیکی سەعات دەی بەیانی دکتۆر دڵشاد شوکر هات، تا ئەو گەیشت ژمارەیەک لە باڵندەکانی دیکەش مردن، بەڵام هاتنی دکتۆر دڵی هەموانی خۆشکرد، دکتۆر پیاوێکی ڕووخۆش و قسە شیرین بوو کە خۆشحاڵ بوو دواجار لەم کاتی شەڕی ناوخۆیەدا کە ڕۆژانە چەندین کەس دەکوژرێت، کەسانێک هەن دەیانەوێت ژیانی هەندێک باڵندە ڕزگاربکەن. دکتۆر گووتی «لەوەتەی شەڕی ناوخۆ هەڵگیرساوە ئیتر دکتۆری وەک من کە سەروکارمان لەگەڵ ژیانی حەیواناتدایە کارێکی ئەوتۆمان نەماوە... ئیشەکەی من بە ڕێزی ژیانەوە بەستراوە، کە ئادەمیزاد حورمەتی بۆ ژیانی خۆی نەبێت، حورمەتی بۆ حەیوانات هەر نابێت». دکتۆر هێدی هێدی دەستیکرد بە دەرهێنانی باڵندە مردووەکان لە قەفەزەکانیان و گووتی «بە ڕاستی حەیف، هەموو باڵندەی نەبینراو و بێوێنەن... بەڕاستی حەیف». گوڵدانچی لە سەر کورسییەکی تەختە لە ناوەڕاستی عەمباری باڵندەکاندا دانیشتبوو، دەستی خستبووە ژێر ڕیشییەوە و گووتی «موخابن جوانترین باڵندەکانیش پێوەبوون». دکتۆر باڵندەیەکی دەرهێنا پەڕێکی ڕەش و بنسکێکی سپی هەبوو، کڵاوپەڕێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، لە کڵاوی جەنگاوەرە ڕۆمانییە دێرینەکان دەچوو، سەوسەن بە دەنگێکی غەمگین و ترساوەوە گووتی «چ حەیفێکی گەورەیە، خوایە چ حەیفێکی گەورەیە، ئەوە چ باڵندەیەکی دەگمەنە... چ باڵندەیەکی دەگمەنە «کراکس بلومنباخی»، لەو باڵندانەیە کە بە لە ناوچوو حسێبە، لە هەموو دونیادا چەند دانەیەکی کەمی هەیە، جاران لە هەندێک هەرێمی بەرازیلدا بڵاوبوون ئێستا زۆر دەگمەنن». دکتۆر بەسەرسامی سەیری سەوسەنی کرد و گووتی «ڕاستییەکەی من زانیاری وەهام نییە، هێندە دەتوانم بڵێم کە من باڵندەی وەهام نەبینیوە... ئاە چ حەیفە ئەوە هەروا بمرێت... خانم من هاوڕێیەکم هەیە زۆر لە مۆمیادا

شارەزایە. ئاە بەڕاستی شارەزایە، لەوانە نییە کە باڵندەکان کەوڵدەکەن و ناو سکیان پڕدەکەن لە پوش و تەولو، ئەو بەڕاستی دەزانێت جوان مۆمیابکات، ها دەڵێیت چی ئەم باڵندانە مۆمیا بکەین... ها... هەموو ئەم باڵندە مردوانە... دەڵێیت چی؟». سەوسەن بە ئەسپایی گووتی «ئا دکتۆر... ئا دکتۆر... پێیبڵێ با باڵندەکانمان بۆ مۆمیابکات.. پێیبڵێ». یەکە یەکە باڵندە مردووەکانیان دەرهێنا، دەیان باڵندەی ناوازە بوون، چەندین جۆری نەبینراوی کۆتر و توتی و قەتێ و بولبول. دکتۆر لە نیوەڕۆوە تا نیوەشەو لەگەڵ باڵندە زامدارەکاندا خەریک بوو... بە هێمنی چەندەها ساچمەی لە برینەکانیان دەرهێنا، هەندێکیان تا مردن بە شەلی و هەندێکیان تا مردن بە باڵشکاوی و هەندێکیان بە کوێری دەمانەوە. سەوسەن و فیکرەت گوڵدانچی و خالید تا نیوەشەو لەگەڵ دکتۆردا بوون. کرێکارەکان لە نیوەڕۆوە تا ئێوارێ خەریکی چاککردنی جێگای تازەبوون بۆ باڵندە ساغەکان. خالید بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەناوەوە تاریک و لە نیگادا ئاڵۆز دەینواند، زۆر کەم قسەیدەکرد، شتێکی ڕەش باڵی بەسەر ڕۆحیدا گرتبوو. سەوسەن بەدرێژایی ئەو ماوەیە لێی نەپرسی «ئایا گومانت بۆ کێ دەچێت؟»، چونکە دەیزانی ئەو پرسیارە چەند ترسناکە و دەشێت چ دەرگایەکی تاریک بکاتەوە. بەڵام دەمە و ئێوارە دکتۆر دڵشاد شوکر لە یەکێک لە پشووەکانیدا، کاتێک خەریکی کێشانی جگەرەیەکی نوێ و خواردنەوەی چایەکی تازە بوو، بێئەوەی ئاگاداری نەوەبێت سەری چ سندوقێک دەکاتەوە پرسی «بەڵام کاک خالید، تۆ گومانت بۆ کێ دەچێت، گومانت بۆ کێ دەچێت؟... لەو باوەڕەدام چەند کەسێکی زۆر کەم دوێنێ شەو زانیبێتیان کە بەڕێزتان گەڕاونەتەوە... چەند کەسێکی زۆر کەم». خالید بە ماندوێتییەوە سەیری دکتۆری کرد و گووتی «دکتۆر ئەوانەی قەڵەندەر ئاموونیان کوشتوە، ئەوانەی ساڵی نەوەدودوو ماڵی ئاموونییەکانیان سووتان، ئەوانەی شیاکەیان گرتە

ماڵەکانمان... هەر ئەوانە دوێنێ شەو باڵندەکانی منیان کوشت». شتێک لە ڕقی قووڵ، لە توڕەیی، لە نائومێدی ڕەش لە دەنگیدا بوو سەوسەنی ڕاچڵەکاند... شتێک پێچەوانەی ئەو ڕوونی و ڕووناکییەی کە لە دەنگی کامەرانی سەلمادا هەستی پێکرد، شتێکی تاریک، زۆر تاریک کە پێشتر لە دەنگی هیچ مرۆڤێکدا نەیبینیبوو. فیکرەت گوڵدانچی کەمێک خۆی ڕاستکردەوە و گووتی «ئاە کوڕم، من لە هەست و نەستت تێدەگەم... دەزانم چەند ناخۆشە... دەزانم چ نامەردییەکە، بەڵام پەلە مەکە... کوڕم پەلە مەکە، لە جۆرە حاڵەتی وادا مرۆڤ نازانێت سەروکاری لەگەڵ کێدایە... کێ دەڵێت ئەوانن... کێ دەڵێت؟ کوڕی من ئێستا بەڵگەمان بۆ قسەیەکی وەها نییە». خالید ئامۆون سەیری سەوسەنی کرد و گووتی «هەستێک لە ناومدا وام پێدەڵێت... من بەڵگەم نییە، هیچ بەڵگەیەکم نییە و ناشتوانم بەڵگەم هەبێت، بەڵام ئەو کەسەی ئەوەی کردوە دەیەوێت لەسەر مەیتی باڵندەکان سەربکەوێت... بە کوشتنی باڵندەکان من بکاتە دەرەوە و دڵی خانمم لێبڕەنجێت...». فیکرەت گوڵدانچی کەمێک ڕیشی خوراند و لەسەرەخۆ گووتی «خالید ئامۆون، تۆ باڵندەکانی خۆت هێنایەوە، باڵندەکانی خۆت هێنایەوە... من بزانم و عەقڵم بە مەسەلەکە بشکێت حیکمەتی گەورەی سەفەرەکە، هەمووی لە ناو باڵندەکاندا نییە... حیکمەتی گەورەی سەفەرە دووروودرێژەکە دەبێت شتێکی تر بێت... باوەڕ ناکەم کوشتنی باڵندەکان هیچ لە شوێنی تۆ بگۆڕێت». دکتۆر دڵشاد بە گومانەوە سەیریکرد و گووتی «لەوانەیە بە پێچەوانەوە لە شوێنی نەیارانی تۆ بگۆڕێت... لەوانەیە لە شوێنی ئەوان کەمبکاتەوە». خالید قووڵ سەیری چاوی دکتۆری کرد و هیچی نەگووت. سەوسەن بە دەنگێکی گریاو گووتی «نا... تکایە، تکایە ناتوانین هیچ کەس تاوانبارکەین... هیچ کەس». خالید بە شتێک لە ڕەنجاوییەوە گووتی «ئەی ژیانی باڵندەکانی من... ئەی ماندووبوونی هەشت ساڵەم لە ئاوارەییدا... ئایا گەر کەسێک

بێت و هەموو ئەوە بدات بە بادا، دەبێت هەروا... هەروا سووک و ئاسان بۆی دەرچێت؟». سەوسەن بە هەمان دەنگی گریاوەوە گووتی «بەڵام... بەڵام... خالید ئێمە هیچ نازانین... نازانین کێ باڵندەکانی کوشتوە». خالید گووتی «من دەزانم کێ باڵندەکانی کوشتوە... مەنگوڕی بابەگەورە، یان یەکێکی تر لە چەقۆکێشەکانی ئەو، بە ئاگاداری کوڕەکەی سەلما... بە دڵنیاییەوە بە ئاگاداری ئەو... من دەزانم». سەوسەن بە دەنگێکی گریاوەوە گووتی «بەڵام وانییە... وانییە... جارێ هیچ شتێک دیار نییە». خالید بە نیگایەکی ماندووەوە سەیری سەوسەنی کرد و گووتی «بەڵام سەوسەن خان... ئەم بێباکییەی تۆ، ئەوەی ناتەوێت ببینیت کوڕەکەی سەلما لە سەرەتاوە چی دەکات، ئەوەی نابینیت چ کارساتێکی بەسەر من و خانەوادەکەمدا هێناوە، ئەوە هەزارجار... هەزارجار برینەکەم قووڵتر دەکاتەوە. ئەوە وادەکات زامدارتریم و برینم لە تەیرەکانم قووڵتر بێت. ئاه سەوسەن خان لێگەڕێ... لێگەڕێ و هەمووی بخەرە بەر ویژدانی خۆت... ببینە ئێمە چ ئازارێکمان کێشاوە... ببینە چەندە برینداربووین... ببینە و بیخەرە بەر ویژدانی خۆت».

سەوسەن دوای ئەو قسانە لە بێدەنگییەکی زۆر قووڵدا نوقم بوو، بەڵام شەو بەر لەوەی ماڵاوایی لە یەکتریکەن، بە خالیدی گووت لە نزیکترین کاتدا، دەبێت یەک ببینن و بە هێمنی لەسەر هەموو شتێک قسەبکەن.

نیوەشەو فیکرەت گوڵدانچی و کچەکەی بە دوو تاپڕەکەوە گەیشتنەوە ماڵ، تا لەبەرچاوی دکتۆر ڕەفعەت ڕەمزی ونبوون هەر یەکەیان تاپڕێکی هەڵگرتبوو، کە چوونە ژوورەوە لە بەردەرکی هۆڵەکەدا فیکرەت تاپڕەکەی خۆی دایە دەست سەوسەن و ئەویش بێئەوەی هیچ بڵێت وەریگرت و لەگەڵ تاپڕەکەی دەستی خۆیدا پێچانی لە چەرچەفێکی کۆنەوە و دەرگای «دۆلابی یادگارە تاڵەکان» ـی کردەوە و لەویادا بۆ مەتامەتایە هەڵیگرتن.

## ٤٢

کوشتنی باڵندەکانی خالید ئاموون لە شاردا دەنگدانەوەیەکی بێوێنەی هەبوو. کامەرانی سەلما لە ماڵی خۆیان لە جێگاکەی خۆیدا نوستبوو کە لە خەویان هەستاند و هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، سەرسامانە سەیری دەورویەری خۆی کرد و بێئەوەی تەواو بە ئاگا هاتبێتەوە، وەک ئەوەی بەدەم خەوەوە بێت گووتی «کام باڵندانە، ئەوانەی ئاورنگ ئاباد یان ئەوانەی شاری خوماسی؟». ئەوەی هەواڵەکەی بۆ هێنابوو کوڕێکی ئاوێنەفرۆش بوو لە بازاڕ، تێگەیشت کە کامەرانی سەلما خەو بەری نەداوە و هێشتا لە خەونەکانیدا هەر بە جیهاندا دەگەڕێت... وشە بەوشە خەبەرەکەی بۆ دووبارەکردەوە و گووتی «دوێنێ شەو خالید ئاموون گەڕاوەتەوە و قەفەزی باڵندەکانی لەبەردەم ئوتێلی باوەجاندا داناوە و نیوە شەو یەکێک بە تاپڕ تەقەی لە تەیرەکان کردوە». کامەرانی سەلما چاوی گلۆفی و بە بێباکییەوە گووتی «جا من کارم بە باڵندەکانی خالید ئاموونەوە چییە؟». کوڕەکە گووتی «نا هیچ کاک کامەران، بەڵام دەنگێک لە بازاڕدایە کە تۆ یان کاک مەنگوڕ ئەوەتان کردبێت، بەڵام من دەزانم کە ئێوە شتی واناکەن». کامەران بە سەرسامییەوە سەیریکرد و گووتی «بەڵام خوایە، من باڵندە بۆ دەکوژم... باڵندە بۆ دەکوژم... من قەت باڵندە ناکوژم». کوڕەکە گووتی « من دەزانم تۆ باڵندە ناکوژیت... من دەزانم».

کە کامەرانی سەلما هاتەدەرەوە بۆ ناو بازاڕ، هەواڵی کوشتنی باڵندەکان بە ئەندازەی هەواڵەکانی شەڕ لە سەر زاری خەڵک بوو. هەواڵەکە تووشی دوودڵییەکی ڕاستەقینەی کرد. بێئەوەی کاتێکی زۆر بکوژێت و لە هیچ قسەوباسێکی سەرزارەکییەوە تێوەبگلێت بە پەلە چوو بۆ چایخانەکە، کە گەیشتە ئەوێ مەنگوڕی بینی جامێکی گەورەی ماستاوی لەبەردەم خۆیدا دانابوو و بەدەنگی بەرز قسەیدەکرد و دەیگووت «سوێند دەخۆم بە قوونی هەموو پیاوە موقەدەس و بەڕێزەکانی ئەم شارە کە ئاگام لە کوشتنی باڵندەکانی خالید ئاموون نییە... ها، شەوێ من لە ماڵی داغڵی بووم، ژنەکەی یەکەم کەسە لە لێنانی پاچەدا، هەموو شتێک باش دەزانێت قۆزی شام، کوبەی حەڵەب، چلوخورشتی ئێرانی و هەزار شتی تریش، بەڵام لە هەر شت زیاتر لای من پاچەکەیەتی... ژنەکەی داغڵی دەزانێت من چەند حەزم لە پاچەیە، دواتەوە من کاتێک پاچەی ژنەکەی داغڵی دەخۆم، هەموو شتێکم لە بیردەچێتەوە... هەموو شتێک، من دوای پاچە خواردن مەزاجێکی وەها سافم هەیە کە ناتوانم بیری خراپ بکەمەوە. من لەوێ بووم لە ماڵی عومەر داغڵی بووم کە یەکێک هات گووتی خالید ئاموون بە خۆی و باڵندەکانەوە هاتۆتەوە. من گووتم بەخێربێتەوە، ها سوێندتان بۆ دەخۆم کە من گووتم بەخێربێتەوە، ئێرە شاری خۆیەتی... شاری ئەوە و شاری هەموو ئاموونییەکانی تریشە. سوێند دەخۆم کە گووتم، چەند شاری منە ئەوەندەش شاری ئەوانە. بەڵام ئەم شەڕە مەلعونە... ئەم شەڕە مەلعونە هەموو شارەکەی لەیەک ترازاندووە، برای لەگەڵ برادا کردووە بە دوژمن. دواتر یەکێک هات و گووتی خالید ئاموون لەبەر بێکەسی و بێجێگەیی چووە لە ئوتێلەکەی باوەجان لایداوە... من گووتم گەر بڕوای بە من بووایە، گەر منی بە دوژمن نەزانییایە، سوێند دەخۆم کە دەمبردە لای خۆم، چیم بۆ کامەرانی سەلما کردووە بۆ ئەویشم دەکرد، بەڵام دەزانم

ئاموونییەکان خێڵێکی کەللە ڕەقن... لەو عەشایەرانەن هێشتا هەر بە کەللەی کۆن بیردەکەنەوە... نا کەس پێم نەڵێت، هەموو عەشایەرەکان بە کەللەی کۆن بیردەکەنەوە، ها سوێند دەخۆم عەشایەرمان هەیە سەرێکی تازەیان خستۆتە جێگای کەللە کۆنە پوتەکانیان و قوونێکی تازەیان لە خۆیان بەستوە... بەڵام ئامونییەکان نا، بەداخەوە».

قسەکانی مەنگوڕ لە چایخانەکەدا دەنگیان دەدایەوە، بەڵام شتێک لە گاڵتەکردن، لە لەرەی پێڕابواردن بەدەنگییەوە دیاربوو، ئەوە جۆرە تۆنێک و مۆسیقایەکی نهێنی بوو کە جار جار لە دەنگیدا دەردەکەوت و تەنیا هەندێکمان هەستمان پێدەکرد. کە کامەران لە تەنیشتییەوە دانیشت و سەیری دەموچاوی ئەوانەی دەوروبەری خۆی کرد، هەستیکرد هەندێک لە نیگاکان هێشتا بە ڕاستی گومانیان لە قسەکانی مەنگوڕ هەیە.

کامەران بە کەمێک نائارامی و سەرسامییەوە گووتی «چ قسەیەکی پڕوپوچە ئەمەی لە بازاڕدا کەوتۆتەوە... ها... دەبێت کێ قسەی وای بڵاوکردبێتەوە. ئێمە بۆ دەبێت باڵندەکان بکوژین... بۆ دەبێت باڵندەکان بکوژین. من قەت باڵندە ناکوژم».

یەکێک لە ئێمە لە مەنگوڕی پرسی «مەنگوڕ، تۆ ڕات چییە، خەیاڵت بۆ کێ دەچێت، دەڵێیت کێ لە پشت ئەم حیکایەتەوەیە؟».

مەنگوڕ تا دوا قووم ماستاوەکەی خواردەوە و گووتی « یوسف کەویاری گەورە لەم حاڵەتانەدا دەیگووت «تاوانبار ئەو کەسەیە کە بزی ناچێت». ها بەڵام من نازانم، بڵێم چی، من کە هەواڵەکەیان پێگووتم، بە خۆمم گووت مەنگوڕ خۆت لەم ئاگرەیان لادە، تێدەگەن... من گووتم مەنگوڕ قوونی خۆت مەخەرە سەر بەردی وا گەرم».

تۆزێک بە جیدییەتەوە چاوی داچەقاند و کۆکی و دەمی سڕی و

گووتی« بڵێم چی... تاوانبارەکە دەشێت هەر کەسێک بێت، هەر کەسێک بێت کە ئێوە خەیاڵتان بۆی ناچێت، دەشێت تاقمی مەنسور ئەسرین بن، کە خۆتان دەزانن دوای شەڕەکەی قەڵەندەر ئامۆون و مستەفا هەزار چ ڕقێکی گەورە لە نێوانیاندا سەوزبووە. خۆتان دەزانن ئەوەی قەڵەندەر کردی کەم نەبوو، کابرا شاعیرێکە ناوی خۆی هەیە، ئەو مستەفا هەزارە زەلامێکە شاعیرەکان سوێند بە قوونی دەخۆن. تۆ کەسێکی وا لەسەر یەک دوو قسە خەڵتانی خوێن بکەیت... ها ئەوە کەم نییە. نازانم، لەوانەشە هەر کەسێکی تر بێت کە دەیەوێت فیتنەکە قووڵبکاتەوە، کەسێک دەزانێت ئامۆونییەکان سەرگەرم و دڵگەرمن و دەیەوێت زیاتر بریندارایانبکات... لە بیرتان نەچێت ئەم شەڕە ئەخلاقی تیا نەماوە. بەڵام خۆ دووریش نییە دەستی یەکێک بێت لەو گاڵتەچییە بێویژدان و شەڕانیانەی ئەم شارە، کە هەموو شتێک دەکەن بۆ ئەوەی دوایی لە دوورەوە پێبکەنن، بە قەبری کەویاری گەورە پێکەنین لەم شارەدا بۆتە شتێکی شەڕانی، شتێکی لە خەنجەر خراپتر، لە ژەهر کوشندەتر، لێتان ناشارمەوە من کە ئەو توخمە مەلعونە لە خەڵکی گاڵتەچی لەم شارەدا دەبینم، حەزدەکەم ئیتر پێنەکەنم، قەت تادەمرم پێنەکەنم... ها یان دوور نییە کەسێک بێت بیەوێت سەر لە کچەکەی گوڵدانچی تێکبدات، بە جۆرێک کچە بە ستەزمانەکە پاک و پیسی بۆ لەیەک جیانەکرێتەوە. گەر ڕاستیتان پێبڵێم هەموو شتەکان کراوەن... دوور نییە خەڵکێک بن کە ڕقیان لەم باڵندانەیە، خەڵکێک هەیە دەزانن بینینی ئەم تەیرانە عەقڵی خەڵکی ئەم شارە دەخاتە سەر هەوایەکی تر... ئێوە مەنگوڕ بە نەفام تێمەگەن، عەقڵم بە شت دەشکێت... ئەم شارە هەزار کەسی تێدایە چۆن لە تاعوون دەترسن ئاوا لە دونیا دەترسن، لەوە زراویان چووە ئێمە شتێک ببینین نەگبەتی ئەم ژیانە پەڕپوتەی خۆمان بیربخاتەوە، خۆتان دەزانن دوای بینینی باڵندەکانی کامەران خەڵکی ئەم شارە بە ژن

و پیاوەوە چەندە حەزیان لە بینینی دونیا كردوە، چۆن هەوای سەفەر جۆتە كەللەیان... ئا كورینا... بڕۆین و جیهان بدۆزینەوە... جیهانی گەورە، میللەتانی تر ببینین كە لووتیان ڕەنگێكی تری هەیە... ئێوە نازانن، خەڵكێك هەیە زۆر لەوە دەترسێت»

ئینجا سەیری هەمووومانی كرد و بەئەسپایی گوتی« بە دووریشی مەزانن كە خالید ئاموون خۆی بێت... ها، ئێوە بۆ ئەو دەرگایە دادەخەن.. بۆ دەڵێن خۆی چۆن باڵندەكان دەكوژێت؟ بەڵام بە قەبری شەیتان من ئەوە بە دوور نازانم. كوڕەكە دەیەوێت سەوسەن فیكرەتی دەست بكەوێت... بە هەر نرخێك بووە... بە هەر نرخێك بووە... ها تێدەگەن، دەشێت حیكایەتەكە وابێت، كوڕەكە دەڕوات و هەموو دونیا دەگەڕێت... هەموو باڵندەكانی خۆشی كۆدەكاتەوە، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ، مانگ دوای مانگ، ساڵ دوای ساڵ خەیاڵێك لە سەریدا گەورە دەبێت... تێدەگەن... بەسەر زەویدا دەڕوات و ئەو خەیاڵە مەلعونە لەسەریایەتی... تێدەگەن، بە دارستان و سەحرا و كوێ ڕووبارەكانی دونیادا دەڕوات و ئەو خەیاڵە مەلعونە وازی لێناهێنێت. ها... هەموو دەزانین كە خالید ئاموون بە ئەندازەی كامەرانی سەلما یان بە ئەندازەی كوڕەكەی ئیبراهیم ئەسرین جوان نییە، بۆیە دەبێت شتێك بكات، گورزێكی گەورە بهاوێت، خۆی بكات بە قوربانی، باڵندەكانی بكات بە شەهید... ها... وەك قەلەندەر ئامونی خزمی كە سوێند دەخۆم بە پشت قوونی هەرچی سیاسی دونیایە، گەر چەكەكەی دابنایە، گەر عینادییەكی گەورەی نەكردایە، لەوانەبوو خوێن لە لووتی نەیەت. بەڵام واز لەوە بهێنن... سەیركەن، تێدەگەن... دوو تاپڕ، دوو تاپڕ... هەڵبەت ئەوەی بە دونیادا گەڕابێت، بەدوای باڵندەكاندا چوو بێتە ناو دارستانە چڕەكان، چووبێتە ناو شوێنە تاریك و عاسییەكان كە شێر و پڵنگیان تێدایە، پێویستی بە دوو تاپڕ دەبێت... ها تێمبگەێنن، بۆ ئەوەی كە تەقەكان دەكات دەبێت تاپڕەكەی

جێبهێڵێت، سوێند دەخۆم کە پێویست ناکات تاپڕەکەی جێبهێڵێت، لەبەرئەوە بە دووری نازانم ئەو تاپڕانە تاپڕی خالید نامون خۆی بن کە کاتی نەبووە بیانشارێتەوە... شەو نیوە شەو لە ئوتێلەکەی باوەجان هاتۆتە دەرێ، هەموو دەزانن کە سەعات سێی شەو ئەو ناوە گەڕ جنۆکەش تیا زەماوەندبکەن کەس ئاگای لێ نییە... هاتۆتە دەرێ تاپڕەکانی تەقاندوە و گەڕاوەتەوە بەردەمی ئوتێلەکە و کردویتی بە هاوار... ها... بۆ ئەوەی دواجار مەنگوڕی بابەگەورە و کامەرانی سەلما تێوەبگلێنێت... ها... بۆ ئەوەی باڵندەکانی بکات بە شەهید، بۆ ئەوەی سۆزی هەموومان بۆ خۆی بباتەوە، بۆ ئەوەی سەوسەن خان بڵێت وای لەم پیاوە بریندارە، وای لەم مرۆڤە کە هەموو گیانی زامە، وەرە گوڵی من، وەرە عەزیزم، من شوو بە تۆ دەکەم... ها... من بە دووری نازانم وا بووبێت... بە دووری نازانم».

یەکێک پرسی «بەڵام مەنگوڕ تو قەبری مردوت، تۆ دوێنێ شەو لە کوێ خەوتیت؟»

مەنگوڕ بە خەندەیەکی ساردەوە گووتی «من دوای پاچەکەی خانمی داغڵی، چوومەوە بۆ ماڵی خۆم و یەک تەختە لێیخەوتم، هیچ شتێک لە خەوی دوای پاچە خۆشتر نییە».

مەنگوڕ بەو تەفسیرانەی لە چایخانەکە پێشکەشیکرد تا ئەندازەیەکی زۆر هەموو گومانێکی گەورەی لە خۆی دوورخستەوە. وەک هەمیشە هەمووومان باوەڕمان پێکرد. کامەرانی سەلماش دڵنیابوو کە ئەو نییە... لە ئێوارەدا گومان بە جۆرێکی وا گەورە بڵاوبووەوە، ژمارەی تەفسیرەکانیش بە شێوەیەکی وا سەیر زیادیانکرد، هەموو گومانمان لە یەکدی بوو. بەڵام دەبێت بڵێم کە بکەری ڕاستەقینەی ئەو تاوانە هەرگیز دەرنەکەوت و ڕۆژێک لە ڕۆژان نەدۆزرایەوە.

٤٣

دوای هەفتەیەک لە گەڕانەوەی ئامووین، مەنسور ئیبراهیم ئەسرینیش گەڕایەوە بۆ شار. بە پێچەوانەی هەر دوو کاروانەکەی دیبیەوە، ئەو لە کاتی نیوەڕۆدا گەیشت، قەفەزەکانی بچوکتر و ڕەنگینتر بوون، باڵندەکانی مەنسور لە بری ئەوەی لە قەفەزی جیاجیادا بن لە دوو لۆری زۆر زۆر گەورەدا لەسەر یەک بارکرابوون، کە لە دوورەوە سەیرماندەکرد باڵەخانەیەکی سەیرمان لە قەفەز دەبینی، باڵندەکان چین چین لەسەر یەک هەڵچنرابوون، باڵندە گەورەکان لە ژێرەوە و باڵندە بچوکەکان لەسەرەوە، ئەوانەی لە ژماردندا وردن باسیان لە زیاد لە سەدوشەست چەشنە باڵندەی جۆراوجۆر دەکرد... کە هەموو لەو پەڕی بەختەوەریدا گۆرانیان دەگووت. دەبێت بڵێم کە باڵندەکانی مەنسور کەمێک لەخۆباییی و لووت بەرز و بەدەمەوا دەیاننواند، کامەرانیان لە کامەرانی باڵندەکانی کامەرانی سەلما نەدەچوو، کە گەلێک سادە و دۆستانە و پڕفزوڵ بوون. هەموو باڵندەکان دەیانخوێند بێئەوەی بەڕاستی سەیری ئێمە بکەن یان سەیری شارەکەمان بکەن، یان وادەریکەون هۆی خۆشحاڵی و بەهانەی بەختەوەرییان گەیشتن بە دەفەری ئێمە بێت. کۆمەڵێک باڵندەبوون لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەوە خۆشحاڵبوون لە دونیادا دەژین و بە جیهاندا سەفەردەکەن. مەنسور ئەسرین قەفەزەکانی بە شێوەی زۆر قەشەنگ و بە گەڵای زۆر ناوازە و بە موورو و دەمامک و پەیکەری بچکۆلە ڕازاندبووەوە،

هەموو پیاوێکی زیرەک تەنیا بەسەیری قەفەزەکان دەیتوانی بزانێت ئەم باڵندانە مەلی چ ئاسمانێک و تەیری چ سەرزەمینێکن، قەفەزی باڵندە ئەفریقییەکان بە دەمامک و پەیکەر و سەمبولی شارستانێتییە ئەفریقییە کۆنەکان و بە کاری قەشەنگی هونەرمەندە خۆڕسکەکانی ئەو سەر زەمینانە ڕازابووەوە، لە سەر هەندێ قەفەزی دی، نیشانە و سەمبولی شارستانییەتی کۆنی مایا و زەخرەفەی جووتیارە بۆلیڤییەکان و ملوانکە و موفەڕک و کەرەستەی هیندییە سوورەکانمان بینی، هەندێ قەفەزیش بە کاری دەستی هەندێک لە هونەرمەندە بودییەکان ڕازابووەوە. بە گشتی قەفەزەکانیش بە ڕەنگی زۆر تایبەتی ڕەنگکرابوون، شێوەی ڕێکخستنی ڕەنگەکان و دیمەنی بارهەڵگرەکان، هەر یەکە و بەجیا لە کارێکی هونەری گەورە دەچوون. کاتێک لۆرییەکان لەدەروازەی خۆرهەڵاتی شارەوە هاتن بەمدیودا، نزیکی سەعات دوازدە گەیشتنە کۆڵانی ماڵی ئیبراهیم ئەسرین و لەبەردەم هەمان ماڵی دێرینی جاراندا وەستان، گەنجێکی باریک و قژ درێژ لە دەستێک جلی نوێدا بە خەندەیەکی ئاڵۆزەوە لە لۆریی یەکەم دابەزی. کە خۆی کرد بە حەوشەکەدا ئیبراهیم ئەسرین لە ڕادیۆییەکی لۆکاڵەوە گوێی لە هات و هاوار و شەڕە جنێوی نێوان حیزبە کوردییەکان دەگرت، کە یەکدیان بە جاش و قاڵۆنچە و دوپشک ناودەنا. خوشکەکەی لەگەڵ منداڵێکی چوار ساڵاندا کە لە کوڕێکی زەڕەنگەر بووبووی خەریکی یاریکردن بوو، خوشکە بچکۆلەکەی لەسەریان جلی بە تەنافەکاندا هەڵدەواسی، ئەو یەکەم کەس بوو مەنسووری بینی و پڕ بە هەموو گەڕەک قریشکانی «مەنسور هاتەوە». هاوارەکەی هێندە بەرز بوو، لە گەڕەکەکانی دیشەوە گوێیان لێبوو. ئیبراهیم ئەسرین باوەڕی بە چاوی خۆی نەکرد، ئەو هەموو ساڵە وا لە بیری چەسپیبوو کە مردن یاخود لەدەستدانی بینایی نایەڵن جارێکی تر کوڕەکەی ببینێتەوە، بۆ ئێستێک وایدەزانی ئەوەی دەیبینێت دووبارەبوونەوەی خەوێکی دێرینە

کە هەشت ساڵ بوو دەیبینی، خەونێک تێیدا سەری بەرزدەکردەوە و مەنسوری بە خەندەیەکی گەشەوە لە بەر دەرگای ماڵەوەدا دەبینی، کە مەنسور نزیکتر بووەوە و ئەویش کەمێک مۆشی خۆی ڕاژەنی و لە غوباری گومان پاکیکردەوە، لە شوێنی خۆی هەستا و وەک دەست بۆ خەیاڵێکی دوور بەرێت، دەستی درێژکرد و لەو پەڕی سەرسامیدا دەستی بەر مەنسور کەوت، گوێی لە دەنگی بوو کە گووتی «وای پیرەبابی خۆشەویست... وای پیرەبابی عەزیز». مەنسور لە منداڵییەکی زووەوە ئیبراهیمی بە پیرەباب بانگدەکرد، کە باوەشیان بە یەکدا کرد، ئیبراهیم ئەسرین ماوەیەکی کورت نەیتوانی هەناسەبدات، لەو ساتەدا جارێکی تر ئیزرائیلی بینییەوە دڵنیابوو ئیزرائیل لە پشت مەنسورەوە بە خەندەیەکی زۆر گەورەوە تەماشایدەکات، بەڵام بێئەوەی بایەخی پێبدات، بێئەوەی بترسێت سینەی پڕکرد لە هەواو و گووتی «تۆیت... تۆیت...». یەکەم جار ئیبراهیم ئەسرین نەگریا، بەڵام کە بینی سیڤان و بەفراو بە چ شەوق و حەسرەتێکەوە باوەش بە مەنسوردا دەکەن چاوی پڕبوو لە فرمێسک. پاش ماوەیەکی کەم هەموو شتەکان لە بەر چاویدا هێمن و هەموو دەنگەکان لە گوێچکەیدا کپ بوون، شادییەکی قووڵ دایگرت... شادییەک لە هەموو شتێکی دونیای دابڕی، دووبارە و چەند بارە باوەشی بە مەنسوردا کردەوە و یەک لەسەر یەک دەیگووت «تۆیت... تۆیت».

لە چەند سەعاتێکدا هەموو شار هەواڵی گەڕانەوەی مەنسوری بیست. ساقی مەحمود و کۆمەڵێ مۆسیقار، مستەفا هەژار و کۆمەڵێک شاعیر لە پێشی پێشەوەی ئەو کەسانەدا بوون کە بەپەلە گەیشتنە لای مەنسور و باڵندەکان... مەنسور بە ئاشکرا ڕوخۆشتر و کراوەتر و پڕ ژیانتر لە جاران دەردەکەوت، بە گەرمییەکی بێوێنەوە باوەشی بە هاوڕێکانیدا کرد، خەندەیەکی ڕاستەقینەی گەورە لە ڕوخساریدا بوو کە مرۆڤ پێش

سەفەرەکە بە دەگمەن دەبیینی. زۆری نەبرد ماڵی ئیبراهیم ئەسرین پڕبوو لەوانەی لە هەموو لایەکەوە دەڕژانە حەوشەکەوە بۆ بەخێرهاتن، بەجۆرێک مەنسور وەک ونبوویەک لە شەقامێکی جەنجاڵدا نە بواری قسەکردن، نەبواری بیرکردنەوە، نە بواری پشووودانی نەبوو. لە هەموو لایەکەوە خزمانی ڕژانە حەوشەکەوە و بێنەوەی خۆی ئاگاداربێت ئامۆزا و هاوەڵەکانی پاسەوانی تایبەتیان بۆ باڵندەکان دانا. سەعات دوای سەعات هونەرمەندان و شاعیران و شێوەکاران زیاتر و زیاتر لە حەوشە و دالان و هەیوان و ژوورەکاندا کەڵەکەدەبوون. مەنسور لە خەیاڵی ڕۆشنبیرانی شاردا بە پێچەوانەی خالید ئاموون و کامەرانی سەلماوە، وەک نمونەی عاشقی گیانفیدا و ڕۆمانسی وێناکرابوو، ساڵ دوای ساڵ وێنەیەکی ئەفسانەیی وەرگرتبوو. ئیتر دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی گەڕانەوە چاوەڕوانکراوەکەی سات دوای سات موروژمی شەیدایانی ئەو عاشقە ڕۆمانسییە بۆ سەر ماڵی ئیبراهیم ئەسرین زیادیدەکرد، بەجۆرێک نە ژوورەکان و نە حەوشەکە نەیدەگرتن. ساقی لە ناچاریدا پێشنیاریکرد کە هۆڵێکی گەورە بگرن و ئاهەنگەکەیان لەو ماڵە چکۆلانەیە دەربهێنن و بیبەنە ساڵۆنێکی ڕاستەقینە، تا هەمووان پتر هەڵپەڕن و شیعر بخوێننەوە و شاییبکەن.

لە سەعاتێکدا هۆڵێکی گەورەی ئاهەنگیان پەیداکرد و هەموو میوانەکان لەگەڵ مەنسور ئیبراهیمدا بە دەیەها ماشێن بەرەو هۆڵەکە بەڕێکەوتن، لۆری باڵندەکانیشیان بە هەموو شاردا تا بەردەم هۆڵەکە بازووت. زۆر لە میوانەکان لە پیکابی سەربەتاڵدا دوای کاروانی ماشێنەکان کەوتن و لە زۆربەی کۆڵان و کوچەکاندا خەڵکی تازە خۆیان گۆڕی و سوار ئوتومبیلەکانیان بوون و چوونە دوای کاروانەکە. لە هۆڵەکەدا هەر زوو هەوەسی ئاهەنگ هەمووانی داگرت، ساقی مەحمود خۆی کرد بە ڕێکخەری بەرنامەکان و ویستی جۆرە ڕێکخستنێکی گونجاو بخاتە ئەو هەموو ناڕێکییەوە کە لە پڕ گەمارۆی مەنسوری دابوو، لە ماوەی چەند

دەقیقەیەکدا تیپە مۆسیقییەکانی ڕێکخست و بەرو دوا گۆرانیبێژەکانی ڕیزکرد، لە نێوان هەموو گۆرانییەک و گۆرانییەکدا شاعیرێکی خستە پرۆگرامەکەوە. ژمارەی شاعیر و گۆرانیبێژەکان بە ئەندازەیەک زۆربوون؛ گەر پرۆگرامەکە چەند ڕۆژێکیشی بخایەندایە بەشی هەموانی نەدەکرد. وەک چاوەڕواندەکرا زۆربەی گۆرانی و شیعرەکان لەو هەفتانەی دوایدا بۆ پێشوازی مەنسور ئامادەکرابوون. بە شیعری «باڵندە موقەدەسەکان» کە یەکێک لە شاعیرە لاوەکان نوسیبووی ئاهەنگەکە کرایەوە، شاعیرەکە بەدەنگی ئەکتەرێکی شانۆ هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵێک دەست جوڵاندنی نابەجێدا شیعرەکەی خوێندەوە، بەڵام لەگەڵ خراپی خوێندنەوەکەیدا چەپڵەیەکی بەجۆشی وەرگرت. مەنسور سەیری لێهات کە ساڵانی دووروودرێژی غەریبی ئەو خەیاڵ و خورافەتانەی نەسڕیوەتەوە کە دوای ڕوداوی ژێرزەمینەکەی خدرۆ دوویار بە ناوی ئەوەوە لکابوون، بەڵام شتەکان وەها خێرا و بێپرس و بێئاگای ئەو دەکران بواری ئەوەی نەبوو لەسەر ئەم بەزمە گەورەیە قسەیەک بکات یاخود هیچ جۆرە ناڕەزاییەک نیشانبدات. لەو ساتەوەی گەیشتبووەوە شار شتەکان وەک لافاو لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد، ئێستا هیچ چارێکی نەبوو ئەوە نەبێت لە جێگای خۆی ڕوخۆش دانیشێت و بە ئەدەبەوە بۆ هەموان پێبکەنێت و خۆی سوپاسگوزار نیشانبدات. گۆرانیبێژەکان یەک لە دوای یەک گۆرانییەکانی خۆیان بەسەر مەنسوردا دەگووت و شاباشیان وەردەگرت، کە وچانێک دروستدەبوو، خەڵکانێک هەڵدەستان و بەخێرهاتنەوەی مەنسوریان دەکرد، دواتر شاعیرەکان شیعرە عاشقانەکانیان دەخوێندەوە، هەندێکیان لە کاتی خوێندنەوەکاندا دەگریان و هەندێکیان هەوڵیاندەدا قسەخۆش و کۆمیدی دەربکەون. باوکی بەردەوام بە چپەوە لە ناو ئاهەنگەکەدا ئەو کەسانەی پیشاندەدا کە لەو چەند ساڵەدا بە پارە کۆمەکی سەفەرەکەی مەنسوریان کردبوو، پورەکانی زوو زوو دەهاتن و باوەشیان پیادەکرد، لە

ناو وشەی شاعیرەکان و لە ناو گۆرانییەکاندا بەردەوام گوێی لە ناوی خۆی دەبووەوە... ساقی دووجار هات بۆ لای و دەیگووت ئاواتەخوازبوو بیتوانیبایە گۆرانی بۆ بڵێت، بەڵام ناتوانێت، چونکە دوای ڕۆیشتنی ئەو دەنگی کەوت و هەرچییەک بکات چیتر ناتوانێت بە هیچ ئاوازێک بچریکێنێت. ساقی چەندە زۆری لە قورگ و هەناسەی خۆی دەکرد نەیدەتوانی گۆرانی بڵێت. لە ناوەڕاستی ئاهەنگەکەدا مەنسور ئەسرینیان هەستان تا هەندێ قسە پێشکەشی ئامادەبووان بکات. کە مەنسور قسەیکرد هەمووان بێدەنگبوون، ماتییەک باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا، کپییەکی قووڵ کەوتە سەر هەموو ڕوخسارەکان، کچانی ئامادەبوو لە هۆڵەکەدا هەموو گیانیان بووبوو بە چاو، دیمەنی ئەم کوڕە ناسکە زەمینگەڕە تەماحێکی قووڵی تێگەیشتن و ناسینی دونیای لە هەمووان‌دا جوڵاندبوون. مەنسور بە هێمنی هەمووانی سوپاسکرد و باسی خۆشحاڵی خۆی کرد کە جارێکی تر دەگەڕێتەوە و شاری خۆی دەبینێتەوە. گووتی «ئەگەر باڵندەکانم بیانتوانیبایە بە دڵنیاییەوە سوپاسیاندەکردن، بەڵام باڵندەکانی دونیا تەنیا یەک زمان دەزانن کە زمانی باڵندەیە» هەموو پێکەنین. هەستمانکرد کەمێک دەستەپاچەیە، وەک ئەوەی نەزانێت بڵێت چی، سەیرێکی ساقی مەحمودی کرد کە ئەمڕۆ جامانە کوردییەکەی بە دەستوری توریانی مەهراجا هیندییەکان بەستبوو و گووتی «من لێرەم، ماوەیەکی دەوێت تا بڕوادەکەم کە لێرەم، من چوو بێتم بۆ هەر شوێنێک ماوەیەکی ویستووە تا بڕوامکردوە لەوێم». زەردەخەنەیەکی گەورەی گرت و دەستی خستە گیرفانی پانتۆڵە ڕەشەکەیەوە و خۆی ڕاستکردەوە و گووتی «چووم بۆ هەر شوێنێک وامزانیوە لە شوێنێکی ترم، ئەوە وادەکات مرۆڤ لە هیچ شوێنێک نەبێت... کە بیر لەوەدەکەمەوە دەڵێم کە وابێت من لە هیچ شوێنێک نەبووم، کەواتە لێرەش نیم». هەموو هەستمانکرد بە ڕاستی نەیەوێت بمانهێنێتە پێکەنین، بۆیە هەموو

بەڕاستی پێکەنین. کەمێک وەستا و گووتی «بەڵام زەوی شوێنێکی سەیرە، مرۆڤ دەتوانێت بیری هەموو کونجێکی بکات، دەتوانێت بیری ئەو شوێنانەش بکات کە لەوێ نەبووە». دەنگی کەمێک قووڵتر و جیدیتر بوو و گووتی «من زۆر سەرمەست بووم بە زەوی، زۆر. مرۆڤ کە زەوی دەگەڕێت ئیتر شتەکان بە چاوێکی تر دەبینێت. کە دونیا دەبینێت ئەوسا تێدەگات کۆترێک کە بەسەربانی ماڵەکەی ئەودا دەفڕێت، لە ڕیزی باڵندەکانی دونیادا چ شوێنێکی هەیە... مرۆڤەکان، شوێنەکان، باڵندەکان بەجۆرێک هەمەڕەنگن... هەموو شتێک ڕەوایە... هەمووی ڕەوایە، هەرچی لەسەر زەوی هەیە ڕەوایە». زەردەخەنەیەکی گرت و بە غەمێکەوە سەری بادا و بە دەنگێکی بەرزتر گووتی «شتەکان بە جۆرێک لە یەک ناچن، بەجۆرێک جیاوازن هەموو شتێک ڕەوایە. تۆ ڕەوایت لە شاری خۆتدا و ئەوانیش ڕەوان لە شاری خۆیاندا. وەک چۆن کەس ناتوانێت گومان لە ڕەوایەتی تەیرێک بکات لە فڕینی خۆیدا، لە سەر درەختی خۆی، کەس بۆی نییە گومان لە ڕەوایەتی تۆش بکات لە فڕینی خۆت و لە هێلانەی خۆتدا... هەموو تەیرێک ڕەوایە... هەموو ژیانێک ڕەوایە». گەرچی زۆربەمان تێنەگەیشتین مەبەستی چییە، بەڵام چەپڵەیەکی گەورەمان بۆ لێدا. هەندێک قسەی تری لەسەر مافی هەموو زیندەوەران و هەموو شوێنەکان کرد، باسی ئەوەی کرد کە مرۆڤێک لەدوورەوە دێت و دەچێتە شارێک یان زەوییەک، لای ئەو هەموو شتێک نەناسراو و سیحراوییە، ئینجا بە غەمگینییەوە سەیریکردین، نەیدەزانی چیمان پێبڵێت، هەستمانکرد بەجۆرێک لە جۆرەکان بەزەیی بە خۆی و ئێمەشدا دێتەوە، هەموو سەرلەبەر بێدەنگبووین، هەناسەشمان دەنگی نەدەهات؛ بەڵام ئەو هەناسەیەکی هەڵکێشا؛ دەنگی هەناسەکەی لە مایکەکەوە دەنگیدایەوە و گووتی «ناتوانم زۆر بڵێم، تاکە شتێک، تاکە شتێک نرخی هەبێت بیڵێم، ئەوەیە کە دوو جۆر شار لە دونیادا هەن...

ئەو شارانەی کە غەریبەیان نەبینیوە و لێیدەترسن، ئەو شارانەی کە غەریبەیان بینیوە و ناترسن... گەر ڕۆژێک لە ڕۆژەکان توانیتان دەرگای ئەم شارە لە ڕووی دونیادا بکەنەوە... لە غەریبەکان مەترسن... چۆن ئەم باڵندە غەریبانەی من شارەکەتان جواندەکەن، هەموو غەریبەیەک کە ڕوودەکاتە ئەم شارە... شارەکەتان جواندەکات... ئەوە تاکە شتێکە کە دەمەوێت پێتان بڵێم... تاکە شتێک، تەنیا غەریبەکانن دونیا جواندەکەن».

هەموو چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد باسی خۆشەویستی و نەمری عەشق و سەوسەنمان بۆ بکات، چاوەڕێی وانەیەکی دووروودرێژبووین لەسەر وەفا و ڕەنج و خۆشەویستی، بەڵام ئەو هیچی نەگووت، بە هێمنی هاتە خوارەوە و چەپڵەیەکی گەورەمان بۆ لێدا، چەپڵەیەک هەموو هۆڵەکەی لەراندەوە. هەندێک بێئەوەی بزانن بۆ، چاویان پڕبووبوو لە فرمێسک، هەندێکی دیشمان بە سۆزەوە سەیری مەنسور و سەیری یەکترمان دەکرد، بەر لەوەی ساقی بە چاوی پڕ فرمێسکەوە جارێکی تر مایکرۆفۆنی ئاهەنگەکە بگرێت و تیپی مۆسیقاکە بانگهێشتی سەر شانۆکە بکاتەوە، بێدەنگییەکی قورس و خنکێنەر باڵی بەسەر هەمووماندا کێشا... لەو ساتەوە، لە ناو فەزا و ئەتمۆسفیری هۆڵەکەدا هەستمان بە شتێکی نائاسایی کرد، هەستێک تەنیا هەفتەیەک دواتر لە مانا ڕاستەقینەکانی تێگەیشتین.

٤٤

سەوسەن سەرنجیدا کە باڵندەکانی خالید ئاموون زۆر غەمگینن و بەدەگمەن دەخوێنن، ئەو دەنگە کورت و غەمگینەی لێیانەوە دێت پتر لە نرکەی زام دەچێت. هەر ئەو ڕۆژە هەندێک لە باڵندە زامدارەکانی بردەوە بۆ ماڵەوە و ژمارەیەکی زۆر لە باڵندە بچوکەکانیشی گواستەوە بۆ قەفەزی نوێ لە ژوورەکەی خۆیدا، بەڵام لەوێش باڵندەکان هەر غەمگین بوون، لەو ژوورەشدا کە پڕبوو لە باڵندەی دڵخۆش و مەستخوێن هەر جۆرە بێدەنگییەکی سەنگین و نائاسایی باڵی بەسەردا کێشابوون. کە سەوسەن باڵندەکانی مەنسور ئەسرینیشی وەرگرت هەر هەمان شتی کرد، باڵندە بچوکەکانی گواستەوە بۆ ژوورەکەی سەرەوەی خۆی و باڵندە گەورەکانی جیاکردەوە و ناردنی بۆ عەمبارە گەورەکە.

هاتنەوەی مەنسور ئەسرین، سەوسەنی خستە بەردەم ئەو ڕاستییەی کە دەبێت بڕیاربدات، دەبایە کۆتاییەک بۆ هەموو ئەو چیرۆکە دووروودرێژە دابنێت و قەدەری کچانەی خۆی هەڵبژێرێت، دەبایە لەو دوو هەفتەیەدا بە جیا چاوی بە هەریەک لە خالید ئاموون و مەنسور ئیبراهیم بکەوتبایە. ئەو گفتوگۆیانە دەبایە گرنگترین گفتوگۆی ژیانی سەوسەن بن. خالید ئاموون لە دوا نیوەڕۆیەکی تا ئەندازەیەک گەرمدا گەیشتە ماڵی سەوسەن خان، بێئەوەی هیچ بپرسێت، وەک پیاوێکی زامدار بەڵام پڕ سۆز لە قاتێکی ڕەشدا بەرامبەر خانم دانیشت، جلەکانی بێئەندازە شیک و

ڕوخساری دەرەکی تابلۆیی ڕێک دەینواند. سەوسەن سەرنجی ئەوەیدا کە خالید ئاموون پرسیارێکی لە باڵندە بریندارەکانی خۆی نەکرد، سەیرێکی ئەو باڵندە چکۆلانانەی نەکرد کە لەوسەری زەمینەوە هێنابوونی. سەوسەن چەند ڕۆژێک بوو ئەو دەنگۆیەی بیستبوو کە دەشێت خالید ئاموون خۆی تەقەی لە باڵندەکان کردبێت، بەڵام بایەخێکی ئەوتۆی بەو قسانە نەدا، یەکەم پرسیار کە سەوسەن لێیکرد ئەوەبوو: خالید لەو باوەڕەدایت باڵندەکان لەم شارەدا ئاسوودەبن، هەستدەکەم باڵندەکان زۆر غەمگین و ماندوو دەربدەکەون؟. خالید سەیرێکی ئەو هەموو قەفەزەی کرد کە لە هەموو لایەکی ژوورەکەدا هەڵواسرابوون، بەڵام نیگای وەها ڕووکەشبین و خێرابوو پێنەچوو شتێکی ئەوتۆ لە باڵندەکاندا سەرنجی ڕاکێشابێت. بە هێمنی لەسەر قەنەفە کۆنەکە دانیشت، هەستی بە هەمان ترس کردەوە کە چەند ساڵێک لەوەوبەر لەسەر ئەم کورسییە هەستی پێکردبوو، بەڵام لەسەرەخۆ گووتی «سەوسەن خان باڵندەکانی من هەمیشە بێدەنگبوون. لە جەنگەڵدا من بە دوای باڵندەی بێدەنگدا دەگەڕام». خالید گەلێک هێمنتر و ئاسوودەتر لەو ڕۆژە دەردەکەوت کە سەوسەن بۆ یەکەمجار لە تەنیشت قەفەزە خوێناوییەکانەوە بینی، بەوەدا چەند ڕۆژێک بوو لەو ئوتێلەدا بەتەنیا دەژیا و چاوەڕوانی ئەم دانیشتنەی دەکرد، پێدەچوو ماوەیەکی زۆری هەبووبێت بیر لە جوڵەو قسە و وشەکانی خۆی بکاتەوە، سەوسەن وای هەستدەکرد هەموو جوڵەیەک و وشەیەکی پێشتر بیری لێکراوەتەوە. خالید گووتی «باڵندەکان تەنیا لە جێگای خۆیاندا ئاسوودەدەبن، لە ناو سروشتدا، لەویادا نەبێت لە هیچ جێگایەکی تر ئاسوودەنابن. ڕاستە لەوانەیە ئەوانیش حەز بەبینینی دونیا بکەن، بەڵام لە قەفەزدا نا... هیچ سەفەرێک لە ناو قەفەزدا خۆش نییە». سەوسەن بە هێمنی و لاوازی چاوی لێکنا و بە چاوی نوقاوەوە پرسی «ئەی تۆ خالید... ئەی تۆ ئاسوودەبوویت لە گەشتەکەتدا بە دونیادا؟». خالید بێئەوەی درۆبکات،

بێتــەوەی هەســتەکانی خــۆی بگۆڕێــت گووتــی «نــا ئاســوودە نەبــووم، ئــەم ســەفەرە لــە ســەختترین ڕۆژەکانــی ژیانــم بــووە». سەوســەن بێتــەوەی چاویکاتــەوە پرســی «هەستتدەکرد تــۆش وەک باڵنــدەکان لــە قەفەزدایــت؟». خالید گووتی «بەڵێ سەوســەن خان، هەستمدەکرد، منیش وەک باڵندەکان لە قەفــەزدام». سەوســەن چاویکــردەوە و گووتــی «بــەڵام خالیــد بــۆ نەگەڕایتەوە؟ تــۆ دەتتوانــی لــە هەمــوو ساتێکدا ســەفەرەکەت بپچڕێنێــت و بگەڕێیتــەوە... حەزمدەکــرد یەکێکتــان، هــەر یەکێکتــان کــە ناتوانێــت بــەردەوام بێــت ســەفەرەکەی بوەستێنێت و بگەڕێتــەوە». «لــە بەرئــەوەی تۆم خۆشدەویست، هەستمدەکرد بــۆ ئــەوەی تــۆ ببیــت بــە ژنــی مــن دەبێــت ئــەم ســەفەرەبکەم... وەک سزایەکی گــەورەی ئــەو خۆشــەویستییە گەورەیــە ســەیرمدەکرد... هەمــوو ســەفەرەکە بــۆ مــن ســزایەکی گــەورە بــوو...». سەوســەن گووتــی «خالیــد پێمبڵــێ... جیهانــت چــۆن بینــی؟». خالیــد بەساردییەوە ســەیریکرد و گووتــی «وەک جەهەنــەم، جیهــان جەهەنەمــە، سەوســەن خــان، ســەفەرەکەی مــن ســەفەرێکی دووردرێــژ بــوو بــە جەهەنەمــدا...». سەوســەن بــە دەنگێکــی زۆر غەمگینــەوە پرســی «بــۆ... خالیــد، بۆچــی بــەو چەشــنە وەسفی دونیــا دەکەیــت؟». «لەبەرئــەوەی جیهــان پــڕە لــە ئــازاری گــەورە گــەورە، پــڕە لــە مــرۆڤ کــە لــە هەمــوو کونــج و کەلەبەرێکدا ئــازار دەکێشــن، پــڕە لــە تاریکی کــە مــرۆڤ نایبڕێــت، پــڕە لــە درۆ، پــڕە لــە مــرۆڤ کــە کەسیان لــە کەسیان تێناگــەن، پــڕە لــە زمــان کــە هیــچ یەکێــک لــەوی دی حاڵــی نابێــت، پــڕە لــە دارستان کــە مــرۆڤ ناتوانێــت بچێتــە ناویــان، پــڕە لــە شــار کــە تیــا وندەبێــت، پــڕە لــە باڵنــدە کــە بــە هیــچ کــەس ناگیرێــن. لــە بەرئــەوەی مــرۆڤ ناتوانێــت لــە یەککاتــدا بیــر لــە خۆشــی و بیــر لــە دونیــاش بکاتــەوە... لەبەرئــەوە». سەوســەن بــە غەمگینییــەوە گووتــی «بــەڵام خالیــد ئامــوون، مــن تــۆم نــارد تــا دونیــا ببینیــت... تــۆم نــارد بــۆ ئــەوەی لــەم شــارە دووربیــت و بتوانیــت ئــەو هەمــوو جوانییــە تەماشــابکەیت، تــا لــەم شــەڕانەدا نەکوژرێیــت... دەزانیــت چەند

شەڕی گەورە ڕوویاندا؟... دەزانیت؟». خالید ئاموون تۆزێک بیریکردەوە و گووتی «دەزانم خانم شەڕ وڵاتەکەی هەڵاهەڵاکردوە، شەڕ وڵاتەکەی ویرانکردوە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من لە ساڵانی سەفەردا ئازاری گەورەم چەشت و سەختی گەورەم بینی، چەندجارێک لە نێوان وڵاتەکاندا گیرام، بەشێک لە سەفەرەکەم لە زینداندا بردەسەر، بەڵام هەمیشە بە ماڵ و پارەی ئاموونییەکان دەهاتمەدەرێ و لە سنوورەکان دەپەڕیمەوە، هیچ شتێکم دەربارەی ئەو ڕۆژە ناخۆشانە بۆ قەلەندەر ئاموون و کەسوکاریشم نەنوسی، تا دڵیان نەشکێنم. سەوسەن خان ئەوەی تۆ وادەزانیت جیهان باغێکی گەورەیە کە پڕە لە گوڵی جۆراوجۆر و باڵندەی جۆراوجۆر هەڵەیە، بمبورە سەوسەن خان، بەڵام من تۆم خۆشدەوێت، دەمەوێت بزانیت چەند سەختیم کێشاوە، دەمەوێت بزانیت کە جیهان باغێکی گەورە نییە... لێرەو لەوێ باغی تێدایە، لێرەو لەوێ باڵندەی جوانی تێدایە، بەڵام ئەوەی من بینیومە زۆرتری ئازار و برسێتی بووە... خانم شەڕ تەنیا لە عێراق و لەم کوردستانەی ئێمەدا نییە، شەڕ لە سروشتی مرۆڤدایە، شەڕ تەنیا لێرەدا نییە بەڵکو لە هەموو دونیادایە».

سەوسەن بە نائومێدییەکی گەورەوە گووتی «ئەی خالید ئێستا خۆشەویستیت بۆ مرۆڤ زیاتری نەکردوە، خۆشەویستی تۆ بۆ مرۆڤ لەو ڕۆژە زۆرتر نییە کە لێرە ڕۆیشتیت؟ تۆ ئەو هەموو خاک و میللەتە جیاوازانەت بینی، ئەوە بەشی ئەوەی تێدایە کە فێری خۆشەویستی بوبیت؟». خالید زەردەخەنەیەکی تاڵی گرت و گووتی «سەوسەن خان من زۆربەی ساڵانی سەفەر بە تەنهابووم، هەشت ساڵە بۆ ماوەیەکی درێژ لە هیچ شوێنێکدا نەماومەتەوە. هەشت ساڵە هاوڕێیەکم نەبووە، تەنیا شتێک بیرم لێکردۆتەوە تۆ بوویت. بەدرێژایی ئەو ساڵانە لەو تەنهاییە قووڵەدا تەنیا خۆشەویستیم بۆ تۆ زیادیکردوە، تەماحم لە تۆ و ئیرەیم بەرامبەر تۆ زیادیکردوە. نەمدەتوانی لە یەک کاتدا بیر لە تۆش و دونیاش

بکەمەوە... من لە هەموو جێگایەکدا تەنیا تۆم دەبینی، ڕاستت دەوێت زۆر بێباک و کەمتەرخەم باڵندەکانیشم دەگرت... من درۆت لەگەڵدا ناکەم، من ڕقم لە هەر شتێک بوو، لە هەر وڵاتێک و هەر دارستان و هەر ئاوێک بوو کە لەم شارەی دوور دەخستمەوە... تا زیاتر دووریکەوتبامایەتەوە، زیاتر ڕقم لە دونیا دەبووەوە. دونیا جێگایەکی ترسناک بوو لای من... من کاتێکی زۆرم بەوەوە نەدەکوشت بیر لە دونیابکەمەوە، من دەقیقە بە دەقیقە دەمژمارد تا بگەمەوە ئەم شارەو تۆ ببینم».

سەوسەن پرسی «ئەی ئەو هەموو دیمەنە سروشتییە جوانانە سەرسامیان نەکردیت. دەنگی خۆشی ئەو بولبولانە مەستیان نەکردیت... لە من زیاتر، لە تەنیا ژنێکی بچکۆلە و نەخۆشی ئەم دونیایە بیرت لە هیچی تر نەکردەوە؟». خالید ئاموون سارد و تیژ سەیریدەکرد و گووتی «ئەوەندە گوێم لە دەنگی دڵی خۆم و هاواری دڵم دەگرت، گوێم لە دەنگی تر نەبوو. ئەوەی سەرسامیدەکردم، توانای نهێنی خۆم بوو کە ئەو هەموو ساڵە دووردرێژە بە دوای خۆشەویستیدا بە زەویدا وێڵبم. پێشتر نەمدەزانی توانای وا گەورەم تێدایە... نەمدەزانی ئامووونییەک هەیە بتوانێت بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشی و سەختییە بگرێت، من کوڕی خێزان و خێڵێک بووم کە هەموو لە خۆشیدا ژیاون، پێشتر زۆر ئاسان ژیانی خۆمم دابینکردبوو، نەمدەزانی توانای وا گەورەم تێدایە... بەڵام ساڵ دوای ساڵ جگە لەو هێزەی لە تۆی نزیکدەکردمەوە هەستم بە هیچی تر نەدەکرد».

هەندێ جار جریوەی باڵندەکان دەیوەستاندن، هەندێکیان بەدەنگێکی وا زوڵاڵ و بەرز دەیانخوێند بەسەر هێمنی دەنگی سەوسەندا سەردەکەوتن و دەبایە خالید ئاموون گەلێک وریا گوێبگرێت تا وشەکانی سەوسەن لە نێوان جریوەکاندا بگرێتەوە.

سەوسەن دوای کەمێک هێمنی، وەک دەستووری خۆی لەگەڵ چاخواردنەوەی بەردەوامدا، دوو چای تێکرد و گووتی «ئەی باڵندەکانت

خۆشدەویست یاخود نا؟».

خالید ئامۆون، بێئەوەی بیخواتەوە سەیرێکی چاکەی کردو گووتی «لە تۆ زیاتر هیچ شتێکی ترم خۆش نەویستووە، باڵندەکان شتێک بوون وەک قەدەر، نە خۆشمدەویستن نە ڕقم لێیان بوو، دەمزانی تۆ باڵندەکانت خۆشدەوێت، لەبەرئەوە دەبوو بیانپارێزم... پەیوەندیم بە باڵندەکانەوە پەیوەندییەکی قووڵ نەبوو، نە قسەم لەگەڵدا دەکردن و نە قسەیان لەگەڵدا دەکردم. هەندێ جار پێمدەگووتن کە دەتانبەم بۆ شارێکی دوور، بەڵام گەر وەڵامیشیان دابێتمەوە من هیچ تێنەگەیشتووم».

سەوسەن سەیرێکیکرد و بە غەمگینی گووتی «واتێدەگەم کە تۆ بە دڵ، بە هەموو دڵ لەگەڵ باڵندەکاندا نەبوویت».

خالید بێئەوەی زۆر بیریکاتەوە گووتی « سەوسەن خان نەمدەتوانی، نەمدەتوانی بە هەموو دڵ لە گەڵیاندابم. دونیای باڵندەکان دونیایەکی نەبینراوە، تا زیاتر پیا ڕۆبچین زیاتر لەم دونیایەی خۆمان دووردەکەوینەوە، تا زیاتر بەدوایدا بڕۆین، زیاتر خۆمان لە بیردەچێتەوە... هەر وەختێک لە ڕاوی باڵندەکاندا نوقمدەبووم، کە گەڕانی جەنگەڵا و جەنگەڵ شێتیدەکردم... خۆمم لە بیردەچووەوە، خۆشەویستی تۆم لە بیردەچووەوە، دڵنیابووم تۆ ئەوەت ناوێت، لەبەرئەوە سەوسەن خان نەمدەتوانی بە هەموو دڵ خەریکی باڵندەکان بم... نەدەکرا، شتی وا نەدەکرا».

سەوسەن بە غەمگینییەوە گووتی «ئەی خالید پێمبڵێ، تکایە پێمبڵێ هەستت بە چی دەکرد کە باڵندەیەک لە باڵندەکان دەمردن؟».

خالید بێئەوەی زەردەخەنەبگرێت، شتێک لە تۆنی گاڵتەجار دەپەڕییە ناو دەنگی و دەیگووت «سەوسەن تۆ دەڵێیت چی من خۆم هیچ کەسێک هەستی پێ نەدەکردم... بەسەر زەویدا دەگەڕام و هیچ کەس لەو دونیا گەورەیەدا نەیدەزانی من چیم، بەشی هەرە زۆری مرۆڤەکانی سەر زەوی هەتا ناوی میللەتەکەیان نەبیستبووم... کورد... کورد... بەشی هەرە

زۆری بەشەرەکانی ئەم دونیایە، ناوی میللەتی وایان نەبیستبوو. سەوسەن خان بیهێنە پێشچاوی خۆت بەزەویدا وێڵ بیت و تەنیای تەنیا بیت و کەس ناوی نەتەوەکەشتی نەبیستبێت. ڕەحم لە مرۆڤێک و لە شارێک و لە جێگایەکەوە وەرنەگریت. دەتەوێت هەست بەچی بکەم... کە باڵندەیەکم دەمرد، لاشەکەیم لە قەفەزەکەی دەردەهێنا و فڕێمدەدا و دەڕۆیشتم و دەمویست باڵندەیەکی تر بگرم... دەمویست دەست بە ژیانی ئەوانی ترەوە بگرم کە نەمردون. چاوەڕێی چی دەکەیت سەوسەن خان، کە باڵندەیەکم دەمرد دانیشم و بگریم؟... ها وەک کەسێک کە نازانێت دونیا چەند دڵڕەق و پڕ ئازارە. سەوسەن خان، تۆش دەزانیت دونیا چ دڵڕەق و پڕ ئازارە. قەلەندەر ئاموون بەر لە مردنی نامەیەکی بۆ نوسیم باسی کوشتنی ئاسایشەکان دەکات، باسی ئەوە دەکات شەوێک تۆی لە ناو مەیتی ئاسایشەکاندا دۆزیوەتەوە، شەوێک چووە بۆ ناو مەیتە سووتاوەکان و تۆ لە ناویاندا بوویت. من چەند ڕۆژە بیری لێدەکەمەوە... لەو ساتەوەی کە نامەکەی قەلەندەر ئاموونم خوێندۆتەوە بیری لێدەکەمەوە... سەوسەن خان تۆ بۆ چوویت بۆ ناو ئەو مەیتانە... ها... سەوسەن خان، لەویادا لە ناو ئەو مەیتانەدا شتێکت بینیوە کە ئەوانی تر نایبینن، بێڕەحمی ژیان، درندەیی ژیان. وانییە... تۆ بەچاوی خۆت چەند ساڵە ئەوە دەبینیت؟ سەوسەن خان تۆ تێمدەگەیت دەڵێم چی. من بەردەوام لە هەموو شوێنێکی دونیادا ئەوەم بینیوە، لە هەموو شوێنێکدا...».

وەک ئەوەی یادی ئەو شەوە سەوسەنی ئازاردابێت، بە ئارامی لە جێگای خۆی هەستا و دەستی خستە سەر مێزەکە و گووتی «خالید ژیانی ئێمە لێرە، تەنیا عومرێکی درێژە لەگەڵ لاشەکاندا دەیبەینەسەر. من چەندین ساڵ بوو بەردەوام لە تەلەفزیۆنەوە لاشەم دەبینی، هەموو شەوێک دەمبینین. بۆیە کە ئێوە داواتانکردم، ویستم لەوبەری دونیا، لە جێگایەکی ترەوە شتێکی تر ببینن، شتێک پەیوەندی بە مردنەوە نەبێت.

بەڵام خالید باڵندە کوژراوەکانی تۆ... ئەو هەموو خوێنە بەقەفەزەکانەوە، ئەم بێدەنگییەی تەیرەکانت... دەمترسێنن».

هێمن قسەیدەکرد و لەناکاو دەستی گرت بە دەموچاوییەوە و وەک بگری گووتی «خالید، من پێویستیم بە یەکێکە لەوسەری دونیاوە بێت و چیرۆکێکی ترم بۆ بگێڕێتەوە... هەتا ئەگەر درۆش بێت. دەمەوێت شوو بەیەکێک بکەم بە چیرۆکەکانی دونیایەکی ترم نیشانبدات و سەرسامبکات، هەتا ئەگەر درۆش بێت... من کچێکی نەخۆشم... دەمەوێت شوو بەیەکێک بکەم، ئەوەم لە بیرببەرێتەوە... دەمەوێت شوو بەیەکێک بکەم باسی ئەم شار و مەملەکەتەم بۆ نەکات». خالید لە جێگای خۆی هەڵدەستا و دەستی سەوسەنی دەگرت و دەیگووت «نا سەوسەن تۆ پێویستت بە یەکێک نییە سرۆت لەگەڵدابکات، پێویستت بە یەکێکە شتەکان وەک خۆیان ببینێت». سەوسەن بە ترسەوە سەیری چاوی دەکرد و گووتی «خالید ئاموون، ئەی ئێستا دەتوانیت لە پێناوی مندا کەس بکوژیت؟ پێمبڵێ دەتوانیت یاخود نا؟»».

خالید هەڵدەستا و پشتیدەکردە سەوسەن و چەند هەنگاوێک لە کورسییەکەی خۆی دووردەکەوتەوە و دەیگووت «زیاد لە هەشت ساڵ لەمەوبەر ئەو پرسیارەت لێکردم، سەوسەن خان لەو ماوەیەدا شتێکی ئەوتۆ لە مندا نەگۆڕاوە، ڕەنگە من کەمێک پیرتربوویم. نا کەمێک پیرتر و عاشقتر و ڕەقتر بوویم. سەوسەن خان، من هەر ئەو وەڵامەم هەیە کە لەوەوبەر پێمگووتی، من لە پێناوی تۆدا ئامادەم هەموو گوناهێک بکەم. من ئێستاش وەک دوێنی، ڕقم لە هەردووکیانە. خۆزگە دەمخوازم هیچیان لەم دنیایەدا نەبوونایە. هەتا دەمرم ڕقم لەو دوو پیاوە دەبێت... هەتا دەمرم».

سەوسەن فرمێسکێکی گەورە لە چاویدا بوو گووتی «خالید، تا ئێستاش ئەو ڕقە گەورەیە هەر لە دڵتدایە... ئەو ڕقە گەورەیە».

خالید وەک ئـەوەی چاوەڕوانی ئەو پرسیارەی کردبێت گووتی «سەوسـەن، مـن ناتوانـم خۆشەویسـتی تـۆ لـە ڕق جیابکەمـەوە. خۆشەویسـتییەک نییـە بەبـێ ڕق، جارانیـش نەبـووە و لـە داهاتووشـدا نابێـت. تـا خۆشەویسـتیم قووڵتـر و گەورەتربێـت، ڕقـم گەورەتـر دەبێـت. لەبەرئـەوەی مـن مرۆڤێکـی سـادەم بەبـێ درۆ... ڕقـم لـە هـەر شـتێکە بکەوێتـە نێـوان مـن و تـۆ وە... هـەر شـتێک بێـت یـان هـەر کەسـێک بێـت».

خالیـد ویستی زۆرتـر قسـەبکات، بـەڵام سەوسـەن گووتـی «خالید دەستتم بـدەرێ... دەسـتتم بـدەرێ بۆنیبکەم».

خالیـد ئامـوون سەرسـامانە وەسـتا و بێئـەوەی تێبـگات دەسـتی دایـە سەوسـەن و ئەویش بـە هێمنـی بۆنیکـرد. زۆر قـووڵ و ئـارام بۆنیکـرد، سـەرەتا بۆنـی دەسـتی کـرد، بۆنـی مەچەکەکانـی، بۆنـی سـەری... گەڕایـەوە و بۆنـی پەنجەکانـی کـرد، هەناسـەی نـا بـە سینەیەوە، بۆنـی دەموچـاوی کـرد، بۆنـی قـژی کـرد... بـەڵام سەوسـەن هەسـتی بـە هیـچ شـتێک نەکرد، وەک ئـەوەی خالیـد ڕۆژێـک لـە ڕۆژان لەسـەر زەوی نەبووبێـت، وەک ئـەوەی یـەک بۆنـی ڕاسـتەقینەی دونیـا بـە پێسـت و دەسـت و ژیانییـەوە نەنوسـابێت... خالیـد ئامـوون پیاوێـک بـوو هـەر بۆنـی کوچەکانـی ئـەم شـارەی لێدەهـات. وەک گومانـی هەبێـت، وەک باوەڕنـەکات، جارێکـی تـر سـەرلەنوێ بۆنیکـردەوە، دووبـارە بـە هەمـوو لەشـیدا هاتـەوە، لـە پەنجەکانییـەوە بـۆ تەوقـی سـەری، هەمـوو جێگایەکـی لەشـی، هەمـوو بسـتێکی دیـار و داپۆشـراوی زیـاد لـە جارێـک بۆنکـردەوە... بۆنـی خالیـد ئامـوون بۆنـی جیهـان نەبـوو، بەڵکو بۆنـی ئـەم شـارە بـوو، بۆنـی مـردووەکان بـوو، بۆنـی ئـەو لاشـانەبوو کـە لـە ژێـر زەمینـی ئاسایشـە سـووتاوەکەدا بۆنیکردبـوون. وەک ئـەوەی سـامێکی گـەورە دایگرتبێـت سەوسـەن گووتـی «خالیـد... بمبـورە...... بمبـورە... بمبـورە کـە بۆنتدەکـەم». وای گـووت و بێدەنـگ سـەیری چـاوی ئاموونـی کـرد و دووبـارە گووتییـەوە «بمبـورە».

٤٥

کە خالید ئامـوون لـە ماڵـی گوڵدانچییـەکان هاتـەدەرێ، هەسـتیکرد شـەڕەکەی بـۆ هەتاهەتایـە دۆڕانـدوە. گەرچـی شـتەکان تـا کۆتایـی ئاسایی تێپەڕیـن، گەرچـی ئـەم تـا دوائەنـدازە لەگـەڵ خانمـدا ڕاسـتگۆ بـوو و هیـچ شـتێکی لـەو ڕۆحـە تاریـک و دوودڵـەی خـۆی لـێ نەشـاردەوە، بـەڵام وای هەسـتکرد سەوسـەن بـە دوای تیشـکێکدا دەگەڕێت کە لەمـدا بوونـی نییـە. لـە قووڵاییـدا هەسـتیکرد سەوسـەن بـە پێچەوانـەی جارانـەوە لـە بێدەنگـی دەترسـێت، ئـەو هەمـوو باڵندانـەی لـە ژوورەکـەدا دەیانخوێنـد، شـتێکیان تێدابـوو جیـاواز لـەو بێدەنگییـە قووڵـەی کتێبـەکان چەنـد سـاڵێک لـە مەوبـەر لەوێـدا سـەپاندبوویان. خالیـد ئامـوون تێنەگەیشـت بـۆ سەوسـەن بەوجـۆرە بۆنیکـرد، بـۆ دوای ئـەو بۆنکردنـە بـەو چەشـنە مانـدوو و نائومێـد دیاربـوو. بۆ پرسـیاری دەربـارەی باڵنـدە کوژراوەکان لـێ نەکـرد. کـە گەیشـتەوە ئوتێلەکە هەسـتێکی قووڵـی خۆشەویسـتی بـۆ سەوسـەن لـە نـاوەوە دەیخـوارد، لـە هـەر شـتێکی تـری دونیـا زیاتـر پێویسـتی بـەو ژنـە بـوو. هەسـتیکرد ئـەو هەمـوو سـاڵە هیـچ شـتێکی تێدا نەگۆڕیـوە، تـەواو وەک جـاران عاشـقێکی پـڕ ئیرەییـە، عاشـقێک حـەزدەکات بازنەیەکـی ئاسـنین بـەدەوری مەعشـوقەکەیدا بکێشـێت و لـە هەمـوو شـتێک دووریبخاتـەوە و بیپارێزێـت.

دوای ڕۆیشـتنی خالیـد ئامـوون، سەوسـەن فیکـرەت هەسـتی بـە ساردییەکی گـەورە کـرد لـە ژوورەکـەدا، سـەرمایەکی لـە نـاکاو کـە ڕۆژانـی

دووروودرێـژی دەرد و ناسـاغی دوای ڕاپەڕینـی بەیـادا هێنایـەوە. بۆ ئـەوەی خـۆی لـەو هەسـتە سـارد و بۆنـە سـاردەی خالیـد ئامـوون ئازادبـکات، بـە خێرایـی چـووە خـوارێ و باوەشـی بـە هـوزاردا کـرد کـە خەریکبـوو لـە باوەشـی فیکرەتـدا خـەوی لێدەکـەوت. وەک خـەوی بینیبێـت، وەک ترسـێک یـان هەواڵێکی گـەورە ڕایچڵەکاندبێـت، توند منداڵەکـەی بـە خۆیـەوە نوسـاند و گووتـی « هـوزار گیـان، جوانتریـن تـەیـری پـورە غەمگینەکـەی خـۆت، شـوکور تـۆ ساردنیت... تـۆ بۆنـی وات لـێ نایـەت». پڕوشـە دەسـتی خسـتە سـەر ناوچاوانـی سەوسـەن و گووتـی «سەوسـەن چـی بـوو؟ ئـەم بەدبەختـەت چـۆن بینـی، ڕاسـتیت دەوێـت مـن لـە هەموویـان غەمگینتـر دەیبینـم، بـەڵام تۆزێـک ئاڵـۆزە، وانییـە؟». سەوسـەن منداڵەکـەی توند بـە خۆیـەوە نوسـاندبوو و سـەیری جێگایەکـی نادیـاری دەکـرد و گووتـی «ئـا پڕوشـە... باسـی مەکـە، باسـی مەکـە». فیکـرەت گوڵدانچـی کەمێـک خـۆی جوڵانـد و چاویلکەکـەی بەرزکـردەوە و سـەیری کچەکـەی کـرد و گووتـی «ئـەم خالیـد ئاموونـە، بێدەنگییەکـی تێدایـە مـن حـەزم لێـی نییـە... پیـاوی وا بێدەنـگ یاخـود بلیمەتـن یـان خەڵکـی ترسـناکن... نازانـم لەوانەشـە زوڵـم بێـت، بـەڵام شـتێکی تێدایـە دڵـم خـۆش نـاکات... هـا... سەوسـەن تـۆ دەڵێیـت چـی؟». سەوسـەن سـەری لەقانـد و گووتـی «گوڵدانچـی باسـی مەکـە، باسـی مەکـە. پیاوێکـی خـراپ نییـە، بـەڵام لەوانەیـە بتوانێـت زۆر خـراپ بێـت، لەوانەیـە بتوانێـت».

بـەڵام دوای دیتنـی مەنسـور ئەسـرین، پڕوشـە هەسـتیدەکرد سەوسـەن لـە ناخـەوە شـەڕێکی گـەورە دەژی. مەنسـور ڕۆژێـک دوای گەڕانـەوەی بـە یاوەریـی باوکـی و سـاقی مەحمـود و هەنـدێ لـە خەڵکـی شـار باڵندەکانـی خـۆی هێنـا و لـە بـەر دەرکـی ماڵـی گوڵدانچیـدا وەسـتا و بێئـەوەی هیـچ قسـەیەکی ئەوتـۆ بـکات کلیلـی قەفەزەکانـی دایـە دەسـت سەوسـەن. هاتنەکـەی مەنسـور زۆر کـورت بـوو، بـەڵام لەگـەڵ کورتییەکەشـیدا زۆر گرنـگ

بوو، هەموو هەستمان پێکرد کە هەردووکیان پەشۆکان، هەستمان بە تێپەڕینی تەزووییەکی گەورە و نهێنی و ترسناک کرد لە نێوانیاندا، هەستمانکرد شتێکی تاریک و نهێنی، کارەبایەکی ڕەش لە نێوانیاندا دروستبوو. بینیمان چۆن مەنسور بە نەرمی دەلەرزێت، کە دەستی برد کلیلەکان دەربهێنێت دەستی دەلەرزی... زۆر زۆر دەستی دەلەرزی. بەڵام کە سەوسەنیش نزیک بووەوە ئەویش دەلەرزی، بۆ ساتێک هەر دووکیان سەیری چاوی یەکیان کرد، سەوسەن لە نزیکەوە زۆر لە نزیکەوە چاوی لێکنا و وەک بۆنێکی بەهەشتی بەسەریدا بچێت، ڕەنگ و ڕوخسارێکی ئاسمانی پەڕییە سەر سیمای، بەڵام هێشتا لەگەڵیشیدا هەر دەستی دەلەرزی. دواتر هەموو بیستمان کە مەنسور و سەوسەن هەردووکیان ئەو شەوە نەخۆش کەوتوون، هەر دووکیان پێکەوە لەرز و تای زۆریان لێهاتووە، پێکەوە تووشی وڕێنە و بزرکاندن بوون، بەڵام بێئەوەی کەسیان ئاگایان لەوی دیکەیان بێت.

دوای چاوپێکەوتنەکەی خالید ئاموون بە ڕۆژێک بڕیاربوو چاوپێکەوتنە گەورەکەی نێوان مەنسور و سەوسەنیش سازبکرێت، ئێمە ئەوانەی ئەو ئێوارەیە شاهیدی ئەو تەزووە تاریکەی نێوان مەنسور و سەوسەن بووین وەک لەسەر پشکۆبین چاوەڕوانی ئەو چاوپێکەوتنەمان دەکرد، ئەو دەست لەرزینە کورت و ئەو نەخۆشییە کتوپڕەی هەردووکیان پێکەوە تووشیبوون، بەسبوو بۆ ئەوەی هەندێک کەس پێشوەخت ئەوە ڕابگەێنن کە کچەکەی فیکرەت گوڵدانچی لە یەکەم نیگا و یەکەم سەیرکردنەوە مەنسوری هەڵبژاردووە.

لە بەیانی ئەو ڕۆژەدا کە دەبایە مەنسور بچێت بۆ ئەو چاوپێکەوتنە گەورەیە، سەوسەن فیکرەت نامەیەکی لە مەنسورەوە پێگەیشت کە سەر لەبەر هەموو هاوکێشەکانی هەڵگێڕایەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە کوڕێکی زۆر منداڵکار و نەناسراو نامەیەکی بۆ سەوسەن خان هێنا و لەدەرگاوە دایە

دەستی و بەخێرایی ماڵاواییکرد و ونبوو. ئەمە دەقی نامەکەیە بەو جۆرەی دوای ڕۆژێک کۆپییەکەی لە بازاڕدا بڵاوبووەوە.

« سەوسەنی خۆشەویست

سڵاو.

ڕەنگە ئەم نامەیە ئەستەمترین و غەمگینترین نامەیەک بێت لە ژیانمدا نوسیبێتم... لەوانەشە تادەمرم نامەیەکی تری وا نەنوسم. تۆ کاتێک ئەم نامەیەت پێدەگات من چیتر لەم شارەدا نیم، لەوانەیە هەرگیز جارێکی دیش نەگەڕێمەوە. من بڕیاری کۆتایی خۆمدا کە بڕۆم و درێژە بەو سەفەرە بدەم کە چەند ساڵ لە مەوبەر دەستم پێکرد. تۆ تەنیا کەسێکیت کە هەستدەکەم دەبێت بۆتی ڕونبکەمەوە بۆ گەڕامەوە و بۆ دەڕۆم. سەرەتا دەبێت بزانیت کە من چەند خۆشمدەوێیت و چەند پێویستیم بە تۆیە، دەبێت گومان لە خۆشەویستی و سەرسامی من نەکەیت. ئەو ڕۆژەش کە تۆم بینییەوە زانیم تا مردن تۆم خۆشدەوێت. بەڵام جگە لەوە زۆر شت هەیە کە دەبێت تۆ بیزانیت. سەوسەنی ئازیز. من ئەو ڕۆژەی کە گەڕامەوە هەستم بە غەریبییەکی زۆر کرد. سەرەتا بزانە ئەو ساڵانی کۆچە منیان کرد بە گەڕیدەیەکی تەواو، من بووم بە دونیاناسێکی بێسرەوت، بووم بە کەسێک ناتوانێت لە جێگایەکدا بمێنێتەوە. ئێستا من لەو کەسانە نیم کە بتوانم لە شارێکدا بژیم و لە ماڵێکدا بسرەوم. هەشت ساڵ لەمەوبەر کە ئەم شارەم بەجێهێشت، حەزم نەدەکرد بڕۆم... ئەم شارە هەموو دونیای من بوو، لێرەدا منداڵیم ژیابووم، لە کۆڵانەکانی ئەم شارەدا ڕامکردبوو، لە قوتابخانەکانیدا فێربووبووم، لە ژێر بارانەکانیدا گەورەبووبووم. هیچ شتێک نەبوو لە سەر زەوی جێگای ئەم شارەم بۆ بگرێتەوە... لەوانەیە لە داهاتووشدا هەر وەها بێت و هیچ شارێک جێگای ئێرەم بۆ نەگرێتەوە. بەڵام نازانم بۆ لە ڕۆژی یەکەمەوە کە تۆ باسی کۆچ و سەفەرت لە گەڵدا کردم وا تێگەیشتم تۆ ناتەوێت بگەڕێمەوە، یان

لە ڕاستیدا ناتەوێت کەسمان بگەڕێینەوە. کە بە ئێمەت گووت بڕۆن، کە ئەو ئەرکە زۆر سەختەت دا بەسەر شانماندادا دڵنیابووم ناتەوێت تاقیمانبکەیتەوە، بەڵکو دەتەوێت ئەم شارە بچکۆلەیە بەجێبهێڵین و بۆ ژیانێکی تر بگەڕێین لە شوێنێکی تری دونیادا. من بەر لە هەر شتێک سوپاستدەکەم... هیچ مرۆڤێک پێشتر دیاری وەهای پێشکەش بە کەسێکی تر نەکردوە، جیهان... بەڵێ سەوسەنی خۆشەویست، تۆ جیهانت پێشکەش بە من کرد... ئەوە گەورەترین دیارییەکە تا ئێستا ژنێک لەم سەر ئەستێرەیە پێشکەشی پیاوێکی کردبێت. کە مانگ دوای مانگ و ساڵ دوای ساڵ لەگەڵ کۆکردنەوەی باڵندەکاندا چوومە پێشێ، کە شار دوای شار و وڵات دوای وڵات گەڕام، کە کەشتی لەدوای کەشتی گۆڕیم و شەمەندەفەر دوای شەمەندەفەر سواربووم، کە شەوم لە بیابانەکاندا ڕۆژکردەوە و لە جەنگەڵەکاندا دوپشکەکان پێیانەوە دام، کە تووشی نەخۆشی بووم و لە خەستەخانەکاندا کەوتم، کە گیرام و ئازادکرام، کە لە دەریاچەی جیاوازدا مەلەمکرد و بە دیار هەڵۆی سیمرغئاساوە لە چیاکان شەونخونیم کێشا، کە بەفر لێیدام و خۆر گەرمیکردمەوە، لەگەڵ هەموو باڵندەیەکدا کە دەمگرت دڵنیابووم کە ئەو باڵندانە دیاری من نین بۆ تۆ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دیاری تۆیە بۆ من. هەر گوڵێکی جوانم ببنبێت، هەر باڵندەیەکی جوانم ڕاوکردبێت، هەر شارێکی قەشەنگ پێشوازی لێکردبم، لەگەڵ هەر ژنێکدا خەوتبێتم... تێگەیشتووم ئەوە دیاری تۆیە بۆ من. سەوسەن من هەموو ئەو ساڵانە سات دوای سات بە قووڵی ژیام... خۆشیم لە خۆشییەکان و خۆشیم لە ئازارەکانیشی بینی. لێتی ناشارمەوە کە جیهان زۆر سەرسامیدەکردم... ئامادەبووم بۆ هەموو شتێک بکرێمەوە، کە سوار کەشتییەکان دەبووم بۆ ئەوەی لە کیشوەرێکەوە بپەڕمەوە بۆ کیشوەرێکی تر، وام هەستدەکرد گەڕیدەیەکم چەندین سەدە لە دوای گەڕیدە گەورەکانی دونیاوە لە

دایکبووم. سەوسەن خان من دەمزانی تۆ بۆیە منت ناردوە بۆ ئەوەی بژیم... بۆ ئەوەی هەموو شتێک تاقیبکەمەوە، تۆ منت نەنارد تا تۆ من تاقیبکەیتەوە، منت نارد تا من جیهان تاقیبکەمەوە، من دەمەوێت پێتبڵێم مانای داواکەی تۆ وەک من تێیگەیشتم ئەوەبوو بڕۆم و بژیم، باڵندەکان تەنیا بەڵگەی ئەوەبوون کە من ژیاوم، کە من چوومەتە ناو جەرگەی ئەو جێگایانەی ژیانی تێدایە، تەنیا ژیانی مرۆڤ نا، بەڵکو ژیان بەهەموو جۆرەکانی و زیندوێتی بە هەموو چەشنەکانی. سەوسەن دەستدان لە باڵندەیەک کە دڵنیایت هیچ کەسی تر پێش تۆ دەستی لێ نەداوە، وەک دۆزینەوەی ئەستێرەیەکی تر وایە. ئەوەی توانیومە تاقیمکردۆتەوە... ژنەکانی دونیام تاقیکردۆتەوە، بۆنی گوڵەکانی دونیا، چێشتخانەکانی دونیا، جلوبەرگە جیاوازەکانی دونیا، زیندانەکانی دونیا، مێشولەکانی دونیا و تامی جیاوازی ئاوەکانی دونیا و ڕەنگی جیاوازی گەرما و سەرماکانی دونیا... من هەمووی تاسەر ئێسقان ژیاوم.

لە کۆتایی ساڵی پێنجەمدا بڕیارمدا نەگەڕێمەوە، لەبەرئەوەی جارێکی تر ئەستەمە بتوانم تا مردن لە ماڵێکدا دانیشم، ئەستەمە لە شارێکدا دانیشم. بەڵام نەمدەویست هەڵبێم، نەمدەویست وادەربکەوم وەک ئەوەی لەبەر بچوکی و بێهێزی و بێتوانایی ناگەڕێمەوە. من خۆم زۆر گومانم لە خۆم بوو، زۆر کەسی تریش هەبوون کە گومانیان لێمبوو... بەڵام ئەوەم زۆر لا گرنگ نەبوو. زۆر شت هەیە خەڵکی نایزانن، بۆ نمونە کەس ئەوە نازانێت کە دونیا وەک مەکینەیەکی گەورە وایە کە خۆی دەجوڵێت، ئەوندەی قاچت خستە سەری خۆی دەتبات. نا... ئەوە زۆر گرنگ نەبوو. من دەبوو بگەڕێمەوە بۆ ئەوەی بە تۆ بڵێم سوپاس، دەبوو باڵندەکانی خۆت ببینیت، ئەوە تەنیا بەشێکی ئەو قەرزە بوو کە دەمتوانی بیدەمەوە بە تۆ. سەوسەن من تەنیا کەسێکم کە تۆ ناتوانیت شووم پێبکەیت، چونکە تەنیا کەسێکم دەتوانم تا کۆتایی

ئەو داوایەی تۆ جێبەجێبکەم، تۆ خۆت دەزانیت کە ناسینی دونیا بێکۆتاییە، ئەوەی دەتەوێت لە شەڕی ناو ئەم وڵاتە دووریکەومەوە، دەتەوێت لە هیچ جەنگێکەوە نەگلێم، دەتەوێت دەستم پیس نەبێت، دەتەوێت کەس نەکوژم و کەس نەمکوژێت، ڕقم لەوانە نەبێت کە تۆیان خۆشدەوێت... دەبێت جیهانگەڕێکی بەردەوامبم، دەبێت لە سەفەرێکدابم کە هیچ ڕۆژێک تەواو نابێت، هەموو ئەوانەی تۆ داوایاندەکەیت لەم وڵاتە مەلعونەدا نەکردەیە... من ئێستا هەموو شەوێکی ژیانم دوو دەنگ پاڵم پێوە دەنێت، یەکێکیان دەنگی تۆیە کە داوام لێدەکەیت بڕۆم و لەم ئاگرستانە دووریکەومەوە، یەکێکی تریشیان هاواری باڵندە وێڵەکانی سەر ئەم زەمینەیە، بانگەوازی جەنگەڵەکانە کە هەستدەکەم هەمیشە بانگمدەکەن، من چارێکم نییە ئەوە نەبێت بڕۆم و ئەم گەشتە تەواوبکەم... گرنگ ئەوەیە من لە هەر جێگایەکی سەر زەمین بم بیر لە تۆ دەکەمەوە، هەمیشە هەستدەکەم جیهان دیارییەکی گەورەی تۆیە و بەبێ یادی تۆ مانای نییە. بەڵام نایشارمەوە لە زۆر شاری دونیادا ئەم شارەی خۆم بیرچۆتەوە، لە زۆر جێگای دونیادا خۆم لە یادکردوە و لە بەردەم زۆر ژنی سەر زەویشدا تۆم بیرچۆتەوە. ئیتر لەو ساتانەدا تێدەگەیشتم جیهان بەجۆرێک منی بردوە گەڕانەوەم نەستەمە، ئەوە ئەو ساتە ترسناکانەی لاوازی بوو کە دونیا بەجوانی و سیحری خۆی دەیفڕاندم و قووڵتر و قووڵتر لە مانای ئاوارەیی خۆم و وێڵی خۆم بەسەر زەویدا تێدەگەیشتم. جگە لەوەش، من ئەو ساڵانە بەردەوام هەواڵی ئەم شارەم بۆ دەهات، ساقی لە هەموو شتێک ئاگاداریدەکردمەوە، هەموو ئەو ئازارە زۆرانەی بەم خۆشەویستییەوە گرێدراون، ئەو ئازارانە نە تۆ و نە ئێمە کەسمان دروستمان نەکردون، بەڵکو ئەم شارە، ئەم دونیایەی لە منداڵییەوە تێیدا دەژین دروستیکردون. سووتانی ماڵی ساقی، سووتانی ماڵی ئاموونییەکان، کوشتنی قەڵەندەر ئامرون، کوشتنی باڵندەکان...

دڵنیابووم ئەو هەموو ساڵە دەتویست ئێمە لەم شەڕە دووربخەیتەوە و نەهێڵیت ئەو ئاگرانە بمانگەنێ، نەهێڵیت پیسببین... ئەوە خۆشەویستی تۆیە، کە بە دووری ئێمەوە گرێدراوە. کە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا، کە هەواڵی کوشتنی باڵندەکانم بیست، تێگەیشتم شەڕ لەم وڵاتەدا دوایی نایەت، ئیتر تۆ ناتوانیت بمانپارێزیت، تۆ ڕێگاکەت پیشاندایین، تۆ هەوڵتدا ڕزگارمانبکەیت، لە ڕاستیدا تۆ ئێمەت هەموو ڕزگارکرد، بەڵام مەرج نییە ئەوانی تر وەک من لەم ڕزگارییە تێبگەن، من دەزانم تۆ ڕزگارتکردوم و نامەوێت جارێکی تر باڵەکانی خۆم بشکێنم... دەزانم تۆ بەلاتەوە سەختە دووبارە پێمان بڵێیت بڕۆین و لەم هەموو شەڕە دووریکەوینەوە. دەزانم لەو هەموو ساڵەدا، لەو هەموو ترسەدا ئەوەت لادروستبووە کە پێویستت بە ئێمەیە... بەڵام سەوسەن سوودی نییە... بۆ ئەوەی لەم شەڕانەوە تێوەنەگلێم، بۆ ئەوەی ئەو هەموو خوێنە پیسم نەکات، دەبێت بڕۆم. تۆ لە من باشتر دەزانیت کە خوێنی تر بەڕێوەیە، شەڕی تر بەڕێوەیە... ئەوەی زۆر ئازارمدەدات، ئەوەیە ناتوانم هیچت بۆ بکەم... تەنیا دۆعادەکەم لە خراپەی ئەم هەموو جەنگانە بەدووربیت. ئەو هەموو ساڵەی سەفەر لە جیهاندا فێریکردم ڕق بە تەواوەتی لە خۆمدا بکوژم. مرۆڤیش لەم شارەدا بێ ڕق ناژی... بێ ڕق ناتوانێت عاشق بێت... دەڕۆم و هەموو ڕۆژێکی ژیانم کە دەژیم و هەموو جوانییەکی دونیا کە تامیدەکەم و هەموو پاکییەک کە لە خۆمدا هەستی پێدەکەم سوپاسی تۆ دەکەم. هێندە هەیە ئاگات لە باڵندەکانم بێت، دڵنیام ئەوانیش هێدی هێدی لەم شارە تێدەگەن... ڕۆژێک کە غەمگین دەبن تێیانبگە و ڕۆژێک کە دەمرن ڕێزیان بگرە. هەندێ شەو کە سەیریاندەکەیت، بزانە من تەنیا کەسێکم کە تا کۆتایی لەگەڵ سەفەرەکەی تۆدا دەژیم... حەزدەکەم دڵنیابیت کە دونیا منی وەها کردەوە ئیتر لە جێگایەکی بچوکدا جێگام نابێتەوە... ئیتر تامردن لەم

سەر زەمینەدا بەڕێوەدەبەم، چونکە ئەوە تەنیا شێوەی منە بۆ ئەوەی لە تۆ دوورنەکەومەوە. ئەوەی لەم سەر زەمینەدا ونبم تەنیا شێوەی منە بۆ ئەوەی تۆ بدۆزمەوە.

بەڵام بزانە من بۆیە ناتوانم بێم و ڕوو بە ڕوو ئەم شتانەت پێبڵێم، چونکە لە دڵەوە دەترسم. ئەو چەند ساتە کورتەی ئەو ڕۆژە تۆم تێدا بینی دڵنیاییکردم کە بینینی تۆ لەوانەیە بە جۆرێک نەخۆشم بخات و لاوازمبکات لە هەموو خولیاکانم پەشیمان ببمەوە، چاکترە بۆ من تۆ نەبینمەوە. هیوادارم بمبوریت، نامەوێت خۆم بخەمە بەر تاقیکردنەوەی وەهاوە... بۆیە لەگەڵ کۆتایی ئەم نامەیەدا، بەبێدەنگی، بەبێ ماڵاوایی هەموو ئەم شارە و ئەم یادگاریانە بۆ هەتاهەتایە جێدەهێڵم.

هیوادارم لەگەڵ یەکێک لە داخوازەکانی تردا ئاسوودە بژیت... هیوادارم هەر پیاوێک تۆ هەڵیدەبژێرێت ڕێزی ئەو خەیاڵە گەورانەت بگرێت. من ماڵاوایت لێدەکەم.

هەمیشە ئاسوودەبە و هەمیشەش بیرتدەکەم.

عاشقی ئەبەدی خۆت: مەنسور ئەسرین»

نامەکە سەرسامییەکی زۆری لە شاردا دروستکرد. خێزانی ئەسرین و هەوادارانی وەک ئەوەبوو بروسکەیەکی گەورە لێیدابن، مەنسور یەکجار لە ماڵ هاتبووەدەرێ و ئیتر تا هەتاهەتایە ونبوو، تاکە نیشانەیەکی ئەوە بوو دوو کۆپی ئەو نامەیەی بۆ ئیبراهیم ئەسرینی باوکی و ساقی مەحمود جێهێشتبوو... دوای ئەوە نە دەنگێکمان لە مەنسور خۆی بیست و نە هیچ کەس لە هیچ جێگایەکی دونیاوە هەواڵێکی ئەوی بۆ هێناین. تا ئەمڕۆش خوشک و خوشکەزاکانی بە ئومێدی ئەوەن ڕۆژێک لە ڕۆژان مەنسور لە گۆشەیەکی دونیاوە سەرهەڵدا و دەربکەوێتەوە، بەڵام ساڵ دوای ساڵ ئەو ئومێدانە لاوازتر و لاوازتر دەبن و ڕوخساری مەنسوریش زیاتر و زیاتر لە

بیردەچێتەوە، چەند ساڵێک لەمەوبەر خوشکەکانی تکایان لە سەوسەن فیکرەت کرد ئەو وێنانەی مەنسوریان بداتێ کە لە ساڵانی سەفەردا ناردبوونی تا دووبارە بیشۆنەوە، سەوسەن فیکرەت هەموو وێنەکانی بۆ ماوەی هەفتەیەک بە قەرز دانێ و دواتر لە وادەی خۆیدا وەریگرتنەوە. خوشکەکانی مەنسور ئەلبومێکی گەورەیان لەو وێنانە دروستکرد، هەر کەسێک لەدەرەوەی وڵات بهاتبایەتەوە ئەلبومەکەیان دەبرد و یەک یەک وێنەکانیان نیشاندەدا، بەڵکو لە رێگای یەکێک لە وێنەکانەوە بشێت کەسێک مەنسور بناسێتەوە و شوێنی بدۆزێتەوە... بەڵام تا ئەمرۆ، هیچ کەس شوێنی مەنسور نازانێت... مەنسور لەو جیهانە گەورەیەدا ونبوو کە سەوسەن بە دیاری پێشکەشیکرد... ئیدی جارێکی دی هەرگیز نە بینیمان و نە دۆزیمانەوە.

٤٦

ئەو ماڵاواییە کتوپڕەی مەنسور، سەوسەنی غەمگینکرد. ئەو بە ڕاستی حەزی بەبینینەوەی مەنسور دەکرد. بۆنی کوڕەکە گەڵێک نائاسایی و سیحراوی بوو، لەو ساتە کەم و کورت و تێپەڕەدا کە ئەم لە بەردەمیدا وەستا و بۆ یەک دوو هەناسەی خێرا ئەو هەوایەی هەڵمژی کە لە جەستەی مەنسورەوە دەهات، بۆنی دونیایەکی نەبینراو و تازە چوو بەسەریدا، کە لەو بۆنە ئەفسوناویتر و گوڵاوییتر بوو کە لەسەر لەشی کامەران هەڵیمژیبوو. ئەو شەوە تا بەیانی بەو بینین و لەرزین و یەکدی نیگاکردنە مەستبوو، هەشت ساڵ لەوەوبەر کە هێشتا کچێکی منداڵکاریبوو، بەوجۆرە نەیدەتوانی جوانی کوڕەکان ببینێت، بەڵام ئێستا ئاشکرا جوانیانی دەبینی و پێیان سەرسامدەبوو. فیکرەتی باوک کە هەستی بە گۆڕانی کچەکەی دەکرد، بە دەنگە پیرەکەی کە مۆسیقایەکی حەکیمانەی تێدابوو پێدەکەنی و دەیگووت «مرۆڤ تا پیر بێت زیاتر جوانی دەبینێت... ئەوە یەکێکە لە ناعەدالەتییەکانی دونیا».

تا ئەمڕۆ کەسانێک هەن دەپرسن، ئاخۆ گەر مەنسور ئیبراهیم نەڕۆیشتبایە، سەوسەن شووی پێدەکرد؟ لە ڕاستیدا سەوسەن ڕۆژێک لە ڕۆژان وشەیەکی لەو بارەیەوە نەدرکاند، بەڵام هەموو دەزانین دوای نامەکەی مەنسور دوو ڕۆژ غەمێکی گەورە بەر ڕۆحی سەوسەنی گرت، وەک دەڵێن دەیان جار ئەو نامەیەی خوێندۆتەوە، چەندین جار بۆنی پێوەکردوە،

هەندێ جاریش گریاوە.

گومان لەوەدا نییە مەنسور بەجۆرێک لە جۆرەکان باشتر لەوانی دیکە لە مانای خەیاڵ و بیرکردنەوەی کچەکە تێگەیشتوە، ڕەنگە هەر خودی ئەو نامەیە دواجار ئابڕووی مەنسوری لە زۆر شت ڕزگارکردبێت، هەموو ئەوانەی نامەکەیان خوێندەوە گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە کوڕەکە کەسێکی بێوەفا و ترسنۆک نییە، بەڵکو کەسێکە کاراکتەر و بینین و تێگەیشتنی لەو چەند ساڵەدا بەتەواوەتی گۆڕدراوە. بەڵام لە چایخانە و بازاڕەکانی شاردا چەندین شەڕی گەورە ڕوویاندا، لەو جێگایانەدا کە شاعیران و مۆسیقارەکان کۆدەبنەوە پێکدادانی خوێناوی قەوما، کەسانێک لە خەڵکی عەوام و لە هەوادارانی کامەرانی سەلما تانەی ئەوەیان لەو خەڵکانە دا کە پاڵەوانەکەیان گومانی لە پیاوەتی خۆی هەبووە، بۆیە بە نهێنی و بێئاگایی کەس هەڵهاتووە. ئەو نوکتەیەی لە دەمی مەنگوڕی بابەگەورەوە کەوتەوە کە گوایە «لە یەکێک لە دارستانەکاندا پڵنگێک گوونی مەنسوری ئەسرینی خواردوە» بەجۆرێک لە شاردا بڵاویبووەوە، خەڵکی لە هەموو جێگایەک دەیانگێڕایەوە، شەڕە قسە و لێکدانەوەی جیاواز بۆ هەڵوێستی مەنسور گەیشتە ناو ماڵەکان و تا ناو ژووری خەوتنەکانیش ڕۆیشت، لە هەندێ یانەی شەوانە و لە چەند دائیرەیەکی دەوڵەتیدا شەڕەکورسی گەورە قەوما. گومان لەوەدا نەبوو هەموو ئەوانەی مەنسوریان بە پاوکەرە موقەدەسەکە، عاشقە گیانفیداکە، ڕێبوارە مەزنەکەی ڕێگای ئەڤین ناودەنا تووشی نائومێدییەکی بێوێنە بوون، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیانویست مەنسور لێرەبێت و سەوسەن بهێنێت و وەک سەمبولی سەرکەوتنی ئەڤین نمونەیەکی گەورە نیشانبدات، زۆریان دوورکەوتنەوەکەی مەنسوریان بەجۆرێک لە هەڵهاتن دەزانی، هەندێک هۆکەیان دەگێڕایەوە بۆ ترسنۆکی و هەندێکی دیکەش بۆ ئەو فەنتازییە باڵدارەی لە ڕۆحی ڕۆشنبیرانی ئەم شارەدا لە کۆنەوە هێلانەیکردوە. ساقی مەحمود نزیکی سێ مانگ لە ماڵ نەهاتەدەرێ، بەرگەی توانج و

سەیرکردن و پرسیارەکانی خەڵکی نەدەگرت، بەرگەی گلەیی ئەو کەسانەی نەدەگرت کە پارەیەکی زۆریان دابوو تا مەنسور سەفەرەکەی بە جیهاندا تەواوبکات، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا مەنسور بە نامەکەی ڕێزێکی قووڵی لای فیکرەت گوڵدانچی و سەوسەنی کچی بەجێهێشت. باڵندەکانی مەنسوریش لە باڵندە گەشبین و پڕ ئاوازەکان بوون. ئەوان لە باڵندەکانی دی سەوسەنیان خێراتر لە دارستان و ژینگە و بۆنی جەنگەڵەکانی خۆیان نزیکدەکردەوە، ئەو پردە گەورەیەش وایکرد سەوسەن بە خێرایی نائومێدی خۆی لە مەنسور بیریچێتەوە و زوو حەسرەتی ئەو ڕۆژانە لەیادبکات.

هەفتەیەک دوای کۆچی مەنسور، سەوسەن دەبایە دوا بڕیاری خۆی بدات. لە شاردا هەموو چاوەڕوانی وەڵامی ئەومان دەکرد. ماڵی گوڵدانچی ئەو چەند ڕۆژە قیبلەی هاتوچۆیەکی بەردەوام بوو، ژنانی خێزانی گوڵدانچی و پورەکانی بێوچان دەهاتن و دەچوون، عیزەت گوڵدانچی و کوڕەکانی لە جوڵەیەکی بێوێنەدا بوون. بەڵام فیکرەتی باوک سووربوو لەسەر ئەوەی هیچ کەسێک دەست لە بڕیاری سەربەخۆ و ئازادی سەوسەن وەرنەدا. هەموو دەمانزانی خانم ڕۆژانێکی سەخت دەژی، ئەو دەبایە لە نێوان کامەران و خالیددا یەکێکیان هەڵبژێرێت، سەوسەن دەیزانی هەڵبژاردنی هەر یەکێکیان تووڕەییەکی گەورە و گرێیەکی دەرونی قووڵ لەوی دیکەدا دروستدەکات. دوو ڕۆژ بەر لەوەی دوابڕیار بدات، فیکرەت گوڵدانچی نامەیەکی نهێنی لە ئامووننییەکانەوە بۆ هات کە هەڕەشەیەکی ئاشکراو گەورەی تێدابوو، بەپێی نامەکە ئەگەر سەوسەن شوو بە بکوژانی قەلەندەر بکات، بەو کارەی سوکایەتییەکی گەورە و بێحورمەتییەکی بێوێنە بە خوێن و ماندووبوونی ئامووننییەکان دەکات و ئەوان لێی نابوورن. لەو کاتەدا خالید ئاموون زۆربەی ڕۆژەکانی لە ئوتێلەکەی باوەجاندا دەبردەسەر، زۆر بە دەگمەن دەهاتە دەرێ، هەندێ ئێواران بە قاتە ڕەشەکەیەوە لەبەردەم پەنجەرەی ئوتێلەکەدا دەوەستا و سەیری دەرەوەی دەکرد، نیوەڕوان دادەبەزی بۆ

چێشتخانەیەکی نزیک و نانی دەخوارد و دوای سەعاتێک دەگەڕایەوە بۆ ئوتێلەکە، لە کاتی نان خواردندا قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، بە هێمنی نانەکەی دەخوارد و بێئەوەی سەیری کەس بکات یان ئاوڕ لە کەس بداتەوە دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی. ئێمە کە شەوان لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەدا کۆدەبووینەوە، ئارەزوویەکی زۆرمان هەبوو بزانین خالید لە ژوورەوە چی دەکات. بەڵام بەوەدا ئوتێلەکە میوانێکی دیکەی تێدانەبوو سەیرکردن و چاوەچاوەی زۆر ئاسایی و ئاسان نەبوو، ئەو چەندجارە کەمەی خزمەتچییەکان بۆ جێبەجێکردنی شتێک چوونە ژووری باسیان لەوە دەکرد کە خالید ئامۆون بەردەوام جانتاکەی پێچاوەتەوە و بە قاتەوە دانیشتووە و هەندێ جاریش بۆ ماوەی نیوسەعات لە ژوورەکەدا دێت و دەچێت و دواتر دەگەڕێتەوە سەر کورسییەکە و بێئەوەی هیچ بکات دادەنیشێت، لە پیاوێک دەچوو چاوەڕوانی ئەوەبێت فەرمانی سەفەرێک یان بلیتی شەمەندەفەرێکی بۆ بێت و بکەوێتەڕێ. خاوەنی ئوتێلەکە چەندجارێک پێشنیاری بۆ کرد تەلەفزیۆنێک یاخود ڕادیۆیەکی بداتێ تا لە ساتەکانی بێئیشیدا خۆی بە شتێکەوە سەرقاڵبکات، بەڵام هەموو جارێک بەساردی سوپاسیدەکرد و دەیگووت ئارەزووی بینینی هیچ و بیستنی هیچ شتێکی نییە. لە هەموو ئەو ماوەیەدا خالید تەنیا سێ جار چووە دەرەوە و کەمێک بە شەقامەکاندا پیاسەیکرد، جارێک بۆ ئەوە بوو هەندێ گۆرەویی تازە و دەرمانێکی دان بکڕێت، جاری دووەمیش بۆ ئەوە بوو لە «فۆتۆگرافی چیا» وێنەی باڵندە کوژراوەکانی خۆی هەڵگرێتەوە، جاری سێهەمیش بەسەردانێکی کورت گەڕایەوە بەردەم دوکانە کۆنەکەی خۆی کە هەر وەک جاران شوێنی فرۆشتنی کەلوپەلی ژنانەبوو. خالید ئەو ڕۆژە بۆ ئێستێکی کورت لە بەردەم دوکانەدا وەستا و بێئەوەی بچێتە ژوورێ بە پەلە گەڕایەوە بۆ ئوتێلەکە، کەسمان هیچی تایبەتیمان لەسەر ڕوخساری نەخوێندەوە، کەسمان تێنەگەیشتین هەستی بەچی کردوە، لەوانەیە هەستی

بە هیچ نەکردبێت. چەند ساڵێک دواتر کە خۆی باسی ئەو ڕۆژانەی بۆ گەنجێکی ئاموونی گێڕایەوە، گووتی «جگە لە تێپەڕینی کات... جگە لە شوێن پێی پۆستاڵی زەمان لەسەر ژیانم هەستم بە هیچی تر نەکرد».

هەموو دڵنیابووین دەقیقە و ساتەکان لە ژیانی خالیددا بە سەختی و خاوی دەڕۆن... بەجۆرێک خاو کە مرۆڤ لە نێوان چرکەیەک و چرکەیەکدا کاتێکی تەواوی هەیە بیر لە زۆر شت بکاتەوە، هەموو کە بەبەردەم ئوتێلەکەی باوەجاندا دەڕۆیشتین و سەرمان بۆ ژوورەکەی ئەو بەرزدەکردەوە، لەو دیو پەنجەرەکانەوە هەستمان بە سستی و قورسی جوڵەی کات دەکرد. لەو ماوەیەدا هیچ کەس لە خەڵکی شار سەردانی خالید ئاموونی نەکرد، هەتا ئەوانەش کە ئارەزووی ئەوەیان هەبوو سەردانییکەن خۆیان لە سڵاو و دیداری پاراست. لەو چەند هەفتەیەدا شەڕ شێتانە لە زۆربەی هەرێمەکاندا ئاگری سەندبوو، ڕۆژانە کوژراو و بریندار دەهاتنەوە بۆ شار، هەواڵ زۆر بڵاوبوو کە ئاموونییەکان بە زیاد لە پێنج سەد چەکدار لە شەڕەکاندا بەشداران و ئەو هێزانەی لەتیف ئاموون سەرکردایەتیان دەکات، ڕێگرێکی گەورەن لە بەردەم ئەوەی یەکێتییەکان لە هەندێ قۆڵەوە پێشڕەوییکەن. بوونی خالید ئاموون بە تەنیا لەو شارەدا هەستێکی قووڵی ناڕەحەتی خولقاندبوو، هەتا هەندێکمان کەمێک لەسەر سەلامەتی و ژیانی دەترساین، هەستماندەکرد خۆ قایمکردنی لە ئوتێلەکە و دەرنەکەوتنی لەسەر شەقامەکان دەگەڕێتەوە بۆ ترسێکی تایبەتی کە پەیوەندی بە شەڕ و کوشتنی باڵندەکان و سیاسەتی بنەماڵەکەیەوە هەیە. بەڵام کەسمان تێنەگەیشتین کە کێ باڵندەکانی کوشتووە، لە هەموو لایەکەوە بێدەنگییەکی قووڵ هەبوو، وەک زۆربەی ئەو تاوانانەی بکەرەکانیان دیارنییە، خەڵکی کوشتنی باڵندەکانیان لەبیرکرد و دوای نەکەوتن. لەو چەند ساڵەی دواتردا هەندێک شت ڕوویاندا کە زۆر سەرنجی ئەوانەی ڕاکێشا کە بەدوای مێژووی ئەم ڕووداوانەوە بوون. لە دوو بۆنەی جیاوازدا دوو پیاوی ئاموونی لە دوو شاری جیاواز و لە دوو

ڕێکەوتی جیاوازدا، شەو بەدەم خەوەوە هەڵدەستن و بێئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت، بێئەوەی دواتر هیچیان لە بیربێت تەقە لە ژنەکانی خۆیان دەکەن و دەیانکوژن. بڵاوبوونەوەی ئەو دوو هەواڵە دەشیا زۆر گرنگ نەبێت، بەڵام ئەوەی گومانەکەی زۆر گەورەکرد ئەوەبوو کە هەمان چیرۆک دەربارەی خالید ئاموونیش دەماو دەمی دەکرد. چەند ساڵێک دواتر کاتێک خالید ئاموون بوو بە فەرمانبەرێکی زۆر گەورە لە یەکێک لە وەزارەتەکانی حکومەتی یەکگرتووی هەولێردا و لە یەکێک لە هەرە گەڕەکە خۆشەکاندا کۆشکێکی سێ قاتی دروستکرد، پاسەوانەکانی دەیانگێڕایەوە کە شەوان چەند جارێک بێئاگا و نوقم لە خەودا هەستاوە و تاپڕێکی کۆنی هەڵگرتووە و بە نوستویی ویستویێتی بچێتە سەرجادەکە و لەوێدا بیتەقێنێت، بەڵام ئەوان هەمیشە لە کاتی خۆیدا فریاکەوتوون و بەئاگایان هێناوە و گێڕاندویانەتەوە بۆ سەرجێ خەوی خۆی. ئاخۆ ئەو قسانە هیچ شتێکی دیاریکراو و کۆتایی و بنەبڕمان لەسەر ڕووداوەکانی ئەو دەمە پێدەڵێن، نازانین... پێدەچێت ئێستاش دوای ئەو هەموو ساڵە مێشتا تەمێکی گەورە و چڕ لەسەر شەوی کوشتنی باڵندەکان نیشتبێت و ئاسان نەڕەوێتەوە.

دوای هەژدە ڕۆژ لەو ئوتێلەدا، ئێوارەی یەک شەممەیەکی سارد، کەسێک بە هێمنی لە دەرگای ژوورەکەی خالید ئاموونی دا، خالید لە ناکاو ڕاچڵەکی و دڵی بە خێرایی کەوتە لێدان، شێوەی لێدانی دەرگاکە وەک لێدانی خزمەتچییەکان نەبوو، ئەمجارە دەستێکی هێمن و ئارامتر بەڵام دڵنیا و بێڕەحم دەرگاکەی کوتا. خالید لە مێژبوو چاوەڕوانی ئەم لێدانەی دەکرد، پتر لە دوو هەفتەبوو بیری لە هەموو شێوە دەنگەکانی ئەو جۆرە کوتانە کردبووەوە، دەیزانی دواجار لە یەکێک لەم شەو و ڕۆژە زۆر درێژانەدا دەستێک لە دەرگاکە دەدات و هەواڵێکی بۆ دەهێنێت کە کۆتایی بە سەفەرێکی دوورودرێژی چەند ساڵە دەهێنێت... هەندێ جار لە خەونەکانیدا دەیبینی سەوسەن خۆی هەواڵەکەی بۆ دەهێنێت، خەونەکانی زۆربەیان

تێکەڵاو و ئاڵـۆز و ترسـناک بـوون، کـە هەڵدەسـتا ماوەیەکی دەویسـت تـا دەگەڕایـەوە دۆخـی جارانـی خـۆی... بـەڵام تـرس و ڕاچڵەکانـی پێشـووتری هیچیـان وەک ترسـی ئـەم سـاتەی قـووڵ نەبـوون کاتێـک دڵـی بـە دەنگـی ئـەو دەستە نەناسـراوەی لـە دەرگاکەیـدا ڕاچڵەکـی. ترسـی دوورودرێـژی لـە مـردن لـە جەنگەڵەکانـدا بـە ئەنـدازەی ئـەم ترسـەی نەبوو، ئـەو سـاڵەی لـە کۆتیڤـار تووشـی پەتـای جەنگـەڵ بـوو، ئـەو کاتـەی پڵنگێکی گـەورە لـە نزیک حەیدەرئابـاد پەلاماریـدا، هێنـد نەترسـابوو... تـا پێشـتر لـە هەمـوو ژیانیـدا بـە ئەنـدازەی ئـەو سـاتە دڵـی نەلـەرزی بـوو. کـە دەرگاکـەی کردەوە دەسـتی دەلـەرزی، ترسـێکی گـەورە لـە چاویـدا بـوو کـە بەدەگمـەن دەپەڕییـە سـەر ڕوخسـاری پیاوێکـی ئاموونـی. لـە پێـش دەرگاکـەدا نەبیلی بینـی، یەکێـک لـە پورزاکانـی سەوسـەن کـە بـە قەڵافەتـی پیاوێکـی گرنگـەوە لـە بەردەرگاکـەدا وەسـتابوو، قاتێکـی شـەکەری نـوێ و جووتێـک پێـڵاوی بریقـەداری قاوەیـی لـە پێکردبـوو. نەبیـل بـە هێمنـی سـڵاوی لێکـرد و پێیگـووت کـە نامەیەکـی تایبەتـی لـە سەوسـەن خانـی پورزایـەوە پێیـە. خالیـد بەدەنگێکـی کەمێـک لـەرزۆک فەرمـووی لـە کوڕەکـە کـرد بێتـە ژوورێ و کەمێـک پشـوویدات، بـەڵام نەبیـل پێیباشـبوو نامەکـە بداتـە دەسـتی و بـڕوات، کـورت و بێقسـە نامەیەکـی لـە گیرفانـی دەرهێنـا و دایـە دەسـت خالیـد ئامـوون و بـە هەمـان ڕێـزی زۆر و دەنگـی پـڕ حورمەتـەوە خوداحافیزیکـرد و بـە خەندەیەکـی هێمنـەوە لـە پلـەی ئوتێلەکـە چـووە خـوارێ.

نامەکـەی سەوسـەن کـورت بـوو، بـەڵام بـە خەتێکـی قەشـەنگ و ڕوون نوسـرابوو. خالیـد کـە کردییـەوە دڵـی زۆر بـە خێرایـی لێیدەدا، بـە پەشـۆکان و نائارامییـەوە لـە سـەر تەنیـا کورسـی ژوورەکـە دانیشـت و دەسـتیکرد بـە خوێندنـەوە:

« زۆر بەڕێز خالید ئاموون

نزیکـی هەشـت سـاڵ لەمەوبـەر بـەر لـەوەی ئێـوە بـڕۆن بـۆ سـەفەر، بـە

هەمووتانم ڕاگەیاند کە دوای ساڵانی دووروودرێژی سەفەر من دەتوانم تەنیا شوو بە یەکێکتان بکەم، پێمگووتن کە ئێوە دوای چەندین ساڵ دەگەڕێنەوە و دەشێت دوای ئەوە من بۆ ئێوە نەبم. دواجار کە من و تۆ چاومان بەیەک کەوت و قسەمانکرد، ڕاستگۆیی تۆ سەرسامیکردم، خۆشحاڵ بووم کە هەستەکانی خۆت و ڕستەکانی خۆت بێ درۆ بە من گووت. ئەوە گەورەییەکی بێوێنەبوو لە تۆدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستمکرد ساڵانی زۆری سەفەر من و تۆی لە یەک نزیک نەکردۆتەوە. هەستدەکەم من و تۆ پێکەوە بەختەوەر نابین. نە تۆ لەگەڵ مندا بەختەوەر دەبیت و نە من لەگەڵ تۆدا... من تامردن ڕێزێکی گەورەم بۆ ماندووبوون و ئازایەتی تۆ هەیە. گومانم لەوە نییە کە تۆ پیاوێکی خۆبەختکەریت... کەسێکی ئازایانە بەسەر زەویدا گەڕایت، ئازایانە منت خۆشویست، دڵنیاشم ئازایانە ئەم بڕیارە قەبووڵدەکەیت کە من لە نێوان هەر سێکتاندا یەکێکی تر هەڵبژێرم و لەگەڵ کەسێکی تردا بژیم. دەزانم بەم بڕیارە زۆر ئازارت دەدەم، زۆر لەوە غەمگینم، بەڵام غەمگینی بەشێکی گەورەی ئەم چیرۆکەی ئێمەیە، لە یەکەم ڕۆژەوە غەمگینی لەگەڵماندا بووە، لەگەڵ من و تۆ و هەموو ئەوانی تردا، من زۆرم پێ ناخۆشە کە ناتوانم بەختەوەرتبکەم. هیوادارم ژیان لە داهاتوودا زۆر کامەرانی گەورە و سەرکەوتنی گەورەت پێببەخشێت. لە دڵەوە هیوای خۆشبەختیت بۆ دەخوازم، حەزدەکەم تۆش لە دڵەوە هیوای خۆشبەختیم بۆ بخوازیت. هیوادارم تێمبگەیت و ڕقت لێم نەبێت، دڵنیابە باڵندەکانت وەک گەورەترین یادگار تا کۆتایی لەگەڵمدا دەژین. گەر بە هاوڕێیەکی خۆشت قەبووڵمبکەیت کامەران دەبم.... سەوسەن فیکرەت».

خالید ئاموون چەند جارێک نامەکەی خوێندەوە، وەک باوەڕنەکات هەموو جارێک کە دەگەیشتە کۆتایی دەگەڕایەوە سەرەوە و دووبارە دەیخوێندەوە... سێ بارە دەیخوێندەوە... چواربارە دەیخوێندەوە. نەیدەزانی لە کوێدا دەبێت بوەستێت و چیتر نەیخوێنێتەوە، لە جێگایەکدا هەستیکرد دەگری، زۆر بە

دەنگی بەرز دەگری، بە جۆرێک دەنگی گریانەکەی لە ڕاڕەوی ئوتێلەکەدا دەبیسترا، خزمەتچییەکان گوێیان لێبوو لەگەڵ گریانەکەدا دەیگووت «بۆ... بۆ سەوسەن... بۆ. ئەو کوڕەی سەلما چی لە من باشترە... بۆ سەوسەن... بۆ بڕیار بۆ پیاوکوژ و چەقۆکێشەکان دەدەیت... بۆ؟؟». خالید زیاد لە نیوسەعات گریا، ئینجا هەستا و چووە بەر دەستشۆرەکە و دەموچاوی شت، خاولییەکەی خۆی و دەرمانی دانەکە و فڵچەکەی پێچایەوە و خستییە ناو جانتاکەی خۆی و دووبارە جانتاکەی داخستەوە. لەسەر قەراغی پەنجەرەکە نامەکەی هەڵگرت و قەدیکرد و خستییە گیرفانی چاکەتەکەی و جانتاکەی هەڵگرت و لە پلەکەکان هاتەخوارێ. کاتێک خاوەن ئوتێلەکە بەوجۆرە تێکشکاو و غەمگین بینی پێیگووت «خالید بەگ، ئێوارەیەکی درەنگە، بەڕاستی ئێوارەیەکی درەنگە، ئێستا زۆر زەحمەتە لە نەقلیاتەوە ئوتومبیلت دەستبکەوێت، تکایە ئەمشەویش لێرە بمێنەوە... تۆزێکی تر دەبێت بە شەو و ڕێگاش ئەمین نییە، ڕێگای هەولێر شەڕێکی گەورەی لەسەرە و باش نییە بە شەوێکی وا بکەویتە ڕێ... بەقسەمبکە و مەڕۆ».
خالید بە دەنگێکی بریندار و لەرزۆکەوە گووتی «ناتوانم دەقیقەیەکی دی لەم شارەدا بمێنمەوە... بمبورە، ناتوانم دەقیقەیەکی تر تیا بژیم». دەنگی بەجۆرێک بریندار و پڕ لە خوێن بوو، دڵی مرۆڤی هەلاهەلادەکرد. خاوەن ئوتێلەکە خۆی تا سەر شۆستەکە جانتاکەی بۆ هەڵگرت و تاکسییەکی بۆ گرت، لەبەردەم تاکسییەکەدا باوەشی پیاکرد و گووتی «کوڕم بە ئومێدی ئەوەم سەرکەوتوو بیت... دان بە خۆتدا بگرە، مەهێڵە خەفەت زەفەرت پێبهێنێت». کە تاکسییەکە لە بەردەم ئوتێلی باوەجاندا جوڵا و لەناو ئوتومبیلەکانی تردا ڕێگای خۆی کردەوە، کەسمان نەماندەزانی تا یازدە ساڵی تر خالید ئامرون ناگەڕێتەوە بۆ ئەم شارە و دووبارە چاوی بەم شەقامانە ناکەوێتەوە.

## ٤٧

هەواڵی نامەکەی سەوسەن وەک با بیهێنێت و بروسکە بیبات بە شاردا بڵاوبووەوە. یەکەمین پەرچەکرداری گەورەی نامەکە لە چاپخانەی پەپولەی ئازادەوە بیسترا کە تێیدا دەنگی گۆرانی بەرزکرایەوە و هەوای سەفا و شاییکردن باڵی بەسەر هەمووانـدا کێشا. بەڵام دەنگوباسەکە وەکو هەموو هەواڵێکی تری ناو ئەم شارە سەرەتا شوێنی دوودڵی و گومان بوو، هەتا کاتێک لە ئوتێلی باوەجانیشەوە هەواڵی ڕۆیشتنی خالید ئامووزمان بیست زۆربەمان هەر باوەڕمان نەکرد، بەڵام کە بیستمان پوورزایەکی دیکەی سەوسەن «هوشیاری پورە خەندە» بە داوەتێکی تایبەتی کامەرانی سەلمای بانگکردوە تا سبەی بچێت بۆ ماڵی فیکرەت گوڵدانچی و لەوێ نانی نیوەڕۆ بخوات، ئیدی شتەکان تا ئەندازەیەک ڕوون دەیاننواند. ئەو ئێوارەیە بەپێچەوانەی چاوەڕوانی هەموانەوە هیچ یەک لە مەنگوڕ و کامەران لە چاپخانەکەدا دەرنەکەوتن، پێدەچوو تا هەواڵێکی زۆر گرنگ و گەورەیان پێ نەبێت نەیانەوێت خۆیان ئاشکرابکەن. ئەو شەوە هەموومان بە دوودڵییەوە خەوتین، پێمان وابوو گەرچی چیرۆکەکە سەربوردی خۆشەویستییەکی گەورەیە و بە چەند سەفەرێکی مەزن دەستپێکردوە و ڕۆحێکی گەردونی دەبەخشێتە مێژووی خۆشەویستی لە شارەکەماندا، بەڵام لە زۆر جێگادا برگەی وەها خوێناوی تێکەوتبوو، وایدەکرد دڵمان هەردەم بلەرزێت. بەڵام ئێستا دوای ونبوونی

مەنسور ئەسرین و مالآوایی خالید جگە لە کامەرانی سەلما و باڵندەکانی هیچی دیکە نەمابوون... هیچی دیکە. بەلام هەموو لەوە دەترساین کچەکەی گوڵدانچی هەوایەکی ڕەش بنیشێتە سەری و بلێت من شوو بە کامەرانی سەلماش ناکەم، دیارە ئەوە پێچەوانەی ئەو ڕێکەوتنە گەورەیە بوو کە سەوسەن و داواکارەکان مۆریانکرد، بەلام لەو سەردەمی شەڕەدا شتێک بە ناوی پەیمانەوە نەمابوو، لەبەرئەوە ترسەکانمان هۆ و بەهانەی خۆی هەبوو... بەلام تا پێدەچێت خودای ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ، یەکێک لە بنکە سەرەکییەکانی خۆی لەم شارەدا دامەزراندبێت، خەڵکی ئەم شارە هەتا لە کارەساتی گەورەشدا دەرفەتێک دەدۆزنەوە هەڵبەڕن، لە دوای شین بێت یاخود لە خۆشیدا، لە نیشتیمان بن یاخود لە غەریبی، هەمیشە جێگایەک دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی دەستبگرن و هەڵبەڕن... وەک ئەوەی ئەو جوڵە نەرمە، ئەو دەستگرتنە بازنەییە، ئەو پێکەوە نوسانە توندەی لە هیچ جۆرە سەمایەکی تری دونیادا نییە، تاکە شتێک بێت مرۆڤی ئێمە لە ترس و تەنهایی قووڵی خۆی ڕزگاریکات و توند بەوانی دیکەوە گرێبیدات. وەک ئەوەی ئەو پێکەوە قفڵبوونەی سەماکەرەکان تەنیا تەعبیرێک بێت لە ڕۆحێکی دەستەجەمعی کە بە کاریگەری شەڕ و هەلاهەلابوونی سیاسی هێدی هێدی بەرەو ئاوابوونێکی هەمیشەیی دەڕوات. ئەو ڕۆژەی کە کامەرانی سەلما چوو بۆ ماڵی گوڵدانچی، زۆربەمان لە بەیانییەوە بە جلی کوردییەوە هاتینەدەرێ، جلەکانمان جلی ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ بوون، ئەو جلانەی چەند ساڵ بوو بەهۆی شەڕ و شۆڕی بەردەوامەوە، بەهۆی کەمبوونەوەی شووکردن و ژنهێنانەوە، بەهۆی گرانبوونی تێچوونی ئاهەنگەکانەوە زۆر نەماندەهێنانە دەرەوە، بەلام گەرچی شار چواردەوری بە نەهامەتی و شەڕ و برسێتی گیرابوو، هەستماندەکرد بەڕاستی پێویستیمان بە ئاهەنگێکی ڕاستەقینەیە تا تواناکانی شادیمان تیا دەرکەوێتەوە و بیسەلمێنینەوە کە زیندووین و

هێشتا توانای کامەرانیمان تێدا ماوە. هەموو وەختێک لەم شارەدا کە کارەساتی گەورە و ترسی گەورە دامانده‌پۆشێت، بەهانەیەک دەدۆزینەوە پێکەوە دەستبگرین و هەڵپەڕین، ئەو هەڵپەڕکێ شێتانەیەی ناو کارەساتەکان، ئەو قاچ کوتانە هیستیری و لێکترنجانە توندە لە نێوان وێستگەکانی غەمدا تەنیا شتێکە بە زیندوویێتی ڕاماندەگرێت. ئەو ڕۆژەش کە کامەرانی سەلما چوو بۆ بینینی خانمی باڵندەکان، بێئەوەی بزانین چی لە گۆڕێیە و چی ڕوودەدات هەموو خۆمان بۆ ئاهەنگێکی درندە و بێلەمپەر ئامادەکرد.

بەپێچەوانەی هەواڵەکەی دوێنێوە، کامەران بۆ خواردنی نیوەڕۆ لە ماڵی گوڵدانچی داوەت نەکرابوو، ئەوە بەشێک بوو لەو درۆ بچوکانەی خەڵکی شار دەیانخستە سەر هەموو هەواڵێکی گەورە و بچوک، بەشێک بوو لەو کولتورە دووروودرێژەی درۆکردن کە نەخۆشی گەورەی خەڵکی ئەم شارەبوو. کامەران دەبایە سەعات سێ لە ماڵی فیکرەت گوڵدانچی ئامادەبێت تا هەواڵێکی گرنگ وەربگرێت. کوڕەکەی سەلما بۆ ئەو نیوەڕۆیە هەر هەمان ئەو جلە کوردیانەی کردە بەر کە هەشت ساڵ لەمەوبەر بۆ داوەتە دەستەجەمعییەکەی سەوسەن لەگەڵ داواکارانی تردا کردبوویە بەری، ئەو بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵە ئەو جلەی بۆ ئەم ڕۆژە بەقەدکراوی هەڵگرتبوو. کە لە دەرگای ماڵی گوڵدانچی چوو بەوبیودا سەوسەن وایدەزانی ئەو هەموو ساڵەی نێوان ئەم دوو بۆنەیە زۆر خێرا تێپەڕیوون، ئێستا بەزەحمەت بتوانێت وێنەی ئەوسای کامەران لە وێنەی ئێستای جیابکاتەوە... هەموو شتێک گرێدراو و یەک ڕێگا و ڕێک دەهاتە بەرچاوی، دەبایە هەموو شتەکان بەوجۆرە ڕوویدەن کە ڕوویاندا، بینینەوەی کامەران لەو جلانەدا نیشانەی ئەوەبوو کە ڕیتمێک و یەکێتییەک و هارمۆنییەکی گونجاو لە نێوان هەموو ئەو سەردەمە جیاوازانەدا هەیە کە ئەو دوو ساتە دوورە لە یەک نزیکدەکەنەوە. نزیکی

نێوان ئەو دوو ساتە نزیکی کات و زەمان نەبوو، بەڵکو نزیکی وێنەکان و ماناکان بوو، کە زیاتر لەنزیکی شوێن و کات مرۆڤ سەرسامدەکەن. لێکچوونی ئەو دوو ساتە سەوسەنی راچڵەکاند، وەکو ئەوەبوو دونیا یەک سوڕی گەورەی خواردبێت و چووبێتەوە سەر هەمان خاڵی پێشوو. ئاخۆ دەکرا لە یەکەمجارەوە، بێتەوەی بهێڵێت ئەو هەموو کاتە تێبپەڕێت، کامەران هەڵبژێرێت؟... سەوسەن لە دڵی خۆیدا گوتی «نا نەدەکرا، دەبووایە زەمان و ئێمە هەموومان بەو هەموو پێچاوپێچەدا بڕۆین. تا بگەینەوە سەر ئەمڕۆ». کامەرانی سەلما زۆر لە سەوسەن زیاتر گۆڕانەکانی دەبینی، باشتر تێدەگەیشت کات چی وێرانکردوە و چی لە جێگای وێرانییەکان دروستکردوە، ماڵی گوڵدانچی بەچەشنێک گۆڕدرابوو، کامەران هەر پێی بخستایەتە بەر دەرگای ئەو ماڵە موچرکێکی سارد بە لەشیدا تێدەپەڕی، ئەو پیربوونی فیکرەت و پیربوونی دیوارەکان و کاڵبوونەوەی ڕەنگەکان و لاوازی درەختەکانی حەوشەکەی ڕوونتر لەوانی دی دەبینی. ئەو ڕۆژە کە چووە قاتی سەرەوە سەری لەو هەموو باڵندەیە سوڕما کە پێکەوە دەیانخوێند، دەیان قەفەزی جۆراوجۆر بەجۆرێکی ئەندازەیی، وەک چۆن دۆڵابی کتێبەکان و ڕەفی کتێبەکان لە کتێبخانە کۆنەکەدا ڕیزکرابوون، بە هەمان شێوە ستوون دوای ستوون و ڕیز دوای ڕیز، لەسەر یەک و لە پاڵ یەکدا ڕیزکرابوون. کامەران سەیری لێهات کە بینی سەوسەن لەسەر هەموو قەفەزێک لە قەفەزەکان ناوی لاتینی باڵندەکانی نوسیوە، ئەو ناوە قورس و درێژانەی بە هیچ کەس لە بەر نەدەکران. گەرچی ژوورەکە بۆن باڵندەیەکی زۆری لێدەهات، بەڵام بۆنەکە وەک جاران لە بەر کەپووی ئەو ناخۆش و تیژ نەبوو، ئاشکرا بۆ خۆشکرنی بۆنی ژوورەکە، سەوسەن گیراوەیەکی تایبەتی بەکاردەهێنا کە پێدەچوو لای یەکێک لە عەتارە خۆماڵییەکان کڕیبێتی. دیمەنی باڵندەکان و شێوەی ڕێکخستنیان بەپێی گەورە و بچوکی و

ڕەنگ لە بەر دڵی کامەران زۆر قەشەنگ بوو. سەوسەن وەک جاران لەوسەری ژوورە گەورەکەدا چاوەڕوانیدەکرد. یەکەمجاربوو ببینێت سەوسەن مەکیاجێکی ڕاستەقینەبکات، جلێکی شینی کاڵی درێژی لە بەردابوو کە سەر شانەکانی کەمێک ڕووتبوون، یەکەمجاری بوو قۆڵە باریکەکانی ببینێت، یەکەمجاربوو بەشێکی زیاتر لە پێستی ببینێت کە تابڵێی ساف و سپی دەینواند. سەوسەن لەو ڕۆژەشدا بێئەوەی شادومانییەکی ڕاستەقینە لەسەر ڕوخساری بێت، پێشوازی لە کامەران کرد و چایەکی پڕ گەڵای بۆنداری بۆ تێکرد و بەرامبەری دانیشت و گوتی « کامەران، وابزانم دەزانیت بۆچی ناردوومە بە دواتدا... دەبێت بزانیت، دڵنیام لەو مەسەلانەدا پیاوانیش غەریزەیەکی باشیان هەیە، بەتایبەت پیاوێک ئەو هەموو ساڵە توانای خۆی لە ڕاوی تەیروتیوری دونیادا بەکارهێنابێت». کامەران پێکەنی و گوتی «سەوسەن خان، من پیاوێکی سادەم، تۆ ژنێکی سادە نیت، ژنێکی ئاسان نیت. لەبەرئەوە ناتوانم هەڵیبهێنم منت بۆ بانگکردوە». سەوسەن کەمێک لە شێوە دانیشتنی خۆی گۆڕی و بە هێمنی گوتی « نا وانییە، من ژنێکی قورس نیم، بۆیە بانگمکردیت، بۆ ئەوەی پێتبڵێم دەمەوێت شووت پێبکەم...». کامەران هەستا و گوتی «سەوسەن خان... بەمە دڵم خۆشدەکەیت و دەمکەیت بە خۆشبەختترین کەسی ئەم دونیایە». سەوسەن گوتی «کامەران دانیشە تکایە دانیشە. زۆر قسەم هەیە بیکەم». کامەران دانیشت و بۆ ئێستێک جگە لە دەنگی باڵندەکان و لێدانی دڵی خۆی گوێی لە هیچی دیکە نەبوو. سەوسەن گوتی « کامەران خۆت دەزانیت کە مەنسور ئیبراهیم بە ویستی خۆی دەستبەرداری داخوزییەکەی خۆی بوو و بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ سەفەر، خۆی نایەوێت من بهێنێت، پێدەچێ ئەوە بۆ مەنسور باشتر بێت. لێتناشارمەوە من ئێستاش غەمگین و تووڕەم لەوەی تۆ شەرت لەگەڵ کوڕێکی وادا کرد، بەڵام زۆرم پێخۆشە کە هەستدەکەم پەشیمانیت. ئیتر

ئەو چیتر لە نێوان من و تۆدا نابێتە ڕێگر... تێدەگەیت، من دەمزانی ڕۆژێک دێت یەکێکتان دەڕۆن و شوێن بۆ ئەوی ترتان چۆڵدەکەن. من گووتم هیچ نەبێت یەکێکتان کە دونیا دەبینن، کە ژنە جوانەکانی سەر زەوی دەبینن، کە تامی جۆراوجۆر دەکەن، ئیتر وەک جاران منتان خۆش ناوێت. بەڵام نا، من بەختەوەرم، من زۆر بەختەوەرم، هەر سێکتان سێ عاشقی ڕاستەقینەبوون، سێ عاشق لەو چەشنەی هەموو ژنێکی دونیا خەونی پێوەدەبینێت... بەڵام هەر یەکە و بەجۆری خۆی».

سەوسەن کەمێک لە دامێنی کراسە شینەکەی چاککرد و بە باڵندەکاندا ڕوانی و هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی « مەنسور ئەسرین وای بە باشتر دەزانێت بە جیهاندا وێڵ بێت و بگەڕێت، نەوەک لەگەڵ مندا لەم شارە بچوک و ناخۆشەدا بژی و بمێنێتەوە. من ئومێدی ئەوەم هەبوو هەر سێکتان پەشیمان ببنەوە، دیارە گەر هەر سێکتان بڕۆشتبانایە و نەگەڕابانایەتەوە من وەک هەر ژنێکی تر بریندارەبووم... بە ڕاستی کە بریندارەبووم. تا ماوەیەکی زۆر وام هەستدەکرد من لە ژنی تر ناچم و ئەوجۆرە شتانە بریندارم ناکەن، بەڵام نا... هەستدەکەم منیش وەک هەر ژنێکی ترم... وەک هەر ژنێکی تر. بەڵام گەر هەر سێکتان پەشیمان ببوونایەتەوە، هەر سێکتان بڕۆشتبانایە و نەگەڕابانایەتەوە، من ڕقم لێتان نەدەبوو، بە پێچەوانەوە هەستمدەکرد هیوام بۆ ئێوە گەیشتۆتە جێگای خۆی. من لە سەرەتاوە گووتم بڕۆن و دونیا ببینن ئەوسا بە ڕاستی تێدەگەن ئایا منتان دەوێت یان نا... وانییە... چ مانایەکی هەیە مرۆڤ ژنێک هەڵبژێرێت لە کاتێکدا هێشتا هیچ ژنێکی تری ئەم دونیایەی نەبینیوە... کامەران جاران خەڵک تەنیا گوندەکانی خۆیان هەبوو بۆ ئەوەی هاوسەری تیا هەڵبژێرن، بەڵام ئێستا هەموو دونیایان هەیە... هەموو جیهانیان لە بەردەستدایە. من سوپاسدەکەم کە لەو هەموو وڵات و شارەی دونیادا منت لە بیرنەکرد. ئەوە شتێکی گەورە بوو لە

تۆوە... شتێک بوو دڵنیاییەکی گەورەی بە من بەخشی... ئەوەی پێدام کە دەتوانم بەرابەری ژنەکانی تری دونیا بوەستمەوە... وانییە؟ ئەوە زۆر نییە؟ دیارە ئەوە بۆ ژنێکی نەخۆشی وەک من زۆر زۆرە. هیچ ژنێک نییە لەم سەر زەوییە بە ڕاستی بۆ پیاوێکی لەو چەشنە نەگەڕێت، بەڵام هەر تۆ وا نەبوویت، خالید ئاموونیش وەک تۆ منی لە بیر نەکرد، بگرە ئەو شێتانەتر منی خۆشویست. دواجار کە قسەم لەگەڵدا کرد هەستمکرد ئەو لە خۆشەویستی خۆیدا بۆ من دەتوانێت شتی زۆر خراپ بکات. ئەو منی گەرم خۆشدەوێت و بەرامبەر هەموو دونیاش ساردە... تێدەگەیت کامەرانی سەلما دەڵێم چی. دواجار بیرتە کە بۆنم بە دەستی تۆوە کرد، بۆنم بە لەشتەوە کرد، بۆنم بەسەرتەوە کرد. بەوجۆرە خالید ئاموونیشم بۆنکرد، خالید بۆنی دونیای لێ نەدەهات... بە پێچەوانەی تۆوە کە بۆنی دارستان و درەخت و ئاو و جەنگەڵەکانت لێدێت. ئەو بۆنی هیچی لێ نایەت، ئەو تەنیا بۆنی مردنی لێدێت... حەزدەکەم بزانیت من شەوێک زۆر زۆر لە نزیکەوە مردنم بۆنکرد، گەر ئەو شەوە نەبووایە نەمدەزانی بۆنی خالید لە چی دەچێت. بەو بۆنە ساردەدا هەستمکرد خالید وەک ئێمە وایە، بۆنی ئێمە دانیشتوانی ئەم شارە و بۆنی مردووەکان لە یەک دەچن، ئێستا تەنیا تۆیت کە بۆنێکی ترت هەیە. ئاە خالید ئاموون من نەبێت هیچ جێگایەک و هیچ کەسێکی دونیای خۆشناوێت، بۆیە گومانم لێکرد... کامەران ئێستا دەستتم بەرێ، دەستتم بەرێ جارێکی تر بۆنیبکەم».

کامەران هەر وەک جاری یەکەم دەستی خۆی دایە، ئەو بۆنیکرد و بە مەستی گووتی « ئەم بۆنە تۆی ڕزگارکرد... من ئێوەم نارد ئەم شارە بەجێبهێڵن، بە لەش و بە دڵ لەم شارە دووربکەونەوە... بە ڕۆح و خوێن بە دونیادا بگەڕێن... بە ڕۆح و خوێن. ئاە کامەران دەمویست کە هاتنەوە ئەم بۆنە لەسەر دەستتان بێت... زۆر خۆشحاڵم بۆ تۆ، زۆر دڵم

بە تۆ خۆشە... کامەران تۆ چەند گۆڕایت، چەند گۆڕایت، دونیا تۆی زۆر گۆڕی، وانییە...». کامەران بە هێمنی سەری دەلەقاند و گووتی «وایە خانم، دونیا منی زۆر گۆڕی».

سەوسەن دەگەڕایەوە سەر جێگاکەی خۆی و چاوی لێکدەنا، باڵندەکان شێتانە دەیانخوێند و شادومانانە لە ناو قەفەزەکاندا دەفڕین، بۆ ئێستێک سەوسەن بەبێدەنگی گوێی لە باڵندەکان دەگرت. پاش ئێستێک بێئەوەی چاوبکاتەوە دەیگووت « دەبێت لە ڕۆژانی داهاتوودا خۆت بۆ زەماوەند ئامادەبکەیت... ئەوە لە ژیانی هەر دووکماندا ڕۆژێکی گەورە دەبێت... ڕۆژێکی زۆر گەورە دەبێت». کامەران هیچی نەدەگووت، سەوسەن چاویدەکردەوە و دەیگووت «بەڵام بەر لەوەی زەماوەندبکەین دەبێت سوێندم لەسەر کۆمەڵێک شت بۆ بخۆیت». کامەران بە دەنگێکی خنکاو لە شادیدا دەیگووت «سوێندت بۆ دەخۆم». سەوسەن هەڵدەستا و بە کەمێک توڕەییەوە دەیگووت «دەبێت سوێندم بۆ بخۆیت کە هەرگیز مەنگوڕی بابەگەورە نەیەتە ماڵمان، پێ نەخاتە حەوشەکەمان، لە زەماوەندەکەماندا بەشدار نەبێت، لەبەرئەوەی مەنگوڕ ئازاری خەڵکێکی زۆر زۆری دا... من لێی نابوورم». کامەران بە دەنگێکی خنکاو دەیگووت «باشە... باشە». «دەبێت سوێندم بۆ بخوێت کە چۆن باڵندەکانی خۆتت خۆشدەوێت، باڵندەکانی تریشت خۆشبوێت». کامەران بە هەمان هێمنی و دڵی پڕەوە دەیگووت «باشە». «سوێندم بۆ بخۆیت کە هەرگیز هیچ باڵندەیەک نەکوژیت، هیچ کاتێک و لە ژێر هیچ هەلومەرجێکدا... هەرگیز تا دەمریت باڵندەیەک نەکوژیت، بزانە گەر باڵندەیەک بکوژیت، وەک ئەوە وایە ئەو پایەیە بڕوخێنێت کە هاوسەریی من و تۆی لەسەر ڕاگیراوە». کامەران دەیگووت «سوێندت بۆ دەخۆم کە هەرگیز تا دەمرم هیچ باڵندەیەک ناکوژم... سوێندت بۆ دەخۆم». «سوێندم بۆ بخۆ گەر من مردم، بە دڵسۆزی هەموو باڵندەکان خزمەتبکەیت»

. «سوێندت بۆ دەخۆم». «سوێندم بۆ بخۆیت کە هەرچییەک لەم وڵاتەدا بووە و دەبێت، تۆ ناچیت بۆ شەڕ و تفەنگ هەڵناگریت و شەڕ ناکەیت». «سوێندت بۆ دەخۆم کە ناچم بۆ هیچ شەڕێک و هیچ چەکێک هەڵناگرم، تا دەمرم... تادەمرم». «سوێندم بۆ بخۆ قەت قژت چەورناکەیت و بۆسەرەوە دایبێنیت، قەت بۆینباخی سوور لە مل ناکەیت، قەت چاکەتی خەت خەت لەبەرناکەیت، گەر خواردنێکم دروستکرد خراپ بوو توڕە نەبیت، گەر نەمتوانی شەوێک لەگەڵتدا بخەوم توڕەنەبیت، گەر کتێبێکم کڕی قەت نەیفرۆشیت». کامەران بە پێکەنینەوە گووتی «سوێندت بۆ دەخۆم... سوێندت بۆ دەخۆم». ئینجا سەوسەن بە زەردەخەنەوە دەیگووت «سوێندم بۆ بخۆ کە بهێڵیت هەموو شەوێک بۆن بە لەشتەوە بکەم، هەموو شەوێکیش پێش خەوتن چیرۆکێکم لەسەر دونیا بۆ بگێڕیتەوە». کامەران هەڵدەستا و دەیگووت «سەوسەن سوێندت بۆ دەخۆم کە چیت دەوێت بۆت دەکەم».

کامەران نزیکی سەعاتێک لەگەڵ سەوسەن گوڵدانچیدا مایەوە، دواتر دوو قوڵی چایەکی لەگەڵ فیکرەت گوڵدانچیدا خواردەوە و گەڕایەوە بۆ لای ئێمە. فیکرەت گوڵدانچی لە کاتی چا خواردنەوەکەدا پێیگووت «دەبێت بزانیت کە سەوسەن کچێکی نەخۆشە، پێویستی بە چاودێری و ئاگاداری بەردەوام هەیە، بەرگەی دڵشکانی گەورە و ئازاری زۆر ناگرێت. گەر دەزانی توانای ئەوەت نییە دڵی ناسکی خانمێکی وەک ئەو ڕابگریت... هیچ کەس لە ئێمە گلەیی لە تۆ نییە، تۆ لە ماڵی خۆتدا و ئێمە لە ماڵی خۆماندا دەژین. تۆ دونیات بینیوە و سەفەرێکی گەورەت کردوە، فێری سەبر بوویت، فێربویت خۆت بناسیت، ئێستا دەزانیت چیت لە تاقەتدا هەیە و چیت بۆ ناکرێت... لە بەرئەوە تکایە دووبارە بیر لە هەموو شتێک بکەرەوە... ئێستا کەس نەماوە لە ڕقی ئەو سەوسەنت خۆشبوێت... کەس نەماوە لە ڕقی ئەو بتەوێت سەوسەن داگیربکەیت...

ها کوڕم... بیرت لەوە بێت کە سەوسەن کچێکی تەنها بووە و عومری لە ناو کتێبدا بردۆتەسەر... ها بیرت لای ئەوە بێت».

کامەرانی سەلما دەیگووت «نا فیکرەت بەگ... سەوسەن پێویستی بە یارمەتی کەس نییە، بە پێچەوانەوە من کەسێکم پێویستیم بە یارمەتی ئەوە... من لەوسەری دونیاوە بۆ لای خانمی کچتان هاتوومەتەوە و پەشیمان نیم... لەبەرئەوە خۆشبەختدەبم ئێوەش وەک یەکێک لە خێزانەکە قبووڵمبکەن و شەرم لەوە نەکەن کە کەسێکی وەک من دەبێتە زاواتان».

فیکرەت گوڵدانچی پێدەکەنی و دەیگووت «پاشەڕۆژ دەزانێت کوڕم... پاشەڕۆژ دەزانێت... با سەیرکەین و ببینین».

بە هەموو پێودانەکان ئەوە ڕۆژێکی گەورەی ژیانی کامەرانی سەلما بوو. کە کامەران لە ماڵی گوڵدانچی هاتە دەرەوە خەندەیەکی گەورە لەسەر ڕوخساری بوو... هەموو لەو ساتەدا کە کامەرانمان بینی تێگەیشتین چیرۆکی سەوسەن فیکرەت و باڵندەکان لەمڕۆوە ئاراستەیەکی تری وەرگرتووە. هەر ئەو ڕۆژە سەوسەن ئەلبومی وێنەکانی دەرهێنا، کە ئێستا پتر لە سێ ئەلبومی گەورەبوون و یەک یەک وێنەکانی خالید ئەموون و مەنسور ئەسرینی جیاکردەوە و لە ئەلبومێکی تایبەتیدا داینان و لە جێگایەکی قایمدا هەڵیگرتن.

## ٤٨

پێش ئەوەی کامەرانی سەلما بچێت بۆ ماڵی گوڵدانچی، مەنگوڕی بابەگەورە پێیگووت «کامەران گوێبگرە. من دەزانم لە ئێستادا ئەو کچەی گوڵدانچی لە من نابوورێت، دیارە من نەفام نیم و دەزانم کە قوونێکی زۆر پاکم نییە، کچەکە ناهەقی نییە گەر ڕقی لە من بێت، من حورمەتێکی زۆرم بۆی هەیە، بەڵام دەزانم ئەو خانمە ناسکە بە ڕاستی لە ژیانی ئەم شارە تێنەگەیشتووە، باشتریش کە تێنەگەیشتووە. عوسە دووگل بە ڕەحمەت بێت دەیگووت «پیاوچاکان ئەوانەن کە هێشتا لەم شارە حاڵی نەبوون». ئینسان کە لە شارەکە حاڵی بوو یان دەبێت بڕوات یاخود بیر لە پاکی ناکاتەوە. من ئەم ماوەیە هەر چییەکم کردبێت بۆ ئەوە بووە تۆ بگەیت بە سەوسەن، دەزانم کچەکە گەر تۆی خۆشبوێت و عاقڵ بێت داوا لە تۆ دەکات، من لە ماڵی خۆت دوور بخەیتەوە... ئەو دەیەوێت تۆ وەکو من دەرنەچیت، منیش ئەو هەموو ساڵە لەگەڵتدا ماندووبووم بۆ ئەوەی بە پاکی بژیت و وەکو من دەرنەچیت. سوێندت دەدەم بە کلکی هەموو ئەو تەیرانەی لەم دونیا حیزەدا کۆتکردونەتەوە، گەر داوای وای لێکردی بێئەوەی قسەبکەیت... بێئەوەی هیچ بڵێیت، بێئەوەی سەر لە خۆت تێکبدەیت، یەکسەر بڵێ باش. من جگە لەوەی تۆ بەختەوەر ببینم هیچی ترم ناوێت. بەوەدا من کوڕم نییە، لەم عومرەمدا پێویستم بەوەیە هەستبکەم شتێکی باشم

بۆ کەسێکی تر کردوە، بەقەبری نەولیا ئەوە بۆ خۆم دەکەم نەوەک بۆ تۆ. من ئیشم باشە، تێدەگەیت، پارەم هەیە، گەر ویستیشم پارەی ترم دەستدەکەوێت، دەتوانم زۆر کۆمەکتبکەم... بەڵام دەبێت لەنێوانماندا سوێند بێت کە جگە لە من و تۆ هیچ کەس هیچ نەزانێت... هیچ کەس».

کامەران لە بەرابەر مەنگوڕدا هەستی بە شەرمێکی گەورەدەکرد. ئەوەی سەوسەن بەو چەشنە لە مەنگوڕ توڕەیە کامەرانی زۆر ئازاردەدا. لە هەموو ساڵەکانی سەفەردا، ئەو بەو یارمەتییە بەردەوامانە ژیابوو کە مەنگوڕ بۆی ناردبوو، ئەو ساڵ دوای ساڵ خۆی لە خراپە و قاچاغ و دزییەوە ئاڵاندبوو بۆ ئەوەی بە دەنگ ئەوەوە بێت، زۆرجار زیاد ڕۆیشتبوو، هەندێ کات شتەکانی لە دەست دەرچووبوون، بەڵام ئەوە مەنگوڕ بوو، ئەوە ئەو بوو، مرۆڤێک بەشێوەی خۆی کۆمەکی بەو دەکرد، بەو شێوەیەی لەسەری گەورەبووە، بەو کەرەستانەی خەیاڵی بۆیان دەچوو، بەو ڕێگایانەی لە منداڵی و گەنجێتییەوە لە ناو چەقۆکێش و دز و قومارچییەکاندا فێری بووبوو. کامەران دەیزانی بەبێ مەنگوڕ نەیدەتوانی ئەو سەفەرە بکات، بەبێ ئەو لەوانەیە نەشتوانێت لە داهاتوودا هەموو گرفتەکانی ژیانی خۆی چارەسەربکات. دەیزانی ئەوەی کە یارمەتیداوە ببێت بە مرۆڤێکی تر تەنیا سەوسەن و جیهان و باڵندەکان نەبووە، بەڵکو مەنگوڕی بابەگەورەش بووە.

لەو ساتەوەی کامەرانی سەلما گەڕایەوە و دوا هەواڵی بەجۆرێکی ڕاست و دروست پێڕاگەیاندین، ئاهەنگەکان دەستیان پێکرد. شادی و خۆشییەکان سێ شەو و سێ ڕۆژیان خایاند، لەبەردەم چاپخانەی بەپولەی ئازاد و ماڵی کامەرانی سەلمادا ئاهەنگی گەرم دامەزرا، لە شەوانی پڕ مەستی و پڕ گۆرانی ژێر زەمینی ئوتێلەکەی باوەجانیشدا تا دەمەوبەیان ئاهەنگ و بەزمەمان سرەوتی نەبوو، بە ڕۆژ چەند جارێک

ئۆتومبێلی شاییکەران، پاسی پڕ لە ژن و منداڵانی ڕەنگاوڕەنگ لە ئێمە و خێزانەکانمان بە شاردا دەگەڕاین. ئەو ڕۆژەی مەلا مارەی خانمی بڕی و شەکراو خورایەوە، بەزمی ئێمە گەیشتە چڵەپۆپەی خۆی، شێتیمان و هاوارمان، هەڵپەڕکێی هیستیریمان، سەرخۆشبوون و ڕشانەوەمان بەجۆرێک بوو خەڵکی بێزارکرد. ئێستاش زۆرمان وێنەی ئەو ئاهەنگانەمان لە ئەلبومەکانماندا هەڵگرتووە، ئێستاش ئەو ڕۆژانە لە یادەوەری ئێمەدا بۆ هەتاهەتایە زیندوون. ئێمە هەموو پێشتر شایی زۆرمان بینیبوو، هەموومان کوڕی هەڵپەڕکێ و بەزمی سەرجادە و سەرخۆشبوونی بێسنوور بووین، بەڵام پێشتر شایی وا گەورە و بەزمی وا گەرممان نەبینیبوو، هەموو بەجۆرێک لە جۆرەکان سەرکەوتنی سەفەری هەشت ساڵەی عاشقەکەی خۆمان بە بۆنەیەکی ئەفسانەیی دەزانی تا ئاهەنگبکەین و مەستبین و بڕشێینەوە... هەندێکمان وێنەی باڵندەکانی کامەرانی سەلمامان کردبوو بە سنگمانەوە و بە شاردا دەگەڕاین، هەموو خولیای ئەوە لەسەرماندا بوو ڕۆژێک بۆمان دەستبدات و ئێمەش سەفەرێکی وا گەورە بە جیهاندا بکەین، لەو پەڕی مەستی و هەڵپەڕکێدا بیرمان لای ئەوە بوو جیهان ببینین، کۆچبکەین بۆ کیشوەرەکانی تر، بەپێ وڵاتە و وڵات بڕۆین و وەک کامەران دونیا ببینین و بەم شێوە ئەفسانەییەی ئەو بگەڕێینەوە.

لە ماوەی پازدە ڕۆژدا کامەرانی سەلما، سەوسەن گوڵدانچی گواستەوە. سەوسەن سووربوو لەسەر ئەوەی کە شەوی یەکەمی زەماوەند و پێکەوە خەوتنیان لە ژوورەکەی خۆی لە قاتی سەرەوەدا و لە بەردەم باڵندەکاندا بێت. هەوڵەکانی خێزانی گوڵدانچی و خوشکەکانی کامەرانی سەلما بۆ ئەوەی ڕازیبکەن یەکەمین شەوی بوکێنی لە ئوتێلێکی تایبەتدا بباتەسەر بێبەرهەم مایەوە، کچەکە وەک هەمیشە سەرسەختییەکی گەورەی پیشاندا و سووربوو کە لەبەرچاوی باڵندەکان بۆ یەکەمجار لەگەڵ پیاوێکدا ڕووتبێتەوە. وابڕیاربوو دوای هەفتەی یەکەمی گواستنەوەکە سەوسەن

بگوازرێتەوە بۆماڵێکی زۆر گەورە کە کامەرانی سەلما گرتبووی، لە ڕاستیدا خانووەکە کۆشکێکی زۆر گەورەبوو کە مەنگوڕ بەپارەی فەرهود و لە کاتی دابەزینی گەورەی نرخی عەقاراتدا کڕی بووی، دوو ماڵی لەیەکدراو بوو کە حەوشێکی شەش سەد مەتری گەورە و لە پشتیشەوە باغێکی بەرینی لەسەر بوو، مەنگوڕ هەر لەسەرەتاوە لە خەیاڵیدا بوو تەواوی کۆشکەکە لەسەر کامەرانی سەلما تاپۆبکات، بەڵام کۆی پڕۆژەکەی بەر عینادییەکی گەورەی کامەران کەوت کە سووربوو لەسەر ئەوەی تەنیا بە کرێ کۆشکەکە وەرگرێت و تەواوی موڵکەکە بۆ مەنگوڕ خۆی بپارێزێت، بەڵام بەو مەرجەش کە سەوسەن نەزانێت موڵکی ئەوە. دیارە مەنگوڕ هێدی هێدی تەمەنی بۆ نیوەی دووەمی پەنجاکان هەڵدەکشا و هیچ کەسیشی نەبوو ببێت بە واریسی و خانوویەکی دیکەشی لە ناوەڕاستی شاردا هەبوو کە نەیدەتوانی چۆڵیبکات. ئەم خانووەی وەک دوا دیاری خۆی بۆ کامەران تەماشادەکرد. بەڵام ڕۆژی گواستنەوەی سەوسەن هێشتا خانووەکە هەندێک چاکردن و دەست پیاهێنانی دەویست کە دەشیا کاتێکی زۆر بەرێت. خانووەکە ئێجگار بەرین و جوان و سەرسوڕهێنەر بوو، سەوسەن کە یەکەمجار بینی، داوای لە کامەران کرد لە بەشێکی حەوشەکەدا ماڵێکی گەورە بۆ هەموو باڵندەکان دروستبکەن و تەواوی ئەو باڵندانەی لە عەمبارەکەدا دەژین بگوازرێنەوە بۆ ئەوێ... لە ڕاستیدا ئەوە ئیشێکی زۆری دەویست، بەڵام وەستا و کرێکارەکان گفتیاندا کە دروستکردنی هەیکەلی ئەو ماڵە لە ماوەی دوو هەفتەدا تەواوبکەن، ئاسنگەرەکانیش پێویستیان بە دوو هەفتە هەبوو بۆ ئەوەی تەواوی بیناکە قەفەزڕێژبکەن. سەوسەن خۆی سروشتی شوێنەکە و ئەندازەی دابەشبوونی قەفەزەکانی دەستنیشانکرد، بەڵام دەبایە بوەستن تا شوێنەکە بەجۆرێک لەدەرەوە و ناوەوە دروستدەکرێت، لە خزمەت مانەوە و ژیانی باڵندەکاندا بێت، دەبایە لە هەموو بستێکدا حیسابی

هاتنی خۆر و کەوتنی تیشک و سەرماو گەرمابکەن، دەبایە بۆ هەندێک باڵندە حەوزی بچوک و بۆ هەندێکی دیکە سەوزی بەردەوام و بۆ هەندێکی دیکەیان مشوری هەوای سارد و شوێنی سارد بخۆن.

هەفتەی یەکەمی زەماوەندەکە دەبایە فیکرەت گوڵدانچی ماڵەکە بۆ کچەکە و زاوا نوێکەی چۆڵبکات. دیارە بیرۆکەی زەماوەند لە ناو باڵندەکاندا بۆ فیکرەت نارێک و نەگونجاوبوو، وەک پیرەمێردێکی ڕیش سپی خۆشحاڵ نەبوو، لەبەر زەماوەندی کچەکەی بۆ هەفتەیەک ئاوارەبێت، بەڵام وەک هەمیشە سەرسەختی کیژەکە هەمووانی گەیاندە بونبەستێکی گەورە و هیچ چارەیەکی نەهێشتەوە جگە لەوەی فیکرەتی پیر بۆ هەفتەیەک لای دکتور ڕەفعەت و پرۆشەی کچی بژی. بەوەدا سەوسەن دەیزانی بەوزوانە ئەم ماڵە جێدەهێڵرێت و دەدرێ بە کرێ، بەوەدا نزیکی نۆ ساڵ بوو لەو ماڵەدا بیریدەکردەوە و یادیدەکردەوە و خەونی دەبینی و دەچووە ناو وێنەکانەوە و جیهانی تەیدەکرد، بەلایەوە گرنگ بوو لە هەمان ئەو ماڵەدا، لە هەمان ئەو شوێنەدا کە ساڵانێکی درێژ کتێبخانەکەی تێدابوو، لە هەمان ئەو ژوورەدا کە بە وێنەکانی ئاریان جەودەتدا گەشتیکردبوو، لە هەمان ئەو ژوورەدا کە جار دوای جار داواکارەکانی خۆی تێدا بینیبوو، لە هەمان ئەو جێگایەدا کە باڵندەکان تێیدا دەیانخوێند و دەژیان... ئا لەویادا دەستبەرداری کچێتی خۆی بێت.

ئێمە وردەکارییەکانی شەوی یەکەمی بوکێنی سەوسەنمان لە هاوڕێیەکی پرۆشەوە بیست کە ئەویش کۆی چیرۆکەکەی لە زاری سەوسەن خۆیەوە بیستبوو. لە یەکێک لە ئێوارەکانی زستانی ساڵی نەوەدوپێنجدا کامەرانی سەلما چوو بۆ ماڵی سەوسەن گوڵدانچی و هەفتەیەکی تەواو نەهاتەدەرێ. ژوورەکەی قاتی سەرەوە جگە لە دوو دۆشەکی گەورە کە هەر دووکیان لەسەر زەوییەکە ڕاخرابوون هیچی دیکەی تێدا نەبوو، ئەو ئێوارەیە باڵندەکان زۆربەیان بە خۆشحاڵییەوە

دەیانخوێند، دەنگی خوێندنی باڵندەکان لە هەندێ شەقامی نزیک لە ماڵی گوڵدانچیشەوە دەبیسترا، ئەوەی سەیربوو سات دوای سات دەنگی باڵندەکان و جریوەیان زیادیدەکرد و بەرزدەبووەوە، کە بۆ یەکەمجار سەوسەن و کامەران لەگەڵ یەکدا ڕووتبوونەوە خرۆشی باڵندەکان بە شێوەیەک بەرزبوو، هەر کەس لە نزیک ماڵی گوڵدانچییەوە بڕۆشتبایە وایدەزانی هەموو تەیری جەنگەڵەکانی سەر زەوی ڕژاونەتە ئەو حەوش و ژوورانەوە. ئەو شەوە سەوسەن ماوەیەکی درێژ تەنیا گوێی لە باڵندەکان گرت و بۆنی لەشی ڕووتی کامەرانی کرد، بۆنی لەشێک کە لەم شارەدا بێوێنە و بێهاوتا بوو، لەشێک بوو بۆنی جیهان و ڕێگا دوورەکان، بۆنی سروشت و شەوی لێدەهات، بۆنی تێکەڵاوبوونی تریفە بە عارەقی مرۆڤ، بۆنی گیای خەوتووی سەر زەمینە دوورەکان و بۆنی تەختەی تەڕی کەشتییەکان، بۆنی شەمەندەفەری کۆن و جووتیاری خەوتووی ناو فارگۆنەکان... بۆنی جیهان کە وەک عەترێکی سیحراوی، وەک گوڵاوێکی نهێنی لە لەشی ئەم پیاوە هەڵدەستا، تێکەڵاوبوونی ئەو بۆنە بە دەنگی باڵندەکان، بە خوێندنی دڕندانەی بولبولەکان، بە هاواری گروپێک لە عەندەلیب و جریوەی دەیان شێوە پاساری دەگمەن، پێکڕا ئارەزووی کچانەی سەوسەنیان دەکردەوە، دەرگاکان و قفڵە دێرینەکانی سەر لەشی سەوسەنیان یەک لە دوای یەک دەشکاند... پێستێکی سپی هەبوو، کامەرانی سەلما لە بچوکی مەمکەکانی بەڵام لە شێوەی هەڵتۆقین و بەرزبوونەوە و ڕەقبوونی لە ناکاوی گۆکانی سەرسامبوو، گەردنی زۆر لەوە بەرزتربوو کە بە جلەوە دەردەکەوت. باڵای باریکتر و کەمەری ڕێکتر و ناوکی وردتر لەوەی هیچ خەیاڵێکی پێشووی کامەران بۆی ڕەسمکردبوو، کە بۆ یەکەمجار بە ڕاستی تێکەڵی بوو، سەوسەن بە گوێگرتنی بەردەوام لە باڵندەکان، بە هەڵمژینی قووڵی بۆنی پیاوانەی کامەران، بە هەناسەدانێکی باریک وێستگەی ئەو ئازارە کەم و شیرینەی

تێپەڕاند کە سەرەتا کەم و دواتر زۆر و زۆرتر و دواتریش کەم و کەمتر و کەمتر دەبووەوە. سەوسەن هەستیکرد باڵندەکان بەر لەو و بەر لەکامەرانیش بۆنی خوێنەکەیان کردوە، تا ماوەیەک بێشەوەی چاویکاتەوە تەنیا لە ڕێگای هاوار و فڕینی باڵندەکانەوە هەستی بە بڵاوبوونەوەی بۆخوێنی کچێتی خۆی دەکرد... کە چاوی دەکردەوە چیتر کچ نەبوو، سەرەتا تەنیا کامەرانی وەک تارماییەک بینی، هەستیکرد بۆنی کامەران ئێستا چڕتر و نیگای بۆهیمییانەتر و ئامادەگی دونیاش لە دەستەکانیدا کە منداڵانە یاری بە مەمکی دەکرد گەورەترە بوو... لەو ساتەدا دڵنیابوو کە خەوێکی دێرینی ژیانی هاتۆتە دی... خەوێکی کۆنی منداڵی کە شوو بە گەڕیدەیەک بکات... ئێستا جیهان... هەموو جیهان، بە بۆن و بە دەنگ و بە جەستە لە ژوورەکەیدا بوو، لە لەشیدا بوو، قووڵ قووڵ بە ناو هەناویدا دەڕۆیشت.

لەو شەوەوە ئیدی تا کۆتایی سەوسەن بەبێ ئامادەبوونی باڵندەکان ناتوانێت لەگەڵ کامەراندا بخەوێت، دەنگی باڵندەکان ئەو هێزەن کە لەشی دەخەنە سەر پشت، کلۆمەکانی دەترازێنن، زنجیرەکانی لە ناوەوە دەشکێنن و وای لێدەکەن بکرێتەوە... بەبێ دەنگی باڵندەکان ئیتر ناتوانێت بگاتە خۆشییە ڕاستەقینەکانی پێکەوەخەوتن، ناتوانێت لەرزە ڕاستەقینەکانی دواچرکە و هەژانی سەر دواترۆپکی تێکەڵاوبوون بژی. لەو شەوانەی هەفتەی یەکەمدا سەوسەن دەگاتە یەقین کە دەبایە یەکێک بڕوات و بە جیهاندا بگەڕێت و ئەم باڵندانە بهێنێت، بۆ ئەوەی ئەو بتوانێت لەگەڵ پیاوێکدا بخەوێت، بەبێ ئامادەبوونی ئەو هەموو بۆن و بەرامە و دەنگە پڕ لە هاوار و قریشکە کێوییەی دونیا ئەستەمبوو وەک ژنێک لەشی خۆی بناسێت و بیکاتەوە و لەزەتی لێببینێت.

## ٤٩

دە ڕۆژ دوای شەوی زەماوەند گواستیانەوە بۆ ماڵە نوێکەیان، سەوسەن سووربوو لەسەرئەوەی فیکرەت دەبێت ئەم ماڵەی ئێستایان بداتە کرێ و لەگەڵ ئەودا بژی. دیارە گوڵدانچی حەزیدەکرد پیرییەکی هێمن لە نزیک یەکێک لە کچەکانییەوە بباتەسەر، بەڵام بەوەدا هێشتا کامەرانی لە نزیکەوە نەدەناسی، ترسی لەوە هەبوو پێشهاتەکانی داهاتوو ناخۆش بکەونەوە و نەتوانێت ئاسوودەبێت، بەڵام گووشاری سەوسەن و کامەران بە جۆرێک بوو گوڵدانچی نەیدەتوانی خۆی لە بەردا بگرێت، کچەکە لەو باوەڕەدا نەبوو بتوانێت بێ باوکی بژی، ئەوەی تا مردن دەبێت لەگەڵ گوڵدانچیدا بێت شتێک بوو لە منداڵییەوە چووبووە خەیاڵی. لە ماوەی چوار ڕۆژدا کامەران لەلای مۆبێلفرۆشەکانەوە تەواوی ئەساسی ماڵەکەی کڕی و گواستییەوە، ژوورەکانی ڕێکخست و شتەکانی دامەزراند و دیکۆری گونجاوی بۆ دۆزینەوە. لە قاتی خوارەوەی ماڵەکەدا یەکێک لە خۆشترین جێگاکانی بۆ گوڵدانچی پڕ فەرشکرد. ڕۆژی گواستنەوەی ماڵەکە بۆ ئێمە ڕۆژێکی جەنجاڵ و پڕ شادی بوو، دووبارە ژمارەیەکی زۆرلە باڵندەکانمان لە لقرییە گەورەکانی گواستنەوەدا بینی، دووبارە گوێمان لە جریوە و دەنگیان بوو لەسەر جادەکان. هەموو خۆشحاڵ بووین کە ماڵە تازەکەی سەوسەن لە جێگایەکدا بوو ئاسانتر لەجاران ڕێبوارانی ئەو گوزەرە دەیانتوانی هەیوان و باغی ببینن. جگە لە قەفەزەکان هەموو ماڵەکەی گوڵدانچی

بە باری لۆرییەک گواسترایەوە، تاکە شتێکی قورس «دۆڵابی یادگارە تاڵەکان» بوو، کە دەبایە وەک خۆی و بێهیچ زیانێک بگاتە هەواری نوێ، دۆڵابێک بوو پڕ لە نەخش، لە تەختەی ئەستوور و سەنگین، بە هیچ جۆرێک هەڵگرتنی ئاسان نەبوو، دەبووایە بە چوار پیاو بیگوازنەوە و لە نیشتەجێی تازەدا شوێنێکی تایبەتی بۆ تەرخانبکەن. ئەو دۆڵابە هەر ئەوە نەبوو تەنیا یادگارێک بێت کە لە ژیانی ساڵانی بەغداوە مابوو، بەڵکو گەنجینەی هەموو بیرەوەرییەکان و شوێنی هەموو یادە غەمگینەکانیش بوو کە لای هەر دوو کچەکە و فیکرەت گوڵدانچیش موقەدەس بوون. لە ڕاستیدا جگە لە باڵندەکان و دۆڵابی یادگارە تاڵەکان ماڵی گوڵدانچی شتێکی دیکەی ئەوتۆی تێدا نەبوو شایستەی گواستنەوە بێت، مێز و کورسییە کۆنەکانی سەوسەنیان گواستەوە؛ قەنەفەی ژوورەکەیان هەڵگرت و وەک پارچەیەکی گرنگی یادگار پێچایانەوە و لە ماڵی تازەدا لە ژوورێکی تایبەتیدا سەربەخۆ دایاننا و دەرگایان لەسەر داخست.

سەوسەن لە ماڵە نوێکەیدا وەک خاتوونێکی کارا و بەقسە ڕەفتاریکرد، هەر لەسەعاتەکانی یەکەمی هاتنییەوە دوای ئەوەی ئینجانەی گەڵاچاکانی لە شوێنێکی تایبەتیدا دانا، خەریکی داڕشتنی بناغەی ماڵی گەورەی باڵندەکان بوو. خۆشحاڵ بوو کە لەم خانووە نوێیەدا ڕووبەرێکی گەورەی هەیە باڵندەکانی تێدا دابەشبکات، لە قاتی سەرەوەدا دیواری نێوان دوو ژووری گەورەی بە کرێکارەکان ڕوخان و ساڵۆنێکی گەورەی نوێی دروستکرد و قەفەزی باڵندەکانی لەوێدا ڕێکخستەوە. ئەو ڕۆژانەی سەوسەن بە دروستکردنی ماڵی باڵندەکانەوە خەریک بوو، لە ڕۆژە پڕ شادییەکانی ژیانی بوو، خۆی بە دەنگە هێمن و نیگا سارد و ڕەنگە پەڕیوەکەیەوە سەرپەرشتی زۆر شتی دەکرد. دیارە فیکرەتی پیر کۆمەکی زۆری پێدەکرد، بەڵام کامەران حەزیدەکرد سەوسەن هەموو شتەکان بەو چەشنە بکات کە دەیەوێت. بەو جۆرە لە ماوەی دوو مانگدا شوێنی باڵندەکان تەواوبوو، بە

چەشنێکیش بوو زۆریان ڕووبەرێکی گونجاویان بۆ فڕین و جوڵە هەبوو، ئەمجارەش بۆ ئەوەی هەموومان باڵندەکان ببینینەوە دەمەونیوەڕۆیەک لە عەمبارە کۆنەکەی عیزەت گوڵدانچییەوە باڵندەکانیان بە هەموو شاردا گواستەوە بۆ ماڵە نوێکەی خانم، گواستنەوەی باڵندەکان یەکێک بوو لەو گەشتە ئەفسانەیی و دەگمەنانەی شاری ئێمە بەخۆیەوە بینی، دووبارە باڵندەکان سەدان بینەری تینوویان بۆ خۆیان ڕاکێشا. کونەپەپوە گەورەکان و ئەو حاجی لەقلەقانەی دەنوکە درێژەکانیان لە قەفەزەکانەوە هاتبوونە دەرێ، ئەو توتییە زەبەلاحانەی بە ئەندازەی پڵنگێک گەورەبوون، ئەو بازانەی پەڕیان وەک ئاڵتون دەدرەوشایەوە، ئەو تەوارە قەشەنگانەی تووشی غەمۆکی بووبوون، دیسان سەرسامیانکردینەوە... بینینەوەی باڵندەکان سەرلەنوێ هەموومانی بۆ سیحرەکانی دونیا واڵاکرد، زۆرمان تا بەردەمی ماڵی نوێی سەوسەن بە هێمنی لەگەڵ کاروانەکەدا ڕۆیشتین، بەڵام لەسەیرکردنی باڵندەکان تێرنەدەبووین، لەو ڕۆژەوە هەستمانکرد کە ئەم باڵندانە شتێک لە قودسییەتیان تێدایە، ناوی باڵندە موقەدەسەکان لەو ڕۆژەوە تەواو چەسپا و بووە نازناوی هەمیشەیی بۆیان. خۆشحاڵی ئێمە بەو تەیرانە جۆرێک بوو، دەمانویست شەو و ڕۆژ بە شەقامەکاندا بسوڕێنەوە تا ئێمە سەیریانبکەین. لەو ڕۆژەشەوە خانم دوو کەسی تایبەتی گرت تا جارجار لە خزمەتی باڵندەکاندا کۆمەکیبکەن، ئەرکی دابینکردنی پێویستی ئەو هەموو باڵندەیە لەوە گەورەتر بوو بەتەنیا بەو هەڵبسوڕێت، بەڵام باڵندە بچوکەکان وەک جاران لە قاتی سەرەوەدا لە ژێر چاوەدێری خۆیدا مانەوە.

دوای گواستنەوەیان بۆ ماڵە نوێکە، کامەرانی سەلما دەبایە بە ڕاستی بیر لە ئیشێک بکاتەوە بیژێنێت، کە لەگەڵ مەنگوڕدا لەو ڕووەوە قسەیکرد، مەنگوڕ ئاگاداریکردەوە دۆخی بازاڕ وەها دژوارە، بەبێ

سەرمایەی زۆر زەحمەتە کارێکی دەستبکەوێت، ئەو گووتی شارەکە ئێستا جگە لە هەندێک ئیشی سەرافەت و بازرگانیکردن بە پارەوە هیچی دیکەی تێدا نییە، مەنگوڕ ڕای وابوو کە ئەو لە بازاڕدا دوکانێک بگرێت و پارەیەک بداتە دەست کامەران تا ئیشی کڕین و فرۆشتنی دراوی پێبکات، قازانجەکان هەڵگرێ بۆ خۆی و هەرکات لە داهاتوودا هەبیوو پارەکەی بۆ بگێڕێتەوە. کامەران لەو چەند ساڵەدا تەنیا هەموو باڵندەکانی دونیای نەبینیبوو، بەڵکو زۆربەی چەشنە دراوی دونیاشی ناسیبوو، لە زۆر بانکی دونیا و لە بازاڕی ڕەشی زۆربەی شارەکانی دونیادا دراوی گۆڕیبووەوە، وریایی لە گۆڕینەوەی پارەدا بەشێکی گرنگی نهێنی سەرکەوتنی سەفەرەکەی بوو، لەو کاتەوە تێگەیشتنێکی بەهێزی بۆ چۆنێتی یاریکردنی دراوە جیاوازەکانی دونیا لەگەڵ یەکدا هەبوو. کامەران کە یەکەمجار قفڵی دوکانەکەی کردەوە و دەرابەکەی هەڵدایەوە، نەیدەزانی ئەم نوسینگە بچوکە لە ماوەی داهاتوودا دەبێتە قیبلەگایەکی سەیر و شوێن نیازی هەموو ئەوانەی دەیانەوێت بە دونیادا بگەڕێن.

ئەو کات سەرەتای شەپۆلە گەورەکانی کۆچ دەرکەوتبوو، بەڵام ئاراستە و گەورەیی ئەو شەپۆلانە هێشتا دیارنەبوو. بەڵام دوای چوار مانگ لەو ڕۆژە کۆچکردن بوو بە هەوڵ و هەواڵێکی ڕۆژانەی ژیانی ئێمە، لە نێوان سەرەتای ساڵی ١٩٩٥ و تا ئەو ڕۆژەی ئەمریکییەکان چوونە بەغدا و سەدام حوسەین ڕوخا، پتر لە سەد هەزار کەس شاری ئێمەیان بەرەو شوێنەکانی دیکەی دونیا بەجێهێشت، ئەوە تا ئەوکات گەورەترین شەپۆلە کۆچێک بوو شارێک لە شارەکانی وڵات بە خۆیەوە ببینێت. ئاشکرا دوای گەڕانەوەی باڵندەکان پەتای کۆچ بووە شتێک کە ئیدی جڵەو نەدەکرا، وەک ئەوەی هاتنی باڵندەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان هێزی فڕینی لە هەمووماندا زیندووکردبێتەوە، وەک ئەوەی ئەو خەونە بچوکەی سەوسەن بۆ ڕزگارکردنی داواکارەکانی لە شەڕ، بووبێت بە

خەونی هەموومان... ماوەیەکی زۆر نەبوو کامەران نوسینگەکەی کردبووەوە کە بێتەوەی خۆی بزانێت چۆن و بە چ هێزێک، لەپاڵ کڕین و فرۆشتنی دراوە جیاوازەکانی دونیادا، ئیشێکی تری گرنگ و گەورەی بۆ دروستبوو. دەبایە باسی جیهان بۆ ئەوانە بکات کە دەیانەویست بڕۆن و ئەم شارە بەجێدەهێڵن. لە ماوەی دوو مانگدا نوسینگەکەی کامەران بوو بە سێ ژووری جیاواز، لە یەکێکیاندا سەوا و مامەڵەی دراو دەکرا، لە دووانەکەی دیکەشدا کامەران و هاوڕێ ئێرانییەکەی باسی جیهانیان بۆ کۆچبەرەکان دەکرد، کامەران و هاوڕێکەی لە ژوورەکەی خۆیاندا سەرتاپای دیوارەکەیان لە سەقفەوە بۆ زەوییەکە کردبوو بە نەخشەی وڵاتەکان... کۆچبەرەکان دەهاتن بۆ لای کامەران و هەزار پرسیار لە دڵیاندا بوو، هەر یەکەیان پرسیاری ڕێگایەک و ئاڕاستەیەکی دەکرد، پرسیاری چۆنێتی پەڕینەوە لە سنوورەکان و ڕووبارەکان و دەریاکان، کامەران بە دڵسۆزییەوە باسی هەموو ڕێگاکانی دونیا و مەترسییەکانی بۆ دەکردن، ناوی شارەکان و ئوتێلەکان و وێستگەکانی دەدانێ، ئامۆژگاریدەکردن چۆن بڕۆن و کەی بڕۆن و لە کوێ بخەون و چۆن پارەکانیان بشارنەوە، لەسەر نەخشەکان شوێنی خاڵەکانی پشکنینی پۆلیسی بۆ دیاریدەکردن، لەسەر نەخشەکان پێیدەگووتن چ ڕێگایەک بگرن، سەعات چەند دەربچن، چەند سەعات بڕۆن. دوورو نزیکی نێوان شارەکانی پێدەگووتن، ناوی قاچاغچییەکانی دونیای دەدانێ کە دەشێت یارمەتیانبدەن، ناوی بەلەمەوانەکان، ماڵی ئەو خاوەن ماشێنانەی خەڵک لە نێوان سنوورەکاندا دەپەڕێننەوە، زانیاری لەسەر شوێنە سارد و گەرمەکان دەدانێ، لەسەر جیاوازی نێوان ڕێگاکان و جۆری مەترسییەکانیان، زانیاری دەربارەی پۆلیسی وڵاتە جیاوازەکان و چۆنێتی بەرتیل وەرگرتنیان، یەک یەک فێریدەکردن چۆن لە جێگا دوورەکانەوە پەیوەندی بە نیشتیمانەوە بکەن، گەر گیران چی بڵێن، گەر هەستیان بە مەترسی کرد چۆن ڕابکەن، چۆن خۆیان بشارنەوە،

چ جلێک لەبەربکەن. هاورێ ئێرانییەکەشی یارمەتی ئەوانەی دەدا کە بەدوای ئافرەت و ڕابواردندا دەگەڕان ئاسان بگەنە خواستی خۆیان، لە هەموو شارەکانی دونیادا ماڵە سۆزانییەکانی لەسەر نەخشە بۆ دەست نیشاندەکردن، شێوەی نزیکبوونەوە لە سۆزانییەکانی فێردەکردن، زانیاری گشتی لەسەر ژنی وڵاتە جیاوازەکانی دونیا دەدانێ، لە چۆنێتی نیشاندانی ڕێزەوە وانەی دادەدان تا دەگاتە شێوەی ڕەفتارکردنی ناو جێگە لەگەڵیاندا، هەندێک لە دانیشتنەکان خێرا و هەندێکی دییان چەندین سەعاتی دەخایاند. کامەرانی سەلما و هاورێکەی بەرامبەر ئەو زانیاریانە ڕاستەوخۆ داوای پارەیان نەدەکرد، بەڵام هەر کەس دەهات خۆی بڕێک پارەی جێدەهێشت، جگە لەوەی زۆربەی کۆچبەران هەر لە نوسینگەکەی ئەودا ڕاستەوخۆ پارەکانی خۆیان دەکردە دراوی بێگانە.

کەس نازانێت کێ بۆ یەکەمجار ئەو ئەفسانەیەی بڵاوکردەوە کە گوایە پەڕی باڵندەکان، موفەڕکێکی بەختهێنە و کۆمەکی زۆر بە مرۆڤ دەکات سەفەرێکی سەرکەوتوو بە دونیادا ئەنجامبدات. بەڵام لە ناکاو ئەفسانەکە بەجۆرێک بڵاوبووەوە بەری پێنەدەگیرا، هێندەمان زانی زۆربەی کۆچبەران دەهاتن، نە تەنها بۆ ئەوەی زانیاری وەرگرن، بەڵکو بۆ ئەوەی پەڕە باڵندەیەکیش بخوازن، پەڕێک کە لە ڕاستیدا بێنرخ و ناچیز دەینواند، بەڵام لە بڕوای ئەواندا نرخێکی گەورەی هەبوو. باوەڕیان وابوو لە کاتی سەفەردا ڕۆحی باڵندەکان لە دەشتایی و دارستان و گوێ ئاوەکانی جیهاندا کۆمەکیاندەکات. ڕۆژانە کامەران لە قەفەزەکاندا پەڕی وەریوی باڵندەکانی کۆدەکردەوە و دەیکردنە کیسەیەک و دەیبرد بۆ بازاڕ و بەسەر ئەو خەڵکانەدا دابەشیدەکرد کە دەکەوتنە ڕێ... لەو سەردەمەدا دەیان کەس لەوانەی لە سنوورەکانی ئێران و تورکیا و سوریا وە بەرەو دونیای گەورە پەڕینەوە، چەندان لەوانەی بەپێ لە سنووری تورکیاوە هەموو گریکستانیان تا ئەسینا تەیکرد، ئەوانەی شەوان لە کەنارەکانی ئیتالیا

بە قاچاغ دابەزین و خۆیان گەیاندە شارە گەورەکانی وەک ڤینیسیا و ڕۆما، پەڕی باڵندەکانی سەوسەن خان لە گیرفانیاندا بوو.

لەو ماوەیەدا سەوسەن و کامەران ژیانێکی بەختەوەر ژیان، ئەوکات پرۆشە فیکرەت لەگەڵ دکتۆری مێردیدا کاتێکی زۆری لە ڕێکخستنی کاروباری عیادەکەدا دەبردەسەر، ڕۆژانە هوزار تا درەنگ لای سەوسەن و باپیرەی دەمایەوە، بە شەو کامەران چ چیرۆکێکی دەربارەی دونیا بۆ سەوسەن دەکرد، بەڕۆژ سەوسەن وەریدەگێڕایە سەر زمانێکی منداڵانە و بۆ هوزاری بچکۆلەی دەگێڕایەوە. کامەران شەو دوای شەو و باڵندە دوای باڵندە چیرۆکی ڕاوکردنەکانی بۆ سەوسەن حیکایەتدەکرد، لە چەند سندوقێکی جیاوازدا کەرەستە جیاوازەکانی ڕاوی نیشاندەدا کە لە داوی ئاساییەوە تێیدا بوو تا ئەو تفەنگە چکۆلانانەی لە بێهۆشکردنی گیاندار و باڵندەدا بەکاردێن، فاقەی زیرەک کە چاوی ئەلەکترۆنیان پێوەیە و شوێنی باڵندەکانت پێدەڵێن، تەڵەی تایبەت کە بێئەوەی ئازاری باڵندەکان بدات قاچیان دەگرێت و بەریان نادات، سپرای گێژی کە مرۆڤ لە ڕێگای سۆندەیەکی تایبەتییەوە دووراودوور دەیرژێت تا باڵندەکان گێژبن و بگیرێن. لەو شەوانەدا زۆرجار کامەرانی سەلما و سەوسەن دوای ئەوەی لە خۆشەویستی و پێکەوەخەوتنێکی درێژ و عاشقانە دەبوونەوە تا بەیانی دەکەوتنە وەرگێڕان و دروستکردنی ناوی کوردی بۆ باڵندەکان. سەوسەن هەمیشە ناوەکانی بە لاتینی دەگووت و لەسەر ڕۆشنایی جۆر و شوێنی ژیان و ڕەنگ و شێوەیاندا ناوی نوێیان بۆ دەتاشین. هەر دووکیان زۆر بەختەوەربوون... خۆیان وەک دوو کەس دەبینی کە قەدەر بۆ دووبارە ناونانەوەی دونیا دیاریکردون، بەڵام ئەمجارە بە کوردی. سەوسەن دەیگووت ئەمە «پێرۆکۆراکس پیرۆکۆراکس» ـە، لەسەر ڕۆشنایی وەسفەکانی کامەراندا ناوەکەیان بە «قەلەڕەشەی ئالپ» وەردەگێڕا. «فراتێرکولا ئارکیتیکا» یان ناودەنا «دوقمەتوتی» لە بەرئەوەی لە توتی

دەچێت و قاچی وەک قاز وایە و دەتوانێت بچێتە ژێر ئاو، «گیمنۆگیپس کالیفۆرنیانۆس» بە «خێوەداڵ» لە بەرئەوەی خەریکە بەرەو نەمان دەڕوات و هێندەی باڵە گەورە و سیمرغئاساکانیشی کردەوە سپێتی بنباڵی بە دەستی خێوێکی فریو دەچێت. ناونانی باڵندەکان بەشێکی گەورەی خۆشی ژیانیان بوو. لەو شەوانەدا «پەپوەمۆن» «پەپوەپاشا» «شین بولبول» «بەردەداڵ» «مرە یاقووتی» «گوڵ پاساری» و دەیان ناوی دیکەیان بۆ مەلە دڵخۆشەکانیان دروستکرد.

ناونانەوەی باڵندەکان بە کوردی، لای سەوسەن و کامەران وەک دووبارە دروستکردنەوەی جیهان وابوو، وەک ئەوە بوو لە ڕێگای ناونانەکانەوە هەموو شتە نادیار و ون و نائامادەکانی دونیا بکەن بە موڵکی خۆیان و باڵندەکانیش بکەن بە بەشێک لە دانیشتوانی ئەم شارە. سەوسەن تا ئەوکاتە تەنیا لەزەتی بینینی دونیا و بیستن و بۆنکردنی دەناسی، بەڵام لە ڕێگای ناونانەکانەوە لەزەتێکی دیکە فێربوو، لەزەتی دروستکردنەوەی دونیا، هەموو ناونانێک چەشنە نزیکییەکی دیکەی دروستدەکرد، هەر باڵندەیەک کە ناوی نوێی خۆی پێدەدرا ئیتر ئاشناتر و دۆستتر لای سەوسەن دەردەکەوت، ئەو ناونانە کوردیانە بەجۆرێک لە جۆرەکان زۆر لە دیوارەکانی غوربەتی لە نێوان سەوسەن و باڵندەکاندا شکاند، وەک ئەوەبوو لەو ڕێگایەوە دونیا بە جۆرێکی ڕوونتر و ڕاستەقینەتر بووبێت بە موڵکی ئەو، وەک ئەوەی بەوە بەشێک لەو خەونە کۆنەی هاتبێتە دی کە جیهان لەم شارەدا نیشتەجێبکات و لە دڵیدا بیڕوێنێت.

دوای زەماوەندەکەی سەوسەن و کامەران و گواستنەوەی باڵندەکان بۆ ماڵی نوێیان شەوێک دکتۆر دڵشاد شوکور بە خۆی و دەیان مۆمیای بچوک و گەورەی باڵندەوە هات بۆ ماڵی سەوسەن گوڵدانچی، دکتۆر پیاوێکی سەرڕووتاوە و شەرمنی لەگەڵدابوو ناوی «کەمال یەڵدا» بوو. ئەم پیاوە یەکێک بوو لەو مەخلوقانەی مرۆڤ تەنیا لە شاری

ئێمەدا ڕێکەوتیاندەکات، کۆمەڵێک ئیشی زۆر جیاواز جیاوازی هەبوو کە هیچیان لەوی دیکەیان نەدەچوو، تەلەفزیۆنی چاکدەکردەوە، شیعری دەنوسی، باڵندەی مۆمیادەکرد، بە شەو شۆفێری تاکسی بوو، دەیزانی ئۆکۆردیۆنیش لێبدات. لە ساڵانی داهاتوودا سەوسەن زۆر ڕێگای دەکەوێتە ئەم پیاوە، کە هەمیشە بە شەرمێکی بێوێنەوە هەموو شتێکی بۆ جێبەجێدەکات. ئەو شەوە دکتۆر دڵشاد، کەمال یەڵدای وەک وەستای گەورەی مۆمیاکردن پێناساندن. مۆمیاکانی یەڵدا قەشەنگ و ڕاستەقینە دەیاننواند، باڵندەکانی لە جۆرە دۆخێکی وەهادا مۆمیاکردبوو هێمنی یان تورەیی بەرجەستەدەکرد. هەندێکیانی بە لقی درەختەوە نوساندبوو، هەندێکی دیکەشی لەسەر بەردی ڕەنگکراو و تایبەتی دانابوو، چەند مەلێکی بە باڵی کراوەوە لە ساتی پێش فڕیندا وەستاندبوو، چەندانێکی دیشی لە دۆخی بیرکردنەوەیەکی ئەبەدی و هێمندا ڕاگرتبوو. سەوسەن مۆمیاکانی لە زۆر شوێنی ماڵە گەورەکەدا بڵاوکردەوە، لە هەندێ جێگادا لە سەر مێزەکان و لە هەندێ شوێنی تردا ڕەفەی تایبەتی بۆ دروستکردن. لە ژووری میوانەکەدا بەیارمەتی وەستایەکی بەردکار لە نزیک سەقفەکەوە هەندێ لەتەبەردی چیاڕەنگی بە دیوارەکانەوە نوساند و هەڵۆ و داڵ و بازە کوژراوەکانی خستنە سەر، بەجۆرێک ئەوەی دەهاتە ژوورەوە ئەو هەستەی لادروست دەبوو کە لە ناو سروشتێکی بەردین و شاخاویدا دانیشتووە و باڵندەکان لە جێی سروشتی خۆیانەوە تەماشایدەکەن.

ڕۆژێک لە ڕۆژان سەوسەن فیکرەت لەگەڵ پرۆشەی خوشکیدا چوو بۆ دوکانەکەی کامەرانی سەلما، تا ئەوکات شوێنی وەها جەنجاڵی نەبینیبوو، بە دیمەنی نوسینگەکە و ئەو هەموو نەخشەیە سەرسامبوو، پێشتر لەم شارەدا ڕێکەوتی شوێنێکی نەکردبوو هێندەی ئەوێ ژیانی تێدابێت، هێندەی ئەوێ بە جوڵە و دەنگ و هاوار سەرشاربێت. ئەوە خۆشحاڵیکرد... لەگەڵ یەکێک لە کۆچبەرەکاندا دانیشت و گوێی لە

کامــهران گــرت چــۆن باســی پهڕینــهوه لــه کهنارهکانــی لوبنانــهوه بــهرهو یۆنـان دهکات. ئـهو دهنگـه دهنگـهی بـازاڕ، ئـهو گهرمـی و جوڵهیـه، ئـهوهی دهتوانێـت تێکهڵـی ئـهم جیهانـه بێـت دڵخۆشـیکرد. دواتـر هەندێـک ڕۆژ دێـت و بـه ڕهنگـه پهڕیوهکـهی خۆیـهوه، بـهو ناسـکییهوه کـه بچوکتریـن شـت دهیشـکێنێت، لهسـهر کورسـییهک دادهنیشـێت و چـاوی لێکدهنێـت و گـوێ لـه دهنگـهکان دهگرێـت، ههندێـک جـار بۆنێـک دهکات کـه لـه بۆنـی ئاسایی ئـهم شـاره و بۆنـی خهڵکانـی ئـهم شـاره ناچێـت، بهڵکـو بۆنێکـی دیکـهی نوێ و نهزانـراوه کـه سـهرهتا نازانێـت چییـه، بـهڵام هێـدی هێـدی تێـدهگات کـه ئـهوه بۆنـی خهونـه... خهونـی ئـهو پیـاو و ژنانـهی دهیانهوێـت بـڕۆن و سـهفهربکهن، خهونـی ئهوانـهی خـهون بـه شـارهکانی دی و بهنـدهره دوورهکان و کهشـتییهکانهوه دهبینـن. ئـهوه ئـهو ههسـتهی دهداتـێ کـه ئـهم جێگایـهی کامـهران ئیشـی تێـدادهکات، سـهر بـهم شـاره نییـه، بهڵکـو وێسـتگهیهکی نادیـاره بـۆ پهڕینـهوه بـهرهو دونیاکانـی تـر و سـهرزهمینهکانی تـر.

٥٠

خالید ئامـوون کـە شـاری بەجێهێشـت و گەیشـتە یەکێـک لـە شـارۆچکە بچکۆلەکانـی دەڤـەری بادینـان، جگـە لـە ڕق هەسـتی بـە هیـچ شـتێکی تـر نەدەکرد، ڕقێکـی گـەورە کـە هـاوڕێ بـوو بـە سـووتانێکی ناوەکـی گـەورە کـە ئاشـکرا گـڕی نـاو سـینەی عاشـقان نەبـوو؛ بەڵکـو گـڕی کەسـێک بـوو کـە هەمـوو شـتێکی دۆڕانـدوە و بەرامبـەر دونیـا تووڕەیـە. خالیـد کـە گەیشـتەوە ئـەو ماڵـەی خوشـکە گەورەکـەی تیـا دەژیـا، بـۆ چەنـد ڕۆژێـک لـە جێـگادا کـەوت. ئامووونییـەکان هەمـوو چیرۆکەکەیـان بیسـتبوو، کوشـتنی باڵنـدەکان زۆر بریندارییکردبـوون، گـەر فـەوزی بـەگ نەبووایـە کـە بـە شـیعری خەیـام و جەلالەدینـی ڕۆمـی هێمنیکردنـەوە، هەندێـک لـە گەنجە ئامووونییـەکان بەجۆرێ شـەرەفی خێڵانەیـان بریندارببوویـوو، دەیانویسـت بـە مەفـرەزەی نهێنـی بڕۆنـەوە نـاو شـار و تۆڵەبکەنـەوە. هەندێـک هـۆی کوشـتنەکەیان گێڕابـووەوە بـۆ فەرمانێکـی نهێنـی کـە لـە یەکێـک لـە سـەرکردە سـەربازییەکانی یەکێتـی نیشـتیمانییەوە دەرچـووە؛ چونکـە ئـەوان هەمـوو ئامووونییـەکان پێکـڕا و بـێ جیـاوازی وەک دوژمـن سـەیردەکەن. بـەڵام بەرپرسـێکی مامناوەنـدی و لۆکاڵـی یەکێتـی لـە ڕێـگای بازرگانێکـی شـەکرۆچاوە نامەیەکـی بـۆ ئامووونییـەکان نـارد و پێیگووتـن کـە ئێمـە «وەک یەکێتـی» ئـەو مەسـەلەیە وەک گرفتـی نێـوان چەنـد بنەماڵـەیـەک دەبینیـن و وەک حیـزب کارمـان بـە ئیشـەکەوە نییـە، ئاگاداریشـیکردنەوە کـە بەدرێژایـی ئـەو ماوەیـەی خالیـد لـە ئوتێلـی

باوەجاندا بووە، بێئاگای خۆی پاسەوانی تایبەتیان بۆ داناوە نەبا کەس نامەردانە زیانی پێبگەیێنێت. ئاخۆ ئەو نامەیەی ڕاستی دەگووت؟ ئایا حیزب هەمووی هەر بەو چەشنە بیریدەکردەوە؟ کەس بەتەواوی نازانێت. بەڵام زۆر لە ئامووننییەکان باوەڕیان بەو قسانەنەکرد و باوەڕیان وابوو ئەو سووکایەتیانەی بە خالید ئاموون کراون، هۆکارەکانی سیاسین و بڕواشیان وابوو یەکێتییەکان دەستیان لەوەدا هەیە کە سەوسەن فیکرەت، خالید وەک مێرد قەبووڵ نەکات. دیارە هەندێک بەڵگەشیان دەربارەی پەیوەندی نێوان کامەرانی سەلما و چەند بەرپرسێکی حیزبی لەبەردەستدا بوو کە بەشی ئەوەی دەکرد وەک چەک بەکاریبهێنن، دوای گەڕانەوەی کامەرانی سەلما، تەنیا مەنگوڕی کۆنە هاوڕێی پێشوازی لێ نەکرد، بەڵکو قەپۆز جوقلی «کە ئێستا بووبوو بە بەڕێوەبەری بەندیخانەیەکی تایبەتی یەکێتی نیشتیمانی» و سامان کیسراش هەریەک بە جیا دوو داوەتی گرنگیان بۆ کرد و لەو دوو داوەتەشدا شەراب زۆر خورایەوە و مەی زۆر ڕژایە ناو پەرداخەکان و گۆرانی زۆر گوترا. هەریەک لە سامان و جوقلی دوو هاوڕێی سەردەمی منداڵی کامەران بوون... دەستێکی فیتنەباز وێنەی دانیشتنەکانی کامەرانی لەگەڵ قەپۆز جوقلی و سامانی کیسرادا گەیاندە ئامووننییەکان.

خالید ئاموون خۆی بە جۆرێک لە جۆرەکان دەیزانی شووکردنی سەوسەن بە کامەران پەیوەندی بە سیاسەتەوە نییە، دڵنیابوو کچەکە بۆ شتێک دەگەڕێت لەودا نییە، گەرچی ئاگرێکی گەورەی ئیرەیی دەیسووتان، گەرچی هەستی بە شەرمێکی بێوێنە دەکرد کە ئامووننییەکان لە ناو هەموو ناخۆشی و دەردی خۆیاندا هەشت ساڵ بۆ ساتێک پشتی ئەویان بەرنەداوە و ئەویش مایەپووچ لە هەموو ئەم گەشتە هاتەدەرێ، گەرچی فەوزی بەگ پێیگووت تۆ نەتۆڕاویت و لەوەدا براوەیت کە هەشت ساڵ سەر زەمینت بە پانی و درێژی بینی و تا مردن ئەو ڕۆژانەت لە

یادناچێتـەوە و ئـەو سـەفەرە هەمیشە مایەی دەوڵەمەندبوونی دڵ و ڕۆحـت دەبێت. خالیـد دوای چەنـد ڕۆژێـک غـەم چـوو بـۆ کۆبوونەوەیەکـی گـەورەی ئامووننیـەکان کـە بـۆ بەخێرهاتنـەوە و دڵدانـەوەی ئـەو کردبوویـان، لـەلای خۆیـەوە هـۆی هەمـوو شـتەکانی لەسـەر شـانی سیاسـەت لابـرد و گووتـی ئـەوەی لـە پشـت هەمـوو ڕووداوەکانـەوە وەسـتاوە کامەرانـی سـەلمایە. ڕقـی بەرامبـەر کامەرانـی سـەلما لـە هەمـوو شـتێک گەورەتربـوو، ئـەوەی ئێسـتا ئـەم لـە غەمـدا نوقمـە و کامـەران لەگـەڵ سەوسـەندا دەژی دەیسـووتان، کـە سـەیری ناخـی خـۆی دەکـرد جگـە لـەو ڕقـە ڕەش و تاریکـە هەسـتی بـە هیـچ شـتێکی تـر نەدەکـرد. هێـدی هێـدی و سـات دوای سـات ئـەو خۆشەویستییە شێت و سـەرگەرمەی بـۆ سەوسـەن هەیبـوو، ڕەنگـی دەگـۆڕا و دەبـووە ڕقێکـی گـەورە و بێوێنـە بەرامبـەر کوڕەکـەی سـەلما، هەسـتیدەکرد سـات دوای سـات ئـەو ڕقـە لـە نـاوەوە دەیبـات و تـا مـردن ناتوانێـت خـۆی لێدەربازبـکات. لـە کۆبوونـەوەی ئامووننییەکانـدا لیسـتێکی کۆنـی تۆڵەیـان دەرهێنایـەوە کـە قەپـۆز جرقڵـی و موشـەجوجە و سـامانی کیسـرا لەسـەری سـەرەوەیدا بـوون، لیسـتێک لـەدوای کوشـتنی قەڵەنـدەرەوە ئامووننیـەکان بـە خوێنـی خۆیـان نوسـیبوویان بـۆ ئـەوەی تۆڵـە لـە بکوژانـی ئـەو بکەنـەوە. ئـەوەی سـەیرە لـەو لیستەدا مەنگوڕ لـە دوای ناوێکـی نەناسـراوەوە لـە پلەی پێنجەمـدا دێـت، کـە نـاوی کەسـێکە لـە کاتـی کوشـتنی قەڵەنـدەردا بەرپرسـی کـۆی ڕێکخسـتنەکانی یەکێتـی بـووە لـەو هەرێمـەدا. ئـەو ڕۆژە لیسـتەکەیان دەرهێنایـەوە بـۆ ئەوەبـوو نـاوی کامەرانـی سـەلمای تێبکـەن، بـەڵام دانانـی ناوەکـە لـە سـەری سـەرەوە وەک پاکردنـەوەی یەکێتییـەکان وەهـا بـوو لـە گوناهەکـە و گۆڕینـی بـوو بـۆ کێشـەیەکی خێڵەکـی، چونکـە هەمـوو شـار دەیزانـی کـە کامەرانـی سـەلما لـە هیـچ حیزبێکـدا نییـە، نـەک هـەر ئـەوە بەڵکـو کابـرا کەمتریـن ئارەزووشـی نییـە گوێـی لـە باسـی سیاسـەت بێـت و لـەو ڕووەوە سـەرودەر لـە هیـچ دەرنـاکات، دووری ئـەو هەمـوو سـاڵە

و ژیانـی ئێستاشـی لەگـەڵ سەوسـەندا کاتێکـی بـۆ جێنەمێشـتوە بیـر لـە سیاسـەت بکاتـەوە و بەجۆرێکـی منداڵانـە نـاوی حیزبـەکان و بەرپرسـەکانی لێتێکدەچێـت.

لەتیـف ئامـوون، قارەمانـی نوێـی ئامووونییـەکان، کـە وردە وردە ناوێکـی ئەفسانەیی پەیدادەکرد دژی ئـەوە بـوو نـاوی کامـەران بخرێتـە لیسـتەکەوە، بـە شـتێک لـە نائومێدییـەوە بیـری خالیـدی خسـتەوە کـە ئـەو پەیمانێکـی مۆرکـردوە کـە مـەرج نییـە سەوسـەن فیکـرەت بـۆ ئـەو بێـت و ئاموونییـەکان هەمیشـە پابەنـدی پەیمانـن و دەبێـت دان بـە ئازارەکانـی خۆیـدا بگرێـت. بـەڵام زۆر لـە ئامونییەکانـی تـر جۆرێکـی تـر بیریاندەکـردەوە و رایـان وابـوو سـووکایەتییەکی گـەورە بـە ئامونییـەکان کـراوە و خوێـن رژاوە و باڵندەکانـی خالیـد لـە ناوەڕاستی شـاردا کـوژراون، لەبەرئـەوە مەسـەلەکە لـە دەستی خالیـددا نییـە و هەمـوو ئاموونییـەکان بـە مـاڵ و سـامان و شـەرەف باجیانـداوە و تـەواوی خێڵەکـە بـۆ ماوەیەکـی دوورودرێـژ سـووکایەتی پێکـراوە و بکەرانـی گـەورەی ئـەو سـووکایەتییەش، لـەدەوری نـاوی کامەرانـی سـەلما کۆبوونەتـەوە و هـۆی سـووکایەتییەکەش هێنـدەی خواسـتی کامەرانـی سـەلمایە هیچـی تـر نییـە.

رقـی ئاموونییـەکان و خواسـتیان بـۆ تۆڵـە لـەوە گەورەتـر بـوو فـەوزی بـەگ و لەتیـف ئامـوون بتوانـن هێوریبکەنـەوە، تەنیـا شـتێک توانیـان بیکـەن ئـەوە بـوو نـاوی کامـەران پێـش نـاوی سـێ بکـوژە سـەرەکییەکەی قەلەنـدەر نەکەوێـت.

لەگـەڵ ئـەو کۆبوونـەوە گەورەیەشـدا ئاموونییـەکان لـە بەهـاری سـاڵی نەوەدوپێنجـدا زۆر لـە شـاری ئێمـە دووربـوون و لـەوەش لاوازتربوون دەسـتیان بگاتـە تۆڵـە. هەفتەیـەک دوای ئـەوە خێرخوایـەک هەواڵـی دانیشـتنی ئامونییەکانـی بـۆ کامەرانـی سـەلما نوسـی و بەیانییـەک بـە خشـکەیی بـۆی خسـتە ئـەو دیـو دەرگای نوسـینگەکەیەوە. کامـەران چەندجارێـک نامەکـەی

خوێندەوە و دواتریش بێنەوەی بترسێت یان بیریکاتەوە بۆ سەوسەنی خوێندەوە و گووتی «بەڵام بۆ؟ بۆ؟ من هیچم بەرامبەر ئامونییەکان نەکردوە، هیچ. من هەشت ساڵ لەمەوبەر چەقۆیەکم لە مەنسور ئەسریندا، بەڵام بەرامبەر ئامونییەکان هیچم نەکردوە...هیچ». سەوسەن لەو ساتەدا بێنەوەی هیچ دەربارەی بڕی مەترسییەکان بزانێت، ماچیکرد و گووتی «کامەران غەم مەخۆ... غەم مەخۆ، و بیر لە شتی خراپ مەکەرەوە». ساڵانی دووردرێژی ڕاو، کامەران فێربووبوو تەنیا لە مار و دوپشک و جاڵجاڵۆکەی ژەهراوی و چنگی چەقۆئاسا و دەنوکی بێڕەحمی باڵندەکان بترسێت، لەبەرئەوە ساڵ دوای ساڵ ترسی لە مرۆڤ کەمتر و کەمتر دەبووەوە... سەفەری بە دونیادا ئەو هەستەی لا لاوازکردبوو بزانێت خۆی لە چ دونیایەکدا دەژی. لەبەرئەوە زەردەخەنەیەکی گەورەی کرت و نامەکەی دڕی و گووتی «بێگومان غەم ناخۆم... بێگومان هیچ نابێت...».

ئەو ماوەیەی سەوسەن و کامەران پێکەوە ژیان، ڕۆژانێکی گەلێک خۆشی تێدابوو. باڵندەکانیان هەمیشە بەختەوەر بوون، هەمیشە دەیانخوێند، هەندێک لەو باڵدارانەی نێر و مێیان هەبوو هێلکەیان دەکرد و جوجکە باڵداری دیکەیان هەڵدەهێنا، هەندێ جار دکتور دڵشاد شوکور دەهات و دەرمانی تایبەتی دەدا بە باڵندەکان. کامەران لە ناو گوڵدانچییەکاندا جێگای خۆی کردبووەوە، ئەوەی بەخێراییەکی گەورەش دەوڵەمەنددەبوو، مایەی خۆشحاڵی هەموومان بوو.

٥١

بەدرێژایی ساڵی نەوەدوپێنج خوێندنی باڵندەکان و دەنگی بولبولەکان بەجۆرێک بەرزبوون هەر کاتێک بەبەردەم ماڵی سەوسەن گوڵدانچیدا دەڕۆیشتین گوێمان لە جریوە و واکواک و زیکەی بەجۆشیان بوو، هەموو باڵندەکان بەختەوەر دەیانخوێند، هەتا باڵدارە غەمگینەکانی خالید ئاموونیش گۆڕابوون و لەو کۆڕاڵە گەردونی و بەردەوامەی باڵندەکانی دیکەدا بەشداربوون. ئەو سەردەمە ئێمە ناوی ماڵی خانمان گۆڕیبوو بۆ کۆشکی باڵندەکان، کامەران هەموو دوو مانگ جارێک فۆتۆگرافێکی بانگدەکرد و وێنەی باڵندەکانی دەگرت، دەبایە خۆی و سەوسەن و فیکرەت گوڵدانچیش هەموو وەرزێک وێنەی نوێ و نوێتر لە نێوان قەفەزەکاندا بگرن.

لە هاوینی ساڵی نەوەدوپێنجدا کامەران یەکێک لە هاورێکانی خۆی هێنا کە وێنەی ڤیدیۆی دەگرت، تا یەکەم کاسێتی ڤیدیۆی درێژ بۆ خۆیان و باڵندەکان پێکەوە تۆماربکات، ئەوە یەکەمین تۆمارێکی ڤیدیۆیی باڵندەکان و ماڵی گوڵدانچییە کە ئێستا لە بەردەستماندا بێت، لەوێدا گوڵدانچی پیر دەبینین، بە خۆی و سمێڵە گەورە و دەموچاوە باریک و قامەتە رێکەکەیەوە لە چاکەتێکی سەوزدا لە بەردەم قەفەزی باڵندەیەکدا راوەستاوە، باڵندەیەکی دەنوک گەورەیە کە لەشێکی باریک و سەوز، لامل و سەرێکی قاوەیی هەیە. گوڵدانچی و باڵندەکە پێکەوە جووتێکی

سەیریان دروستکردوە، لە ڤیدیۆکەدا هەر دوو تەنیا و گۆشەگیر بەڵام دڵخۆش و ڕەزامەند دەنوێنن. باڵندەکە، چەشنە تەیرێکە تەنها لەسەر یەک دورگەی زۆر بچوک لە باشووری ئاسیا بە ناوی نارکۆندامەوە دەژی، هەر لەسەرەتاوە ئەو باڵندەیە کە لە شوێنێکی وابچوکی دونیادا دەژی و لە هیچ جێگایەکی تری دونیادا وێنەی نییە گوڵدانچی پیری سەرسامکردبوو. فیکرەتی پیر کە هەندێ جار سەیری چاوی حەکیمانەی باڵندەکەی دەکرد، ئەو ئارەزووەی خۆی نەدەشاردەوە کە دەیەوێت بڕوات و لەو دورگە بچوکەدا ونبێت و لەوێ لە ناو سروشتی ئازاددا لەگەڵ ئەم باڵندانە بژی... لە وێنەکەشدا ناوازەیی باڵندەکە تا ئەندازەیەکی زۆر ناوازەیی فیکرەت گوڵدانچی دووبارەدەکردەوە و زیاتر بەرجەستەیدەکرد.

لە وێنە و فلیمەکانی ئەو دەمەدا بە ئاشکرا ئاسەواری ژیانێکی جەنجاڵ و هاتوچۆیەکی گەرم لە نێوان سەوسەن و دونیای دەرەوەدا دەبینین. وێنە هاوینییەکان لە حەوشە گەورەکەدا ئەوە نیشاندەدەن کە زۆربەی شەوان خێزانی سەوسەن بە گەرمی و گوڕی پێشوازی میوانی زۆریان کردوە، بارودۆخی ناهەمواری سیاسی و داکەوتنی باری ئابووری لە وڵاتدا ڕێگر نەبوون لە بەردەم ئەوەدا کە سەرسەن وەک بوکێکی نوێ ژیانێکی پڕ داوەت و میوان بژی. کۆشکی باڵندەکان شەوانە بۆتە جێگای کۆبوونەوەی ماڵی برا و خوشکەکانی فیکرەت گوڵدانچی، ماڵی هاوڕێکانی کامەران، ماڵی ئەوانەی بە خۆزگەیەکی زۆرەوە دەهاتن تا باڵندەکان ببینن. ئەمڕۆ کە سەیری ئەلبومی خانەوادەگی خانم دەکەین، وێنەگەلی کەسانی زۆر نەناسراو دەبینین، وێنەی منداڵانی نەناسراو، بوک و زاوای گەنج، نیگاری خانەوادەگی گەورەی هەندێک کەس کە دووروونزیک خزمایەتییەکیان لەگەڵ گوڵدانچییەکاندا نییە. ئەوانە پێکڕا بەڵگەی دروستی ئەو ڕاستییەن کە ساڵی نەوەدوپێنج گەرچی یەکێکە لە تەڵخترین ساڵەکانی مێژووی سەدەی بیستی ئێمە، بەڵام دروست لەو

ساڵەدا خانم چڕترین و پڕترین ساڵی ژیاوە. هەر لەو ساڵەدا و لە چوارەمین چەژنی لەدایکبوونی هوزاردا سەدان میوانی تایبەتی کە دکتۆر رەفعەت ڕەمزی و پڕوشە بانگیانکردون حەوشی کۆشکی باڵندەکان پڕدەکەن، دەیان دکتۆری بەناوبانگ، بەڕێوەبەری هەموو خەستەخانەکانی شار، هەندێک لەو مامۆستایانەی زانست کە بەتایبەت دێن کامەران باسی شوێنە سەیر و جیاوازەکانی دونیایان بۆ بکات، هاوشانی کچانێکی گەنج کە هاوڕێی پڕوشەن و ئەو هەلەیان بە گونجاو زانیوە بێن و لە نزیکەوە باڵندەکان ببینن... هەموو لە وێنەکان و کاسێتەکانی ڤیدیۆدا دەردەکەون و پێکڕاش بە شادیی دەبینرێن.

لەو ماوەیەدا کامەران لەدەرەوەی ماڵیش ژیانێکی پڕ و زیندووی هەبوو، هەفتانە شەوێک لە ژێر زەمینی ئوتێلەکەی باوەجاندا لەگەڵ مەنگوڕ و هاوڕێکانیدا کۆدەبووەوە، بەختەوەربوو کە هێندەی پارە دەستدەکەوت دەیتوانی کرێیەکی ڕاستەقینە بدات بە مەنگوڕ، دەیتوانی هاوڕێ بێپارەکانی داوەتی خواردنەوە بکات. ئەو ساتانەی مەنگوڕ کامەرانی تێدا دەبینی زۆر دەگەشایەوە و بەختەوەر دەبوو، بەڵام لەو ساتانە بگوزەرێت، مەنگوڕ بە گشتی ڕۆژ دوای ڕۆژ بێدەنگتر و بێوەیتر لە جاران دەردەکەوت، هەندێک کاسبی تایبەتی دەکرد کە کەسمان بە تەواوی نەماندەزانی چییە. خەفەتێکی زۆری دەخوارد کە ئەو تەنیا کەسێک بوو نەیدەتوانی بچێت و باڵندەکان ببینێت، جار جار کامەران قەفەزی هەندێک تەیری لەگەڵ دەستی خۆیدا دەهێنایە بازاڕ و لە چایخانەی پەپولەی ئازاد دایدەنان و ئێواران کاتێک بۆ ماڵ دەگەڕایەوە لەگەڵ دەستی خۆیدا دەیبردنەوە، هەموو دەمانزانی بۆیە ئەو باڵندانە دەهێنێت تا مەنگوڕ بیانبینێت. بینینی باڵندەکان بێئەندازە دڵی مەنگوڕیان خۆشدەکرد، کە باڵندەکان دەیانخوێند مەنگوڕ نائومێدانە دەکەوتە جنێودان بەم شارە کە مرۆڤ جگە لە هۆڕنی ئوتومبێل و فڕەفڕی پاسە نەفەریەرەکان و هات

و هاواری دەستگێڕەکان زیاتر هیچی دیکەی تێدا نابیستێت. تا شەڕی ناوخۆ گەرمتر بووایە مەنگوڕ نائومێدتر و پیرتر دەینواند، هەڵبەت وەک هەمیشە پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ سەرکردەو پیاوە چالاکەکانی ناو یەکێتیدا هەبوو، گیانی بەوە بوو شەوان دەچووە سەر مێزەکانیان و بەدەنگی بەرز ڕەخنە ئاگرینەکانی خۆی دەگووت، خۆشحاڵ بوو بەوەی هەموو قسەیەکی لێقەبووڵدەکەن... زۆرجار و لە زۆر شوێندا بەدەنگی بەرز ڕەخنەی دەگرت. کە لێمان دەپرسی ئایا ناترسێت، بەئاشکرا ئەو جۆرە قسە توندانە دژی حیزب دەکات. دەیگووت «برادەری عەزیز، ئێوە فەقیرن... قوونی مەنگوڕ قەڵایەکی ئاسان نییە بە هەموو کەس بگیرێت».

لە بەهار و هاوینی ئەو ساڵەدا سەوسەن و کامەران چەندجارێک سەیرانی دەرەوەی شاریان کرد، کامەران هەموو جارێک ژمارەیەکی زۆر لە بولبولەکانی دەخستە پشتی پیکابێک و دەیبردن بۆ ناو سروشت، ئەو سەیرانانە بۆ سەوسەن و باڵندەکان وەک خۆی بە پێکەنینەوە دەیگووت «شادیهێن و خەفەتبەر» بوون.

لە بەیانییەکی فێنکی کۆتایی هاوینی نەوەدوپێنجدا سەوسەن وەک هەموو ڕۆژێکی دی هەستا بۆ ئەوەی پەنجەرەکان بکاتەوە تا هەوای نوێ بێتە کۆشکەکەوە، دوای ئەوەی کترییەکەی خستە سەر ئاگر بە ڕوخساری خەواڵووەوە وەک جاران چوو بۆ ماڵی باڵندەکان تا ئاوی بەردەمیان بگۆڕێت، ئا لەویادا و بۆ یەکەمجار، یەکەمین باڵندەی مردووی دۆزییەوە. ئەگەر نەڵێم جوانترین باڵندەی هەموو قەفەزەکان بوو، دەبێت بڵێم باڵندەیەک بوو لە هەرە جوانەکان، تەیرێکی ناوازە کە لەگەڵ کۆمەڵە باڵندەکەی مەنسور ئەسریندا هاتبوو، هەر بەو ناوەوە کە لەدونیادا پێناسرابوو «باڵداری خوداوەندان» ناویان نابوو، مەلێک ئەورووپییەکان لە جوانیدا وەک باڵداری بەهەشت سەیریانکردبوو، «پارادیسیۆ ئۆپادا»

ناوە لاتینییەکەی بوو، پەڕەکانی درێژ و زێڕین بوون، درێژی پەڕی زەرد و تەڵایی کلکەکەی هەندێجار لە مەترێک نزیک دەبووەوە، یەکێک بوو لەو باڵندانەی هەستێکی خودایی لای سەوسەن دروستدەکرد، هەرکات دەیبینی هەستی تێکەڵبوون لەگەڵ هەوای فیردەوسدا دایدەگرت. باڵندەکە بێ هۆیەکی دیاریکراو لە قەفەزەکەی خۆیدا مردبوو. کامەرانی سەلما لەسەر دەنگی سەوسەن لە خەو هەستا کە بە باڵندە مردووەکەوە لە نزیک سەرییەوە دەگریا، ئەوە یەکەمین ڕۆژی غەمگینی ژیانی هاوبەشیان بوو. فیکرەت دەبایە تەواوی بەیانییەکە قسە لەگەڵ سەوسەندا بکات و ئەو ڕاستییەی بیربخاتەوە کە باڵندەکان ڕۆحلەبەرن و دواجار ڕۆژێک لە ڕۆژان هەموو دەمرن. ئەو بەیانییە کامەران تەلەفونی بۆ کەمال یەڵدا کرد و باڵندە قەشەنگەکەیان بە مردویی برد بۆ مۆمیاکردن. بەڵام ئەوە لە سەوسەندا ترسێک و پرسیارێکی گەورەی دروستکرد: چی دەبێت گەر ڕۆژێک باڵندەکان هەموو بمرن... چی دەبێت؟ چی دەبێت گەر هەموو باڵندەکان بکەونە ناو هەمان ئەو بێدەنگییەی باڵندە مۆمیاکان تێیکەوتوون؟. گەر باڵندەکان هەموو بمرن، ئەوکات دەبێت بە هەموو ڕۆح و جەستە و خەیاڵی لەم شارەدا نوقم بێت، دەبێت ئەو ڕاستییە قەبوڵبکات کە ئەم شارە نەبێت هەموو ئەو شوێنانەی دی کە ئەو بۆیان هەڵدێت، دەڕۆن و لە ناودەچن، ڕاستییەک نەیدەتوانی قەبووڵیبکات و تاسەر لەگەڵیدا بژی.

هەفتەیەک دوای ئەوە «باڵداری خوداوەندان» بە مۆمیاکراوی و بە ویقاری تەیرێکەوە کە دەزانێت لە غوربەتدا مردوە گەڕایەوە بۆ ماڵێ... بەڵام هاتنەوەی باڵندەکە بە بێدەنگی، لەبری ئەوەی دڵی سەوسەن خۆشبکات، ڕایچڵەکاند و جارێکی دی دووری دونیای بیرخستەوە.

لەسەرەتای ساڵی نەوەدوشەشدا بارودۆخی سیاسی لە کوردستان تەواو دژواربوو، شەڕی ناوخۆ تا دەهات درتر و بێرەحمتر دەبوو، جەنگ

لەسەر داگیرکردنی هەولێری پایتەختی هەرێم تادەهات خوێناویتر دەگەڕا، لە ئاسۆکاندا هیچ هیوایەکی ڕێکەوتن بەدی نەدەکرا، ڕۆژانە سەدان خەڵک لە هەموو سنوورەکانەوە دەچوون بەودیودا. هەندێک لە کۆچبەران بەر لەوەی بڕۆن دەهاتن و دەپاڕانەوە تا لەگەڵ باڵندەکاندا وێنەیەک بگرن... هەندێک سەردانی کۆشکی باڵندەکانیان بە یەکێک لەو ئەرکە گەورانە دەزانی کە دەشێت لە سەفەرەکەیاندا بەخت و سەرکەوتنیان بۆ بهێنێت، لە پاییزی ساڵی نەوەدوپێنجەوە هەندێک لەو کەسانەی سەردانی کۆشکی باڵندەکانیان کرد، سوێندیان خوارد لە هەر جێگایەکی دونیادا بگیرسێنەوە، نامەو نیگار بۆ خانمی سەوسەن بنێرن.

لە کۆتایی ئابی ساڵی نەوەدوشەشدا و دوای نزیکی ساڵ و نیوێک لە دروستبوونی کۆشکی باڵندەکان، هێزەکانی پارتی دیموکرات هەولێری پایتەختی هەرێمیان لە دەست هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی دەرهێنا، شکستی هێزەکانی یەکێتی خێرا و ئەفسانەیی بوو، تێکشکانی ئەوان لە هەولێر بەجۆرێک بوو تووشی شکستێکی سەرتاسەریی کردن، هێزەکانیان لە هەموو قۆڵەکانەوە شکان و لە هەموو بەرەکانەوە هەڵهاتن. لەهەندێ جێگادا هەموو شتێکیان بە ساغی جێهێشت و لە هەموو لایەکەوە بەرەو سنوورەکانی ئێران پاشەکشەیانکرد، هێزەکانی پارتی لە ماوەیەکی زۆر کورت و خێرادا گەیشتنە شاری ئێمە. هەواڵی هەڵهاتنی سەرکردەکانی یەکێتی و شکستی هێزەکانیان شاری ئێمەی بە جۆرێکی بێوێنە شڵەقاند. ئاموونییەکان لە پێشی پێشەوەی ئەو هێزانەدابوون کە بەرەو خۆرهەڵات و بەنیازی گرتنەوەی دەڤەری ئێمە پێشڕەویانکرد. لەتیف ئاموون سەرکردەی بەشێکی ئەو هێزە گەورەیە بوو کە بەرەو ناوچەی ئێمە جوڵا. لەتیف پیاوێکی چکۆلانە و خڕ و سمێڵ بارێک بوو، خۆی بە کڵاشینکۆفێکی بێقۆناغەوە لە ماشێنێکی تازەی سەربازیدا لە پێشی هێزەکانەوە دەڕۆیشت، ئارام و لەسەرخۆ دەینواند. لەتیف لە ئاموونییە

زۆر خێڵەکییەکان بوو کە ناوی عەشرەتەکەی خۆی لە هەرشتێکی دیکەی دونیا بەلاوە گرنگتر بوو، تا ڕۆژی کوشتنی قەلەندەر کە هاوڕێی منداڵی و گەنجی یەکدی بوون، بڕیاری نەدابوو لەم شەڕەوە بئاڵێت، بەڵام کوشتنی قەلەندەر ناچاریکرد بە سەر و ماڵەوە خۆی فڕێبداتە جەنگەوە. ئەو ڕۆژەی لە دەروازەی شار هاتن بەمدیودا ئاموونییەکان نزیکی پێنج سەد چەکدار دەبوون کە دەیانویست دوای ئەو هەموو سووکایەتی و دەرکردن و ئابڕووبردنە بە سەرکەوتوویی بگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆیان، زۆریان بە ڕۆحی تۆڵە و هەندێکیان بە هیوای ئاشتی و ئاسوودەیی دەگەڕانەوە. پارتییەکان بێ شەڕ و بەرگرییەکی ئەوتۆ شاریان گرت، بینای یەکێک لە بارەگا سەرەکییەکانی یەکێتیان کرد بە بنکەی سەرەکیان و بە جۆرێکی خێرا هێزەکانی خۆیان بە شاردا بڵاوکردەوە.

خالید لە ماوەی ئەو ساڵ و نیوەدا بووبوو بە ئەندامێکی چالاکی حیزب. لەو ماوەیەدا ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕقی کۆدەکردەوە، بەردەوام لە گێنگڵ و ئازار و بێسەبرییەکی گەورەدا دەژیا، برینێکی قووڵی ناوەکی دەیجوڵاند... بۆ ئەوەی ئازارەکانی لە بیربکات و ژیانێکی نوێ دەست پێبکات بووبوو بە کادێرێکی سیاسی بزێو و چالاک. چیتر ئارەزوویەکی نەمابوو بە دیار کۆمەڵێک کەرەستەی ژنانەوە لە دوکانێکدا دابنیشێت، دەیویست نیشێکبکات ئازارەکانی خۆی لەبیربچێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەوڵە ڕێگر نەبوو لەوەی جارجار کەسانی تایبەتی بنێرێت سۆراغی ژیانی سەوسەن و کامەرانی سەلمای بۆ بکەن. هەموو ئاموونییەکان دەیانزانی تێکەڵبوونی بێسرەوتی ئەو لەگەڵ نیشوکاری حیزبدا هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەراقەی لە ناوەوە دەیخوات. ئەو ڕۆژەی لەتیف ئاموون لەگەڵ هێزەکەیدا بەرەو شار دەجوڵا، لە دوا چرکە و ساتەکاندا، لە گەرمەی خۆئامادەکردن و هێز ڕێکخستندا لە یادی بوو بنێرێت بە

دوای خالیـد ئاموونـدا بـۆ ئـەوەی لێیبپرسـێت ئاخـۆ ئارەزوویەکـی هەیـە لەگەڵیـدا بگەڕێتـەوە بـۆ شـار. ئـەو ڕۆژە بـۆ مـاوەی دە دەقیقـە گفتوگۆیەکـی دوو قۆڵـی لـە نێوان لەتیـف و خالیـد ئاموونـدا ڕوویـدا کـە تـا ئێسـتا کـەس ناوەڕۆکەکـەی نازانێـت، چونکـە تـا ئـەمڕۆ وەک نهێنییەکـی قفڵکـراو و داخـراو لـە نێوان هەردووکیانـدا ماوەتـەوە. کەسـانێک دەڵێـن خالیـد لـەو گفتوگۆیـەدا داوایکـردوە تۆڵـەی بۆبکرێتـەوە، کەسـانێکی تریـش دەڵێـن خالیـد تەنیـا گوتوویێتـی ئارەزوویەکـی نییـە بگەڕێتـەوە بـۆ شـاری نائومێدییـە گـەورەکان و حـەزدەکات تامـردن غەریـب بێـت... شـتێک کـە ئاشـکراو نکوڵـی لـێ نەکـراوە ئەوەیـە کـە تۆڵەکردنـەوە لـە کوشـتنی قەلەنـدەر یەکێـک بـوو لـە ئامانجـە سـەرەکییەکانی بەشـداری ئاموونییـەکان لـەو شـەڕەدا.

## ٥٢

ڕۆژێک بەر لە گەڕانەوەی پارتیزانەکان، لە نیوەڕۆوە هەموو شتێک لە شارە بچوکەکەماندا گۆڕدرا. مەنگوڕ کە بە تەواوی لە هەواڵی گرتنی هەولێر دڵنیابوو، بە پەلە گەڕایەوە بۆ ماڵێ و هەندێ کاغەز و بەڵگەنامەی تایبەتی کۆکردەوە و هەندێکیانی سووتاند و چەندانێکی تری لە جێگایەکی نهێنی شاردەوە و ئەو پارە دانراوەی لە ماڵ قایمیکردبوو لە پشتێنێکدا هەڵگرت و پشتێنەکەی بەستە پشتی و چەقۆیەکی کۆنی، کە یادگارێکی دێرینی یوسف کەویاربوو لەجێگایەکی نهێنی دەرهێنا و بە خێرایی بەرەو نوسینگەکەی کامەرانی سەلما کەوتە ڕێگا. بازاڕ تا ڕادەیەک چۆڵ و زۆر لە دوکانەکان داخرابوون، خەڵکی لە ترسێکی گەورەدا دەژیان. دەنگوباسەکان وەهابوون کە پارتیزانەکان هاوشان بە تانک و زرێپۆشەکانی سەدام حوسەین دەدەن بەسەر شارەکەدا. هەندێ لە بازرگانەکان لە ترسی تالانی لۆریان نابوو بەدەمی دوکان و مەخزەنەکانیانەوە و شتەکانیان بەرەو شوێنی باشتر و ئەمینتر دەگواستەوە. خەستەخانەکان خۆیان بۆ دۆخێکی نائاسایی ئامادەدەکرد، بەشی زۆری فەرمانگەکان داخرابوون، زۆربەی شەقامەکان تەواو خاڵیبوون. کە مەنگوڕ گەیشتە نوسینگەکەی کامەرانی سەلما سەیری لێهات کە نوسینگەکەی ئەو تەنیا شوێنی بازاڕە دەرگای کرابێتەوە، لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کامەران وەک لە هەموو دونیا بێئاگابێت لەگەڵ گەنجێکی منداڵکاردا دانیشتبوو

و باسـی جەنگەڵـە گەورەکانـی کەنـاری خۆرئـاوای ئەفریقـای بـۆ دەکـرد. کامـەران بـە خەندەیەکـی گـەورەوە وەک ئـەوەی ڕۆژێـک بێـت لـە هـەرە ڕۆژە ئاسـاییەکانی ژیـان پێشـوازی لـە مەنگـوڕ کـرد. مەنگـوڕ بێئـەوەی بـوار بـە کامـەران بـدات، بـە خێراییەکـی بێوێنـە گەنجەکـەی ڕەوانـەی ماڵـەوە کـرد و بـە کامەرانـی گـووت کـە خێـرا هەمـوو پارەکانـی لـە قاسـەی دوکانەکـە دەربهێنێـت و شـتە گرنگەکانـی کۆبکاتـەوە و نوسـینگەکە قفڵبـکات و بـڕۆن، چونکـە لـە چەنـد سـەعاتی داهاتـوودا پارتییـەکان بـێ بەرگرییەکـی ئەوتـۆ دەگەنـە ئێـرە. کامـەران سـەرەتا گووتـی «هـا مەنگـوڕ، بـەڵام هاتنـی پارتییـەکان ئـەو هەمـوو ترسـە گەورەیـەی بۆچییـە... خـۆت دەزانیـت مـن لـە سیاسـەتدا نیـم، خـۆت دەزانیـت... بـەڵام بـە ڕاسـتی حەزدەکـەم تـۆ ئـاگات لـە خـۆت بێـت، تـۆ لـە حیزبـدا بوویـت». ئـەم سـادەییەی کامـەران مەنگـوڕی بێزاردەکـرد. پەلـی گـرت و بـردی بـۆ ژووری نوسـینگەکەی خـۆی و پێیگـووت «کامـەران، گوێبگـرە... مـن لـەم شـارە مەلعونـەدا پیربـووم، حیکایەتێـک نییـە لـە کوچـە و کۆڵانـی ئـەم شـارەدا ڕوویدابێـت و مـن نەیزانـم. پەنجـا سـاڵە چـی لـەم شـارەدا قەومابێـت لـەم کەللەیەمـدا چەسـپیوە و نایەتـە دەرێ، دەزانـم خەڵکـی ئـەم مەملەکەتـە چـۆن بیردەکەنـەوە. هەمـوو پیـاوە گەورەکانـی ئـەم شـارە لـە شـتی بێمانـادا تیاچـوون... تێدەگەیـت، لـە شـوێن و سـاتی وادا تیاچـوون دەبـوو لـەوێ نەبـن، دەکـرا لـەوێ نەبـن. هەمـوو پیـاوە ئازاکانـی ئـەم شـارە بـۆ مـردن شـوێنی خـراپ و کاتـی خـراپ هەڵدەبژێـرن. بـە قەبـری باوکـم وایـە، سـەیرمکە، مـن لـە دوو سـاڵ لەوەوبەرەوە دەزانـم کـە ڕۆژێـک ئامووزنییـەکان دەگەڕێنـەوە. ئـەوە دیاربـوو درەنـگ یـان زوو بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان دونیـا دەگۆڕێـت و ئـەوان دێنـەوە شـار... تێدەگەیـت، مـن لەیەکـەم ڕۆژەوە کـە چەقۆکەمـان لـە کوڕەکـەی ئیبراهیـم ئەسـرین دا دەزانـم حیکایەتـی ئـەم خۆشەویسـتییەی تـۆ تێکـەڵ بـە هەمـوو پیـس و پۆخڵـی شـارەکە بـووە، بێئـەوەی تـۆ بتەوێـت یاخـود مـن بمەوێـت.

ئینسان نازانێت لەم شارە مەلعونەدا حەز لە ژنێک دەکات و سەیردەکات کەوتۆتە شەڕێکەوە نە سەری دیارە و نەبن. من پێتدەڵێم، هەرچییەک بووایە، شتەکان باشتر نەدەڕۆیشتن لەوەی من کردم... بەلام حەزدەکەم بزانیت من قەلەندەر ئاموونم نەکوشت، من قەت فەرمانی وام نەداوە، قەت فەرمانی کوشتنیم نەداوە، بەلام ئەوە ئێستا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. دوو ساڵ لە مەوبەر ئاموونییەکان نامەیەکیان بۆ ناردم، نامەیەکی زۆر تایبەت کە سەری هەرە باڵای ئاموونییەکان نوسیبووی، ئەو وەخت هەموو وایاندەزانی من قوونی گەورەی ناو مەسەلەکەم... وایاندەزانی من لە ترسا دەڵێم کە فەرمانی کوشتنی قەلەندەرم نەداوە، بەلام من ڕاستیم دەگووت، من خراپترین پیاوی ئەم شارەم، هەموو شتە خراپەکانم کردوە کوشتن نەبێت، سوێند دەخۆم کە زۆریش دڵم خۆشە کە هەرگیز کەسم نەکوشتوە، خۆت ئەوە دەزانیت، دوائەوە کە تۆ بە جۆرێکی تر گەڕایتەوە بۆ ئەم شارەو وازت لە چەقۆ و هەموو شتێک هێنا و بۆ خێزانەکەت دەژیت... ئەوە هیوای من بوو. ڕێک ئەوە هیوای من بوو، بە باڵندەکانەوە بێیتەوە و ببیت بە مێردێکی باش بۆ سەوسەن خان. بەلام ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە لە چەند سەعاتی داهاتوودا ئەم شارە وەک پۆپنەی کەڵەشێر سووردەبێتەوە، سەیرکە من نامەکەم پێیە، تێدەگەیت، بۆ تۆم هێناوە تا لای خۆت هەڵیبگریت، لە نامەکەدا نوسیویانە کە گوایە من تا ماوەیەکی تر دەتوانم خاتر جەم بم و خۆم نەخەمە سەغڵەتەوە، چونکە پێشتر، یەعنی پێش ئەوەی بمکوژن دەبێت بەچاوی خۆم مەرگی عەزیزترین کەسانی خۆم ببینم. سوێنددەخۆم بە قوونی هەرچی شەیتانە کە ئەم ئاموونیانە دەتوانن زۆر بێڕەحم بن... لە دەستیان دێت مرۆڤ لەسەر ساجی گەرم دانێن و سووریبکەنەوە، من قەت وام نەدەزانی. کامەرانی سەلما ئەوان و هەموو شارە مەلعونەکە دەزانێت کە تۆ عەزیزترین کەسی لەلام، ئەو کوڕەیت من تەمەنامدەکرد

لە ژیاندا هەمبووایە... ئێستا لە بەیانییەوە هەزاران خەڵک لەم شارە رایانکردوە، بێئەوەی هیچ کێشەیەکی گەورەیان لەگەڵ پارتی یاخود ئامووننییەکاندا هەبێت، هەزاران هەڵهاتوون لەبەرئەوەی لووتیان باشتر ئیشدەکات و بۆنی ئەو بەڵا گەورەیە دەکەن کە بەڕێوەیە، تۆ... تۆ... ئەو هەموو شتەت بەدواوەیە دەتەوێت دانیشیت و پەنجە نەجوڵێنیت؟ ئای باوکەڕۆ، تۆ دەبایە لە پێش هەمووانەوە لەم شارە دەرچیت و شوێنی خۆت لەو سەر مەرزە قایمبکەیت. ژیانی تۆ لە مەترسییەکی گەورەدایە... بە قەبری هەموو پێغەمبەران سوێنددەخۆم کە ژیانی تۆ لە مەترسییەکی گەورەدایە، من شتەکان لە بەرچاوت قورس ناکەم، بەڵام گەر وەک هەموو پیاوە ئازاکانی تری ئەم شارە قوونی خۆت خوار دانێیت و نەیجوڵێنیت، من نازانم چی دەبێت... بە قەبری مردوم، نازانم چی دەبێت».

کامەران وەک ئەوەی گەڕابێتەوە دۆخی جارانی، هەمان ئەو سەرسامی و بێوەڵامییەی پێوەدیاربوو کە چەند ساڵ لەمەوبەر پێش سەفەرەکەی تووشی بوو. وەک ئەوەی بە تەواوەتی نەزانێت چی دەکات، سەیری مەنگوڕی کرد و گووتی «من سوێندم خواردوە لەم شارە نەچمەدەرەوە... خۆت ئەوە دەزانیت. سوێندیشم خواردوە لە هیچ شەڕێکی دونیادا بەشدارنەبم... لەبەرئەوە نازانم چی بکەم». مەنگوڕ گووتی «گوێبگرە... گەر حەزت لە قسەی ڕووت و بێپێچ و پەنایە، تۆ بکەویتە دەست ئامووننییەکان نابیتەوە بە خاوەنی کەوڵی خۆت. گەر بتگرن دەتکوژن... ئەوە ڕاستییەکەیەتی. ئامووننییەکان چەند سەعاتێکی تر لێرەن، تێدەگەیت، گەر لەگەڵمدا نەیەیت منیش ناتوانم بڕۆم و بەجێتبهێڵم، ئەوسا هەردووکمان دەکوژرێین... ڕاستیت پێبڵێم حەزم لێ نییە وازوو قوونی خۆم لە جەهەنەمدا ببینمەوە، بەڵام گەر نەیەیت، ئەوا چارم نییە». کامەران بە نیگەرانی و سەرسامییەوە گووتی «مەنگوڕ،

ناتوانم سەوسەن و باڵندەکان بەجێبهێڵم... خوایە تۆ دەتەوێت چی بکەم... هیچ پیاوێک ناتوانێت ئەوە بکات».

مەنگوڕ گووتی «ماوەیەکی زۆر کەممان لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی بیریکەینەوە و بڕیاربدەین، ئێستا دەرگای نوسینگەکەت دابخە و بابڕۆین، دەبێت سەوسەن خان بەم چیرۆکە بزانێت، دەبێت بزانێت ژیانی تۆ لە مەترسیدایە».

لە ماوەی نیوسەعاتدا هەردووکیان لەبەردەم کۆشکی باڵندەکاندا بوون، بەوەدا مەنگوڕ بۆی نەبوو پێبخاتە کۆشکەکەوە، گفتوگۆکان لە بەردەم دەرگای کۆشکەکەدا ئەنجامدران. مەنگوڕ دوای ئەوەی حورمەتێکی زۆری نیشانی سەوسەن دا، بە شێوازی خۆی بۆی ڕوونکردەوە کە لە چەند سەعاتی داهاتوودا پارتییەکان شار دەگرن و دەشێت ژیانی کامەران لە مەترسیدا بێت. شتەکان لای سەوسەن بێمانا و کتوپڕ بوون، بێئەوەی هۆ ڕاستەقینەکەی بزانێت هەستیکرد هەموو گیانی دەلەرزێت، هەستی بە ساردییەکی لە ناکاوکرد، بە لاوازییەوە گووتی «کامەران بڕۆ، بڕۆ... تۆ دەتوانیت بڕۆیت من و گوڵدانچی لێرەین... ئەگەر مەنگوڕ مەترسییەک دەبینێت باشترە بڕۆیت. من هەشت ساڵ تۆم بە دونیادا نارد بۆ ئەوەی نەکەویتە شەڕەوە، ئاە... کەی شەڕ تەواودەبێت، کەی بۆ هەتاهەتایە شەڕ لەم شارەدا تەواو دەبێت. مەنگوڕ باشتر دەزانێت، من لای باڵندەکان دەمێنمەوە و باوکم لەگەڵدایە، بەڵام سوێندم بۆبخۆ بەشداری شەڕ نەکەیت، تفەنگ هەڵنەگریت، هیچ شتێک نەکەیت جگە لەوەی لە شەڕ ڕابکەیت».

کامەران سەیری ئەو ڕەنگە سپییەی کرد، سەیری ئەو لەرزە لە ناکاوەی کرد، لەرەی دەنگی، ئەو هەناسە باریک و دەنگە ناسکەی، ئەو غەمە لە ناکاوەی پەڕیبووە سەر ڕوخساری. نەیدەتوانی بەجێیبهێڵێت، بەڵام چی دەبێت گەر مەنگوڕیش لەگەڵیدا بمێنێتەوە و ئامووزنییەکان

بیگرن و بیکوژن... ئەوە ئازارێکی وەها لە دڵیدا دروستدەکات لەوانەیە بەرگەی نەگرێت. ئەی ئەگەر رۆیشت و نەیتوانی بگەڕێتەوە؟ ئەی دەبێت تا چەند ساڵی دی لە ترسی ئامونییەکان ڕابکات؟ ئەی ئەگەر بارودۆخی سیاسی گۆڕا و نەیتوانی سەوسەن ببینێتەوە؟ ئەی گەر ئامونییەکان ئازاری سەوسەنیان دا؟ . کامەران دەیزانی کە ناتوانێت وەڵامی هیچ یەک لەو پرسیارانە بداتەوە، بەڵام دڵنیابوو گەر ئەو نەڕوات مەنگوڕیش دەمێنێتەوە و لەوانەیە بکوژرێت، خۆی هەستی بە مەترسی نەدەکرد، پێیوابوو ترسەکانی مەنگوڕ دەربارەی شوێنی ئەو لە چیرۆکەکەدا لە جێگای خۆیدا نییە. هەموو دونیا دەزانێت کە لە کاتی کوشتنی قەلەندەر ئامون و ڕوداوەکانی دیکەشدا ئەو لە وڵات نەبووە، هیچ کەسێک نییە ئەوە نەزانێت، بەڵام مەنگوڕ پێیگووت «لەم شەڕەدا برا برای کوشتوە، چەندین کەس دەستی چۆتە خوێنی کەسی خۆی... وامەزانە کەس ڕەحم بە تۆ دەکات».

دوای ڕاڕاییەکی زۆر کامەران پلانێکی هەبوو، کە دەبایە جێبەجێیبکات.

لەگەڵ سەوسەندا چووە ژوورێ بۆ ناو کۆشکەکە، خۆی گۆڕی و بێ ماڵاواییەکی ڕاستەقینە سەوسەنی ماچکرد و گووتی «سەوسەن مەترسە، هەرچییەک بوو دەبێت ئازا بیت... تێگەیشتیت... دەبێت ئازابیت، من تا بکرێت زوو دەگەڕێمەوە، بەڵام ئاگات لە باڵندەکان بێت، مەچۆرە دەرەوە... زۆر ئاگات لە خۆت و باڵندەکان بێت، من زۆر زوو دەگەڕێمەوە».

کە کامەران لەگەڵ مەنگوڕدا ڕۆیشت، سەوسەن هەستی بە ساردییەکی گەورەکرد، هەستیکرد باڵندەکان جۆرە بێدەنگییەکی سەنگین و قورس دایگرتوون، ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، لەگەڵ ئەو گەرمییەشدا سەوسەن هەستیکرد دەبێت خۆی بە شتێکی دی داپۆشێت، بەڵام شتێکی ئەوتۆی دەست نەکەوت لە خۆی بئاڵێنێت. باوکی لە بەیانییەوە بەدوای هەواڵدا بەردەوام گوێی لە ڕادیۆکان دەگرت، لە ڕۆژدا چەند جارێک کوپێک چای

هەڵدەگرت و دەچووە ماڵی باڵندەکان و لەگەڵ تەیرەکاندا قسەیدەکرد. سەوسەن سەرنجیدا ماوەیەکە گوڵدانچی زۆر لەگەڵ باڵندەکاندا قسەدەکات، هێدی هێدی ئەو قسەکردنە زۆرە دەیترساند، بەڵام فیکرەت هەموو جارێک بە پێکەنینەوە دڵنیایدەکردەوە کە شتەکان ئاساییین و هێشتا عەقڵی لە جێگای خۆیدایە و شێت نەبووە. دوای ڕۆیشتنی کامەران بە سەعاتێک سەوسەن چووە ناو باڵندەکانەوە، چەندە هەوڵیدا دەنگی باڵندەکان لەم ساتی ترس و دڵتەنگییەی دوور بخەنەوە، بەڵام دەنگەکان بۆ هیچ جێگایەکیان نەبرد، هەستیکرد ئەمڕۆ بەچڕی و بە هەموو هەستەکانی لەم ماڵەدا و لەم شارەدا دەژی و هەرچییەک بکات ناتوانێت لە شوراکانی ئێرە دەرچێت.

٥٣

ئێوارەی یەکەم لەتیف ئاموون هەندێ خاڵی پشکنینی لەسەر شەقامە گشتییەکان جێگیرکرد، دۆشکەکانیشی لەسەر هەندێک شوێنی بەرز دامەزراند و گەڕایەوە بۆ بارەگا سەرەکییەکەی خۆی. گەرچی دوو ساڵ بوو خەونی بەوەوە دەبینی بگەڕێتەوە بۆ ئەم شارە و دووبارە کوچە و شەقامەکانی ببینێتەوە، کەچی ئێستا نە دڵی بەم سەرکەوتنە ئاسانە خۆشبوو، نە ئەم گەڕانەوە کتوپڕە شادومانیدەکرد. شتێک لە ناوەوە دڵی دەگوشی کە نەیدەزانی چییە، شارەکە بە ئەندازەیەک چۆڵبوو، نیگای شەقامە خاڵی و بێڕۆحەکان لە گەرمای خنکێنەری ئەم عەسرەدا بەجۆرێک ماندووکەربوون، مرۆڤیان تووشی نائومێدی دەکرد. کە گەڕایەوە بارەگاکە ناردی لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێکانییەوە خواردنیان بۆ هێنا. دوای نان خواردن، کەمێک بە پشتێنەکەی دەست و دەمی سڕی و لەسەر مێزەکە هەندێ بروسکەی خێرا و نامەی هەواڵنێرە بێتەلەکانی خوێندەوە کە لە شوێنی جیاوازەوە لە ورد و درشتی جوڵاندنەوەی هێزەکان ئاگاداریاندەکردەوە. زۆربەی بەرپرسە مەیدانییەکان دەیانویست بزانن چۆن لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا بجوڵێنەوە کە شار چۆڵدەکەن و پەیتا پەیتا بەرەو دەرەوە هەڵدێن. لەتیف بەدەم چا خواردنەوەوە بە قەڵەمدارەکەی خۆی گووت، نوسراوێک ئاڕاستەی هێزەکان بکات دەست بۆ هیچ کەسێک نەبەن و لێگەڕێن خەڵک بێ ڕێگریی هاتوچۆبکەن. قەڵەمدارەکە کوڕێکی

گەنجی باریکەڵە و درێژ بوو، سەیری لەو فەرمانە هات کە لەتیف ئاموون بێ گەڕانەوە بۆ سەروو خۆی بڕیاری دابوو. کوڕەکە دڵنیابوو ئەمە هەموو ئاموونییەکانی تر کە هاتبوون تۆڵەبکەنەوە و لەسەر شەڕ گەرمبوون تووڕەدەکات. بەڵام ئەو هەستی بە تەمەڵییەکی زۆر دەکرد، تەمی ڕووداوەکانی ئەم دوو ڕۆژە بەجۆرێکی گەورە بەرچاویان گرتبوو، وەک ئەوەی لە ناوەوە ئارەزوویەکی ڕاستەقینەی نەمابێت بۆ درێژەدان بەم جەنگە، وەک ئەوەی لەدڵەوە بخوازێت دوژمن و نەیارەکان، ئەوانەی ئەو دەبێت بەدوایاندا بگەڕێت و بیانکوژێت، بەخێرایی شار چۆڵبکەن و خۆیان بشارنەوە و ئەرکی سەرشانی ئەو سووکبکەن. کوڕە قەڵەمدارەکە لە خاوی و تەمەڵی لەتیف ئاموونیدا ئەوەی خوێندەوە کە دەیەوێت ماوەیەکی درێژ بیەخشێتە ناحەزەکان هەڵبێن و لە شاردەرچن. هەموو دەیانزانی هەوڵی وەها بێهودەیە، لەدەرەوەی ژوورەکەی لەتیف ئاموون ئەوانی دی بێئۆقرە چاوەڕوانی فەرمانێکی ڕاستەوخۆیان دەکرد، تا بێوچان دەستبکەن بە گەڕان بەدوای ئەو کەسانەدا کە لە لیستی گەورەی ئاموونییەکاندا بوون. کەمتەرخەمی ئەو ئێوارەیەی لەتیف هەمووانی سەرسامکرد. سەعات هەشتی شەو چوارکەس لە بەردەرگای ژوورەکەی لەتیفدا وەستان و داوایانکرد چاویان پێیبکەوێت، لەتیف لە ژوورەوە لە ژێر پانکەیەکی بچکۆلەدا جامەنەکەی داگرتبوو و بەسەری ڕووتی لە سەر کورسی و مێزێک دانیشتبوو و بیری لە نوسینی نامەیەک بۆ نوسینگەی عەسکەری حیزب دەکردەوە. میوانەکان برایەک و ئامۆزایەک و دوو خاڵۆزای قەلەندەر ئاموون بوون. هەر چواریان نائارام و تووڕە دیاربوون، پێیانڕاگەیاند کە نواندنی خاوێتی لە گەڕان بە دوای بکوژانی قەلەندەردا وادەکات هەلی تۆڵەکردنەوەیان سات دوای سات لاواز و لاوازتر بێت، هەر چواریان لەو بڕیارە تووڕەبوون کە دەرفەتی دابوو، خەڵک لە هەموو قوڵەکانەوە شار چۆڵبکەن. لەتیف بە خاوی و کەمتەرخەمییەوە پێیگووتن، ئەو کەسانەی ئەوان بۆی دەگەڕێن لە

شاردا نەماون، بەپێی زانیارییەکان لە دوێنێ شەوەوە لە شار دەرچوون و بەرەو سنوور هەڵهاتوون. بە ساردی و هێمنییەوە پێیگوتن بە بڕوای ئەو گەڕان لە شاردا سوودێکی نییە و سبەی دوای پشوویەکی یەک شەوانە، هێزەکانی خۆی بەرەو سنوور دەجوڵێنێت و دوای هەڵهاتووەکان دەکەوێت. قسەکانی لەتیف بۆ میوانەکان نائومێدکەر بوو، ئەوان دەیانویست خەڵکی شار تۆڵەیان ببینن، هەر چواریان بەدەنگێکی بەرز داوایان لە لەتیف کرد هێزیان بداتێ تا چیتر کات بە فیڕۆ نەدەن و دوای بکوژانی قەلەندەر بکەون. براکەی قەلەندەر گووتی، خاوی و دانیشتن لەساتی وادا هێندەی تر ئابڕوویان دەبات و دەبێت شتێک بکەن حەیا و نرخیان بە ڕاستی هەستێنێتەوە. لەتیف ئاموون کە ئێستا بە حوکمی ناچاری بوو‌بوو بە حاکمی بەشێکی شار، بەلایەوە قورس بوو دوای ماندوێتی ئەو دوو ڕۆژە لە شەوێکی واگەرمدا لە ژوورەکەی بچێتەدەرێ و مالان بپشکنێت. هەموو دەیانزانی لەتیف پیاوێکی کردەو ئازایە، بەلام قسەکردن و دانیشتنی لە ژێر هەوای پانکەکەدا ئەو سەرنجەی جێدەهێشت کە شەڕی بەردەوام و دووردرێژ ماندوویانکردوە . دوای سەعاتێک قسەکردن لەتیف ئاموون بە دەموچاوی پیاوێکەوە کە هەر ئێستا دەیەوێت بخەوێت، جامانەکەی کردە سەرێ و کلاشەکانی لەپێکردەوە و لەگەڵ چوار میوانەکە و هێزێکی بچکۆلەدا چووەدەرێ. دڵنیابوو ئەوە نەبێت کە دوای ئەم جەنگاوەرە تورانەبکەوێت، چارێکی تری نییە. براکەی قەلەندەر ئاموون چاوساغیان بوو، ئەو لە هەر کەس زیاتر پلان و هەوای تۆڵەی لەسەردا بوو. یەکەم جار چوون بۆ ماڵی قەپۆز جوقلی، کەدەرگاکانیان شکاند و چوونە ژوورێ دڵنیابوون کەس لە ماڵەکەدا نادۆزنەوە، تاریکییەکی سەنگین و کوشندە هەموو ماڵەکەی خنکاندبوو، بە کۆمەکی دوو لۆکس و چەند لایتێکی گەورەی دەستی ماڵەکەیان ژووراو ژوور پشکنی، قەپۆز لە ماوەی ڕابوردوودا بووبوو بە بەرپرسی یەکێک لە بەندیخانەکانی یەکێتی، بەلام شتێکیان نەدۆزییەوە

شـایەنی بایـەخ بێـت، دواجـار ئەلبومـی وێنەکانیـان دەرهێنـا و ئاگریـان لـە ماڵەکـە بـەردا و هاتنـەدەرێ. ئـەو شـەوە تـا دوازدەی شـەو ماڵـی هـەر یـەک لە سامانی کیسرا و هوشەجوجەشیان سووتاند، ماڵـەو مـاڵ بـە خۆیـان و لۆکس و لایتەکانیانـەوە نۆای بـرا و کەسـی نزیکـی ئەوانـدا گـەڕان، بـەڵام کەسیان دەسـت نەکـەوت. لەگەڵ نوشوسـتی هەموو پشـکنین و گەڕانێکـدا ئامووننییەکان تووڕەتـر و نائومێدتـر دەردەکەوتـن، هیسـتریانەتر دەرگاکانیـان دەشـکاند و دەچوونـە ژوورێ، تووڕەتـر شـتومەکەکانیان دەدا بەسـەر یەکـدا، ناحەزانەتـر نەوتیـان بـە ماڵەکانـدا دەکرد و دەیانسـووتاندن. لەتیـف ئامـوون چەندجارێـک هەوڵیـدا هێزەکـەی خـۆی لـە جێگایەکـدا جڵەویـکات و بیانوەسـتێنێت، بـەڵام نەیتوانـی... لـە نزیکـی سـەعات یەکـی شـەودا لـە ماڵـی مەنگـوڕی بابەگـەورە، ئەلبومـی وێنەکانیـان دەرهێنـا و ئاگریـان لـە خانووەکەی ئەویش بـەردا. لەتیف زۆری هەوڵـدا لەوێـدا بوەسـتن، بـەڵام ئامووننییـەکان سووربوون لەسـەر ئـەوەی بـەر لـەوەی خۆرهەڵبێـت و ڕۆژ بێتـەوە ماڵـی کامەرانـی سـەلماش بپشـکنن، دواجـار پێویسـتیان بـەوە بـوو لـە یـەک شـەودا، کـە هێشـتا شـەڕ گەرمـە، هێشـتا کـەس هۆشـی بەخۆیـدا نەهاتۆتـەوە، ئـەم چیرۆکـە کۆتایـی پێبهێنـن. هەمـوو دەیانزانـی کـە بەیانـی خۆرهـەڵات، شـار لـە خـەو هەسـتا، شـەوێک بەسـەر نیشـتەجێبوونی هێزەکانـی حیزبـدا تێپـەڕی، هەسـتکردنی مـرۆڤ بـە سـنووری خـۆی دووبـارە زیندوودەبێتـەوە، ئیتـر دەرفەتـی پەشـیمانی زیاتـر و ئەگـەری پاشـگەزبوونەوە گەورەتـر دەبێـت... ئـەوەی دەکرێـت دەبێـت لـەم شـەودا بکرێـت... هـەر ڕقێـک هەیـە دەبێـت ئەمشـەو خاڵیبکرێتـەوە.

لەسـەعاتی سـێی بەیانیـدا هێزەکانـی لەتیـف ئامـوون کـە بۆنـی دوکـەڵ و نـەوت و ئاگریـان لێدەهـات گەیشـتنە بـەردەم کۆشـکی باڵنـدەکان... لـە سـەعاتێک بـەر لـە گەیشـتنی ئەوانـەوە باڵنـدەکان تـەواو بێدەنـگ بوویـوون، بێدەنگییـەک کـە تـرس و چاوەڕوانـی، نـەوەک زوڵمـەت و خـەو چاندبـووی.

٥٤

لە سەعات یەک و نیوی هەمان شەودا سەوسەن فیکرەت خەبەری بووەوە و لە تاریکییەکەدا دەستی کوتا و دەستی بەر لەشی کامەرانی مێردی کەوت کە بە جلە کوردییەکانییەوە لە جێگاکەدا خەوتبوو. تاریکی ژوورەکە زۆر چڕبوو، سەوسەن چاوی نەیدەبینی، بەڵام نەیدەزانی کەی کامەران گەڕاوەتەوە، سەعات دەی شەو کە خەوت کامەران هێشتا لە ماڵ نەبوو. لای وابوو کامەران لەگەڵ مەنگوڕ و خەڵکانێکی زۆری دیکەدا لە ترسی تۆڵە هەڵهاتووە. بەرلەوەی چرا دەستییەکە دابگیرسێنێت، تەواوی هەستی خۆی لە تاریکییەکەدا کۆکردەوە و بۆنی بە سنگی کامەرانەوە کرد... وەک هەمیشە بۆنی باغەکانی دونیای لێدەهات، بۆنی کەشتی دوور، بۆنی با کە بەسەر کێڵگەی نێرگسدا تێپەڕیوە، بۆنی ڕاوکەرە ماندووەکان، بۆنی میوەی شارە دوورەکان و هاڵاوی قاوەی قاوەخانەکانی ئەو سەری دونیا... دوای دوو ساڵ لە گەڕانەوەی کامەرانی سەلما هێشتا بۆنی وەک ئەو ساتە وابوو کە لە گەشتە درێژەکەی بە جیهاندا گەڕایەوە. سەوسەن ماوەیەک لە جێگاکەدا دانیشت و تەنیا گوێی لە مشەی دەگرت، پاش ماوەیەک هەستیکرد زۆر پێویستی بەوەیە بیبینێت، بە ئەسپایی فانۆسەکەی داگیرساند و سەیریکرد، لە ڕەنگە شەرابییەکەی، لە برۆ ڕەشەکانی، لە خاوی قژی، لە چاڵی چەناگە و ڕێکبڕی ڕوخساری وردبووەوە... سەیری لە بێدەنگی باڵندەکان هات،

شەوانی تر ئەم کاتە بولبولەکان جارجار جریوەیەکیان لێدەهات، بەڵام ئەمشەو هەموو بە ئاگا و بێدەنگ بوون. ئارەزوویەکی گەورەی هەبوو کامەران هەستێنێت و لەگەڵیدا بخەوێت، بەڵام بێدەنگی باڵندەکان هێند قورس بوو، پەشیمانیکردەوە. لە تاریکیدا هەستا و چووە بەر پەنجەرەکان... ڕۆشنایی هەندێ ئاگری دووری بینی، بەڵام بێئەوەی لە هیچ دڵنیابێت گەڕایەوە ناو جێگاکەو حەزیکرد بخەوێت، لە ناکاو هەستی بە ماندوێتی و سەرئێشە و خاوییەکی گەورە لە لەشیدا کرد، لەمێژبوو بەو توندییە هەستی پێ نەکردبوو. نەیزانی کەی خەوی لێکەوتۆتەوە، بەڵام کە بە ئاگا هاتەوە دوو سێبەری زەبەلاح لەسەر سەری بوون. چەند ساتێک دواتر زانی ئەو دوو پیاوە یەکێکیان لەتیف ئاموون و ئەوی دیکەیان هاجەر ئاموونی برای قەلەندەرە. لەتیف ئاموون وەک یەکێکی زۆر ئازیزی خۆی لە خەو هەستێنێت، بە هێمنی دەستی خستە سەر جێگاکەی سەوسەن و بە ئەسپایی گووتی «خانم هەستە... هەستە... ئێمە لێرەین». کامەران و سەوسەن هەر دووکیان لەسەر چرپەکانی ئاموون ڕاچڵەکین، لەتیف ئاموون بۆ ئێستێک سەیری لە هێمنی خۆی هات، بەڵام نەیزانی دەبێت بڵێت چی، نەیزانی بۆ وا هێمن و لەسەرەخۆ و بەڕەفتارە. کامەران لە شوێنی خۆی هەستا و بێئەوەی هیچ بڵێت سەیری هەر دوو پیاوەکەی کرد و سەیری سەوسەنی کرد، هێشتا هەر لەخەودا بوو، هێشتا ڕوون نەیدەبینی، وەک بەدەم خەوەوە بێت گووتی «باڵندەکان لە دارستاندا ونبابن». کەسیان تێنەگەیشتن کامەران مەبەستی چییە، بەڵام بەر لەوەی کاتیان هەبێت بیری لێبکەنەوە، سەوسەن بە دەنگێکی گریاو و ترساوەوە گووتی «ئێوە کێن؟». لەتیف ئاموون سەیریکرد و گووتی «مەترسە سەوسەن خان، مەترسە». سەوسەن سەیری دەرەوەی کرد و هەستیکرد بەر پەنجەرەی ژوورەکەی پڕە لە خەڵکانی تر، فیکرەتی پیری بینی لەدەرەوە بە

تورەیی لەگەڵ هەندێ کەسدا قسەدەکات، ڕوناکییەکی گەورە هەموو هەیوانەکەی ڕوناککردبووەوە، فیکرەت بە نائارامییەکی زۆرەوە خۆی کرد بە ژووردا و سەیری لەتیف ئاموونی کرد و گووتی «هەڵکوتانە سەر ماڵان لە شەوی وەهادا... هیچ نییە جگە لە ڕەوشتێکی ناشیرین، ها بەڕێز لەتیف ئاموون، خۆت دەزانیت من چەند ساڵ دۆستی هەمووتان بووم، تێدەگەیت، لە ماڵی خۆمدا پێشوازیم لە ئێوە کردوە، ئەوەی تۆ دەیکەیت... سەعات سێی شەو بدەیت بەسەر ماڵی مندا ڕەوشتی ئەمنە کۆنەکانم بیردەخاتەوە... تێدەگەیت، بۆ ئەوەی بتوانین قسەبکەین و تێبگەم بۆ ئەم هەموو هێزەت هێناوەتە سەر ئەم ماڵە، هەر ئێستا ئەم چەکدارانە لە حەوشە و هەیوانی من دووربخەرەوە». تورەیی فیکرەت، کامەرانی بە ئاگاهێنایەوە، ئێستا دەیزانی کە ئاموونییەکان لێرەن. هاجەر ئاموون بە هێمنی گووتی « فیکرەت گوڵدانچی، بەداخەوە لە ماڵەکەی ئێوەدا کەسێک هەیە کە ئێمە بەدوایدا دەگەڕێین... کەسێک دەبێت لەگەڵ خۆماندا بیبەین». فیکرەت گووتی «لە ماڵی مندا کەسێکی تێدا نییە تۆ بیبەیت... ئەوەی تۆ بۆی دەگەڕێیت لێرە نییە. بەڵای هەموو بەڵاکان ئەوکاتە دەست پێدەکات کە مرۆڤ نەتوانێت خەتابار و بێ خەتا لە یەک جیابکاتەوە». هاجەر بە تورەییەکەوە گووتی «بەڵام خەتای هەموو خەتاکان ئەوەبوو تۆ کچەکەی خۆت دا بەو کەسانەی کە براکەی منیان کوشت». فیکرەت دەستی بەرزکردەوە و گووتی «ئەوانەی براکەی تۆیان کوشت دیارن، خەڵکی ئەم شارە هەموو دەزانن بکوژانی براکەی تۆ کێن، هەمووش دەزانن کە ئەوان بۆیان نییە پێ بنێنە ماڵی من... لەبەرئەوە جەنابت بە هەڵە خۆت کردوە بە ماڵی مندا».

لەو کاتەدا کە فیکرەت گوڵدانچی بێئارام دەینەڕاند. هەندێک لە ئاموونییەکان لە بەشەکانی دیکەی کۆشکەکەدا خەریکی شت شکاندن و ڕشتنی نەوت بوون بۆ ئەوەی کۆشکەکە بسووتێنن، هەندێکیان

دزەیانکردبــووە ماڵــی باڵنــدەکان و سەرسـامانە سـەیری مەلـە ترسـاو و بێدەنگەکانیـان دەکرد. لەتیـف لـە گەرمـەی گوێگرتـن لـە هاتوهـاواری نێوان فیکـرەت و هاجـەر ئامووندا بیریکەوتـەوە کـە دەشـێت چەکـدارەکان لەسـەر هەمـان هــەوای پێشــوو بـڕۆن و ئێـرەش ئاگـردەن، بـە خێرایـی لـە ژووری خەوتنەکـە چـووە دەرێ و بـە توڕەییـەوە هێزەکـەی خـۆی لـە کۆشـکەکە کـردە دەرێ و نائومێدانـە قیژانـدی کـە هیـچ کـەس نابێـت دەسـتکاری هیـچ شـتێک لـەم ماڵـەدا بـکات، هیـچ شـتێک.

توڕەیـی لەتیـف ئامـوون بەجۆرێک بوو ئاموونییەکانـی دی وەئاگاهێنایەوە، هاجـەر هاتـەدەرێ و بـۆ هێورکردنـەوە هەمـووان گووتـی «لێـرە جگـە لـە کامەرانـی سـەلما هیـچ شـتێکی دیکـە نابەیـن... هیـچ شـتێکی دیکـە».

هـەوای سـەرەتای ئەیلـول هێشـتا هـەر گـەرم بـوو، کـە کامەرانیـان سـوار ماشـێنەکە کـرد، سەوسـەن تەنیـا سـەیریدەکرد و هیچـی تـر، کـەس لەوانـەی لەوێدا بوون هیچیان لێ نەبیسـت، سـەیری ڕوخسـاری عارەقاوی چەکدارەکانی دەکـرد و بێدەنـگ بـوو، گوێـی لـە توڕەبوونەکانـی باوکـی دەگـرت و بێدەنـگ بــوو، بۆنــی نەوتــی ڕژاوی دەکــرد و بێدەنــگ بــوو، ســەیری سەرسـامی و دەستەوەسـتانی کامەرانـی دەکـرد و بێدەنـگ بـوو. دڵنیابـوو ئـەوەی کامەرانی ئیفلیجکـردوە، ئـەوەی وای لێکـردوە ئـاوا بەبێدەنگـی لەگـەڵ ئـەم چەکدارانـەدا بـڕوات، ئـەو سـوێندە گەورەیەیەتـی کـە هەرگیـز شـەڕناکات.

هاوارەکانـی فیکـرەت گوڵدانچـی تەنیـا کچەکـەی و کۆشـکی باڵندەکانـی ڕزگارکـرد، بــەڵام نەیتوانــی ڕێگــری لــە بردنــی کامــەران بــکات. کــە ئاموونییــەکان ڕۆیشــتن، فیکــرەت لــە بــەر هەیوانەکــە لەســەر پلەکەیــەک دانیشــت و دەســتیکرد بــە گریــان، نزیکــی دە ســاڵ لەمەوبــەر لــە ترســی شـەڕ هەڵهاتبـوو بۆ ئـەم شـارە، هەمـوو شـتێکی کردبـوو بۆ ئـەوەی جەنـگ ڕوونەکاتــە ماڵەکــەی، ڕوونەکاتــە ژیانــی کچەکانــی، بــەڵام ئێســتا دوای دە ســاڵ، دوای ئــەو ســوڕە گەورەیــەی زەمــان، جەنــگ لــە بەرگێکــی تــر

و شـێوەیەکی تـردا بـەر دەرگای پێدەگرتـەوە... ئێسـتا پێکـەوە لەگـەڵ سەوسـەندا لەسـەر پلەکـەکان دادەنیشـتن، فیکـرەت دەگریـا و سەوسـەن سـەیری ئاسـمانی دەکرد، هـەر دووکیـان دڵنیابوون کـە هەرگیـز ناتوانن لـە گەمـارۆی جەنـگ دەرچـن.

شتەکان زۆر خێرا تێپەڕین، لەتیـف ئامـوون لـە قووڵایـی دڵـەوە بـاوەڕی بـە پاکـی کامەرانـی سـەلما هەبـوو، گـەر توانـای هەبووایـە هـەر ئێسـتا ئازادیدەکرد، بـەڵام پلەوپایـەی لـە عەشـرەتدا بەرتەقـای پلـە حیزبییەکـەی نەبـوو، لـە سـەروو ئـەوەوە دەیـان هێز و یاسـا و دەسـتووری نهێنـی هەبـوون کـە دەسـەڵاتی ئەویـان بچـوک و بچوکتـر دەکـردەوە. ئـەو لـە ئێـوارەدا ڕاپۆرتێکی کورتـی خوێندبـووەوە کە دەڵێت کامەرانی سەلما دەمەونیوەڕۆ لەگـەڵ مەنگـوڕدا شـاریان بەجێهێشـتووە، بـەڵام گەڕانـەوەی بـۆ ماڵـەوە و خەوتنـی بـەو چەشـنە بەجلـە کوردییەکانییـەوە توڕەیکرد، لـە دڵـی خۆیـدا هاواریکـرد «تـۆ چ نەفامێکـی گەورەیـت... چ بێمێشـکێکی گەورەیـت، لـە ڕۆژێکـی وەهـادا چۆن لـە شاردا دەمێنیتـەوە». ئێسـتا دڵنیابوو ئەو سـەفەرە درێـژە بـە دونیـادا زۆر شـتی بیـر کامـەران بردۆتـەوە. لەتیـف ئامـوون هیـچ ئارەزوویەکـی نەبـوو قسـە لەگـەڵ کامەرانـی سـەلمادا بـکات، نـە لەبەرئـەوەی نەیدەویسـت، بەڵکـو دەیزانـی هـەر قسـەیەکی لەگەڵـدا بـکات دواتـر وەک مەراقێکـی گـەورە لـە دڵیـدا دەمێنێتـەوە... کوڕەکـە لـەوە گەنجتـر و جوانتـر بـوو، بکوژرێـت... دڵنیابـوو گوناهیشـی نییـە، دڵنیـاش بـوو هـەر وشـەیەک ئەمـڕۆ بگووترێـت، سـبەی لـە یادەوەریـدا ئـازاری گـەورە جێدەهێڵێـت. کـە بـە چەکدارەکانـی گـووت لـە یەکێـک لـە ژوورەکانـدا بیبەسـتنەوە و دەرگای لەسـەر کلیلـدەن، دەیزانـی هەرچییـەک بـکات بێهـوودە و بێمانایـە، دڵنیابـوو گـەر کامەرانـی سـەلما لـە ژوورەکـەی خۆشـیدا بخەوێنێـت، شانسـێکی ئەوتـۆی نییـە و ئاموونییەکانـی دی هـەر دەیکـوژن. لـە ئێـوارەوە هەمـوو بـۆ قوربانییـەک دەگـەڕان، بـۆ شـتێک دەگـەڕان توڕەیـی و نائومێـدی دووروودرێـژی

خۆیانی تیا خاڵیبکەنەوە... هەستیکرد پاڵنەرێکی ئەوتۆ و بەهانەیەکی مێند گرنگی نییە تا ڕێگری لە کوشتنی کامەرانی سەلما بکات. ماندوێتی و گەرما وایان دەکرد نەتوانێت بە ڕوونی بیربکاتەوە، دواجار هەموو شەڕێک پێویستی بە چەند قوربانییەک هەیە، بۆ جەنگاوەران ناخۆشترین شەڕ ئەوەیە خوێنی تێدا نەڕژێت. لە ئێوارەوە کە هاتبوونە شار، هیچ حاڵەتێکی تەقە و بەرگریکردن ڕووی نەدابوو، لە ناو شاردا بریندار و کوژراو نەبوو... لەتیف ئاموون شەرمەزاردەبوو گەر دواتر وەک سەرکردەی ساردترین و بێڕۆحترین شەڕی ناو مێژووی ئێمە باسبکرێت. بەڵام ئێستا ماندووبوو، بێئەوەی خۆی زۆر سەغڵەتبکات، فەرمانی بە قەڵەمداری مێزەکەی دا جێگای بۆ ڕابخات و بخەوێت، کە چووە ناو جێگاکەوە دڵنیابوو سبەینێ کە هەڵدەستێت چ هەواڵێک چاوەڕوانیدەکات. بەڵام ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە بە جۆرێک برستیان لێبڕی بوو، وەک کەسێک کتوپڕ بێهۆش بووبێت خەوی لێکەوت و لە خەویدا خەونی بەوەوە بینی کە خەبەری دەبێتەوە و خۆی لە سەر زەوییەکی دی و لە جیهانێکی تردا دەبینێتەوە کە زۆر لەم شارە و لەم جەنگەوە دوورە.

کوشتنی کامەرانی سەلما لە نێوان چواری بەیانی و شەشی بەیانیدا ڕوویدا، هۆی مردنەکە یەک فیشەک بوو، نرابوو بەسەر سنگییەوە. تا ئێستا کەس نازانێت بکوژەکە کێیە، تاوانەکە بەشێوەیەک لە نێوان ئاموونییەکاندا شاردراوەتەوە و بەشکراوە، مرۆڤ گومانی لە هەموویان بێت و گومانی لە کەسیش نەبێت. ئەوە ئەو خوێنە بوو کە ئاموونییەکان پێویستیان پێیبوو تادواتر بە هەستێکی ڕاستەقینەی شەرەف و سەرکەوتنەوە لەم شارەدا بژین. کوشتنی کامەران تەنیا جۆرێک نەبوو لە تۆڵە، بەڵکو جۆرێک بوو لە سروت و ڕیتواڵی پێویست کە دووبارە شوێن و سێبەری ئەوانی لە ژیانی ئێمەدا دەچەسپاندەوە. هەموو خۆشحاڵ بووین کە شارەکە بێکوشتارێکی ڕاستەقینە و شەڕی کۆڵانەو کۆڵان گیرایەوە، بەڵام

بـەوەدا لـە دابونەریتـی سیاسـەت و عەشـیرەتدا سـەرکەوتنێک نییـە بەبـێ خوێـن، کوشـتنی کامـەران وەک ڕەمـزی ڕاسـتەقینەی ئـەو سـەرکەوتنە لـە یـادەوەری ئێمـەدا بـۆ هەتاهەتایـە مایـەوە. لەسـەعات شـەش و نیـوی بەیانیدا لاشـەکەی کامـەران کـە لـە بەتانییەکـی ڕەشـەوە پێچرابـوو لـە بـەردەرگای مزگەوتـی گـەورەی شـاردا دانـرا. تـا نزیکـی سـەعات هەشـت کـەس نەیوێـرا بچێـت بەلایدا، لـە سـەعات هەشتدا دوو مـەلا بـە جلـی پیاوانـی ئاینییـەوە لـە تەرمەکـە نزیـک بوونـەوە و سـەریان لادا، نزیـک بوونـەوەی مـەلاکان کۆمەڵێک ڕێبـواری دیکەشـی هانـدا کـە تـاک و تـەرا بەسـەر شـەقامەکاندا دەڕۆیشـتن لـە لاشـەکە نزیـک ببنـەوە، یەکێکیـان کامەرانـی سـەلمای ناسـییەوە. لەسـەعات نـۆدا بـە یارمەتـی دوو مەلاکـە و بـە کۆمەکـی هەندێـک ڕێبـواری ڕاگـوزەری دی، تەرمەکەیـان گواسـتەوە بـۆ نـاو مزگەوتەکـە. لەسـەعات دە دا فیکـرەت گوڵدانچـی و دکتـور ڕەفعـەت پێکـەوە هاتـن بـۆ سـەیری لاشـەکە کـە لـە ژووری مردوشـتنی مزگەوتەکـەدا بـە جلەکانییـەوە لەسـەر تەختێکـی گـەورە دانرابـوو. خـۆی بـوو، کامەرانـی سـەلمابوو، بـە قـژە ڕەش و ڕەنگـە شـەرابی و برژانگـە درێـژ و ڕەشـەکانییەوە، بـە هێمنییەکـی بێوێنـەوە، بـە ئارامییەکـی زۆر قووڵـەوە مردبـوو، نیشـانەیەکی تـرس و تێکچـوون لـە ڕوخسـاریدا نەبـوو، بەڵکـو وەک یەکێـک ئـاگای لـە مردنـی خـۆی نەبێـت، وەک ئـەوەی چاوەڕوانـی هەسـتانەوەیەکی نزیـک و خێرابـکات، وەک ئـەوەی سـەرخەوێک بشـکێنێت و دواتـر ڕاسـت ببێتـەوە... وەهـا دیاربـوو.

کـە تەرمەکـەی کامەرانـی سـەلما گەیشـتەوە، گوڵدانچییـەکان زۆربەیـان لـە بـەردەم کۆشـکی باڵندەکانـدا ئاپۆرەیـان بەسـتبوو. دکتـۆر ڕەفعـەت نەیهێشـت لاشـەکە لـەو پیکابـە دەربهێنـن و بیخەنـە پێشـچاوی کـەس، پێشـنیاریکرد سەوسـەن بـۆ دواجـار لاشـەکە ببینێـت و دواتـر ڕاسـتەوخۆ بـۆ شـتن ببیـەن بـۆ نزیکتریـن مزگـەوت. سـەرەتا سەوسـەن بـاوەڕی بـە هەواڵەکـە نەکـرد، ئـەوەی بەوجـۆرە بەخێرایـی بێـوەژن بکەوێـت دواشـت

بوو لە ژیانیدا بیری لێکردبووەوە، هەستی بە ئازارێکی زۆر قووڵ کرد، ویستی بگری، بەڵام نەیتوانی، وەک هەمیشە بە نیگایەکی ماندووەوە، بە ڕەنگێکی پەڕیوەوە بە لەرزێکی نهێنی و توندەوە لە لەشیدا باوەشی بە فیکرەتی باوکیدا کرد، باوەشی بە پرۆشەدا کرد، هەموو دەگریان... بەڵام ئەو نەگریا. توند خۆی بەوانەوە نوساند و دڵنیابوو ژیانی بۆ هەتاهەتایە گۆڕاوە، بەڵام هەستەکانی بەجۆرێک ئاڵۆز و بێدەنگ و ناوەکی بوون، لەدەرەوە، لە نیگایدا، لە دەنگیدا مرۆڤ هەستی بە هیچ نەدەکرد، لەو ساتەدا سەوسەن لە ژنێکی مێرد کوژراو نەدەچوو، ڕوخساری کەمێک ترساوبوو، بەڵام ئەو ترسە بەشی ئەوەی نەدەکرد، مرۆڤ وەک خانمێکی کۆست کەوتوو تەماشاییکات، ئێستاش هەر لە منداڵە ڕەنگ پەڕیو و ماندووەکەی جاران دەچوو. دوای کەمێک بە دەنگێک کە وەک دەنگی باڵندەیەکی خنکاو وابوو، داوایکرد بەدەستی خۆی جلە خوێناوییەکان لەبەری کامەران دابکەنێت. پیاوەکان دەستیان گرت و بردیانە سەر لاشەکە. سەوسەن دەستی بە قژی تەرمەکەدا هێنا، ڕوخساری لە ڕوخساری ئەوکاتانە دەچوو کە پێکەوە دەخەوتن و دواتر ماندوو لەسەر باسکی ئەم خەوی لێدەکەوت. بەدەستی خۆی جلەکانی بە هێمنی لەبەر داکەند، ئەو پەڵە خوێنینە گەورەیەی بینی لە ناوەڕاستی سنگیدا، بەدەنگێکی کەمێک سەرسام و بەرز گووتی «کۆتری سینەزامدار... گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا... گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا». هەموو ئەوانەی لەوێدا بوون ئەو باڵندە قەشەنگەیان بیرکەوتەوە کە پەڵەیەکی سوور، وەک شوێنی خەنجەرێک، یان جێگا گوللەیەک لەسەر سینە سپییەکەی بوو. ئەو باڵندە تایبەتییەی دوو ساڵ لەوەوبەر کامەران بەجیا و وەک دیارییەکی تایبەت لە بەرچاوی هەموومان دای بە سەوسەن. سەوسەن دەستێکی لە خوێنی سەر سینەی کامەران دا و بۆنیکرد، خوێنەکە بۆنێکی سیحراوی هەبوو، بۆنی کامەرانی سەلمابوو کە

لەگەڵ هیچ بۆنێکی دیکەی دونیادا نەدەگۆڕدرا. چەندەها جار ناوی ئەو باڵندەیەی لەبەر خۆیەوە گووتەوە، ئێستا بە ڕونی جۆرە لێکچوونێکی بێویژدانانە و دڵڕەقی لە نێوان هەردوو ئەم بوونەوەرە جوانەدا دەبینی. لە بەرچاوی هەمووانەوە بۆنی بە هەموو لەشییەوە کرد، هەمان بۆنی سیحراوی جارانی هەبوو، بەڵام ئێستا تێکەڵی بۆساردێک بوو، پێشتر تەنیا لەسەر جەستەی مردووەکان بۆنیکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بە ئاشکرا بۆنی جیهانی لێدەهات... دڵنیابوو جارێکی تر ئەم بۆنە هەڵنامژێتەوە... لەبری ئەوەی بگری و بەخۆیدا بکێشێت، بە هێمنی چەند جارێک کامەرانی ماچکرد و چەند جارێکی دی قووڵ بۆنیکردەوە، کە پیاوەکان لە پیکابەکە دایانگرت، خەریک بوو بێهۆش دەکەوت، بەڵام هێزێکی ناوەکی ڕایگرت و گووتی «لە دوێنێ شەوەوە باڵندەکان تەواو بێدەنگن». قسەکەی هێندە کتوپڕ و سەیربوو، هەمووان کەمێک ڕامان، لەو ساتەدا باڵندەکانیان بیرکەوتەوە و سەرنجی ئەوەیان دا کە بێدەنگی باڵندەکان بە چەشنێک قورسە، بە چەشنێک لەسەر کۆشکەکە نیشتووە، هەموو بێئاگا هەست بە ئامادەیی دەکەن. فیکرەت گوڵدانچی ویستی هەندێک لە جلە خوێناوییەکان لە دەست سەوسەن وەرگرێت، بەڵام ئەو بە غەمگینی گووتی کە خۆی دەیەوێت تەواوی جلەکان بەدەستی خۆی بخاتە دۆڵابی یادگارە تاڵەکانەوە. بەبێدەنگی بە خۆی و جلە کوردییە خوێناوییەکانی کامەرانەوە بە ناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا ڕۆیشت کە تا دەهات زۆرتر و زۆرتر دەبوون. لەو ساتەدا سەوسەن لەبەرچاوی هەموو ئەوانەی بە ناویاندا تێپەڕی، لە شاژنێکی زامدار دەچوو، لە ساتی جێهێشتنی شانشینی گەورەی خەونەکانیدا.

## ٥٥

کامەرانــی ســەلما بـۆ ئــەوەی مەنگــوڕ لــە شــار دووربخاتــەوە و خــۆی بگەڕێتــەوە بـۆلای سەوســەن و باڵنــدەکان، دەبایــە لــە ڕێـگادا بــەرەو ســنوور لـە جێگایەکـی گونجـاودا خـۆی لـە مەنگـوڕ ونبـکات، بێئـەوەی گومانـی ئەوەی تیا بجوڵێنێـت کـە دووبـارە گەڕاوەتـەوە. ئـەو شـەوە مەنگـوڕ گەیشتە سـەر سـنوور بێئـەوەی ئاگاداربێـت کـە کامـەران لـە ژێـر باڵـی تاریکیـدا گەڕاوەتـەوە بۆ شـار. لـە ئێـوارەی ڕۆژی دووەمـدا هەنـدێ لەوانەی تازە لە شـار هەڵهاتبوون هەواڵــی کوشــتنی کامەرانــی ســەلمایان گەیانــدە ئەوانــەی لەســەر ســنووری ئێـران گیریانکردبـوو. هەواڵەکـە وەک بـاو بروسـکە بـە ناو هەمووانـدا تێپەڕی و شـەپۆلی دڵتەنگییەکـی گـەورەی جوڵانـد، لەگەڵ گەیشـتنی هەواڵەکـەدا هەموو مەنگوڕیـان بینـی چەنـد دڵۆپـە فرمێسـکێکی گـەورە لـە چـاوی هاتەخـوار، بـەڵام هیچـی نەگـووت. ئـەو شـەوە مەنگـوڕ لـە ژێرباڵـی تاریکیـدا دای بـە کێوە بەرزەکانـی سەرسـنووردا و ئیتـر تـا پتـر لـە دەسـاڵ نەمانبینییـەوە. مەنگـوڕ بەرلـەوەی لـە ئێرانـەوە بـەرەو دەرەوەی وڵات سـەفەربکات، کۆپییەکـی تاپـۆی خانووەکـە و نامەیەکـی مۆرکـراو وەک وەسـێت و بڕێکـی ئێجـگار زۆر پـارەی نـارد بـۆ سەوسـەن و لەگەڵیشـیدا تـەواوی کۆشـکەکەی بـۆ ئـەو جێهێشـت. مەنگـوڕ لەگـەڵ سـەدان کەسـی تـردا بـە کۆمەکـی ئـەو نەخشـە کۆنـەی لـە دەمێـک ساڵەوە کڕیبـووی و هەمیشـە لـە گیرفانیـدا بـوو لـە سـنووری ئێـران و تورکیـا چـوو بەودیـودا، لەگـەڵ دەیـان کەسـی تـردا بەپـێ سـنووری یۆنانـی

بەزاند، بەپێ بە خاکی گریکەکاندا تا ئەسینا ڕۆیشت، لەوێوە بە بەلەم بەرەو ڕۆخەکانی ئیتالیا پەڕییەوە، جارێکی دی بەپێ لە چیاکانی نێوان ئیتالیا و سویسرای دا و لە فەرەنساوە بەرە و بەلچیکا و لەوێوە بەرەو هۆڵەندا ڕۆیشت. ئیتر دە ساڵی تەواو هەواڵی لە ئێمە پچڕا... دەساڵ هیچ شتێکمان دەربارەی نەزانی، هیچ هەواڵێکیمان نەبیست. دوای دە ساڵ لە ئێوارەیەکی ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٦ دا وەک پیرەمێردێکی نەخۆش و پەککەوتە کە وەک خۆی دەیگووت «قوونی بە ئەستەم هەناسەی تیا مابوو»... گەڕایەوە و پێیگووتین کە بۆ مردن هاتۆتەوە.

کوژرانی کامەران لە هەلومەرجێکدا ڕوویدا کەس نەیتوانی غەمی گەورەی بۆ بخوات، زۆربەی هاوڕێ و دۆستە نزیکەکانی لە دۆخێکی دژواردا لەسەر سنوورەکان گیریان خواردبوو، یاخود لە شاردا بێدەنگ لە ماڵەکانی خۆیاندا چاوەڕوانی ڕووداوەکانی داهاتوویان دەکرد. دواتریش خوێنی کامەران وەک خوێنی زۆربەی کوژراوەکانی شەڕی ناوخۆ بوو بە ژێر تەپوتۆزی ئەو سەردەمەوە. لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا جارێکی تر پارتییەکان شکانەوە و یەکێتییەکان بە چ خێراییەک هەڵهاتبوون، بە هەمان خێرایی گەڕانەوە و پارتییەکانیش بە چ خێرایەک سەرکەوتبوون، بە هەمان خێرایی شکستیان هێنا و ئامووننییەکانش جارێکی تر لە زێد و ماڵی خۆیان ئاوارەبوونەوە. تاکە غەمگینی ڕاستەقینە دوای سەوسەن و فیکرەتی باوکی باڵندەکان بوون کە لە شەوی کوژرانییەوە تا چەندین ڕۆژ بێدەنگ بوون... سەوسەن لە ڕۆژانی پرسەکەدا بەردەوام ئەو باڵندە بچوکە سینە خوێنینەی کامەرانی خستبووە سەر سنگی و بە غەمگینی سەیری هەمووانی دەکرد. ئێستا هەموو شار، ناوی ئەو باڵندە بچوکەیان لە بەربوو گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا... گالیکۆلۆمبا لۆزۆنیکا. منداڵە بچوکەکانی شار لە کوچەکاندا ڕایاندەکرد و وایان دەگووت. سەوسەن لە کاتی پرسەکەدا هێندەی گوێی لە بێدەنگی قورسی باڵندەکان بوو، گوێی

لـە گریانـی کەسـوکارە تەعزێبارەکـەی خـۆی و کامـەران نەبـوو. سەوسـەن گەرچـی ئازارەکانـی زۆر قـووڵ بـوون، بـەڵام بـە فرمێسـک نەگریـا، لـە تـەواوی پرسـەکەدا جگـە لەسەرئێشـەیەکی بـەردەوام، جگـە لـە بێهێزییەکـی گـەورە کـە هێـدی هێـدی دەچـووە خوێنییـەوە هەسـتی بـە هیچـی تـر نەکـرد. لـە ناخدا پێویسـتی بەوەبـوو کـە ئـەم هەمـوو ئادەمیـزادە دەوروبـەری چۆڵبکەن و بگەڕێتـەوە بـۆ تەنهایـی خـۆی. هەمـوو ڕۆژانـی پرسـەکە هـوزاری لـە باوەشـدا بـوو و بـە هێمنـی سـەیری تەعزێکەرانـی دەکـرد، پێدەچـوو دوورونزیـک پەیوەندییەکـی ڕاسـتەقینەی بـەو دونیایـەوە نەبێـت کـە ئەوانـی دی تیـا دەژیـان و تیـا دەگریـان. نـە ئەوکاتـە و نەدواتـر، هیـچ کـەس شـتێکی تایبەتـی دەربـارەی هەسـتە ناوەکـی و قووڵەکانـی سـەبارەت بـە مردنـی کامـەران لـێ نەبیسـت. بـەڵام سەوسـەن ئیـدی لـەو ڕۆژی مردنەوە تا چەندین سـاڵ کۆشـکی باڵندەکانـی جێنەهێشـت و نەهاتـەدەرێ، هەوڵـی فیکـرەت گوڵدانچـی و پرۆشـە بـۆ هێنانـە دەرەوەی لـەو کۆشـکە بـە جێگایـەک نەگەیشـت. دوای تەواوبوونـی پرسـەکە تاکـە شـتێک بـۆی دەژیـا باڵنـدەکان بـوو، دوای کوژرانـی کامـەران ماوەیەکـی زۆری ویسـت تـا دووبـارە مەلـەکان کەوتنـەوە خوێنـدن و هاتنـەوە دەنـگ، بـەڵام دەنگـی ئێسـتایان لـە گوێـی ئێمـەدا غەمگینتـر دەزرینگایـەوە. ئـەو نرکـە و هاوارانـەی دواتـر لـە باڵندەکانـەوە دەهـات وایانکـرد نـاوی ماڵـی سەوسـەن بگۆڕیـن بـۆ کۆشـکی باڵنـدە غەمگینـەکان. هەنـدێ شـەو ماڵەکـە وەهـا لـە دەنگـی غەمگینـی باڵنـدە پڕدەبـوو، ئێمـەی ڕێبـواران کـە ڕاگـوزەر بـە کوچـەدا دەڕۆیشـتین وامـان دەزانـی دەنگـی کۆمەڵێـک ڕۆحـی مـردوە لـەو دیـو دەرگاکانـی کۆشـکەوە دەگریـن و شـیوەندەکەن. پەیوەنـدی سەوسـەن لەدوای کۆچـی کامەرانـەوە بـە هەمـوو شـتێکی دیکـەی ئـەو دیـوی کۆشـکەوە، سروشـتێکی سـەیری وەرگـرت، دوای دووسـاڵ و نیـو لـە دابـڕان و بێدەنگـی ئێوارەیـەک نـاردی بـەدوای ئاریـان جەودەتـدا، ئەمجـارە نـە تەنهـا بـۆ ئـەوەی وێنـەی سـەر دیـواری بـۆ بـکات، بەڵکـو بـۆ ئـەوەی لـە ڕێگـای کامێرایەکـی

فۆتۆگرافی تایبەتییەوە وێنەی بۆ بگرێت. بەوەدا خۆی نەدەچووە دەرێ دەبایە ئاریان هەموو هەینییەک وێنەی گۆڕەکەی کامەرانی بۆ بگرێت، وێنەی شەقامەکان و کوچەکانی شار. سەوسەن چیتر نەیدەتوانی لەگەڵ حەقیقەتی ئەم شارەدا بژی، بەڵکو تەنیا دەیتوانی لەگەڵ وێنەکانیدا هەڵبکات. لە مانگ و ساڵانی دیدا دەستیکرد بە چاندنی گوڵ لە حەوشیماڵەکەدا، هەموو ڕۆژانێکی هەینی چەپکێک گوڵی دەنارد بۆ سەر گۆڕەکەی کامەران. لە ساڵانی داهاتوودا کەمال یەڵداش وەک ئاریان دەبێتە میوانێکی بەردەوامی ماڵی گوڵدانچی، لە پاییزی ئەو ساڵەوە باڵندەکان هێدی هێدی و یەکە یەکە دەکەونە سەر مردن. کەمال یەڵدا هەموو جارێک دێت و بەدەستی خۆی باڵندە مردووەکان دەبات و بە مۆمیاکراوی دەیانهێنێتەوە. هێدی هێدی و ساڵ دوای ساڵ باڵندە مۆمیاکان تەواوی ژوور و ڕاڕەوەکانی ماڵی گوڵدانچی داگیردەکەن. ئاریان جەودەت دێت و وەک جاران بە هێمنی دەکەوێتەوە نیگارکردنی دیوارەکان. ماڵی گوڵدانچی بەجۆرێک پڕدەبێت لە تابلۆ سروشتییە شێتەکان و لە باڵندەی مۆمیاکراو و لە قەفەزی بولبولی غەمگین، مرۆڤ هەر کاتێک دەچێتە ناوی وادەزانێت پێی خستۆتە ناو جەنگەڵێکی دوور و بێهاوتاوە. پرۆشە و دکتۆر ڕەفعەت لەو ساڵانەدا بەجۆرێک سەرقاڵی کارن، بە چەشنێک لە ئیشی خەستەخانە و عیادەدا نوقمدەبن، هەوزاری کوڕیان بەشی هەرە زۆری کاتی خۆی لەگەڵ سەوسەن و باڵندەکاندا دەباتەسەر. سەوسەن لە دوای مردنی کامەرانەوە دەستدەکات بەوەی بایەخێکی بێوێنە بدات بەو منداڵە، ڕۆژ دوای ڕۆژ هەوای ناسینی دونیا و گەڕان بەزەویدا لەسەریدا سەوزدەکات. فیکرەت گوڵدانچی کە تا دێت زیاتر و زیاتر لەگەڵ باڵندەکاندا قسەدەکات و بەشێکی درێژی سەعاتەکانی خۆی لەگەڵ باڵندەکاندا دەباتەسەر، ڕۆژێک لەسەوسەن دەپرسێت، چۆن دەبێت کەسێک هەموو ژیانی خەونی بە جیهانەوە بینیبێت ئێستا لە کۆشکێکدا

خـۆی دیلبـکات و نەچێتـەدەرەوە؟. سەوسـەن پێیدەڵێـت لەبەرئـەوەی تەنیا لـەم ماڵـەدا دەتوانێـت هەسـت بـە گەورەیـی دونیا بـکات، لـەدەرەوەی ئـەم ماڵـە هەمـوو شـەقام و کوچەکانـی ئـەم شـارە جگـە لـە بچوکـی و تەسـکی هیچـی دیکـەی بیرناخەنـەوە. فیکـرەت ئێسـتا ئارەزوویەکـی نییـە وەک سـاڵان، کیژەکـە هانبـدات بچوکـی ئـەم شـارە قەبووڵبـکات، ئارەزوویەکـی نییـە لـەم زیندانـە تازەیـە دەریبهێنێـت کـە باڵنـدە و مۆمیـاکان بۆیـان دروسـتکردوە، بـە پێچەوانـەوە هەسـتدەکات خۆشـی هێـدی هێـدی بـەرەو جێگایـەک دوور لـەم شـەقامە سـارد و بێرۆحانە پاشەکشـەدەکات. کاتێـک دەگەینـە کۆتایـی سـەدەی بیسـت و پێشـوازی لـە سـاڵی دوو هـەزار دەکەین، فیکـرەت گوڵدانچی زمانێکـی تایبەتـی بـۆ قسـەکردن لەگـەڵ باڵندەکانـدا دەخولقێنێـت کـە تەنیا خـۆی تێیـدەگات. لەگـەڵ تێپەڕینـی کاتـدا فیکرەتیـش ئیـدی بـۆ پرسـەکان نەبێـت زۆر کـەم دەچێتـەدەرێ. بـەڵام وردە وردە دەبینێـت وەک مردنـی باڵنـدەکان پیاوانـی نـەوەی ئەویـش یەکەیەکـە دەکـەون و دەمـرن... هەنـدێ ڕۆژ ناچـارە لـە پرسـەیەکەوە بچێـت بـۆ پرسـەیەکی تـر. وەک هەمـوو پیـاوە بەتەمەنەکانـی وەک خـۆی کـە لـە پرسـەکاندا لەسـەر کورسـی مزگەوتـەکان دادەنیشـێت و گـوێ لـە سـورەتەکانی قورئـان دەگرێـت، جـۆرە تێڕامانێکـی فەلسـەفی دەربـارەی ماناکانـی ژیـان و مـردن سـەرقاڵیدەکات. فیکـرەت لـە دڵـی خۆیـدا دەڵێـت مـردن تەنیـا یارییەکـی خۆشـی ئـەم شـارەیە کـە هەمـوو بەباشـی دەیزانیـن. هەمیشـە کـە لـە پرسـەکان دەگەڕێتـەوە، بـۆ ئـەوەی کەمێـک خەیاڵاتـی مـردن لەسـەری خـۆی دەربـکات، بـۆ مـاوەی درێـژ لەگـەڵ باڵندەکانـدا قسـەدەکات.

لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـت و یەکـدا ئێوارەیـەک ئیبراهیـم ئەسـرینیش بەڕاسـتی ئیزرائیل دەبینێت، ئەو پیاوەی هەموو ژیانی ئیزرائیلی بەشـێوەیەکی تایبەتـی بینیبـوو، لـە سـاتی مردنـدا، لـەو دەقیقەیـەدا کە بەڕاسـتی ڕووبەڕووی ئیزرائیـل دەبێتـەوە، تێـدەگات کـە بەدرێژایـی ژیانـی بـە هەڵـە مردنـی بینیوە و

ئەوەی هەمیشە لەبەردەمیدا هاتووە و چووە ئیزرائیلی ڕاستەقینە نەبووە، بەر لە مردنی فریای ئەوە دەکەوێت بە کچەکانی بڵێت تا ئێستا هەرچی خولیایەکی مردن لەسەریدا بووە، دەستکردی تەپوتۆز و تاریکی ئەم شارەبووە و پەیوەندییەکی بە مردنی ڕاستەقینەوە نەبووە. تەنیا لە ساتی مردندا تێدەگات کە هەموو ئەو ئیزرائیلانەی پێشتر بینیونی پەیوەندیان بە ئیزرائیلی خوداوە نەبووە، بەڵکو هەموویان فریشتەی تایبەتی ئەم شوێنە و ئەم شارە تاریکە بوون، ڕەنگە جوبرائیلی ڕەحمەت بووبن و پەیامێکی تریان هێنا بێت. لە پرسەکەی ئیبراهیم ئەسریندا، فیکرەت گوڵدانچی جارێکی تر ساقی مەحمود دەبینێتەوە، پیرێکی چەماوە و ماندوو کە لەو دوو ساڵەدا بارتەقای چەندین ساڵ پیربووە. ئەو ئێوارەیە ساقی مەحمود و فیکرەت گوڵدانچی پیاسەیەکی دووروودرێژ دەکەن، بەڵام بەر لەوەی ماڵاوایی لە یەکتربکەن، ساقی مەحمود داوای لێدەکات ڕێگای بدات ڕۆژێک بێت و باڵندەکان ببینێتەوە، بەتایبەت باڵندەکانی مەنسور کە ئەو بە پێچەوانەی زۆر کەسی ترەوە هێشتا ڕێزێکی قووڵی بۆی هەیە و بە عاشقێکی ڕاستگۆ و گەورەی دەزانێت. ساقی مەحمودی پیر لە ئێوارەیەکی ئەو هەفتەیەدا چوو بۆ سەیری باڵندەکان و لەبەردەم قەفەزەکاندا دەستیکرد بە گریان. سەوسەن بە هێمنی لێیپرسی «بۆ دەگری؟». ئەو لەوەڵامدا گووتی «بۆئەوە دەگریم کە لەم شارەدا دەمرم و هیچ شتێک لەسەر دونیای گەورە و بەرین نازانم، ئەوەشی دەیزانم پڕە لە هەڵە و نادروستی». لەو ئێوارەیەوە ساقی مەحمود و فیکرەت گوڵدانچی بوون بە دۆستێکی زۆر نزیک. زۆر ئێوارە ساقی دەهات بۆ سەیری باڵندەکان و بەوە سەرسامبوو کە دەیبینی فیکرەت بە زمانێکی تایبەتی قسە لەگەڵ باڵندەکاندا دەکات، لەو ماوەیەدا فێربوون ئێواران پێکەوە لەگەڵ یەکدا دانیشن و تاوڵەبکەن، تاکە شتێک کە هەردووکیان سوێندیان لەسەر خواردبوو نەیکەن باسی سیاسەت بوو، بەتایبەت باسی دوو حیزبە گەورەکەی وڵات، هەردووکیان

لەو باوەڕەدابوون هەر مرۆڤێک بتوانێت غەمی ئەو دوو هێزە لە دڵ نەگرێت، دەبێت بە بەختەوەرترین مرۆڤی ئەم مەملەکەتە. سەوسەن بەوە بەختیاریوو ساقی بێت بۆ ماڵیان و لەگەڵ باوکیدا ببێتە دۆست. هەر لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کەسانێکی زۆر لەوانەی لەدەرەوەی نیشتیمانەوە دەهاتنەوە، نیگاری ئەو ڕێبوار و کۆچبەرانەیان بۆ سەوسەن دەهێنایەوە کە لەمسەرەو سەری زەویدا بڵاوبووبوونەوە و لە هەموو جێگایەکی دونیاوە وێنە و نامەی تایبەتیان بۆ دەنارد. خەڵکانێکی زۆر سوپاسی سەوسەنیان دەکرد کە لەگەیشتن بە ئومێدی خۆیاندا باڵندەکانی ئەو کۆمەکیکردون. هاوینی ساڵی نەوەدوهەشت و نەوەدونۆ لێشاوی سەردانەوەی کۆچبەرەکان بۆ کوردستان گەیشتە ترۆپکی خۆی، بەدرێژایی ڕۆژان و شەوانی هاوین، سەوسەن میوانداری ئەو دۆستانەی دەکرد کە نامە و کاغەزی ئەوانەیان بۆ دەهێنا کە لە مسەرەوسەری زەویدا نیشتەجێ بووبوون، هەموو وێنەی شارەکانی خۆیان بۆ دەنارد، وێنەی ماڵەکانیان، وێنە تایبەتییەکانیان لە کاتی گەڕاندا بە کوچە و بازاڕەکاندا، لە کاتی سەردانی باغچە جیاوازەکانی ئاژەڵاندا، نیگاری ئەو دورگە و دەریا و دەریاچانەی ڕێگایان تێیکەوتووە. هەندێکیان تکایان لەسەوسەن دەکرد پەڕێکی دیکەیان لە باڵندەکان بۆ بنێرێت، باڵندە غەمگینە موقەدەسەکان، وەک ئێستا ئێمە ناومان دەنان، ئەو باڵندانەی چەند ساڵ بوو بە گەرویەکی غەمگین دەیانخوێند. سەوسەن ئەلبومێکی زۆر گەورەی بۆ وێنەکان کردەوە، لەو ئەلبومەدا وێنەی چەندین شار و شارۆچکە و ناونیشانی جیاوازی دونیای تێدابوو، کە سەوسەن ڕۆژ دوای ڕۆژ کۆیدەکردنەوە، شەو دوای شەو دەریدەهێنان و پەنجەی دەخستە سەر وێنە بێدەنگەکان و چاویدەکردەوە و دەچووە ناویان، ئێستا لە جاران ئاسانتر دەیتوانی بۆنبکات و دەنگەکانیش ببیستێت، دەیتوانی چاوبکاتەوە و بە ڕاستی بۆنی شوێنە دوورەکان بکات، هاواری باڵندەکان ببیستێت، سەوسەن ئێستا دەیتوانی هەموو دونیا بهێنێتە ناو کۆشکی باڵندەکانەوە...

هەموو دونیا. بەڵام لەپاڵ ئەو میوانانەشدا بەردەوام ئاریان جەودەت و کەمال یەڵدا و فیکرەتی باوکی ڕادەسپێرێت، کتێب و ئەتڵەسی تایبەتی بۆ بکڕن، لە ماوەی چەند ساڵێکدا دووبارە ژمارەیەک کتێب دەهێنێتەوە بۆ ماڵ، کە زۆربەیان کتێبی تایبەتی گوڵ و باڵندە و جەنگەڵ و چیا و دەریاچەکانی دونیان. هوزار لە باوەشی پورە نەخۆشەکەیدا گەورەدەبێت، کە بەردەوام پەڕۆیەکی شینی بەسەرییەوە بەستوە و بەپەرداخێک چاوە کە بۆنی گەڵاچای بۆنداری لێدێت، بە دەم سەرنێشەیەکی هەمیشەیی و بە هەستی لاوازییەکی ئەبەدییەوە قسەی بۆ دەکات، کتێبەکانی پیشاندەدات، فێری ناوی لاتینی باڵندەکانی دەکات، فێریدەکات لە منداڵییەوە هەوڵبدات گوڵ لە ناو کتێبەکاندا بۆنبکات، باڵندە لە ئاسماندا بناسێتەوە، تەیرەکان بەپێی دەنگ جیابکاتەوە، ناوی شارەکان و ڕێگاکان و دوورگەکانی دونیای فێردەکات، لەو سەدان حیکایەتەی بۆ دەگێڕێتەوە کە کامەرانی سەلما لە شەوانی درێژی شووە کورتەکەیدا بۆی گێڕابووەوە. هوزار لە تەمەنی هەشت ساڵیدا بوو کاتێک دکتۆر ڕەفعەت سەرنجیدا کوڕەکەی ناوی لاتینی سەدان گوڵ و باڵندە دەزانێت، ناوی دەیان شار و دوورگەی لەبەرە کە ئەو نەیبیستون، دەزانێت کورتترین ڕێگا بەدەریادا لە نێوان ئەمریکای باکوور و باشووردا چییە. ئەوە تووشی ترس و تۆقانێکی کتوپڕی دەکات. دوای دەنگەدەنگێکی گەورە لەگەڵ پروشەدا کە گەلێک قاپی تێدا شکا و گەلێک پەرداخ لە سەر دیوارەکان زرمەیانکرد، دکتۆر بڕیاریدا ئیدی کوڕەکەی نەبات بۆ کۆشکی غەمگینی باڵندەکان و بیبات بۆ لای دایکی کە دەمێک ساڵ بوو داوای ئەوەی دەکرد کوڕەزاکەی لە سەر دەستی ئەودا گەورەبێت. دکتۆر کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو بە پیاوێکی مۆن، کاتی زۆرتر و زۆرتری لەگەڵ نەخۆشەکاندا دەبردەسەر، لووت بەرزتر و تووڕەتر دەبوو، پێیوابوو کە سەوسەن منداڵەکەی لە دونیایەکدا نوقمکردوە کە کەم و زۆر پەیوەندی بە منداڵییەوە نییە،

بەجۆرێک هەوای ناسینی دونیای خستۆتە سەرییەوە کە دەشێت منداڵەکە لە داهاتوودا لە دەوروبەری خۆی تێنەگات و توانای ژیانی تێدا نەبێت. دوورخستنەوەی منداڵەکە لە سەوسەن، هەردووکیانی تووشی نەخۆشییەکی گەورە کرد. لە هەموو ئەو ماوەیەدا سەوسەن لەگەڵ نەخۆشییە قورس و سەرئێشە بەردەوام و بێهۆشبوونە کتوپڕەکانیدا نەیهێشت دکتۆر ڕەفعەت سەیریبکات و وەک جاران دەرمانی بداتێ، دەبایە فیکرەت گوڵدانچی بەدوای دکتۆرێکی دیکەدا بگەڕێت و بیهێنێت بۆ ماڵەوە، لەو ماوەیەدا منداڵەکەش بەجۆرێکی ترسناک تووشی ڕشانەوە و لاوازی و سەرئێشە و لە هۆشخۆچوون هات... منداڵەکە لەو ماوەیەدا تەواو لە خوێندن دابڕا و نەیتوانی بچێتەوە بۆ قوتابخانە، ئەوە ژیانی دکتۆر ڕەفعەت و پرۆشەی وەها تێکدا، بەرنامەی کار و پەیوەندی هاوسەرییان بەجۆرێک تێکچوو کە یان دەبایە جیاببنەوە یاخود دەبایە منداڵەکە ببەنەوە بۆ لای سەوسەن. سەرسەختی و کەللەڕەقی دکتۆر دوای دوو مانگ گەیشتە کۆتایی خۆی و ڕۆژێک بڕیاریدا هوزار لەگەڵ پرۆشەدا بباتەوە بۆ کۆشکی باڵندەکان. ئەو ئێوارەیە دکتۆر بە پێچەوانەی سروشتی تووڕەی خۆیەوە، گەلێک بە ئەدەبەوە داوای لە سەوسەن کرد، شتی زۆر نەخاتە مێشکی منداڵەکەوە و خەیاڵی وا گەورە نەکات، دواتر نەتوانێت بژی. بەڵام سەوسەن زۆر بە ڕەقی سەیری دکتۆری کرد و بە وشکی گووتی «دکتۆر، کوڕەکە دەبێت دونیا بناسێت، نابێت وا تێبگات کە ژیان هەمووی ئەوەیە کە لەم شارەدا دەیبینێت». وەڵامەکەی سەوسەن لە ناخەوە هەمووانی ترساند، بەڵام نیگاکانی وەک هەمیشە بە چەشنێک بوون، کەم کەس دەیتوانی لە پێشدەمیدا دەنگ بەرزبکاتەوە و شتێکی پێچەوانە بدرکێنێت.

## ٥٦

باڵنـدەکان هێـدی هێـدی دەمـردن، دکتـۆر دڵشـاد مردنـی بەشـێک لـە باڵندەکانی دەگێڕایـەوە بـۆ تەمەنـی سروشـتیان و مردنـی هەندێکـی دیکەشـی دەگێڕایـەوە بـۆ نەخۆشـی تایبەتـی و مردنـی ژمارەیەکـی دیکەشـی دەخستە سـەر ئەسـتۆی غـەم. ڕۆژێکیـان دکتـۆر بـە سەوسـەنی گـووت « باڵنـدەکان لـە مـرۆڤ زۆر غەمگینتـر دەبـن... باڵنـدەکان وەک ئێمـە دەگریـن و ڕۆحێکـی ناوەکیـان هەیـە ئۆقرەیـان لێدەبڕێـت و کینگڵیـان پێـدەدا». سەوسـەن لـەو چەنـد سـاڵەدا تـەواو گەیشـتبووە ئـەو جێگایـەی بەڕاسـتی لە شـێوەی خوێندن و سروشـتی دەنگیانـدا هەسـت بـە غەمیـان بـکات، هەمیشـەش چەنـد ڕۆژێک بـەر لـە مردنیـان هەسـتی بـە هاتنـی کۆتایـی دەکـرد. لـە سـەرەتای سـاڵی دوو هـەزاردا کۆتـری سـینە زامداریـش مـرد. سەوسـەن چەنـد هەفتەیـەک پێشـتر هەستی بـە نزیکبوونـەوەی مردنـی کردبـوو، بـەڵام ئـەوەی نائاسـایی بـوو لـە سـاتی مردنـدا، لـە شـوێنی هەمـان ئـەو پەڵـە سـورەی سـەر سـنگییەوە، چەند دڵۆپـە خوێنێکـی چـڕ هاتنـەدەرێ، کـە سەوسـەن دەسـتی لێـدا و بۆنیکـرد هەمـان ئـەو بۆنـە تایبەتییـەی کامەرانـی سـەلمای لێدەهـات، ئـەو بۆنـەی سەوسـەن لەگـەڵ هیـچ بۆنێکـی دیکـەی دونیـادا تێکەڵـی نەدەکـرد. ئـەو بـوو، بۆنـی کامـەران بـوو جارێکـی تـر لـە ڕێگای خوێنـی ئـەم کۆتـرەوە دەگەڕایەوە. کـە کەمـال پەڵـدا هـات باڵندەکـە بەرێـت بـۆ مۆمیاکـردن، سەوسـەن تـکای تیاکـرد زۆر ئـاگاداری بێـت و تایبـەت ڕەفتـاری لەگەڵدابـکات. دواتـر مۆمیاکەی

لەسەر مێزێک لە نزیکی سەری خۆیەوە دانا و هەموو شەوێک بەر لە خەوتن تەماشایدەکرد. لەدوای پێنج ساڵ لە کوشتنی کامەران، سەوسەن وەک گەڕابێتەوە بۆ قۆناغی پێش گەڕانەوەی داواکارەکانی هەندێ شەو وەک جاران، ئەلبومە کۆنەکانی بەنهێنی دەردەهێنایەوە و سەیری وێنەی داواکارەکانی دەکرد، وەک ئەوەی چاوەڕوانی گەڕانەوەیان بکات، وەک ئەوەی هێشتا هیچ کەسێکیان نەگەڕابێتنەوە و ئەم باڵندانە تەنیا زادەی خەوێکی درێژبن. لەوە بترازێت سەوسەن لەو چەند ساڵەدا تووشی دەردێک بوو کە زۆربەی ژنی تەنیای دونیا تووشی دەبن، ماوەی درێژ لە بەردەم ئاوێنەدا دەوەستا و قژی شانەدەکرد، هەندێجار بە سەعات بەردەوام دەبوو، بێئەوەی بەڕاستی خۆی لە ئاوێنەکەدا ببینێت، قژی دادەهێنا و خەیاڵی بۆ جێگایەکی تر و بیری بەرەو شوێنێکی تر پەڕیبوو، قژی دادەهێنا و دایدەهێنایەوە، بەڵام لە بری خۆی باڵندەکانی دەبینی، لەبری خۆی ناو جەنگەڵ و دارستانە دوورەکانی دەبینی.

لەسەرەتای سەدەی نوێوە دوای ئەوەی هەر دوو حیزبە گەورەکەی وڵات بڕیاریاندا ئاشتببنەوە، هێدی هێدی ئاموونییەکان گەڕانەوە بۆ شاری ئێمە. ڕاستە زۆربەمان کوشتنی قەلەندەر و کامەرانی سەلمانمان لە بیرنەکرد، بەڵام یادگارەکانی شەڕ بە چەشنێک تاڵبوون زۆربەمان دەمانویست برینی ئەو ڕۆژانە نەکولێنینەوە و سەری زامەکان دووبارە هەڵنەدەینەوە. لە کۆتایی ساڵی دووهەزاروسێدا هەموو ئاموونییەکان جگە لە خالید ئاموون هەموو گەڕانەوە بۆ شار، زۆربەیان خانووەکانیان وەرگرتەوە و چوونەوە سەر ئیشە کۆنەکانیان. لە ماوەی ئەو هەموو ساڵەدا خالید ئاموون پەیوەندی بە سەوسەن فیکرەتەوە نەکرد، جۆرە شەرمێکی قووڵ و ترسێکی قووڵتر لە ناوەوە دەیهەژاند. دوای کوشتنی کامەران، خالید بە قۆناغێکی بێدەنگی گەورەدا ڕابورد، بە خۆی و تاپڕێکەوە پیاسەی دووروودرێژی بە کێوەکاندا دەکرد، هەموو هەفتەیەک چەند جارێک دەچوو

بۆ ڕاو، زیاد لە هەرجۆرە گیانەوەرێک باڵندەی ڕاودەکرد، گەرچی لە قسەو گفتیدا هەستمان بەشتێک نەدەکرد، بەڵام نیگا و سەیرکردنی بۆ باڵندەکان پڕبوون لە جۆرە کینەیەکی شاردراوە. هەرگیز گۆشتی باڵندە کوژراوەکانی خۆی نەدەخوارد، هێند هەبوو دەیهێنانەوە و دەیدا بە یەکێک لە پاسەوانەکانی و قسەیەکی لە زار نەدەهاتەدەرێ. خالید ئاموون زۆر زوو لە پلە حیزبییەکاندا سەرکەوت و بوو بە بەرپرسێکی کارای حکومەت، هەمیشە بە بێدەنگییەکی سەیرەوە کاریدەکرد، لە هەموو کۆبوونەوەی ئامووننییەکاندا بەشداردەبوو بێئەوەی قسەیەکی ئەوتۆبکات، هەموو هەستیان بەو غەمگینی و حەسرەت و کینە گەورەیەی دەکرد کە بەرۆکی ژیانی بەرنادات. کەدوای یازدەساڵ بۆ یەکەمجار بە ئیشێکی گرنگی حکومەت گەڕایەوە بۆ شار، سەیرمان لێهات کە لە ناو ئەو هەموو ئوتێلە تازە و خۆشەدا کە لەو ماوەیەدا لە شارەکەماندا کرابووەوە، ڕاستەوڕاست چوو بۆ ئوتێلەکەی باوەجان، لەوێ باوەشی بە خاوەنە پیرەکەیدا کرد و لە هەمان ئەو ژوورەدا دابەزی کە یازدە ساڵ لەوەوبەر لێیدابەزیبوو، هەموو خۆزگەمان دەخواست بزانین خالید ئاموون لەو ژوورەدا چی دەکات، پارەیەکی زۆرمان دا بە یەکێک لە خزمەتچییەکان تا لە ناکاو خۆی بکات بە ژوورەکەیدا و بزانێت ئەم بەرپرسە باڵایەی حکومەتی نوێ لەوێ چیدەکات، سەیرمان لێهات کە کوڕەی خزمەتچی بە پەشۆکاوی هاتەخوارێ و پێیگوتین خالید ئاموون لەسەر هەمان ئەو کورسییە کۆن و تەنهایەی جاران دانیشتووە و دەگری، ئەو پیاوەی خەریکبوو لە هەموو وڵاتدا دەبووە هێمای وشکی و دڵڕەقی، دوای ئەو هەموو ماوەیە هاتبووەوە بۆ ئەوەی لێرەدا بگری، لەو ساتەدا ئیتر دڵنیابووین کە یازدە ساڵە خالید لە ڕووی ڕۆحییەوە لەو چرکەیەدا وەستاوە و ناتوانێت بەجێیبهێڵێت. کە لە ئوتێلەکەی باوەجان دابەزی پاسەوانەکانی ئێمەیان دوورخستەوە و نەیانهێشت زۆر لە نزیکەوە بیبینین، بەڵام کە

سوار ئۆتومبیلەکانیان بوون ئێمەش دووراودوور بە ماشێنەکانمان دوایان کەوتین. ئەو ڕۆژە خالید ئاموون خۆی و پاسەوانەکانی بەرەو باکووری شار و بە ئاراستەی کۆشکی باڵندە غەمگینەکان بەڕێکەوتن. هەموو واماندەزانی دەچێت بۆ لای سەوسەن فیکرەت، بە جوانیشمان دەزانی لە جوانترین بێوەژنی شارەکەمان بپرسێتەوە و سەردانێکی کورتیبکات و هەوڵبدات شتێک لەو غەم و خوێنە بتەکێنێت کە لەسەر هەموو چیرۆکەکە نیشتووە. بەڵام بینیمان لە نزیک کۆشکی باڵندەکانەوە وەستا، لەو دیو دیوارەکانی کۆشکەوە گوێی لە دەنگی باڵندە غەمگینەکان گرت، کە ئەوکات خەریکبوو دەهاتنە کزی. چەند دەقیقەیەک لەوێ وەستا و تەنیا سەیری دیوار و پەنجەرەی کۆشکەکەی کرد، هەموو دەمانزانی چ ئازاریەخشە مرۆڤ لەم دیو دیوارەکانی ماڵی مەحبوبەیەکی کۆنەوە بوەستێت و نەتوانێت بچێتە ژوورێ، دەمانزانی چەندە سەختە مرۆڤ هەموو ژیانی حەسرەتی ئافرەتێک لە دڵیدا هەڵگرێت. لەگەڵ ئەوەی هەموومان بە بەرپرسی سەرەکی کوشتنی کامەرانی سەلامان دەزانی، بەڵام لەو چرکەی بێکەسی و بەدبەختییەدا کە لەمدیو دیوارەکانی کۆشکەوە وەستابوو، کسپە لە دڵمانەوە هات بۆی و گریانمان بۆی دەهات. کێ چوزانێت، ڕەنگە سەوسەن حەزیکردبێت بیبینێتەوە، ڕەنگە چەندین پرسیاری هەبووبێت لێیبکات، ڕەنگە گەر جورئەتیبکردایە و لەدەرگاکەی بدایە، دواجار هەموو شتەکان بگۆڕابانایە. هەموو دەمانزانی ئەوە دوا فرسەتی ژیانێتی تا دوا هەنگاو بنێت بۆ گەیشتن بەسەوسەن، بەڵام بێئەوەی لەدەرگا بدات سوار ئۆتومبیلەکەی بووەوە و ئەو کوچەیەی جێهێشت و ئیدی هەرگیز نەماندی بگەڕێتەوە. دواتر زۆرمان هەوڵدا لە ڕێگای پڕوشە و کچانی دیکەی خێزانی گوڵدانچییەوە بزانین خانمی باڵندەکان چۆن بیر لە خالید ئاموون دەکاتەوە، بەڵام هەموو دڵنیایانکردینەوە کە سەوسەن لەو ڕووەوە هیچ شتێک ناڵێت و ئامادە نییە هیچ حەرفێک بدرکێنێت.

٥٧

لـە سـاڵی ٢٠٠٢ دا سـاقی مەحمـود خوشـکەکەی مـرد و لەسـەر داوای فیکـرەت گوڵدانچـی گواسـتییەوە بـۆ نـاو کۆشـکی باڵنـدە غەمگینـەکان، لـە ڕاستیدا ماڵەکـە هێنـد گەورەبـوو جگـە لـە سـاقی چەندین کەسـی دیکەشـی دەگرت، بـەڵام سـاقی بەجۆرێـک دەسـتکورت بـوو، گـەر گوڵدانچـی دەسـتی نەگرتبایـە مـرۆڤ نازانێـت چـۆن و لـە کـوێ وندەبـوو. هاتنـی سـاقی بـۆ کۆشـکەکە کەمێـک ژیانـی سەوسـەن و هـوزار و فیکـرەت گوڵدانچیشـی پڕکـرد. ئیـدی بەیانیـان پێکـەوە بەرچاییاندەکـرد، هەمیشـە پڕوشـە بـازاڕی بـۆ دەکـردن، کـە وەک ژنێکـی بەهێـز و گورجوگـۆڵ ئیشـیدەکرد، بەسـەرێک لـە خەسـتەخانە ئەهلییەکـەی دکتـۆر ئیشـی حیسـاباتی دەکـرد و بەسـەرێکی دیش دەبایـە ئـاگای لـە باوکێکـی پیـر و خوشـکێکی نەخـۆش بێـت کـە وەک خـۆی دەیگـووت «لـە نـاو کۆمەڵێـک تەیروتیـوردا چەقیـوە و نایەتـەدەرێ» .
هەندێجـار لـە ماندووبوونـدا دەگریـا، ڕایدەکـرد بـۆ لای کچـە پورەکانـی، بـۆ لای مریـەم گوڵدانچـی کـە لـە لابۆرێکـی گـەورەی پشـکنینی پزیشـکی کاریدەکـرد و سـکاڵا زۆرەکانـی خـۆی لـە دەسـت دونیـا دەردەبـڕی، لـە دەسـت مێردەکـەی کـە کاری پزیشـکی گۆڕیـوە بـۆ کاسـبییەکی تەماحکارانـە، لەدەسـت نەخۆشـەکان کـە نازێکدەکـەن لـە توانـای ئەمـدا نییـە بیکێشـێت، لـە دەسـت خوشـکێکی نەخـۆش و ڕەنـگ زەرد و بێدەنـگ کـە هیـچ کـەس ناتوانێـت خەیاڵـی بخوێنێتـەوە، لەدەسـت باوکێـک کـە فێـری زمانێـک بـووە

باڵـندەکان نەبێت کەس تێیناگەن، لـە دەسـت شـارێک کـە تادێت جەنجاڵتـر و بێڕەحمتـر دەبێـت. تاکـە دڵنەوایـی ئـەوە بـوو کـە ئێسـتا دەتوانێـت بەباشـی ماشـێن لێبخوڕێـت و خێـرا لـە نێـوان هەمـوو جێگاکانـدا بێـت و بچێـت. بەیانیـان کـە دەگەیشـتە کۆشـک و گوێـی لـە دەنگـی غەمگینـی باڵـندەکان دەبـوو، سـەیری لێدەهـات چـۆن ئـەو باڵـدارە دڵخۆشـانەی کـە سەرەتا جریوەیان مرۆڤـی دەهێنایە سـەما و هەتـا پیاوێکـی کەمـدووی وەک دکتـۆر ڕەفعەتـی دەگەشـاندەوە و دۆخێکـی ڕۆحـی نوێـی پێدەبەخشـی، بـەو چەشـنە وەرگـەڕان و ئێسـتا ڕۆژ دوای ڕۆژ غەمگیـن و غەمگینتـر دەخوێنـن. بـەڵام کـە دەهاتـە نـاو ماڵەکـە کـە هەموانـی دەبینـی لەسـەر مێـزی نانخواردنـی بەیانـی چاوەڕوانـی هاتنـی ئـەو دەکـەن، کـە هـوزاری دەبینـی باوەش بـە پـورە سەوسـەنیدا دەکات و هەواڵـی باڵندەکانـی لێدەپرسـێت، هەناسـەیەکی قووڵـی هەڵدەمـژی، هەسـتی بـە گەورەیـی و قووڵـی ژیـان لـەم کۆشـکە گەورەیـەدا دەکـرد. دوو سێ جـار لـە مانگدا سـاقی مەحمـود و گوڵدانچـی هـەر لـە بەیانییـەوە دەچوونـە دەرێ، پێکـەوە هەمـوو شـار دەگـەڕان، چاخانەکانیـان بەسـەر دەکـردەوە، دەچوونـە بـازاڕی کۆنەفرۆشـان، ماوەیـەک لـە نـاو بالـە و بۆنـی شـێداری جلـی کۆنـدا ونده‌بـوون، دواتـر دەچـوون بـۆ یەکێـک لـە چێشـتخانەکان و نانیـان دەخـوارد، لەگەڕانـەوەدا دەچـوون بـۆ بـازاڕی ماسیفرۆشـان و ماسـییەکی گەورەیـان دەکـڕی و شـەو لـە مـاڵ دەیانبرژانـد. سـەرەتا سـاقی مەحمـود بـاوەڕی نەدەکـرد کـە فیکـرەت گوڵدانچی بـە ڕاسـتی بتوانێت قسـە لەگـەڵ باڵندەکانـدا بـکات، بـەڵام دواتـر ئـەو چیرۆکـە سـەیرانەی فیکـرەت لەسـەر باڵـندەکان و ژیانیـان و شـوێنیان دەیگێڕایـەوە بـە جۆرێـک سـەیر و ڕاسـتەقینە دیاربـوون، سـاقی گەیشـتە ئـەو بڕوایـەی کـە فیکـرەت تـەواو لـە باڵـندەکان تێـدەگات.

لـە بەهـاری سـاڵی ٢٠٠٣ دا کـە سـەدام حوسـەین ڕوخـا و ئەمریکییـەکان هاتنـە نـاو وڵاتەکـەوە، شـارەکانی ئێمـە تاقـە شـاری سـەر ئـەم ئەسـتێرەیە

بوون کە هاتنی ئەمریکییەکان و هەرەسی سەدام حوسەینیان لە دڵەوە پێخۆشبوو، دواجار هیچ کەس وەک ئێمە لەسەر ئەم ئەستێرەیە دڵڕەقی ئەو پیاوەی نەبینیبوو، سەوسەن ئەو وەرزە وەک شێت گەڕایەوە بۆ بەر تەلەفزیۆنەکان و لە قووڵایی دڵەوە ڕوخانی سەدام حوسەین شادومانیدەکرد، بەڵام تەنها کەسی شارەکەش بوو هەستی بە نزیکبوونەوەی تۆفانێکی ترسناکی ناگر دەکرد. لە کۆتایی ساڵدا بەر لەوەی سەدام حوسەین بە خۆی و ڕیشە درێژەکەیەوە لە چاڵەکەدا بگیرێت، باڵندەکانی خانم وەک ئەوەی نەیانەوێت ئەو ڕۆژە تاریک و ڕەشانە ببینن کە چاوەڕوانی وڵاتەکە دەکات، هێدی هێدی ژمارەیان ڕووەو کەمبوون دەچوو. فیکرەت گوڵدانچی مردنی باڵندەکانی وەک مردنی خەونی هەموو وڵاتەکە دەبینی. لە کۆتایی ساڵدا کەمتر لە پەنجا باڵندە لە قەفەزەکاندا مابوون، بەشێکی زۆری بولبولە بچکۆلە و باڵندە دەنگخۆشەکان مردبوون، لەگەڵ ئەوەشدا هەر کەسێک بە بەردەم کۆشکدا بڕۆیشتبایە گوێی لە دەنگی باڵندەکان دەبوو، بەڵام هەموو سەرنجمان دا کە دەنگەکان مانگ دوای مانگ کزتر و کزتر دەبن. هەندێ شەو سەوسەن وای بەخەیاڵدا دەهات کە گوێی لە دەنگی باڵندەیەکی مۆمیایە لە جێگایەک لە جێگاکانی کۆشکەکەوە هەڵدەستێت، هەڵدەستا و ژووراو ژوور دەڕۆیشت، بەڵام هیچی نەدەبینی و هیچی نەدەبیست... لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شەوێک ئەو دەنگە نامۆ و سەیرانە لەسەریدا زیندوودەبوونەوە. زۆرجار وای هەستدەکرد باڵندەکان لە جیهانێکی ترەوە، لە شوێنێکی ترەوە بانگیدەکەن، بەڵام هەندێجاری دیکەش هۆی ئەو دەنگانەی دەگێڕایەوە بۆ گیرخواردنی خۆی لە ناو زنجیر و قەفەزەکانی ڕابوردوویەکی تاڵ و کوشندەدا.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا ڕۆژێک مەنگوڕ گەڕایەوە بۆ شار... سەر و ڕیشێکی سپی هێشتبووەوە، زۆر لە جاران لاوازتر بوو. بەپێچەوانەی چاوەڕوانی هەموومانەوە، لەبری ئەوەی بەجلە نێرینە کوردییەکانییەوە دەربکەوێت،

بە چاکەت و پانتۆڵێکی کۆنەوە لەبەردەم چایخانەی پەپولەی ئازاددا دەرکەوت، کراسێکی سپی لەبەردابوو کە قۆپچەکانی سەرەوەی کرابوونەوە و تۆپەڵێک مووی سپی لە سنگییەوە هاتبووەدەرێ. دوای دەساڵ ژیان لە غەریبیدا بووبوو بە پیاوێکی بێدەنگ کە دەموچاوی هەندێکمانی لەبیربوو و هەندێکی دیکەشمانی نەدەناسییەوە. ئەو کات قەپۆز جوقڵی بووبوو بە فەرمانبەرێکی گرنگ لە یەکێک لە فەرمانگەکانی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش، سامانی کیسرا بووبوو بە دەموچاوێکی ناسراو هەندێجار لە تەلەفزیوندا دەردەکەوت و باسی «وەبەرهێنان» و «پلانی گشتی بۆ کێشەی نیشتەجێبوون» و ئەوجۆرە شتانە دەکرد، تا دەیتوانی خۆی لە ڕابوردوو بە دوور دەگرت و نەیدەویست کەس هیچ شتێک دەربارەی جارانی ژیانی بدرکێنێت و لاپەڕە کۆنەکانی هەڵبداتەوە، هوشەجوجە ڕیستورانێکی مۆدێرنی کردبووەوە کە هەرزانترین خواردن تێیدا بەرابەر سی دۆلاری ئەمریکایی دەوەستا. کە مەنگوڕ هاتەوە هەموو وامان دەزانی کە ئەوان دێن بۆ لای و دوای ئەو هەموو ساڵە داوای لێبوردن و گەڕانەوەی دۆستایەتی دەکەن، بەڵام هیچ کەسیان مەنگوڕیان لە بیرنەبوو. بەڵام بەدیوێکی دیشدا ئێمە واماندەزانی کە مەنگوڕ لەم دەساڵەدا هەموو ڕابوردووی لەبیرکردبێت، کەچی سەرسامبووین کە زانیمان ئەو لە هەموو ئەو ماوە درێژەدا جگە لە ڕابوردوو بیری لە هیچ شتێکی تر نەکردۆتەوە، کە گەڕایەوە بۆ چایخانەکە وەک جاران چەقۆیەکی کۆنمان پێبینی کە دەیگووت چەقۆکەی یوسف کەویارە. دیاربوو ئەو چەقۆیەی بە هەموو زەویدا گێڕاوە، ئێستاش لە گیرفانی قاتە خۆڵەمێشییە کۆنەکەیدا وەک هێمای وەفا بۆ سەردەمێکی بەباچوو هەڵیگرتبوو. لە یەکەم ئێوارەی دەرکەوتنییەوە بە ئێمەی گووت کە هاتۆتەوە بۆ ئەوەی لێرە بمرێت.

لە ئێوارەی ڕۆژی دووهەمدا بینیمان کە چوو بۆ کۆشکی باڵندە غەمگینەکان، هوزار دەرگاکەی لێکردەوە، بە دەنگێک کە پڕی حورمەتی

تەواو بوو داوای لێکرد سەوسەن خان ئاگاداربکاتەوە کە میوانێکی دووروڵاتی هاتووە کە ناتوانێت بێڕوخسەتی ئەو پێ بخاتە ئەو دیو دەرگاکەوە. بۆ ئێستێکی کورت سەوسەن نەیناسییەوە، سەوسەن لەم دیو ئاسنی دەرگاکەوە و ئەو لەو دیو ئاسنی دەرگاکەوە وەستابوون، بەرلەوەی تەواو بیناسێتەوە، سەوسەن هەستی بە بۆنێکی سەیرکرد، بۆنی پیاوێک کە ماوەیەکی درێژ لە قەراغ دەریایەکی گەورە ژیاوە، پیاوێک بۆنی دەساڵ ژیانی لە گوندێکی هۆڵەندیدا لێدەهات کە دەکەوتە سەر کەناری دەریا، دەساڵی ڕێک مەنگوڕ بە تەنیا لە کەناری ئەو دەریا گەورەیەدا ژیابوو، دەساڵی ڕێک هەموو ڕۆژێک چەند سەعاتێک سەیری دەریای کردبوو، بۆنێکی تایبەتی گرتبوو کە تەنیا سەوسەن دەیتوانی بیناسێتەوە. سەوسەن بەو دەنگە ناسک و نەخۆشەی کە تێپەڕینی ساڵان و پیربوونی دونیا کاری تێنەدەکرد، گووتی «ئاه مەنگوڕ، ئەو هەموو ساڵە لە کوێ بوویت، هەموو وامان دەزانی مردویت». مەنگوڕ لەسەرەخۆ گووتی «سەوسەن خان، دوێنێ گەڕامەوە، لەوسەری زەوی بووم، لە جێگایەک نزیک لە قوونی دونیاوە، لە قەراغ بەحرێکی گەورە... ئا سەوسەن خان، هەر هاتم لە دەرگاوە ڕێز و حورمەتێکی بچوک نیشانبدەم و سڵاوێکی کورت بکەم». ئەو بۆن دەریایەی کە لێیدەهات، وەها توندبوو، سەوسەن دەستی برد و بە هێمنی بەرەو ئەو دیو دەرگاکە ڕایکێشا و گووتی «مەنگوڕ، وەرە ژوورێ، لەم دە ساڵەدا دونیا وەها گۆڕاوە دەتوانم لە هەموو شتێک ببورم...». بینینی مەنگوڕ، هەر یەک لە فیکرەت گوڵدانچی و ساقی مەحمودی حەپەساند کە لە هەیوانی کۆشکەکەدا لەسەر مێزێک پێکەوە بەسەر تاوڵەیەکی کۆندا نوشتابوونەوە و لە گەرمەی زار هەڵداندا بوون. لەو چرکە ساتەدا کە هەمووان سەیری یەکتریان کرد، کە نیگاکان لە یەک گیربوون و چاوەکان تەماشای یەکدیان کرد، هەموو تێگەیشتن کە زەمان سوڕێکی گەورەی خواردوە، جیهان بەجۆرێک وەرچەرخاوە شوێنێک

بۆ ڕقە کۆنەکان و جێگایەک بۆ چیرۆکە بەباچووەکانی نێوانیان نەماوە، وەک ئەوە بوو زەمان لەم پیرییەدا سەرلەنوێ لە ئاوێکی نوێی هەڵکێشابن و دووبارە دروستیکردبێتنەوە، ڕووداوەکان بە چەشنێک هەموویانی هاڕیبوو، جێگایەک بۆ کینە تایبەتی و بچوکەکانی نێوانیان نەمابوو، نائومێدییەکانی ژیانیان بە جۆرێک گەورەبوو کە دەبایە لە چاوی یەکدا بۆ کەمێک ئومێد بگەڕێن... کە ساقی و مەنگوڕ باوەشیان بە یەکدا کرد، لای فیکرەت گوڵدانچی باوەشەکەیان لە ئاشتبوونەوەی دوو پیاوی زیندوو نەدەچوو، بەڵکو لە ئاشتبوونەوەی دوو لاشە دەچوو. چەند ڕۆژێک دواتر کە هەر سێکیان پێکەوە لەسەر بەرچایی بەیانی دانیشتن، فیکرەت بە پێکەنینەوە پێیگووتن «ئەوەی ئێمەی کردوە بە دۆست، نزیکبوونەوەی مردنە».

سەوسەن و فیکرەت گوڵدانچی هەرگیز ئەوەیان لە بیرنەکرد کە ئەم کۆشکەی لە ناویدا دەژین کۆشکی مەنگوڕە، چەند ساڵێکی زۆر هەوڵیاندا شوێن و هەواڵی لە گەڕیدە جیاوازەکانی دونیاوە بزانن کە لەملاولای زەوییەوە دەگەڕانەوە بۆ شار، بەڵام هیچیان دەست نەکەوت. ئەو ڕۆژە کە دەرکەوتەوە هەر دووکیان خۆشحاڵ بوون و پێشنیازی ئەوەیان کرد، لەم کۆشکە گەورەیەی خۆیدا لەگەڵیاندا بژی. هەڵبەت مەنگوڕ هیچ جێگایەکی نەبوو، خۆشحاڵ دەبوو، لێرەدا لە شوێنێکی وا هێمندا بژی. لە هەمان شەودا تاکە جانتاکەی هەڵگرت و هات بۆ کۆشکی باڵندە غەمگینەکان و لە ناو مۆمیاکاندا شوێنێکی بۆ خۆی ڕێکخست.

کە بەیانیان هەر سێکیان لەسەر مێزی بەرچاییەکە دادەنیشتن، سەوسەن وەک سێ باڵندەی مۆمیای گەورە دەیبینین... سێ پیرەمێرد بوون کە پێکەوە وەک سێ تارمایی بە ژوورەکانی کۆشکدا دەهاتن و دەچوون، هەموو ڕۆژێک چەند جارێک بە هەموو ژوورەکاندا دەگەڕان. مەنگوڕ بەردەوام چیرۆکی بۆ دەگێڕانەوە، لە شەوی یەکەمدا چیرۆکی جۆرە مەلێکی بۆ گێڕانەوە کە بە «باڵندەی پەنابەر» ناوبانگی

دەرچوویبوو، مەلێک بوو گوایە لە تورکیاوە تا ئەورووپا دوای پەنابەرە کوردەکان دەکەوێت. چیرۆکی خالیدی مەمەچاوبازی بۆ گێڕانەوە کە جووتێک باڵندە وڵاتە و وڵات تا ئەرویج لەگەڵیدا فڕیون. مەنگوڕ گووتی «خالید لە هەر جێگایەک بایە، ئەو جووتە تەیرە دەیاندۆزییەوە، جووتێ تەیری بچکۆلەبوون... ئێوە خالید ناناسن، من لە دوو جێگای سەفەرەکەمدا خالیدم لەگەڵدا بوو، من باوەڕم بە حیکایەتی ئەو تەیرانە نەکرد، تا شەوێکیان لە سالۆنێک لە ماڵی ناسیاوێک خەوتبووین، خالید هەمیشە بەدەمدا دەخەوت، کە هەستام بینیم هەر دوو باڵندەکە لەسەر قوونی نیشتبوونەوە. ئەوە یەکەمجاربوو ئەو تەیرانە ببینم، بەڵام دواتر ئەو تەیرانەم لای پەنابەری تریش بینیوە، پانەبەرم بینیوە لە گیرفانیاندا هێلانەیکردوە، تێدەگەن لە گیرفانی سەرەوە یان خوارەوەی چاکەتەکانیاندا جووجکی خۆیانیان هەڵهێناوە...».

مەنگوڕ لە ڕۆژی یەکەمەوە لە ڕێگای ئەو چیرۆکانەوە جێگای خۆی لە ماڵی سەوسەندا کردەوە. پیری زۆر کاری لە یادەوەری و فەنتازیاکانی نەکردبوو، لەگەڵ دوو پیرەکەی تردا بە ناو ماڵەکەدا دەگەڕا، باڵندەکانی بەسەر دەکردەوە، ئاوی بۆ دەگۆڕین، لەگەڵ هاوڕێکانیدا تاوڵەیدەکرد، لەگەڵیاندا دەچووە ناو شار، لە چایخانە جیاوازەکان دادەنیشت، کە دەچوونە بازاڕی ماسییەکە، خۆی وەک ماسی ناسێکی شارەزا پیشاندەدا. گەر ماسیفرۆشەکان گومانیان لە توانای بکردبایە، دەیگووت «کوڕی باوکم وەرە بۆنی دەستم بکە، بۆنی قوونم بکە، ئێستاش بۆنی دەریای لێدێت، تۆ دەتەوێت من فێری ماسی ناسی بکەیت؟». شەوان لە هەیوانی ماڵەکەدا هەر سێکیان سێ بەتانیان دەدا بە خۆیاندا و دادەنیشتن، سەیری ئەستێرەیان دەکرد و گوێیان لە خوێندنی دوا باڵندەکانی کۆشکەکە دەگرت. سێ باڵندەی پیر بوون... سێ باڵندەی پیر کە زەمان نەوەک کەمال یەڵدا مۆمیایکردبوون.

٥٨

لەو چەند ساڵەی دواییدا ئاریان جەودەت ڕۆژانە دەهات بۆ کۆشک، بەڵام ساڵ دوای ساڵ بێدەنگتر و بێدەنگتر دەبوو، هونەرمەندێکی ناوازە بوو کە جگە لە سەوسەن فیکرەت بینەرێکی دیکەی لە دونیادا نەبوو. بەیانیان بە خۆی و جانتای بۆیە و فڵچەکانییەوە دەهات و لەسەر یەکێک لە دیوارەکانی کۆشکەکە دەستی بە نیگارکێشان دەکرد، لەو چەند ساڵەی دواییدا زۆربەی جار خۆی نیگارەکانی هەڵدەبژارد، هەمیشە دەستەسرێکی سووری تەنکی بە گەردنییەوە دەبەست و کاسکێتێکی سەوزی لەسەر دەکرد و لە کۆشکی باڵندە غەمگینەکاندا بێپرسیار دەردەکەوت. وەک هەمیشە ڕۆژانە چەندجارێک لەگەڵ سەوسەندا دادەنیشت و چای دەخواردەوە. چەند ساڵ بوو ئەو چایە نەبێت کە سەوسەن لێیدەنا و پڕیدەکرد لە گەڵای بۆندار لە هیچ شوێنێکی تر چای بۆ نەدەخورایەوە. هێدی هێدی ئاریان ببووبوو بە بەشێک لە کۆشکەکە. هەندێ شەو تا بەیانی لە کۆشکەکەدا دەمایەوە و نیگاریدەکێشا، سەوسەن هەمیشە بۆ ماوەی درێژ بەدیاریەوە دادەنیشت و سەیریدەکرد، بەڵام هەندێ جاریش لێدەگەڕا بە تەنیا ڕەسمبکات. هەندێ شەو بەدەم خەوەوە هەڵدەستا و سەیری لێدەهات کە ئاریانی دەبینی لە جێگایەک لە جێگاکانی کۆشکەکەدا مەستانە نیگاردەکات. بە نۆبەت دیوار دوای دیوار نەخشیدەکرد، کە ئیدی شوێنی بەتاڵ نەدەما نیگارێکی کۆنی بە

بۆیـەی سـپی دادەپۆشـی و لەسـەرەوە دەسـتی پێدەکـردەوە. هەنـدێ ڕۆژ هـەر سـێ پیـاوە پیرەکـە، سـێ کورسـیان دادەنـا و سـەیریاندەکرد، بـەڵام ئاریـان دڵنیابـوو ئـەم سـێ پیـرە ناتوانـن وەک سەوسـەن تێبیگـەن.

کـە لـە سـاڵی دووهەزاروچوارەوە جەنـگ لـە عێـراق ڕەوتێکـی شـێتانەی وەرگـرت، سەوسـەن بـەردەوام لـە نیـگاری تەقینـەوە و لاشـەی سـووتاوی سـەرجادەکان هەڵدەهـات و لـە وێنەکانـی ئاریانـدا نوقمدەبـوو. بـەردەوام لـە خـۆی دەپرسـی کـەی سـێبەرەکانی مـەرگ دەگەنـە ئـەم شـارە. لـەو ماوەیـەدا تەنیـا ئـەوەی لـە خەیاڵـدا بـوو هـوزار لـە جەنگەکانـی ئێسـتا و سبەی ڕزگاریـکات. ئـەو وێنەیـەی کـە دەشـێت سـبەینێ هـوزار گەورەبێـت و بیبـەن بـۆ جەنـگ، دەشـێت گەورەبێـت و تەقینەوەیەکـی شـێت لەسـەر شـەقامێکی ئـەم وڵاتـەدا بیکوژێـت، شـێتیدەکرد. هـوزار لەگـەڵ گەورەبوونیـدا پتـر لـە دونیـای پـورە غەمگینەکەیـدا نوقـم دەبـوو. کـە تەمەنـی بـوو بـە دوازدە سـاڵ لەگـەڵ سەوسـەندا سـوێندیان خـوارد کـە چیتـر نهێنـی خۆیـان ئاشـکرانەکەن و ئـەوە دەرنەخـەن کـە سەوسـەن لـە ژێـرەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتـر و زیاتـر دونیـای دوور لای هـوزار شـیریندەکات. لـەو تەمەنـەوە هـوزار فێربـوو کـە خـۆی لـە بـەردەم ڕەفعەتـی باوکیـدا بـکات بـە کەسـێکی بێئـاگا و نـەزان؛ نەبـا لـە سەوسـەنی دووربخاتـەوە. هـوزار قوتابییەکـی زیـرەک نەبـوو، بـەڵام نـاوی لاتینـی هەمـوو گـوڵ و باڵندەکانـی دونیـای لەبەربـوو، ئـەو چەنـد سـاڵە سەوسـەن هەمیشـە لەسـەر ئەتڵەسـە گـەورەکان، لـە ڕێـگای وێنـە تایبەتییەکانـی خۆیـەوە، بەڕێـگای حیکایەتـەکان، زۆر شـتی لەسـەر جیهـان فێرکردبـوو. کـە هـوزار تەمەنـی بـوو بـە چواردەسـاڵ تەنیـا ئومێـدی پـوری ئەوەبـوو لـەم شـارەی دووربخاتـەوە، لـەو جەنگـە زۆر و نادیارانـەی دووربخاتـەوە کـە دەشـێت سـبەی سـەر هەڵبـدەن. کوڕەکـە خۆشـی هێـدی هێـدی خەونـی سـەفەرێکی دووروودرێـژ لـە خەیاڵیـدا سـەری هەڵـدەدا... باڵندەکانیـش هەمیشـە هێدی هێـدی دەمـردن... شـەوێکیان هـوزار بـە پـوری

گووت «پوورە سەوسەن، لەگەڵ مردنی دوا تەیردا، من لەم شارە دەڕۆم و بە دونیادا دەگەڕێم و باڵندەی ترت بۆ دەهێنم». سەوسەن بە هێمنی دەستی خستە سەر دەمی و گووتی «کە باڵندەکان هەموو مردن تۆ دەڕۆیت، تێگەیشتیت... کە باڵندەکان هەموو مردن، من دەتبەم و ڕێگات پیشاندەدەم و تۆ خۆت دەڕۆیت، بەڵام باڵندە ناگریت، تێدەگەیت... لەوانەیە تا تۆ دەگەڕێیتەوە پوورە سەوسەن لێرە نابێت. بەڵام هەرچییەک بوو، لە هەر کوێی دونیا بوویت نامە بۆ دایکت دەنوسیت، تێدەگەیت زەوی دەگەڕێیت و گوێ لە دەنگی باڵندەکان دەگریت... گرنگترین شت ئەوەیە لەم وڵاتەدا نەبیت و شەڕنەکەیت».

لە کۆتایی ساڵی دووهەزاروحەوتدا تەنیا پێنج باڵندەی زیندوو مابوون، کە دەنگیان بە ئەستەم دەگەیشتە ئەو دیو دیوارەکانی کۆشک، ئێمە هێدی هێدی هەستمان بە کزبوون و نەمانی دەنگی باڵندەکان دەکرد، هەندێکمان ڕوخسەتمان لە کەمال یەڵدا وەردەگرت کە بەرلەوەی باڵندە مۆمیاکان بباتەوە بۆ کۆشک نیگایەکیان بکەین، ئەو ڕۆحسوکانە دەرفەتی ئەوجۆرە نیگایەی پێدەداین، بێئەوەی بهێڵێت وێنەی باڵندەکان بە کامێرا دیجیتالە نوێکانمان بگرین. لە هاوینی ئەو ساڵەدا زۆر کەس لە سەر تەلەفونە دەستییەکانیان، کورتە کلیپێکیان بۆ هات کە کەمال یەڵدا لە کاتی مۆمیاکردنی کونەپەپویەکی قەشەنگدا پیشاندەدات، دیاربوو کەسێک لەوانەی یەڵدا متمانەی داوەتێ، بێئاگای خۆی تۆماریکردوە، ئەو کورتە ڤیدیۆیە هۆکاری گەورەی ئەوەبوو یەڵدا هەموومان دەربکات و نەهێڵێت ئیدی باڵندەکان ببینین. لەگەڵ مردنی هەموو باڵندەیەکدا سەوسەن لاوازتر و لاوازتر دەبوو، هەر سێ پیاوە پیرەکە هەستیاندەکرد کە نزیکبوونەوەی باڵندەکان لە کۆتایی کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سەوسەن هەیە، شەو دوای شەو لە ژێر تیشکی مۆمەکاندا، لە ژێر شەقی زەردی گڵۆپە کزەکاندا ڕەنگ زەردتر دەردەکەوت. مەنگوڕ بۆ

ئەوەی دڵی خۆشبکات شەوان لە تەنیشت قەرەوێڵەکەیەوە دادەنیشت و چیرۆکەکانی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، حیکایەتی چەقۆکێشەکانی شار، چیرۆکی پەنابەرەکان، سەربوردی ئەو کوردە داماوانەی لە هەموو جێگایەکی سەر زەویدا مرۆڤ وەک مەخلوقێکی بێنرخ و بێبەهرە سەیریاندەکات. دەستی دەخستە سەر دەستی سەوسەن و دەیگووت «کچم تۆ دونیات خۆشدەوێت، تۆ وات لە خەڵکێکی زۆری ئەم شارە کرد دونیایان خۆشبوێت... بەڵام لە خۆت نەپرسیوە ئاخۆ دونیا ئێمەی خۆشدەوێت، من نیوەی ئەم سەر زەوییەم بەپێ تەیکردوە، پێتدەڵێم، لە هەموو شوێنێکی دونیادا ئێمە وەک لەشێکی بۆگەن سەیردەکەن... من کە گەیشتمە کەنار دەریا و ژوورێکی بچکۆلانەم پەیداکرد، ئیتر وەستام، سەیرکردنی دەریا تاکە شتێک بوو ئارامی دەدامێ. چونکە کاتێک ئەم مەنگوڕە بچوک و پیر و ناجۆرە لە ڕۆخی دەریادا شان بە شان لەگەڵ خەڵکانی باڵابەرز و بەقەوامی میللەتانی تردا دەوەستا، هەستیدەکرد هەموو بەرامبەر گەورەیی ئەو ئاوە چەندە بچوکن... ئەوە زۆر دڵی مەنگوڕی خۆشدەکرد... ئەوە تەنیا شتێک بوو وەک کوردێک هەست بە یەکسانی بکات لەگەڵ بەشەرەکانی تری ئەم دونیایەدا. یوسف کەویاری گەورە دەیگووت «کە مرۆڤ لەم شارەدا لەدایکبوو، لاشەکەی لە هەر کوێیەک بنێژرێت، ڕۆحەکەی هەر لێرە دەمرێت»، گەر خۆم بە دونیادا سەفەرم نەکردبایە تێنەدەگەیشتم ئەو شەوە کامەرانی سەلما بۆ گەڕایەوە ئەم شارە، چەند ساڵ ئەو پرسیارەم لە خۆم کرد، بۆ کامەرانی سەلما فێڵی لێکردم و گەڕایەوە؟ دواجار زانیم کە کامەران نەیدەویست ڕۆحی لە جێگایەک و لەشی لە جێگایەکی تر بمرێت. لە ساڵانی دووورودرێژی سەفەردا ئەوە لە هەر شتێک زیاتر ترساندبووی، نەیدەویست جارێکی تر لەو ترسەدا بژی. وەک تۆ کچم... وەک تۆ... کە خۆت لەم کۆشکەدا دیلکردوە نەبا لەشت لەم شارەدا نوقم بێت و لە ڕۆحت ون ببێت».

فیکـرەت گوڵدانچـی دەیزانـی لەگـەڵ مردنـی دوا باڵنـدەدا، پەیوەنـدی سەوسـەن بـە جیهانـی گـەورەوە، بـەو دونیـا بەرینـەوە کـە لـە منداڵییـەوە عاشقێتی دەپچرێـت. لـە کۆتایـی سـاڵی دووهەزاروحەوتدا هەمـوو هەواڵـەکان بۆتەوەبـوون کـە تادەشـێت و دەکرێـت ژیانـی ئـەو چەنـد باڵندەیـەی مـاون درێژبکرێتـەوە. لـە سـەرەتای بەهـاری سـاڵی داهاتـوودا ئیـدی دەنگـی باڵنـدەکان لـەدەرەوە نەدەبیسـترا، لـە ناوەڕاسـتی بەهاریشـدا تەنیـا باڵندەیـەک کـە مابـوو، داڵێکـی گـەورە بـوو کـە نـاوی وەک داڵـی زیویـن ڕۆیشـتبوو. داڵـی زیویـن یەکێـک بـوو لـەو باڵندانـەی لـە قەفەزەکانـی خالید ئاموونـدا برینداربوویـوو، بـەڵام بـە کۆمەکـی دکتـۆر دڵشـاد مەترسـی مردنـی تێپەڕاندبـوو و ئێسـتا وەک دواهەمیـن تەیـری نـاو کـۆی قەفـەزەکان تەنیـا مابـووەوە. یەکێـک بـوو لـە هـەرە غەمگینتریـن باڵنـدەکان، کـە سـیازدە سـاڵ بـوو لـەم شـارەدا دەژیـا و یـەک یـەک مردنـی هەمـوو باڵندەکانـی بینیبـوو، ماڵاوایـی لـە هەمـوو هاوڕێکانـی کردبـوو. ئـەو چەنـد مانگـەی کـە بـە تەنیـا مایـەوە، هەمـوو دەیانزانـی کـە زۆر نابـات تەنهایـی و گەرمـا و بێدەنگـی دەیکوژێـت. لەسـەرەتای ئابـی ئـەو سـاڵەدا، لـە گەرمـای کوشـندە و بێئـاوی ئـەو وەرزەدا، بەیانییـەک فیکرەت هەستا بۆ ئـەوەی کەمێـک قسـە لەگەڵ ئەو داڵـەدا بـکات، بـەڵام وەک هەمـوو باڵندەکانـی دیکە کە بێدەنگ و بێهـاوار و بێپەلەقاژەیەکـی ڕاسـتەقینە دەمـردن، مردبـوو. فیکـرەت کـە داڵەکـەی هێنایـە دەرێ و سـەیری ماڵـی گـەورەی باڵندەکانـی کـرد، هەمـوو قەفـەزەکان چۆڵبـوون... دەیەهـا قەفـەز کـە ئێسـتا یـەک لەسـەر یـەک وەسـتابوون و خاڵێتیـان دەنگێکـی قـورس و ترسـناکی لەوێـدا جێهێشـتبوو.

کـە هەواڵـی مردنـی دوا باڵنـدە لـە شـاردا بڵاوبـووەوە، هەمـوو دڵنیابوویـن بـەو مردنـە چیرۆکێـک کۆتایـی دەهـات کـە تەمەنـی لـە بیسـت سـاڵ زیاتـر بـوو. ئێمـە عاشـقانی باڵنـدە غەمگینـە موقەدەسـەکان کـە زۆربەمـان وێنـەی باڵندەکانمـان لـە ئەلبومـی تایبەتیـدا هەڵگرتبـوو، هەسـتمانکرد لەگـەڵ مردنـی

دوا باڵندەدا شار ناخۆشتر و تاریکتر و دوورتر لە جاران دەردەکەوێت... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستمانکرد باڵندەکان جۆرە پردێکیان لەنێوان ئێمەو جیهاندا دروستکردوە کە ئاسان ناڕوخێت. ئەو ڕۆژە کە دوا باڵندە مرد، کۆشکەکە لەدوورەوە هێمن و ئاسایی دەردەکەوت، لە ناویشەوە بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر هەموو شتێکدا گرتبوو. پێش نیوەڕۆ هەر سێ پیرەمێردەکە بە غەمگینی هاتنەدەرێ و هەموومانیان لە مردنی دوا باڵندە ئاگادارکردەوە، بە چایخانەکاندا گەڕان، بە بازاڕدا سوڕانەوە، دوکانی ئاسیاو و هاوڕێ کۆنەکانیان بەسەرکردەوە... هەموو ئەوانەی هەواڵەکەیان نەبیستبوو بە کۆمەکی سێ پیرە پیاوەکە، بیستیان. ئەو ئێوارەیە هەموو کەمال یەڵدامان بینی کە چوو دوا باڵندە وەربگرێت و لەوسەر بە چاوی پڕ فرمێسکەوە هاتەدەرێ. ئەو بۆی باسکردین کە سەوسەن زۆر ئارام و لەسەرخۆ پێشوازی لێکردوە و پێیگوتووە کە چەندین ساڵە بیری لەم ساتە کردۆتەوە و خۆی بۆ ئامادەکردوە، لەبەرئەوە ئەم کارەساتەی کە ڕوویداوە شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە شتێکی نائاساییمان لە ماڵی گوڵدانچیدا نەبینی، دووجار موزارمان بینی هاتەدەرێ و گەڕایەوە. شەو هەموو شتێک لە ماڵی گوڵدانچییدا ئارام بوو. ئەوە یەکەم شەو بوو دوای ئەو هەموو ساڵە ماڵەکە بێ چرکە و دەنگ و جریوەی باڵندەکان بخەوێت، ئێمە کە لەدوورەوە سەیری کۆشکەکەمان دەکرد، مانگمان دەبینی بە گەورەیی لەسەری دەدرەوشێتەوە. ئەو شەوە موزار لەگەڵ ڕەفعەتی باوک و ڕەوشەدا نەگەڕایەوە بۆ ماڵێ... بێئەوەی هیچ کەس پێیبزانێت یاخود بیبینێت بەیانی زوو لەگەڵ خانمی باڵندەکاندا لە ماڵ هاتنەدەرێ، سەوسەن نزیکی دوازدە ساڵ بوو پێی نەخستبووە ئەودیو دەرگاکەوە... ئەوە یەکەمجاربوو دوای ئەو ماوە درێژە پێبخاتە سەر شەقامی ئەودیو دەرگای خۆیان، سەیری لە گۆڕانی شار و ئەو خانووبەرە تازە و شەقامە نوێیانە هات کە

بە چۆڵـی لەگـەڵ هـوزاردا پیادەڕۆیشـتن، بـەڵام وەک هەمیشـە هەسـتی بـە دڵتەنگییەکـی قـووڵ و خنکێنـەر کـرد. هـوزار جانتایەکـی چکۆلانـە و بڕێـک پـارەی پێبـوو کـە سەوسـەن سـاڵ دوای سـاڵ بـۆی هەڵگرتبـوو، دەفتەرێکـی گـەورەی ناونیشـان و ژمـارەی تەلەفوونـی ئـەو کەسـانەی هەڵگرتبـوو کـە لـە کۆشـکی باڵندەکانـەوە و بـە کۆمەکـی پـەڕی ئـەوان بـەرەو دونیـای دوور ڕۆیشـتبوون. ئـەو کەسـانەی سـاڵ دوای سـاڵ و وەرز دوای وەرز ناونیشـان و شـوێن و نیـگاری خۆیـان بـۆ خانـم ناردبـوو، پاسـپۆرتێکی نوێـی پێبـوو کـە تـا ئێسـتا کەسـمان نازانیـن چـۆن پەیدایکردبـوو. لـە نزیـک سـەعات پێنـج و نیـوی بەیانیـدا گەیشـتنە نەقلیاتـی گـەورەی شـار، شـۆفێرێکی پیـر لـە تاکسـییەکدا چاوەڕوانـی ڕێبوارەکانـی بەریەیانـی دەکـرد، بـەڵام نەقلیاتەکـە بـە گشـتی چـۆڵ و بێنەفـەر دەینوانـد. سەوسـەن داوای لـە پیرەمێردەکـە کـرد ئـەو کـوڕە گەنجـەی تـا نزیکتریـن خاڵـی سـەر سـنووری ئێـران بـۆ بەرێـت... گرنـگ ئەوەبـوو بگاتـە سـەر سـنوور، ئیـدی لەوێـوە خـۆی هەمـوو نەخشـەکانی دونیـای لەسـەردا بـوو، لـە منداڵییـەوە سـاڵ دوای سـاڵ و ڕێـگا لـەدوای ڕێـگا هەمـوو دونیـای لەبەربـوو، گەنجتریـن گـەڕاڵ بـوو کـە دووری هەمـوو شـارەکانی دونیـای لـە یەکـدی دەزانـی، دەیزانـی هـەر شـەقامێک لـەم زەوییەدا بـە چ جـۆرە زەوی و بـە نـاو چ چەشـنە باغێـک و بـە کێڵگـەی چ جـۆرە دەغڵێکدا دەڕوات. لەوێـوە ئیتـر پێویسـتی بـە کۆمەکـی کـەس نەبـوو، لەوێـوە هەمـوو سـەر زەمیـنماڵـی خـۆی بـوو. بـەر لـەوەی شـۆفێرەکە جانتـای تەنیـا میوانەکـەی بخاتـە سـندوقەکەی پشـتەوە، پـوری باوەشـی پیاکـرد و ماچیکـرد و گـوتـی «لـە هـەر کوێیەکـی دونیـا بوویـت، نامـە بـۆ دایکـت بنێـرە... لـە هـەر شـوێنێکی زەوییـەوە توانیـت قسـە لەگـەڵ دایکتـدا بکەیـت بیکـە، لـە هەر شـوێنێکی دونیـاوە توانیـت شـتێکی جـوان بۆئـەم شـارە بنێریتـەوە بینێـرە. هـەر ڕۆژێـک زانیـت کـە ناتوانیـت ئیتـر سـەفەربکەیت و بڕۆیـت، لـە جێگایەکـدا دانیشـە و چیرۆکـی خـۆت بـۆ خەڵکـی ئـەم شـارە بنوسـەوە».

هەر دووکیان بە هێمنی سەیری یەکتریان کرد، هەر دووکیان قووڵ یەکتریان خۆشدەویست، هەردووکیان ڕەنگ پەڕیو و تەنها دەیاننواند، هەردووکیشیان نەگریان.

سەوسەن نزیکی سەعات شەشی بەیانی گەیشتەوە ماڵەوە، بێئەندازە شەکەت و کەنەفت بوو، بە هێمنی چوو بۆ ماڵی باڵندەکان، لەوێش هەموو شتێک بێدەنگ و غەمگین دیاربوو، کەمێک چووە ناو قەفەزەکان، تا ئێستا دەیتوانی بۆنی بەجێماوی هەندێک لە باڵندەکان بکات، بۆنی یادگارە بەجێماوەکانیان هەڵمژێت. پاش ئێستێک گەڕایەوە بۆ ناو کۆشک، ژووراو ژوور گەڕا... سەرسامبوو کە لەیەکێک لە ژوورە چەپەکاندا، بەو بەیانییە زووە ئاریان جەودەتی بینی بە جووتێک چاوی سوور و ماندوو بێخەوەوە ڕەسمدەکات، وای هەستکرد ئاریان چەند ڕۆژ بێت لەم ماڵەدا لەیادکرابێت و هەمووان لەویادا بیریسان چووبێتەوە. ئاریان بەجۆرێک لە ناو ڕەنگ و نیگارکردندا نوقمبوو وەک شێت دەردەکەوت. سەوسەن بە هێمنی دەستی خستە سەرشانی و گووتی «ئاریان کاتی ئەوە هاتووە پشوویدەیت... کاتی ئەوە هاتووە هەموو پشوویدەین، تۆش دەبێت پشوویدەیت، ئاه چەندە تۆم ماندووکرد لەگەڵ خۆمدا، چەندە تۆم ماندووکرد». ئاریان پێشتر جۆرە ڕستەی وەهای لە زاری سەوسەن نەبیستبوو، بە سەرسامی سەیریکرد، بەجۆرێک شەکەت بوو نەیتوانی هیچ بڵێت، بەڵام هەر کەسێک لەویادا بووایە و ئەو نیگا سەرسام و قووڵ و شێتانەی ئاریانی بدیبایە هەموو ئەو شتانەی تیا دەخوێندەوە کە نزیکی بیست ساڵ بوو وای لەم کوڕە کردبوو نیگار بۆ ئەم خانمە بکات. بیست ساڵ بوو ئەویش لەسەفەرێکی دوور و قووڵ و بێبڕانەوەدا بوو لە پێناوی ئەم خانمەدا کە هەموو عومری بێدەنگ و سەرسام سەیریدەکرد و هیچی نەدەگووت. هەموو دەمانزانی ئەم کوڕە چەندە سەوسەنی خۆشدەوێت، هەمووش دەمانزانی چ پەیمانێک تامردن زمانی

بەستووە. ئەو بەیانییە ئاریان جانتاکەی پێچایەوە، دڵنیابوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەم کۆشکە بۆ ئەوەی نیگاریکات، بێئەوەی دوا نیگاری تا دوا فلچە تەواویکات، بۆیەکانی کۆکردەوە و بە چاوێکەوە کە پڕبوو لە فرمێسکی گەورە سەیری سەوسەنی کرد و جانتاکەی هەڵگرت و کەمێک لە ژوورەکان ڕاما و کەمێک سەیری باڵندە مۆمیاکانی کرد و وەک وێڵێک نەزانێت بۆ کوێ بچێت، کۆشکی باڵندەکانی بەجێهێشت.

لە سەعات شەشونیوی بەیانیدا سەوسەن چووە بەر ئاوێنەکە و ماوەیەک بە بێدەنگی قژی داهێنا، دواتر سەری لە فیکرەت گوڵدانچی و ساقی مەحمود و مەنگوڕی بابەگەورە دا کە هەر سێکیان لە خەوێکی قووڵی بەیانیدا نوقم بوون. سەری لە هەموو باڵندە مۆمیاکان دا، هەندێکیانی بە هێمنی ماچکرد، بۆنی بە هەندێکیانەوە کرد، دواتر سەرکەوتە سەرەوە و لە ژووری خەوتنەکەیدا دۆڵابی جلەکانی خۆی کردەوە، لەوێدا سەری سندوقێکی بچکۆلانەی کردەوە، سێ نامەی زۆر دێرینی دەرهێنا کە تەمەنێکی زۆر درێژیان هەبوو، سێ نامە کە وەک یەکەمین ڕۆژی ناردنیان نوێ دەیاننواند، وەک ئەوەی هەر ئەمڕۆ و بەر لە سەعاتێک نامەبەرێک هێنابێتنی، ئەو نامانەبوون کە پتر لە بیست ساڵ لەمەوبەر ڕازی بوونی داواکارەکانی بۆ سەوسەن گواستەوە، ڕۆژێک سەوسەن داوای لێکردن بڕۆن و سەفەربکەن. بە هێمنی چاوی لێکنا و بۆنی بە نامەکانەوە کرد، ئەوە یەکەمجاربوو هەستبکات کە کاغەزەکان بە ڕاستی بۆنێکی تایبەتیان لێدێت، بۆنی تێپەڕینی ژیان و بەباچوونی زەمان. لەسەرخۆ نامەکانی نا بە دڵییەوە و هەستا و بۆ ئەو ژوورە تایبەتەی دۆڵابی یادگارە تاڵەکانی تێدابوو چووە خوارێ، لەوێ دۆڵابەکەی کردەوە، نامەکانی خستە ناوی، جارێکی دی چووە سەرەوە و هەندێک لە کتێب و دەفتەرەکانی هوزاری هێنا و ئەوانیشی خستە ناو دۆڵابەکەوە. لەویادا کەمێک وەستا دەستی لە جلە کۆنەکانی نزاری برای دا، دەستی

لـە جلـی خوێناوییەکانـی کامـەران دا و جارێکـی دی بۆنـی پێوەکـردەوە، ئـەو شوشـەی خۆڵەمێشـەی هەڵگـرت کـە پاشماوەی ماڵـی سـاقی مەحمود بـوو، دەسـتی لـەو دوو تاپـڕە کۆنـە دایـەوە کـە دەمـێ سـاڵ بـوو لەویـادا خەوتبـوون... دواجـار وەک ئـەوەی بۆنـی زەمانێکـی دوور لـە سـینەی خۆیـدا هەڵگرێـت بۆنـی بـە هەمـوو شـتەکانەوە کـرد و بـە حەسـرەتێکی نادیـارەوە دەرگای دۆڵابەکـەی داخسـت و سـەرکەوتە سـەرەوە. لـە ژووری خەوتنەکـەی خۆیـدا ئەلبومـی وێنـەی هـەر سـێ داواکارەکـەی دەرهێنـا، پـەردەی هەمـوو پەنجەرەکانـی دادایـەوە، کۆتـری سـینە زامـداری خسـتە سـەر سـەرینەکەی خـۆی، سـێ ئەلبومەکـەی خسـتە سەرسـنگی خـۆی و بـە ئارامـی پاڵکـەوت. پـاش کەمێـک هەسـتیکرد گوێـی لـە دەنگـی کۆترەکەیـە، وای هەسـتکرد لـە تاریکییەکـەدا بـە زیندوێتـی دەبیینێـت، کەمێـک بـە ماندوێتـی ڕامـا و هەسـتیکرد بـە ڕاسـتی کۆترەکـە دەجوڵێتـەوە، نـا بەڵکـو هەمـوو باڵنـدە مۆمیاکانـی دەبینـی لـەو دیـو دیوارەکانـەوە دەجوڵێنـەوە، هەسـتیکرد هەموویـان لـە هەمـوو ژوورەکانـدا زیندوودەبنـەوە، چاویکردەوە و لـەو پـەڕی سەرسـامیدا هەمـوو ئـەو وێنانـەی تاریانـی بینـی وەک جەنگـەڵ و درەخـت و کێڵگـە و دارسـتانی ڕاسـتەقینە دەکرێنـەوە. بینـی باڵنـدە مۆمیـاکان لـە جێگای خۆیـان دەفـڕن و خۆیـان دەکـەن بـە ئاسمان و ئـاو و دارسـتانی نـاو نیگارەکانـدا، لـە نـاکاو بێئەندازە خۆشـحاڵ بـوو، بۆنێکـی خۆشـی دونیـا لـە هەمـوو لایەکـەوە خـۆی کـرد بـە ژوورەکەیـدا، بینـی کـە کۆترەکـەی تەنیشـتی دەفرێـت... بینـی تەمێکـی دەمەوبەیانـی چـڕ بـەڵام فێنـک ئابلۆقـەی دەدات، هەسـتیکرد دەنگێـک لـە پشـت ئـەو تەمـەوە بانگیـدەکات، نەیدەزانـی دەنگـی کێیـە... هەسـتیدەکرد ڕوخسـاری کەسـێک لـەو دیـو تەمەکـەوە دەردەکەوێـت و بانگیـدەکات، بـۆ یەکەمجـار لـە ژیانیـدا ئارەزووییەکـی گـەورەی هەبـوو، قـووڵ و دوور بـە نـاو ئـەو جەنگەڵـەدا بـڕوات، بـە نـاو ئـەو تەمـەدا ڕۆبچێت... دەیویسـت بزانێـت ئـەو دەنگـە کێیـە کـە لـەو دیـو درەختەکانـەوە، لەودیـو

ئاوەکانەوە بانگیدەکات، دەیویست بزانێت باڵندەکان بۆ کوێ فرین... لە جێگاکەی خۆی هەڵدەستا، ڕوناکییەکی نادیار لەو دیو تەمەکانەوە ڕایدەکێشا، ڕوخساری کەسێکی دەبینی کە نەیدەزانی کامەرانی سەلمایە، مەنسور نەسرینە یاخود خالید ئامونە؟ لە دڵەوە دەیویست دوای تەلیسمی ئەو تارماییە نادیارە بکەوێت، کە لە بەردەمیدا دەڕۆیشت و زیاتر و زیاتر بەرەو ناو جەنگەڵێکی دوور و گوێ ئاوێکی نەناسراو ڕایدەکێشا، بەڵام سەوسەن دەیویست ئەم پیاوە ببینێت... دەشیویست بزانێت باڵندەکان دوای مردن بۆ کوێ دەفرن... دەڕۆیشت و دڵنیابوو کە گەیشتە قووڵایی ئیتر ناتوانێت بگەڕێتەوە... باڵندەکان و تارماییەکان و ئاوەکان ڕایاندەکێشا، جەنگەڵ بە دەنگەکانی و هەوا بە فێنکی و درەختەکان بە بۆنی خۆیان دەیانبرد... ئێستێکی دەکرد و دەیویست بگەڕێتەوە، دەیویست وەرگەڕێت و بچێتەوە سەر جێگاکەی خۆی، بەڵام نا... نەیدەتوانی بگەڕێتەوە، کە ئاوڕی دەدایەوە کۆشکەکەی لە تەمێکی دوورو چڕدا دەبینی، دەستێکی نهێنی بەرەو پێشەوە پاڵی پێوەدەنا... دەستێکی نهێنی بەرەو جێگایەک پاڵی پێوەدەنا کە باڵندەکان بەسەر سەریدا و لە نزیکییەوە و لە پێشییەوە بەرەو ئەوێ دەفرین... ئێستا دڵنیابوو قووڵ بەرەو شوێنێک دەڕوات کە پێشتر نەیبینیوە، جێگایەک دەتوانێت لەوێ بۆنی هەموو گوڵەکانی دونیا بکات و گوێ لە دەنگی هەموو باڵندەکان بگرێت... ئەمجارە بێئەوەی بیریکاتەوە... بێئەوەی پێویستی بەوە بێت دوودڵ بێت بەرەو ناو ئەو تەمە ڕۆیشت... تەمێک کە تا زیاتر بە ناویدا ڕۆدەچوو ڕۆشن و ڕۆشنتر دەبووەوە... بێئەوەی بترسێت دوای پۆلی ئەو باڵندانە کەوت کە پێشی دەکەوتن... بێئەوەی بترسێت دوای ئەو تارماییە کەوت کە پێشی دەکەوت. ئێستا دڵنیابوو بەرەو جێگایەک دەڕوات هەموو ئەو شتانەی تیا دەبینێتەوە کە زۆر زۆر بیریاندەکات. بە هێمنی ڕۆیشت و هەستیکرد جیهان...

هەمـوو جیهـان بانگیـدەکات... هەسـتیکرد جیهـان هەمـوو جیهـان بـەرەو ناخـی خـۆی داوەتیـدەکات، هەسـتیکرد جیهـان، هەمـوو جیهـان دەرگاکانـی خـۆی یـەک یـەک بـۆ دەکاتـەوە... ئیـدی بـە خێراییەکـی ئەوتـۆ دەڕۆیشـت پێشـتر بەخۆیـەوە نەبینیبـوو... ئێسـتا ڕایدەکرد و ڕایدەکـرد... تـا زیاتریـش ڕایدەکـرد کۆشـکی غەمگینـی باڵنـدەکان لـەو دیـو تەمـەوە کەمتـر و کەمتـر و کەمتـر دەردەکـەوت. تـا زیاتـر ڕایدەکـرد، زیاتـر دڵنیادەبـوو کـە ئیـدی ناتوانێـت جارێکـی دی هەرگیـز بگەڕێتـەوە.

# کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە | د. حەمید عەزیز | |
| ٢. کورد لەدیدی<br>ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە | د. فەرهاد پیربالّ | |
| ٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان | د. فەرهاد پیربالّ | |
| ٤. نەتەوەی ژێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی<br>کوردی | د. جەعفەر عەلی | |
| ٦. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر<br>بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | د. جەعفەر عەلی | |
| ٧. مەحوی لەنێوان زاهیریی<br>ت و باتینییەت و ... | د. ئەحمەدی مەلا | |
| ٨. نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٩. کورتیلەیەک لە<br>مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ<br>لیۆنارد ملۆدیتۆ | حوسەین حوسەینی<br>د. هیوا عومەر |
| ١٠. کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١١. فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |
| ١٢. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە<br>نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |

١٣. دەسەڵات و جیاوازی    مەریوان وریا قانیع
١٤. لە چ ئێستایەکدا دەژین    مەریوان وریا قانیع
١٥. شوناس و ئاڵۆزی    مەریوان وریا قانیع
١٦. دین و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٧. سیاسەت و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٨. کتێب و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٩. دواهەمین هەناری دونیا    بەختیار عەلی
٢٠. ئێوارەی پەروانە    بەختیار عەلی
٢١. جەمشید خانی مامم    بەختیار عەلی
٢٢. مەرگی تاقانەی دووەم    بەختیار عەلی
٢٣. کەشتی فریشتەکان (١)    بەختیار عەلی
٢٤. کەشتی فریشتەکان (٢)    بەختیار عەلی
٢٥.شاری موسیقارە سپییەکان    بەختیار عەلی
٢٦. سێوی سێهەم    بەختیار عەلی
٢٧. لە دیارەوە بۆ نادیار    بەختیار عەلی
٢٨. وەک باڵندەی ناو
جەنگەڵە ترسناکەکان    بەختیار عەلی
٢٩. چێژی مەرگدۆستی    بەختیار عەلی
٣٠. ئەی بەندەری دۆست،
ئەی کەشتی دوژمن    بەختیار عەلی
٣١. مەعریفە و ئیمان    بەختیار عەلی
هێمن قەرەداخی
٣٢. دۆزی کورد لە بازنەی
پەیوەندییەکانی ئەمریکاو...    گۆران ئیبراهیم صاڵح
٣٣. سەمەرقەند (چ٢)    ئەمین مەعلوف    د. ئەحمەدی مەلا

| | | |
|---|---|---|
| ٣٤. وێستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٣٥. ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٣٦. گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٧. مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | د. جەمال ڕەشید<br>د. فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |
| ٣٨. منداڵانی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٩. مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٠. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٤١. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٤٢. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٤٣. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٤٤. کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٤٥. فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٦. فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٧. دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٨. کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٩. کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٥٠. زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥١. فرانسیسکۆس قەدیسی من | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥٢. ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣. شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٥٤. من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |
| ٥٥. میرنامە | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٥٦. ڕوخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٧. قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥٨. خەونی پیاوە ئێرانییەکان<br>کەوتنی بۆرە قەڵا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٩. گرگن | پێر لاگەرکفیست | خەبات عارف |
| ٦٠. ١٩٨٤ | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٦١. سوور و ڕەش | ستاندالْ | سیامەند شاسواری |
| ٦٢. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٦٣. جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٤. جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٥. ئێوارستان | پێر لاگەرکفیست | خەبات عارف |
| ٦٦. دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٧. ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦٨. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩. مەرگی تاقانەی دووەم (چ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧١. تا ماتەمی گوڵ...<br>تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٢. سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٣. تاوەرەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٧٤. غەزەلنوس و<br>باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٥. ئەی بەندەری دۆست، ئەی کەشتی دوژمن (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧٦. دواهەمین هەناری دونیا (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٧. ئێمەی پەنابەر | کۆمەڵێ نووسەر | |
| ٧٨. گرەوی بەختی هەڵاڵە (چ٢) | عەتا نەهایی | |
| ٧٩. عێراقییەک لە پاریس | سەمۆئێل شەمعون | سەباح ئیسماعیل |
| ٨٠. جیهانی سۆفیا و فەرهەنگی سۆفیا (چ٤) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨١. کچەی پرتەقاڵ (چ٣) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٢. لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٣. کچی بەڕێوەبەری سێرک (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٤. نهێنی یاری کاغەز (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٥. مایا (چ٢) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٨٦. ئینسایکلۆپیدیایەکی مێژوویی وێنەدار | کۆمەڵێ نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٨٧. کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا | د. حامد مەحمود عیسا | زرار عەلی |
| ٨٨. دوالیزمی دژیەک لە هۆنراوەلیریکییەکانی مەولانای ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزی دا | لهۆن قادر | |
| ٨٩. فەلسەفەی ئایین (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩٠. سایکۆپۆلیتیک (چ٢) | ئازاد قەزاز | |
| ٩١. خۆت بناسە | ئازاد قەزاز | |
| ٩٢. مەسیح لە خاچ دەدەنەوە (چ٢) | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |

| | | |
|---|---|---|
| ٩٣. قەدەغەشکێنی (چ٢) | مەولود ئیبراهیم حەسەن | |
| ٩٤. گەڕان بەدوای نەمرییدا (چ٢) | مەولود ئیبراهیم حەسەن | |
| ٩٥. پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی (چ٢) | مەولود ئیبراهیم حەسەن | |
| ٩٦. فەلسەفەی بوون | د. محەمەد کەمال | |
| ٩٧. وەک ڕووبارە بەخووڕەکە | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |

